

دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان

## ماکسیم گۆرگی

وەرگێڕانی

**حەمە کەریم عارف**



# خەمی نان

# (لەنێو خەڵکیدا)






بڵاوکراوەکانی ناوەندی توێژینەوەی ئەدەبیی
عەبدولڕەحمان زەبیحی ٢٠٢١

زنجیرە: ( ٨٢ )

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

Tel: 0533202936 07701549509
email: jamalerfan99@gmail.com

jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر ماکسی مۆڵ

# خەمی نان



# (لەنێو خەڵکیدا)


- نووسەر: ماکسیم گۆرگی
- وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف
- دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد
- دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
- نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢١
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٧٠٠٠ دینار
- چاپ: چاپخانەی تاران

## (١)

... تەواو ئەوەتـام لەنێـو خەڵکیـدا. کـارێکم دۆزیـوەتەوە. لە دووکانێکی پێڵاوفرۆشی زۆر فاخیری شەقامی سەرەکی شاردا شاگردی دەکەم.

وەسـتام کـابرایەکی کـورتە بـاڵای خـڕکەلانەیە. ڕوخسـاری لاواز و ڕەنگ بۆرەقنەیە، ددانەکانی زەرد وکرمۆڵن، چاوەکـانی لێـڵ و لێخـنن. وا هەسـت دەکەم چـاوانی نـابینن، بـۆ ئەوەی دڵنیابم داخۆ دەبینن یان نا، دەمەلاسکەی دەکەمەوە.

بە دەنگێکـی نـزم، لـێ جـدی گـوتی:- دەم و قەپـۆزت خوارمەکەوە، دەم وقەپۆزت بخواتەوە!

عەجایەب خۆ چاوی دەبینێ! ئەمەم پێنـاخۆش بوو، بـاوەڕم نەدەهات چاوی ببینێت، ڕەنگە وەسـتا هەر بە مەزەندە ئەوەی زانیبـێ کە مـن لاسـایی دەکەمەوە. بـۆ ئەوەی بە تەواوەتـی ئەرخایەن ببم، دووبارە لاسایی دەکەمەوە.

بە ئارامییەکی زیاترەوە، لێوە ئەستوورەکانی دەبزوێنێ:

- یەک کەڕەت پێم گوتی دەم وقەپۆزت خـوارمەکەوە. ئەدا دەرمەیەنە، ئەدا وئەتوارت بخواتەوە!

چپە تووندەکەی وەکو ئەوەی لە دووم بێ، لە گوێما دەنگی دایەوە.

- دەسـت بەیەکـا مەمـاڵە، ئەوەت لە بیربـێ کە تـۆ لە موغـازەیەکی دەرەجە یەکـی شـارا، کە کەوتـووەتە شـەقامی سەرەکی شارەوە، کاردەکەی، شاگرد دەبێ وەکو بت، ئاقڵ و بێجووڵە لەبەر دەرگا بوەستێ.

تێنەدەگەیشـتم بت (پەیکەر) چییە؟ مەبەستی چییە؟ باشـە چـی لە دەسـتەکانم بـکەم، تـا ئانیشـکم یەکپـارچە ئەگزیمـا و

زیپکەبوو، خورووییان لەوەدا نەبوو! ئارامی لەبەر بڕی بووم، یانی تەواو نابێ دەستەکانم بخورێنم؟!

وەستا، ژێراوژێر نیگایەکی دەستەکانی کردم و ئەوجا پرسی:

- لە ماڵی خۆتاندا چ کارە بووی چ کارێکت دەکرد؟

کە پێمگوت چ کارێکم دەکرد، سەرەخڕەکەی کە چنگێ مووی بۆزی پێوە لکابوو، باداو، بە پەستیەوە گوتی:

- شتە کۆنەت کۆ دەکردەوە؟... بلێ بەرەڵلاییی... خۆ سواڵ لەم کارە باشترە! لە دزییش خراپترە.

بە ڕاوێژێکی شانازی ئامێزەوە گوتم:- دزییشم کردووە.

دەستەکانی وەکو چنگی پشیلەیەک, لە سەر مێزەکە هێنانەوە یەک، چاوە ئەبلەقەکانی تێ بڕیم و لە پشت مێزەکەیەوە فیشکاندی:- چۆ ... ن؟ دزییشت کردووە؟

بۆم ڕوون کردەوە کە چۆن وکەی دزیم کردووە، چیم دزیوە، ئەوجا وەکو یەکێک تەواو ئەرخایەن ببێت، بە ڕاوێژێکی هێدی ونزم گوتی:

- دەی ئەم کاری مندالانە بووە، با چاوپۆشی لەوە بکەین، بەلام ئەگەر پارە یان پێلاو لە موغازەکەی من بدزیت، لە زندانت توونند دەکەم و نایەلم تا نەگەیە هەژدە سالان، ئازاد ببیت.

بەو قسانە ترسام ولە دلی خۆدا هێندەی دی ڕقم لێی بووەوە.

جگە لە وەستام دوو یاریدەدەری دیکەش لە موغازەکە کاریان دەکرد: یەکێکیان ساشای خالۆزام (کوڕی یاکوف) بوو، دووەمیان کوڕێکی چەلەنگی زیتەلی گۆنا سوور بوو. ساشا پالتۆیەکی کورتی سووری لەبەر و بەرکۆشەیەکی پۆشی بوو، بوینباخی لە مل بوو، پانتۆلێکی درێژی لەبەربوو دەگەییە سەر

پێڵاوەکانی. زۆر بەخۆی دەنازی وکەم و زۆر گوێی بە من نەدەدا، هیچ حیسابێکی بۆ نەدەکردم.
وەختایەک بابام بۆ لای وەستای هێنام، داوای لە ساشا کرد کە ئاگای لێم بێت وفێری نهێنیانی کارەکەم بکات. ساشا نێو چاوانی تێکنا وبە خەمساردیەوە بەرسڤی دایەوە:
- جارێ پێش هەموو شتێک دەبێ فێری ئەوەبێ بەگوێم بکات.
هەنگێ باوە گەورەم دەستی بە سەرما هێنا و، دانەویەوەو دەمی لە پەنا گوێم ناو گوتی:
- بچکۆل، بەگوێی بکە، چونکە هەم لە تۆ گەورەترەو هەم لە کارەکەشا لە تۆ لە پێشترە...
هەنگێ ساشا، نیگایەکی بە ماناوەی کردم وگوتی:- قسەکانی باوەگەورەت لەیاد بێ!
ئیدی لە یەکەم ڕۆژەوە، خۆی بەسەرما دەنواند و چاوی لێ سوور دەکردمەوە، چونکە لە من کۆنتر بوو لەوێ. جارجار وەستام پێیا هەڵدەشاخی و دەیگوت:
- کاشرین، بەس چاو زەق کەرەوەو خێسە بکە...
ساشا کاشرین، سەری دادەنواند ودەیگوت:- وەستا من مۆرەم نەکردووە.
وەستا قەناعەتی بەو درۆ زەقە نەدەکرد و لە سەری دەڕۆیی:
- بەو ئاوایە چەناگەت بامەدە... ڕەنگە مشتەرییەکان بە نێریت بزانن...
یاریدەدەرە گەورەکە، ژێراوژێر ڕیشخەنێکی بۆ دەکرد وزۆری پێخۆشبوو. وەستا لێوە دزێوەکانی هەڵقورتاند. ساشا، خۆی دایەپاڵ ڕەفەکان و لە تەریقیدا گوناکانی سوور هەڵگەڕان. من لەو گفتوگۆیانە بێزاربووم: ئەو خەڵکە وشە

وزاراوەی سەیر بەکار دێنن، هەندێجار کە ئەوان قسە دەکەن، لێیان تێناگەم، وادەزانم بە زمانی فەرەنگی دەئاخفن.

کە مشتەرییەکی ژن خۆی بە دووکان و موغازەکەدا دەکرد، وەستا دەستەکانی لە گیرفانی دەردەهێناو بە ئەسپایی دەستێکی بە سمێڵەکانیا دێنا و بزەیەکی شیرینی بۆدەکردو چرچ و لۆچان دەم وچاوی دادەپۆشی، بەلام چاوەکانی نەدەگۆڕان، بەلام شاگردە (یاریدەدەر) گەورەکە، لەجێی خۆی ڕاست دەبووەوە، سینگی دەردەپەڕاند، باسکەکانی بەخۆیەوە دەنووساندو دەستەکانی وەکو دوو باوەشێنی گەورە بادەدا، ساشا بۆ ئەوەی چاوە زەقەکانی وەشارێت، چاوی دادەخست ومن لەبەر.دەرگاکە دەوەستام وبە دزییەوە دەستەکانم دەخوراندو دووراودوور تەمەشای دیمەنی ئەم سەودا و مامەڵەیەم دەکرد.

یاریدەدەرەکە (شاگرد) دەکەوتە سەر ئەژنۆ، پێڵاوەکانی بەپای کڕێکارەکە دەگرت، دەستەکانی دەلەرزین، بەجۆرێ ئەم لاو ئەولای پای دەگرت وەکو ئەوەی بترسێت، نەبا بشکێت، من دەبیرەوە دەچووم، لە دڵی خۆما دەمگوت ئەم پێیە لە ئەژنۆوە تا خوارەوە، چەند لە بوتڵێکی سەرەوخوار دەچێت.

جارێک خانمێک، بە توونیدی پاژنەی ڕاتەکاندبوو و بۆلاندبووی:- ئاە! تۆ ختووکەم دەدەی!

شاگردەکە بلەز بەرسڤی دابووەوە:- نەخێر خانم، دەمەوێ ئەندازەی پێت بگرم.

دیمەنی شپرزەی شاگردەکە زۆر کۆمێدی بوو، بۆ ئەوەی جڵەوی پێکەنینی خۆم بگرم، ڕووی خۆم وەرگێڕا و جارجار ئاوڕێکی پاشەوەم دەدایەوە. ڕەفتار و جووڵەی شاگردەکە زۆر خۆش بوو. هەرچەند سەرم دێنا ودەبرد باوەڕم نەدەکرد،

بتوانم ڕۆژێک لە ڕۆژان قامکەکانم بەو چاپوکییە و بەو هەموو ئەدەبەوە بجولێنم و پێلاو لە پێی کەسێکی نەناس بکەم.

زۆرجار وەستا دەچوو بۆ گەنجەکەی ئەوسەری فرۆشگاکە وساشای بۆلای خۆی بانگ دەکرد. شاگردە گەورەکە بە تەنێ لەگەڵ کڕیارەکەدا دەمایەوە. لە بیرمە جارێک، دەستی بە پاژنە و گوزینگی خانمێکی سوور وسپی قژ زەردا هێنا، ئەوجا قامکەکانی هێنانەوە یەک و ماچێکی کردن. خانمەکە لەبن لێوانەوە گوتی:- کە هەتیوێکی بێ تەربیەتی!

یارۆ، بەر خەبەبەی پڕ با کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا وکەوتە دەمەلاڵکێ... ئۆ... ئا... ئۆ!

لە ناکاوا پێکەنین گرتمی، خەریک بوو لە پێکەنینا دەخنکام، بۆ ئەوەی نەکەوم دەستم بە دەسکی دەرگاکەوە گرت. دەرگاکە کرایەوە و سەرم دای بە شووشەکەدا کە شکا و ڕژایە سەر ئەرزەکە.

شاگردە گەورەکە، لاقی دا بە عاریدا و بەر دەمرێژی جنێوی دام، ئەوجا وەستا بە دەستە بەهێزەکانی وبە موستیلە زێرە گەورەکەی بەربووە سەر وکەللەم. ئەوجا ساشا کەوتە خوتەخوت وبۆڵەبۆل، ئەویش لای خۆیەوە گوێی سوومەوە. ئێوارێ کە بۆ ماڵ دەگەڕاینەوە، گوتی:

- ئاگاداربە، ئەگەر جارێکی دی ئەمە دووبارە بکەیتەوە، بێگومان دەرت دەکەن. من نازانم تۆ بەچی پێدەکەنی؟

ئەوجا بۆی ڕوونکردمەوە، شاگرد تا زیاتر لەگەڵ مشتەریدا، نەرم ونیان و ڕووخۆش و بە وێڵ و ماریفەت بێ باشترە و بازاڕی گەرمتر دەبێ... دەبێ ئەمە بکەیە گوارە و لە گوێی بکەیت.

- ئافرەتان، کە مجامەلە بدینن، ئەگەر پێلاویشیان پێویست نەبێ، هەر دەیکڕن، خواخوایانە کوڕێکی قۆز وڕووخۆش

بدینن، یانی تۆ ئەمەش نازانی؟ فایدەی نییە، هەر هەوڵێک لەگەڵ تۆدا بدرێ بە فیڕۆ دەچێت!

ئەم قسەیەی دواییم زۆر لەبەر گران بوو، هیچ کەسێک لە فرۆشگاکەدا، بەتایبەتی هەوڵی نەدابوو، شتێک فێری من بکات و هەوڵەکەی بە فیڕۆ چووبێ، بۆیە نەدەبوو ساشا ئەو قسەیە بکات.

هەموو بەیانییەک، شێفەکە، کە ژنێکی تووڕەی دەغەزاری مردەلۆخ بوو، یەک سەعات زووتر لە کوڕە خاڵەکەم هەڵیدەساندم، هەرکە لەناو جێگاکە دەردەهاتم، سەماوەرەکەم پێدەکرد، ئێزنگ و قەلاشکەریم لە هەموو سۆپاکان دەکرد، قاپ و ئامانەکانم دەشت، جلەکانی وەستام و شاگردە گەورەکە وساشام خاوێن دەکردەوە، پێڵاوەکانیانم دەسڕی. دوایی کە دەهاتم بۆ موغازەو فرۆشگاکەم گسکدەدا و تەپ وتۆزەکەیم دەتەکاند، چایم دەم دەدا، ئەوجا بە هەشتاو هەموو شارم دەدایە ژێرپاوەو ڕاسپاردەو بەستەی مشتەرییەکانم دابەش دەکرد. پاشان بۆ ماڵ دەچووم وخواردنی نیوەڕۆم دێنا. تا من لەو کارانە دەبوومەوە، ساشا لەجیاتی من لەبەر دەرگا دەوەستا. هەرکە من دەگەڕامەوە، هەموو داخی خۆی بەمن دەڕشت، کە گوایە ئەم ئیشە لە شان و شەوکەتی ئەو کەم دەکاتەوە... هاواری بەسەردا دەکردم:

– هەی تەمەڵ، هەی بێ غیرەت! کارەکانت بەملی مندا دەدەی!

ئەوەی ڕاستی بێ لەم ژیانە بێزار وبێتاقەت بووم، کە بیرم لە ژیانی ئازادی خۆم لە نێو مەزرا و لێرەوارەکانی ئەم بەرو ئەوبەری ڕووباری لێلی ئوکا و، کوچە وکۆلانە لمەلانەکانی کونافینو دەکردەوە، بەزەییم بەخۆما دەهاتەوە، بیری نەنکم و هاوڕێکانم دەکرد، لێرە کەس نەبوو قسەی دەگەڵ بکەم، کەس

لە زمانی من حاڵی نەدەبوو. ئیدی لەم ژیانە درۆزنانەیە زۆر تووڕە و پەست دەبووم.

زۆرجـــار وا ڕێـــدەکەوت کە خانمـــانی مشـــتەری دوای سـەودایەکی زۆر و چەنەبـازیەکی فـرەو گـۆڕینی ئەم پـێڵاو و ئەو پێڵاو، هیچ پێڵاوێکیان بەگەن نەدەکرد و بەدەستی خاڵی لە موغـــازەکە وەدەردەکەوتـــن، هەنگـــێ وەســـتا و هەر دوو شاگردەکەی، ساشا و ئەوی دی، تووڕە دەبوون و وەکو کەو دەچوون. وەستا، کە بزەکەی سـەر لێوی ئاوا دەبوو، ئەمری پێدەکردم:- کاشرین، ئەو قۆندەرانە بخەوە جێی خۆیان!

ئەوجا، لە ناکاوا لێشاوی جنێوان لە دەمیەوە بەردەبوو:

- بۆ ڕابواردن دێن بۆ ئێرە، مالۆسانی بەرەڵلا، لە ماڵەوە ناحەوێنەوە، ئیدی بۆ چاوبـازی و خوێڕاتی بەسـەر موغـازە و فرۆشگاکاندا دەگەڕێن! خۆزگە ژنی من دەبوو، دەمزانی چۆن ئەو دنیای بە ڕەنگینی نیشاندەدەم...

لە کاتێکـــا ژنەکەی، درێژداهـــۆڵێکی باریـــک وبنـــێس و چاوڕەشی، دفناک (کەپوو زەلام) بوو، پێی بە عاردیدا دەدا و هاواری بەسەرا دەکرد و بەجۆرێ ڕەفتاری دەگەڵدا دەکرد لە تۆ وایە خولام و نۆکەری ماڵەکەیە.

ئیـدی وەســـتا وجـــووتە شـــاگرد، دوای ئەوەی بە ڕێـــز وحـورمەتێکی زۆرەوە، بە گفـت ولفتێکـی ناسـکەوە خانمێکیـان بەڕێ دەکرد و تابەر دەرگا بەڕێیان دەکرد، هەرکە دەهـاتنەوە ناو موغازەکە هەزار و یەک قسەی دزێویان بۆ هەڵدەبەست و لە پاشـملەیان دەگـوت. وام لێـدەهات بە هەشـتاو دووی ژنەی تـاین بـکەوم و لە ڕێگـادا بیگـرم و هەمـوو ئەو قسـانەی بـۆ بگێـڕمەوە کە وەسـتا و شـاگردەکانی، بە نەهەق لە پاشـملەیان دەگوت.

هەڵبەتە من ئەوەم دەزانی کە مرۆڤ مایلە لە پاشملەی یەکدی بڵێن و لەوە ئاسانتر نییە قسە وقسەڵۆکان لە پاشملەی هەرکەسێک هەڵبەستی... بەڵام ئەمانە لە تامیان دەرکردبوو، کەسیان نەدەبوارد، ئەم سێ کەسە، خۆیان لە هەموو کەس پێ بالاتر بوو، دەتگوت لە ئیجادی بۆ ئەوە هەڵبژێردرابوون، کە بێخەم و خەیاڵ، ئیراد لە هاونەژادی خۆ بگرن و ئیدی کەسیان نەدەبوارد.

بەغیلیان بە هەموو کەس دەبرد، قەت ستایشێکیان لە دەم نەدەبوووەوە، ئیدی بۆ هەرکەسێک چیرۆکێکی نەنگین وئامادەیان پێبوو، زاریان دەتگوت مقەستی درۆمانە وتیژکراوەتەوە، بە عەمراتم خەڵکانی وام نەبینی بوو.

دەمەو ئێوارەیەک خانمێکی گەنج، زۆر گەنج خۆی بە موغازەکەدا کرد، ژنێک بوو چاو گەش، سەرگۆنا ئاڵ، پاڵتۆیەکی مەخمەڵی لەبەربوو، کە یەخەیەکی فەرووی ڕەشی پێوەبوو. دەم وچاوی لە بەینی یەخە فەرووە ڕەشەکەوە، دەتگوت گوڵێکی کێوی دەگمەن وبێ وێنەیە. وەختایەک پاڵتۆیەکەی دایە دەست ساشا، هێندەی دی جوان دەرکەوت، نموونەیەک بوو لەو گۆڕە. دوو ئەڵقەی ئەڵماس نیشان لە گوێیدا دەدرەوشانەوە، بەژن و بالای زرافی، لە ژێر کراسە ئاوریشمە شینباوەکەیەوە، کە لە ناوقەدی جەڕی بوو، هێندەی دی بەرجەستە بووبوو. یەکسەر فاسیلیسای جوانی وەبیر هێنامەوە، بەلای منەوە پەرییەک بوو لەو گۆڕە، یانی بەلای کەمەوە دەبوایە ژنی حاکم بێ. پێشوازیەکی شاهانەیان لێکرد، هەرسێ زەلامەکە لەبەردەمیا، وەکو ئەوەی کڕنۆش بۆ خواوەندێک بەرن، بە چۆکا هاتن و لە تۆ وایە گوڵ لە زاریان دەباری. بە سێ قۆڵی، بە ناو موغازەکە کەوتن و بە دەوریا دەهاتن، وێنەکانیان لە جامخانەکاندا ڕەنگی دەدایەوە. وام

هەستدەکرد هەموو شتێک گڕ دەگرێت ودەتوێتەوەو خەریکە شێوەو شکڵێکی تازە وەردەگرێت. لێ ژنەی گەنج دوای ئەوەی بێ هیچ چەنەبازی و چەند وچوونێک جووتێ پێڵاوی گرانبەهای هەڵبژاردو هێشتا بە تەواوەتی لە دووکانەکە دوور نەکەوتبووەوە کە وەستا، فیکەیەکی کێشا وگوتی:- سۆزا.... نی.... یە!

شاگردەکەش، بە کەش وفش و پۆزلێدانەوە گوتی:- بەکێی دەزانی، کەسێکی سەماکارە.

ئیدی بە دوو قۆڵی کەوتنە باسی ئاشقانی خانم و ئەشقبازی و ڕابواردنەکانی. ئیدی ئەوەی دەیانگوت، بتخستبا سەر نان سەگ بۆنی پێوە نەدەکرد، بە تەواوەتی لە تامیان دەرکرد، پیاو قێزی دەبووەوە. دەیانگوت مەگەر پیاوێک کەر بێ بچێتە ژێرباری خەرجی ئەم جۆرە ژنانە، دیاربوو ئەو هەموو جنێو و بێزکاڵیەیان لە بەغیلی بوو. جارێک وەستا دوای فراڤین، چوو بۆ گەنجەی موغازەکە وخەریک بوو بە دەم وەنەوزدانەوە دەخەوت، دەرفەتم لێهێنا، قەپاغی سەعاتە زێڕەکەی بەر باخەڵیم کردەوە، هەندێ سرکەم کرد بە مەکینەکەیدا، وەختایەک بۆ ناو موغازەکە گەڕایەوە، سەعاتەکەی بە دەستیەوە گرتبوو، من لە کەیفان لە پێستی خۆم نەدەهێوریم. سەعاتەکەی بەدەستەوە بوو وحایر وحەپەساو دەیبۆلاند:

- ئەمە چییە؟ سەعاتەکەم لە خۆیەوە ئارەقە دەکاتەوە، تا ئێستا شتی وا ڕووی نەداوە. تەسەورکەن، بەڕاستی ئارەقە دەکاتەوە! ئەمە نیشانەیەکی خراپە، نیشانەی نەگبەتیە.

وێڕای ئەو هەموو کارەی چ لە موغازەکە و چ لە ماڵەوە بە سەریاندا دابووم و وەکو سەگی پێ سووتاو، کەنەفت و ماندوو، لە نێوان موغازەکە و ماڵەوەدا لە هاتوچۆدا بووم و

نەدەپەرژام سەری خۆ بخورێنم، بەرە بەرە بێزار دەبووم و حەوسەڵەم نەدەما، ئیدی لە بیانوویەک دەگەڕام هەڵەیەک بکەم تا دەرم بکەن، بەردەوام لەخۆم دەپرسی: " باشە چ کارێک بکەم، تا ئەمانە دەرم بکەن و لەم حاڵە ڕزگاربم؟ "

لە دەرێی موغازەکەدا، خەڵکانێک کە سەراپایان لە بەفرا بوو بە هەشتاو بەبەر موغازەکەدا دەڕۆیشتن، لە تۆوایە پەلەیانە و لە ڕێورەسمی بەڕێکردنی جەنازەیەک دواکەوتوون و بیانەوێ بیگەنێ. ئەسپێن ژێر گالیسکان، بە زەحمەت گالیسکەکانیان بە ناو بەفری کەڵەکەبوودا، ڕادەکێشا. زەنگی کڵێسایەکی پشت موغازەکە هەموو ڕۆژێ، بە دەنگێکی خەمناک لێیدەدا. وەرزی ڕۆژووی گەورە بوو، کە زەنگی کڵێساکە لێیدەدا، دەتگوت کوتەکێک بەسەرما دەکێشن، ڕاستە زەنگەکە ئازاری پێنەدەگەیاندم بەڵام گێژی دەکردم، هێڕی دەکردم، حۆلی دەکردم.

ڕۆژێک، کە لەبەر دەرگای مەخزەنەکەدا، سەندووقێکی کالای تازەم بەتاڵ دەکرد، پاسەوان و جانکوشی (مجێوری کڵێسا) کڵێساکە لێم نزیک بووەوە، کابرایەکی پیری شان وشەپلیک داتەکیو بوو، بچووک دەتگوت بووکەڵەیە، شڕ وشەپڕێو دەتگوت کسۆکان شێلاویانە. گوتی:- بچکۆل جووتێ نەعلم بۆ نادزیت؟

وەڵام نەدایەوە، لە سەر سەندووقێکی بەتاڵ ڕۆنیشت، باوێشکێکی دا، نیشانەی خاچی کێشا، هەمان پرسیاری دووبارە کردەوە:- چیت گوت، بۆم نادزی؟

- دزی باش نییە، حەرامە.

گوتی:- بەڵام دەکرێ. دەی بچکۆل گیان بەزەییت بە پیریەکەما بێتەوە، بیکە بەخاتری ئەم ڕیشە سپییەم.

زۆر جیاوازتر بوو لەو خەڵکانەی دەوروبەرم، پیاو پێی ئاسوودە دەبوو. زۆر بە جدی بۆ دزی هانی دەدام، ئەوەندە پاڕایەوە تا قەناعەتی پێکردم و لە پەنجەرەکەوە جووتێ نەعلم بۆ هەڵدا.

بە کاوەخۆ، بێئەوەی هیچ ڕەزامەندیەکی تایبەتی پێوە دیاربێ گوتی:

- زۆرچاکە! خۆ پەشیمان نابیتەوە؟ هەڵم ناخەڵەتێنی؟! باشە، باشە، من دەزانم تۆ لەوانە نیت کە بەخەڵکی ڕادەبوێرن.

یەک دوو خولەکان بەبێدەنگی لەوێندەر دانیشت، پاژنەی پێڵاوەکانی لە بەفرە نمسارە پیسەکە دەسوو، ئەوجا سەبیلە سواڵەتیەکەی داگیرساند، لە ناکاوا ترسێکی خستە دڵمەوە:

- چۆنە ئەگەر من تۆ بخەڵەتێنم؟ چۆنە ئەم جووتە نەعلە هەڵگرم و بیبەم بۆلای وەستات و پێی بڵێم تۆ بە نیو ڕۆبلان پێت فرۆشتووم؟ نرخی خۆی لە دوو ڕۆبلان زیاترە و تۆبە نیو ڕۆبڵت پێفرۆشتووم، یانی بە نرخێ پێت فرۆشتووم کە بایی ئەوەندە بکات شیرینی بۆخۆت پێبکڕیت؟

بە حەپەساوی وسەرگەردانی لێمڕوانی، وەکو ئەوەی هەڕەشەکەی خۆی بردبێتەسەر، بەدەنگێکی نزمی مینگن لەسەر قسەکانی ڕۆیی، چاوی بڕی بووە پێڵاوەکانی، دووکەڵی شین دەوری سەری گرتبوو.

- ئەدی چۆنە وەستاکەت بە ئانقەست بۆ ئەم کارەی ڕاسپاردبم و گوتبێتی: ' بڕۆ ئەم کوڕە تاقی بکەوە کە کارم لەلا دەکات، وبزانە تا چ ئەندازەیەک دەستپاکە ' هەنگێ چ دەکەیت؟

تووڕە بووم وگوتم:- نەعلەکانت نادەمێ!

گوتی:- نا، ناتوانی نەمدەیتێ، تازە وەعدت داوە، کردت بەماڵ بەسەر خۆتەوە!

دەستی گرتم و بۆلای خۆی ڕایکێشام، قامکە ساردەکەی کێشا بە تەوێڵمدا وگوتی:- چۆن بەو ئاسانیە ئەمەت قەبوول کرد: " هانیَ، نەعلەکانت بگرە ".

- بۆچی، خۆ تۆ خۆت داوات کرد، وانییە؟

- دەتوانم داوای زۆرشتان بکەم. ئەگەر داوات لێبکەم کلێساکە بدزی، دەیدزیت؟ ئاخر چۆن بەو ئاسانییە متمانە بە خەڵکی دەکەی، هەی شێتە؟

لە خۆی دوورخستمەوەو هەستا:

- من پێویستم بە پێڵاوی دزیاری نییە، ئەو گەورە پیاوانەش نیم کە پێڵاو و قۆندەرە لە پێ بکەم. سوعبەتم لەگەڵ کردیت. مادامێکی باوەڕت پێکردم، ڕێگەت پێدەدەم کە بۆ سەر بۆرجی کلێساکە سەر بکەوی. لە جەژنی پاکدا وەرە تا بتوانی زەنگەکە لێبدەیت و لەو سەرەوە تەمەشای شار بکەیت.

- من شارەکەم دیتووە.

- ئاخر لەو سەرەوە، لە سەر بورجەکەوە زۆر جوانترە.

هێدی هێدی دوور کەوتەوە، پاژنەی پێڵاوەکانی لە بەفرەکە ڕۆدەچوون، ئەنجام لە سووچێکی کلێساکەدا ون بوو، من لە پاشەوە تەمەشام دەکرد و بە نیگەرانییەوە لەخۆم دەپرسی: " تۆ بڵێی ئەم پیرەمێرە بەڕاستی سوعبەتی دەگەڵ کردبم، یان وەستا ڕای سپاردبوو کە تاقیم بکاتەوە. دەترسام بۆ موغازەکە بگەڕێمەوە.

لە ناکاوا سەر وسەکوتی ساشا پەیدا بوو وهاواری بەسەرما کرد:

- باشە لەوساوە چت دەکرد لێرە؟

زۆر تووڕە بووم، مقاشێکم بەدەستەوە بوو، بە هەڕەشەوە مقاشەکەم لێڕاوەشاند. دەمزانی ساشا، لەگەڵ شاگردە گەورەکەدا، دزی لە وەستا دەکەن. بە دوو قۆڵی جووتێ پێڵاو

یان جووتێ سۆلیان لە لوولەی سۆپاکەدا تاقەت دەکرد، کە دەوام تەواو دەبوو، شتە دزراوەکانیان لە قۆلی پاڵتۆکانیاندا دەشاردەوەو لە موغازەکە وەدەر دەکەوتن. من لەم کارە هەم تووڕە دەبووم و هەم دەترسام، چونکە هێشتا هەڕەشە وگوڕەشەکانی وەستا لە گوێمدا دەزرنگانەوە. لە ساشام پرسی:- دزی دەکەیت؟

وەکو شەریکە دزێک بیەوێ نکۆڵی بکات، بەتووندی گوتی:

- من دزی ناکەم، شاگردی گەورە دزی دەکات، من تەنیا یارمەتی دەدەم. داوای ئەو کارەم لێدەکات ومن ناتوانم بە گوێی نەکەم، دەنا تۆڵەم لێدەکاتەوە، وەستامان، بەخۆیشی ڕۆژێ لە ڕۆژان شاگرد دووکان بووەو وەکو هەرکەسێکی دی دزی کردووە. هەموو ئەو حیلە وحەوالانە دەزانێت. بەڵام با ئەمە هەر بەینی خۆمان بێ، تۆ هەقت نەبێ و دەمی خۆت بگرە!

بەدەم قسەکردنەوە، بە بەردەوامی لە ئاوێنەکەدا تەمەشای خۆی دەکرد و گرێی بۆینباخەکەی چاک دەکردەوە، لە هەموو شتێکدا تەنانەت لە ڕەفتار وکرداری جووڵاندنی دەست و قامکەکانیشیا، لاسایی شاگردە گەورەکەی دەکردەوە. هەمیشە چاودێری دەکردم، بە حوکمی ئەوەی لەمن گەورەتر بوو، دەمی لە سەرم بوو، ئەمری بەسەرا دەکردم، هاواری بەسەرا دەکردم، بە ڕووما هەڵدەشاخی وکە دەستووریکی دەدامێ بازووەکانی بە غـروورەوە بڵاودەکردنەوەو دەستەکانی دەجووڵاند و زیاتر ئەمەی بۆ ئەوە بوو چاوترسێنم بکات و نەبم بە کۆسپی سەر ڕێگای. من لەو درێژتر و توندوتۆڵتر بووم، بەڵام ئەو خڕیلەیەکی قوت و قەڵە و بزێو بوو. کە پاڵتۆ کورت و پانتۆڵە شۆڕەکەی لەبەر دەکرد سام و هەیبەتێکی تایبەتی لە بەرچاوم پەیدا دەکرد. بەڵام وێڕای ئەمەش، شتێکی

تیابوو، مایەی تەوس بوو ونەدەچووە دڵەوە. زۆر ڕقی لە شێفەکە بوو، کە لە ڕاستیا ژنێکی سەیر بوو، هیچ دیار نەبوو کە ئاخۆ ژنێکی باشە یان ژنێکی بەدڕایە...

بەدەم گێڕانیَ چاوە ڕەشە ئاگرینەکانیەوە دەیگوت:

- زۆر حەزم لە شەڕە، لە هەموو شتێک پتر حەزم لە شەڕە، ئیدی هەر شەڕێک بێ! شەڕی کەڵەشێر یان سەگ یان پیاوان، ئەمە گرینگ نییە، گرینگ ئەوەیە شەڕ لە ئارادابێ...

هەرکاتێک کۆتران یان کەڵەشێران لە حەوشەکەدا، بەشەڕ هاتبان ئەو کارەکانی بەجێدەهێشت و بە بێدەنگی لەبەر پەنجەرەکە دەوەستا تا شەڕەکە تەواو دەبوو. ئێوارانیش ڕووی دەکردە من و ساشا و دەیگوت:

- منداڵینە، بۆچی بێئیش و کار لێرە دانیشتوون، بۆچی ناچنە ناو حەوشە و زۆرانێک بگرن؟

ساشا، تووڕە دەبوو:- کەودەن، من منداڵ نیم، من شاگردی دەرەجە دووی موغازەکەم.

- ئەم قسانە لای من نایخوات، کەسێک تا ژن نەهێنێت هەر منداڵە.

ساشا، دەی بۆڵاند:- کە پیرەژنێکی دەبەنگ و کەڵلەپوتی!

- خۆ شەیتان زیرەکە، بەڵام خوای گەورە خۆشی ناوێ.

ساشا، جۆری گفتوگۆیەکەی پیرەژنی زۆر پێناخۆش بوو، خۆ ئەگەر عینادی لەگەڵدا بکردایە، ژنەی تاین خێسەیەکی توندی لێدەکرد وبەپەلە دەیگوت:

- عەمرت نەمێنێ، سیسرکی چەپەڵ، ئاخر تۆچیت، خۆت بەچی دەزانیت؟

ساشا، چەند جارێک هەوڵی لە گەڵدا دام، کە دەنبوز لە سەرینەکەی ژنەی تاین بچەقێنین، یان لە کاتی خەوا، دەم وچاوی بە بۆیاخی پێڵاو یان بە هیس وتەنی ڕەشبکەین، یان

نوکتەی پێبکەین. بەڵام من لەم ژنە دەترسام، دڵنیابووم، بەدەم ئەم جۆرە کارانەوە دەمگرێت، بەتایبەتی کە خەوی زۆر سووک بوو. زۆرجار شەوان لە خەو ڕادەبوو، چراکەی دادەگیرسان، لەسەر جێگاکەی دادەنیشت وچاوی دەبڕییە خاڵێکی نادیار. هەندێجاریش لە ناو جێگاکەی دەردەهات، وبۆلای من کە لەسەر موغەیریەکە دەخەوتم، دەهات، لەخەوی هەڵدەستانم و بەدەنگێکی گڕ دەیگوت:

- ئەلیوشا، خەوم زڕاوە، دەترسم، تکایە حیکایەتێکم بۆ بگێڕەوە.

منیش خەواڵوو، بەدەم خەو وبێداریەوە، هەرچیرۆکێکم بە بیردا بهاتبایە بۆم دەگێڕایەوە، ئەویش بە دیارمەوە کزکۆڵەی دەکرد، بەدەم خەوەنوتکێوە، بەبێدەنگی گوێی لێدەگرتم. هەستم دەکرد بۆنی کافوور ومۆم و بخوردی لێدێت، بۆنی مردووی لێدێت و ڕەنگە مردنی نزیک بووبێتەوە. وام هەست دەکرد کە ڕەنگە ڕێک لەم کاتەدا لێ ببێتەوەو بمرێت... ئێستا نەمرێ و بەسەرمنا ساغ ببێتەوە. هەنگێ ترسم لێدەنیشت و دەنگم بەرزدەکردەوە، بەڵام ئەو قسەکەی پێدەبڕیم و دەیگوت:

- وس! دەنا ئەو حەرامزادانە بێدار دەبنەوە و وادەزانن لە گەڵتا خەوتووم و تۆ ئاشقی منیت.

هەمیشە بە یەک شێوە لەلامەوە دادەنیشت، جۆری دانیشتنەکەی نەدەگۆڕی - خۆی کووڕ دەکردەوە، ئەژنۆکانی لە باوەش دەگرت، پەراسووەکانی لە ژێر کراسە کەتانە زبرەکەیەوە دیاربوون... ماوەیەک بەبێدەنگی ڕۆدەنیشت، ئەوجا لەناکاوا لەبن لێوانەوە دەیگوت:- خۆزگە دەمردم و لەم گیانەسەریە ڕزگار دەبووم.

ئەوجا وەکو ئەوەی یەکێک بدوێنێ، لە سەری دەڕۆیی و دەیپرسی:- ئەم هەموو تەمەنەم بەسەربرد، بەچی چوو؟

ئەوجا حیکایەتەکەی بە نیوەچڵی پێدەبڕیم:- فایدەی نییە، با بڕۆین، چاوێ گەرم بکەین...

ئەوجا هەڵدەستا و لە نێو تاریکی مووبەقەکەدا، ون دەبوو.

ئیدی ساشا، لەبن لێوانەوە دەیگوت:- ئەم ژنە جادووگەرە.

جارێک پێمگوت، ئەگەر پیاوی وڕاستدەکەی ڕووبەڕوو وای پێبڵێ، بۆڵەیەکەی کرد:- وادەزانی لێی دەترسم؟

بەڵام هەرزوو، بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی پینەبکات گوتی:

- نا، بەرەوڕوو وای پێ ناڵێم، نەبا بەڕاستی جادووباز بێت.

شێفەکە، زۆر لەخۆبایی بوو، ڕقی لە هەمووان بوو، سەبارەت بە منیش، هەر وابوو، کەمترین خاتری نەدەگرتم... بەیانیانی زوو، سەعات شەش لەلاقم دەنەوی و ڕایدەکێشام و هاواری بەسەرا دەکردم:

- هەلو، ڕابە، پڕخوهۆڕ تاکەی! هەرە ئیزنگ و شەواتەک بێنە! سەماوەرەکە پێبکە! پەتاتەکان پاک بکە!

ساشا، لەدەنگە دەنگی ئەو بێدار دەبووەوە، بەڕوویا هەڵدەشاخی:

- ئەرێ ئەم وەڕە وەڕەت لە چییە؟ دوایی بە وەستا دەڵێم کە نایەڵێت کەس چاوێ گەرم بکات.

ژنەی تاین، بەرەو ساشا دەڕۆیی، بەدیارییەوە دەوەستا، نیگایەکی تووڕەی دەکرد و دەیگوت:

- ڕەزات خواتەوە، هەی نانەجیبی ناڕەسەن! خۆزگە کوڕی من دەبووی هەنگێ دەمزانی چۆن پێستم دەگرووێت!

ساشا، بەدەنگێکی نەوی کە ژنەکە گوێی لێنەبێت، دەیگوت:

- هەی جادووباز، بەنەحلەتی خوا بێت!

ئەوجا کە بە دوو قۆڵی بۆ دووکان دەچووین، بەدەم ڕێگاوە بە منی دەگوت:

– وەرە با کارێ بکەین ئەم ژنە بەدەرکردن بدەین. چۆنە بە دزی ئەوەوە چنگێ خوێ بکەینە چێشتەکەوە، یان نەوت بکەینە خواردنەکەوە، ئەگەر خواردنەکە بەبەردەوامی سوێر بێ یان تام نەوت بێ، بێگومان دەری دەکەن. بۆ نایەی ئەم کارە بکەی؟

من گوتم:– ئەدی خۆت بۆ نایکەی، کێ دەستی گرتوویت؟

دانی لێگرکردمەوە وگوتی:– ترسنۆکی بێ غیرەت.

***

ژنەکە بە بەرچاوی خۆمانەوە مرد. دانەوی بووەوە کە سەماوەرەکە هەڵبگرێت، لە ناکاوا لە ناوەندی ژوورەکە ڕۆنیشت وەکو ئەوەی یەکێک لە ناکاوا کوڵە مستێکی بەناو سکیاکێشابێ، بە دەما تل بووبووەوە، دەستەکانی بلاو بووبوونەوە، خوێن بەلا لغاوەیدا هاتبووە خوارەوە.

من وساشا یەکسەر زانیمان کە مردووە، حەیاتی لەبەر براوە، بەلام ترس پرزەی لێبڕی بووین، دەممان چووبووە کلیلە. چەند چرکەیەک بووری بەبێ ئەوەی بتوانین هیچ کارێ بکەین، زەق زەق تەمەشای ئەومان دەکرد. ئەنجام ساشا لە مووبەقەکە وەدەرکەوت، من تیامابووم نەمدەزانی چ بکەم، سەرم نا بە شووشەی ئەو پەنجەرەیەوە کە هەتاوەکەی لێدەهاتە ژوورەوە. وەستا هات، نیگەران و پەشۆکاو بە چیچکانەوە بە دیار ژنەکەوە دانیشت. بە کەسەرەوە تەمەشای دەکرد، دەستێکی بە سەروڕوویدا هێنا وگوتی:– بەڕاستی مردووە، چ بکەین، چارچییە؟

ئیدی ئاوڕی لای ئیکۆنە چکۆلەکەی نیکۆلای پەرجوسازی دایەوە, کە لە سووچێکی دیوارەکەوە هەڵواسرابوو و دەستی بە خاچ کێشان کرد و کەوتە دوعا و نزایان، کە لە وێرد و

نزایان بووەوە گوتی:- کاشرین، کوا بە غار هەڕە پۆلیس ئاگادار بکەوە!

زۆری پێنەچوو، پۆلیسێک هات، قەدەرێ بە خاوەخاو بە دەوری جەستەکەدا سوورایەوە و بەخشیشێکی وەرگرت و ڕۆیی، دوای ماوەیەک بە عەرەبانەیەک و عەرەبانچییەکەوە گەڕایەوە. ئیدی بەدوو قۆڵی، یەکێکیان سەری شێفەکە و ئەویتریان لاقی هەڵگرت و جەنازەکەیان بردە دەرەوە. وەستاژن لە کونی دەرگاکەوە تەمەشای دەکرد. ئەمری پێکردم:- ئەرزەکە باش خاوێن بکەوە!

وەستا گوتی:- سوپاس بۆ خوا کە شەوێ مرد.

تێنەگەیشتم بۆچی لەسەر ئەوە سوپاسی خوای کرد...

شەوێ کە چووینە ناو جێگاوە، ساشا بە شێوازێکی نەرم ونیان کە هەرگیز لەو نەدەوەشایەوە گوتی:- چراکە مەکوژێنەوە!

- بۆ، دەترسیت؟

لێفەکەی دا بەسەری خۆیداو ماوەیەک بێدەنگ بوو. شەوێکی کڕ وکپ بوو، هیچ دەنگێک نەدەهات، لە تۆ وایە شەویش گوێی بۆ شتێک هەڵخستووە و چاوەڕوانی شتێکە. وام وێنا دەکرد ئێستا نا تۆزێکی دی، دەنگی زەنگان لە هەر چوار نکاڵەوە بەرز ببێتەوەو هەموو خەڵکی دەڤەرەکە لەخەو ڕاپەڕن و بەدەم ترس و لەرزەوە بکەونە هاوار.

ساشا، لووتی لە ژێر لێفەکەوە دەرهێنا و بە ئەسپایی گوتی:

- چۆنە بچین بە دوو قۆڵی و بەتەنیشت یەکەوە لەسەر موغیرییەکە بخەوین؟

- زۆر گەرمە تەحەموول ناکەین.

دووبارە بێدەنگ بوو... دوای تۆزێک پرسی:

- ئەرێ زوو نەڕۆیی؟ من بە جادووبازم دەزانی... ناتوانم بخەوم.

- منیش.

هەنگێ ساشا کەوتە باسی مردوان کە چۆن روحانیەتیان لە گۆڕەکان دێنەدەرێ تا حەوت نیوەشەو بەناو شارا دەگەڕێن و تاقیبی ماڵ و کەسوکاری خۆ دەکەن. بەدەنگێکی نەوی گوتی:

- مردووان تەنیا شاران دەناسنەوە، بەڵام شەقام وماڵەکان ناناسنەوە.

بێدەنگی تێکەڵ بە تاریکی شەوەکە بوو، ساشا سەری هەڵبڕی وگوتی:- دەتەوێ تەماشایەکی ناو سەندووقەکەم بکەی؟

لە مێژ بوو، کەڵکەڵەی ئەوەم کەوتبووە سەر کە ئاخۆ چی لەم سەندووقەدا حەشاردابێت. هەمیشە قفڵێکی گەورەی لێدابوو، زۆر بە پارێزەوە دەیکردەوە. خۆ ئەگەر جارێک هەوڵم بدایە تەنانەت بە دزیشەوە سەیرێکی ناوی بکەم، لێم تووڕە دەبوو و هاواری بەسەرما دەکرد:

- چیت دەوێ؟ ماڵت دزراوە؟

لەبەر ئەوە، بەبێ دوودڵی پێشنیازەکەیم قەبووڵ کرد. بەچوار مشقی لەسەر تەختە خەوەکەی ڕۆنیشت، ئیدی وەکو هەمیشە بە دەنگێکی نێر ئەمری پێکردمکە سەندووقەکەی لەسەر تەختە خەوەکە، لەبەردەما دابنەم. کلیلەکەی لەگەڵ خاچەکەیدا بە زنجیرێکەوە کردبوو، لە ملی کردبوو. پێش ئەوەی سەندووقەکە بکاتەوە، نیگایەکی گومانباری بە هەر چوار نکاڵی تاریکی مووبەقەکەدا گێڕا، بە ویقارەوە برۆکانی وێکهێنایەوە و قفڵەکەی کردەوە، فوویەکی بە قەباخی سەندووقەکەدا کرد و وەکو ئەوەی گەرم بێ و دەست

بسووتێنێ، ئەوجا بەرزی کردەوە، سەرەتا هەندێک جل وبەرگی ژێرەوەی لە ناو سەندووقەکە دەرهێنا.

سەندووقەکە تا نیوەی پڕ بوو لە قوتووی بەتاڵی داودەرمان، گورزە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگی پێچانەوە چای، قوتوی ماسی سەردین و قوتویەک بۆیاخی ڕەش و شتی دیکە.

لێم پرسی:- ئەمانە چین؟

- ئێستا دەزانی، پەلە مەکە.

سەندووقەکەی خستە نێوان هەر دوو لاقی وبە سەریا دانەوییەوە، ئەوجا لەبن لێوانەوە ئایەتی:

- ئەی ئەو باوکەمان لە ئاسمانای...

خوێندەوە.

من بەتەما بووم هەندێک بووکەڵە و ئەسپاب وازی دەربێنێ، من لە ژیانما بووکەڵە و ئەسپاپ وازیم بەخۆوە نەبینی بوو، بە ڕواڵەت ڕقم لەو شتانە دەبووەوە، بەڵام لە دڵەوە بەغیلیم بەو کەسانە دەبرد کە ئەو شتانەیان هەبوو. زۆر خۆشحاڵ بووم کە ساشا هێشتا، هەرچەندە گەورە بوو، هەندێک لەو گەمە و یاریانەی پاراستبوو. هەستم دەکرد، ساشا شەرم لە کارەکەی خۆی دەکات، شەرمەکەی لە من شاراوە نەبوو.

یەکێک لە قوتووەکانی کردەوە، چوارچێوەیەکی چاویلکەی لێ دەرهێنا, کردیە چاوی، بە کەش و فشەوە ڕوانیە من و گوتی:

- دروستە شووشەی پێوە نییە، بەڵام هەر باشە، بەو حاڵەشەوە هەر پێی دەگوترێ چاویلکە.

- با منیش تاقیبکەمەوە.

بلەز بەرسڤی دایەوە:- لەچاوی تۆ نایەت، ئەمە بۆ چاوی ڕەشە، چاوی تۆ کاڵە.

هەوەڵجار بە دەنگێکی دلێر وبنجبڕ ئەو قسەیەی کرد، بەڵام لە ناکاوا دەنگی خاو بووەوە، چاوێکی نیگەران وپەشۆکاوی بەچوار نکالی مووبەقەکەدا گێڕا. ئەوسا لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو. قوتویەکی بۆیاخی ڕەشی پێڵاوی کردەوە، کۆمەڵێک دوگمەی گەورەو بچووکی تیابوو، بە کەش وفشەوە گوتی:

- هەموو ئەمانەم لە کوچە و کۆڵانان خڕکردوونەتەوە، بەتەنیا کۆم کردوونەتەوە. سی وحەوت قوپچەیە.

قوتوی سێهەم پڕبوو لە دەنبوزی مسینی گەورە کە ئەوانیشی لە کوچە وکۆڵانان دۆزی بووەوە. کۆمەڵێک پاژنەی قۆندەرە و نەعلان کە هەندێکیان نفت و نوێ بوون، کۆمەڵێک بزماری کەوشان، دەسکێکی مسینی دەرگا، تۆپێکی عاجی، شانەیەکی ژنانە، کتێبێکی خەونامە و گرتنەوەی بەخت و زۆرشتی تری لەو بابەتانە.

خۆ ئەو کاتانەی کە من لە کوچە وکۆڵان وزبڵدانەکانا لە ئێسقان و کۆنە پەڕۆیان و خوردەوات وئاسنەواڵە دەگەڕام، دەمتوانی لە زەرفی یەک هەیڤدا، دە ئەوەندەی ئەمانەی ئەو کۆبکەمەوە. کە سەروەت وسامانەکەی ساشام بینی، تووشی نائومێدی بووم، بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. کەچی ئەو زۆر دڵی بەم شرکە وپرکانە خۆشبوو، بە پارێزەوە دەستی پێدا دێنان، بە خۆشیەوە لێوە ئەستوورەکانی دەجوولاند، چاوە زەقەکانی پڕبوون لە میهر وسۆز. بەڵام بە چاویلکە بێ چاوەکەیەوە، سیما منداڵانەکەی زیاتر لە لێبۆکان دەچوو. پرسیم:

- باشە ئەم شتانەت بۆ چین، بەتەمای چییان لێبکەیت؟

لە میانی چوارچێوە بەتاڵەکەی چاویلکەکەیەوە نیگایەکی کردم و بە دەنگێکی خاو گوتی:

- دەتەوێ هەندێکیانت بدەمێ؟

- نەخێر، سوپاس.

وادیاربوو لە وەڵامەکەی من پەست بوو، کەمێک بێدەنگ بوو، ئەوجا وەکو ئەوەی بڕیارێکی زۆر گرینگی دابێت، گوتی:

- کوا کۆنە خاولیەک بێنە، با هەموو ئەم شتانە پاک بکەینەوە، گەرد و تۆز خواردوونی.

وەختایەک لە خاوێنکردنەوەی شتەکان بووینەوەو، هەموویانمان بەجوانی لە جێی خۆیان دانایەوە، ساشا لەسەر لا و ڕوو لە دیوارەکە ڕاکشا. باران دەستی پێکرد، بایەکی توند خۆی بە دەرگا وپەنجەرەکانا دەکێشا. ساشا، هەر بەو دەقەوە بەبێ ئەوەی رووی وەرگێڕێ گوتی:

- پەلە مەکە، با بارانەکە خۆشبکاتەوە، لە باخچەکەدا شتێکت نیشان دەدەم کە سەرت سوور بمێنێت.

من بەبێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، لە سەر جێگاکەم ڕاکشام تا بخەوم. دوای چەند چرکەیەک ساشا لە ناکاوا ڕابوو، چنگی بە دیوارەکەدا دەکرد، بە دەنگێکی ترسناک گوتی:

- دەترسم... خودایا چەند دەترسم! خودایا خۆت ڕەحمم پێدا بکە!..

ئەو ترسە بۆ منیش سیرایەتی کرد، تەزوویەکی ساردم پێدا هات، وام دەهاتە بەرچاو کە ژنە شێفەکە، پشت لە من و ڕوو لە پەنجەرەکە وەستاوە، هەنیەی ناوەبە شووشەی پەنجەرەکەوە، ڕێک وەکو ئەو کاتانەی کە لەوێندەرەوە تەماشای شەڕە کەڵەشێرەکانی دەکرد. ساشا، هەنسکی هەڵدەدا و، چنگی لە دیوارەکە دەدا، لاقەکانی دەلەرزین. بە زەحمەتێکی زۆر، بێئەوەی سەیری چەپ و ڕاست بکەم وەکو ئەوەی بە سەر پشکۆی ئاگردا ڕێبکەم، بەناو مووبەقەکەدا ڕۆیشتم و لەلای ساشاوە گرمۆڵە بووم. تا توانیمان گریاین، ئەنجام خەو بردینییەوە.

دوای چەند ڕۆژێک جەژنی بەسەرا هات، تەنیا دانی بەیانی کارمان کرد، بۆنیوەڕۆژەو فراڤین بۆماڵ هاتینەوە، پاش ئەوەی وەستا و ژنەکەی چوون سەرخەو بشکێنن، ساشا بە دزییەوە هات بۆلای من و گوتی:- کوا وەرە لە گەڵەم.

یەکسەر زانیم بۆ ئەو شوێنەم دەبات کە قەرار بوو، شتە سەیرەکەم نیشانبدات.

چووین بۆ ناو باخەکە، لە نێوان دوو ماڵدا، لە زەوییەکی تەنگدا دە پازدە داری زیزەفونیان ڕاندبوو، قەدەکانیان خەنەتیلەکەی هەلێنابوو، لق وپۆپە ڕووت وڕەشەکانیان، ڕوویان کردبووە ئاسمان ولە مردوو دەچوون. تاقە هێلانەیەکی قاژوان بە سەر ئەو لقانەوە نەدەبینرا. ئەو درەختانە لە کێلی قەبری زۆر گەورە دەچوون. جگە لەو درەختانە هیچ ڕووەکێکی دی لەو ناوە نەبوو، نە گیایەک، نە پنجە دڕوویەک نە دەوەنێک... ئەرزەکە ڕەش، ڕەق دەتگوت ئاسنە. لە هەندێک شوێنا، چالاییەک بەدی دەکرا کە گەڵای وەریوی بۆگنخی پار داپۆشی بوو، بۆنێکی لێدەهات کە لە بۆگنخی زەلکاوان دەچوو.

ساشا، بەرەو سووچێکی باخەکە ڕۆیی، لە ژێر دار زەیزەفۆنێک وەستا، ماوەیەک لەوێندەر مایەوە، چاوی بڕییە پەنجەرە پیسەکەی ماڵەکەی بەرانبەر، بە چیچکانەوە دانیشت و بەدەست کۆمەڵێک گەڵای زەرد وڕزیوی لابرد، ڕەگ و ڕیشەیەکی خوار و ئەستوور بەدیار کەوت و نووکی تیژی دوو کەرپوچیش (خشتی سوورەوە کراو) کە لە لایەوە لە ئەرزەکەدا چەقێنرابوون بەدیارکەوتن. هەردوو خشتەکەی بەدەست لابردن، ئیدی پارچە برنجەیەک لە ژێریانەوە وەدەرکەوت، پێدەچوو ڕۆژێ لە ڕۆژان پارچەی جەمەلۆنی ماڵێک بووبێ، لەژێر برنجەکەوە، تەختەیەکی چوارگۆشە

هەبوو. ئەوجا چاڵێکی پانم بینی کە لەژێر ڕەگە دارەکەوە دەمی کردبووەوە، ساشا دەنکە شەمچەیەکی پێکرد، پاشماوەی مۆمێکی داگیرساند و لە دەمی چاڵەکەی نزیک کردەوە وگوتی:- تەمەشاکە، بەڵام مەترسە..

ئەو بەخۆی دەترسا، ترس بە سەر وسیمایەوە دیاربوو، مۆمەکە لەدەستیا دەلەرزی. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، وەکو ئەوەی ترسێکی گەورە باڵی بەسەریا کێشابێ، لێوە ناشیرینەکانی تەتەڵەیان دەکرد، چاوەکانی مەند بوون، دەستە ئازادەکەی بە دزییەوە خستە پشتیەوە. ترسەکەی ئەو بۆ منیش سیرایەتی کرد، بەوپەڕی پارێزەوە چاوم بڕییە ژێر ڕەگە دارەکە کە لە کەوانەیەک دەچوو بەسەر شکەفتەکۆکەیەکەوە، ساشا، سێ شەماڵی دی داگیرساند و چاڵەکە پڕبوو لە ڕوناکی و تیشکێکی شینباو. چاڵەکە بە ئەندازەی پەقرەجێکی (سەتڵ) ئاسایی دەبوو، بەڵام کەمێک پانتر بوو. قەدەکەی بە پارچە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ و لەتە فەخفووری و فینجانی چینی ڕازێنرابووەوە، لە ناوەڕاستی چاڵەکەدا،گردولکە گڵێک بەرز بووەوەو پەڕۆیەکی سووری بەسەردا درابوو، تابووتێکی چکۆلەی داری، کەبە قەسدیر و برنجە داپۆشرابوو، لەسەر دانرابوو، قوماشێکی بەسەرا درابوو کە لە ئاورێشم دەچوو.

لە ژێر قوماشەکەوە، هەر دوو لاقی قاوەیی وردەنووکە چکۆلەکەی چۆلەکەیەک دیاربوو، لە پشت ئەم گۆڕەوە خاچێکی مسین داچەقێنرابوو، سێ مۆمی نیوە، کە لە کاغەزێن زێڕین و زیوینی نوقڵ و چکلێتانەوە پێچرابوون، لە دەوری گۆڕەکە دەسووتان.

گڕی مۆمەکان، بەرەو زارکی چاڵەکە هەڵدەکشان و بەرز دەبوونەوە، ناو چاڵەکەش بە جۆرەها ورشە و پرشەی

ڕەنگاوڕەنگ دەدرەوشایەوەو دەکوژایەوە، دەدرەوشایەوە و دەکوژایەوە.

بۆنی خاک وخۆڵ و مۆمی گەرم وجۆرەها بۆگنخم بەسەردا هات، خەریک بوو دڵم دەردەچوو... شتێک لە شێوەی پەلکە زێڕینەدا، لەبەرچاومدا سەمای دەکرد، ئەم دیمەنانە تووشی سەرسامییەکی ئەوتۆی کردم، کە ترسەکەمی بە تەواوەتی ڕەواندەوە. ساشا پرسی:- ئەمە جوان نییە؟

گوتم:- ئەمە چییە، فایدەی چییە؟

- ئەمە کڵێسایە، میحرابە، باشم دروستکردووە؟

- وەڵڵا نازانم.

- ئەم شادڕەوانە چۆلەکەیەکە، لەوەیە ببێت بە مەزار، چونکە شەهید بووە، بەبێ تاوان کوژراوە.

- بە مردوویەتی دۆزیتەوە؟

- نا، هاتبووە ژێر هەرزاڵەکە و، من بە کڵاوەکەم گرتم و خنکاندم.

- بۆچی خنکاندت؟

- نازانم، ئیدی خنکاندم.

چاوە درشتەکانی تێبڕیم و پرسی:- جوانە؟

- نەخێر.

ئیدی بەسەر چاڵەکەدا دانەوییەوە، بلەز سەری چاڵەکەی بە تەختە چوارگۆشەکەنایەوە، ئەوجا پارچە قەسدیرەکەی خستەسەری، ، هەردوو کەرپوچەکەی لە جێی خۆیان دانایەوە. ئەوجا گەڵا وشک ورزیوەکانی بەسەریا دایەوە، هەستایە سەرپێیان و خۆڵی سەر ئەژنۆکانی داتەکاند، زۆر بەجدی پرسی:- باشە بۆچی بەدڵت نەبوو؟

- چونکە بەزەییم بە چۆلەکە بەستە زمانەکەدا دێتەوە.

چاوەکانی، کە لە چاوانی نابینایان دەچوون، تێبڕیم، ئەوجا یەکێکی بە سینگما کێشا و هاواری بەسەرما کرد:

- کەر پیاو هەمــوو ئەمەت لە حەسـوودیدایە. وەک ئەوەیە خۆی لە مالّی خۆیا لە باخەکەی شەقامی کاناتنایادا، شتێکی جوانتری دروست کردووە؟

ئەو کەوێلەم بیرکەوتەوە کە بە کۆمەکی بابام بۆ خۆمم دروست کردبوو، یەکسەر وبێ دوودڵی بەرسڤم دایەوە:- بەڵێ، بێگومان ئەوەی من دروستم کردبوو، زۆر جوانتر بوو.

ساشا، پالّتۆکەی داکەند، فڕێی دایە سەر ئەرزەکە، هەر دوو قۆڵی هەڵمالّی. تفی کردە هەر دوو دەستی و گوتی:- کەواتە، ئەگەر پیاوی وەرە مەیدان!

هیچ ئارەزوویەی شەڕم نەبوو. خەمێکی گەورە لە سەراپام نیشتبوو، تاقەتی ئەوەم نەبوو، تەمەشای سەروسیمای توورەی خالّۆزاکەم بکەم، بەلاّم ئەو بە پێچەوانەوە، هێرشی بۆ هێنام تا توانی کەللەیەکی بە سینگمدا کێشا، یەکسەر کەوتمە سەر ئەرزەکە و چۆکی نایەسەر سینگم و هاواریکرد:- ژیان یان مردن؟

خۆ من لەو بەهێزتر وبە داروبارتر بووم. تەواو توورە بووم، ئیدی گەنگەشەکەمان خولەکێکی نەخایاند، پڕم دایە و بەدەما دام بە عاردیدا، لە ژێرەوە کەوتە پرخەپرخ و نالّە نالّ، من ترسام، ویستم هەڵی بسێنمەوە، بەلاّم بە دەست و لاق دووری خستمەوە، بەجۆری دەلەرزی دەتگوت، بە سێدارەیانەوە هەڵواسیوە، هێندەی دی ترسم لێ غالّب بوو، وازم لێهێنا ولێی دوور کەوتمەوە، تیا مابووم، نەمدەزانی چیبکەم؟ ئەو سەری هەڵبڕی وگوتی:- پێت وایە سەری شات پەڕاندووە؟ بەم دەقەوە لەجێی خۆ ناجوڵێم تا وەستامان دێت

بەسەرا، هەنگێ هەموو شتێکی لە سیری تا پیازی بۆ دەگێڕمەوە، ئەوسا بێ چەند و چۆن تڕۆت دەکەن.

ئیدی کەوتە جنێودان وهەڕ وگیف، خوام نەما، خۆم گەیاندە دیار چاڵە پیرۆزەکە، هەر دوو خشتەکەم دەرهێنا، چۆلەکەکەم بەخۆی و تابووتەکەیەوە دەرهێنا و، لە سەر حەسارەکەوە تووڕم دا، ئەوجا چاڵەکەم تێکدا و بە پێیان کوتامەوە و لەگەڵ ئەرزەکەدا تەختم کرد وگوتم:- باش تەمەشا بکە! دڵت ئیسراحەتی کرد؟ ئەمەت بە دڵە؟

کاردانەوەی ساشا، بەرانبەر بە تووڕە بوونەکەی من زۆر سەیر بوو. لە سەر ئەرزەکە ڕۆنیشت، دەمی داچەقاندبوو، نێوچاوانی تێکنابوو، برۆکانی وێکهێنابوونەوە، بەبێدەنگی تەمەشای دەکردم. کە لە کارە شێتانەکەم بوومەوە و دڵی خۆم کرد بە تەرزە, بە کاوەخۆ هەستا، جلەکانی تەکاند، بە خەمساردی پالتۆکەی بە شانیا دا و، بەدەم نەرمە هەڕەشەیەکەوە گوتی:

- سەبرێ بکە، ئەوسا دەبینی چ بەڵایەکت بەسەردا دێ. من ئەم کارەم بۆیە کردبوو تا بتخەمە تەڵەوە، ئەمە جادووە.. ڕاوەستە بزانە چیت بەسەر دێت!

تەزوویەکی سارد بە سەراپامدا هات، دەتگوت چوار پەلیان بڕیومەتەوە. ئەو ڕۆیی، بەبێ ئەوەی ئاوڕی پاشەوە بداتەوە، درێژەی بە ڕۆیشتنەکەی دا، خوێنساردیەکەی، تەواو شپرزە و هەراسانی کردم.

لێبڕام سبەی بەیانی هەڵێم. لە شار، لە وەستا، لە ساشا و جادووەکەی هەڵێم و ئەم ژیانە گەوجانە و بێئاکامە بەجێ بهێڵم.

سبەی بەیانی، شێفە تازەکە، بە دەم هەستاندنمەوە هاواریکرد:

- ئەیەڕۆ! ئەوە دەم و چاوت چیەتی؟

لە دڵـی خـۆدا گـوتم: " وادیـارە جـادووەکە کـاری خـۆی کردووە! "

بەڵام ژنەکە بەجۆری لە قاقای پێکەنینی دا کە منیش خۆم پێ کۆنترۆڵ نەکرا. دوایی لە ئـاوێنەدا تەمەشـای خـۆم کـرد، توێژێکی خەستی هیس و تەنی نیشتبووە سـەر سـەروچاوم. لە دڵی خۆدا گوتم:- تۆ بڵێی ساشا ئەم کارەی کردبێت؟

شێفەکە، بە پێکەنیەوە گوتی:- نا، کاری منە.

وەکـو هەمـوو ڕۆژێـک، دەسـتم بە بۆیـاخکردنی پێڵاوەکـان کرد. دەسـتم بەنـاو تاکێک لە پێڵاوەکاندا کرد، ئـاخ، دەنبوزێک چوو بە سـەری پەنجەمدا. لەدڵی خۆدا گوتم: " هەبێ و نەبێ ئەمەش کاریگەری و باندۆری جادووەکەیە! "

دەرزی و دەنبـوزان لە نێـو هەمـوو قۆنەرەکانـدا پەنهـان کرابوون، ئەوندە وەستایانە دانرابوون، هەرچۆنێ دەستم بەناو قۆنەرەکاندا دەکرد، دەرزییەک یـان دەنبوزێک چزەی لە قـامکم هەڵدەستان.. زۆر تووڕە بووم گۆزەیەک ئـاوی سـارد و تەزیـم هەڵگـرت و بە کەمـاڵی خۆشـحاڵی کـردم بە سـەری جەنـابی جادووبازەکەدا کە هێشا لە غورابی خەودا بوو، یان بە درۆوە خۆی کردبووە خەو.

بەڵام هێشـتا هەر نـیگەران بـووم و هەسـتم بە نـاڕەحەتی دەکـرد، هەرچـیم دەکـرد ودەکۆشـا، دیمەنـی ئەو تـابووتەم لەبەرچـاو نەدەڕەویـیەوە کە چـۆلەکە دامـاوەکەی بە چـنگە قـاوەییە خوارەکـانی ودەنـووکە چکـۆلەکەیەوە لە خـۆ گرتبـوو، هەر چـــواردەوری بە وردە شووشـــەی ڕەنگاوڕەنـــگ دەدرەوشـایەوە. ئیـدی تـابووتەکە لەبەرچـاوم گەورە بـوو، چنگەکـانی چـۆلەکەکە بەرەبەرە گەورەبـوون، پاشـان ژیـانی تێکەڕا.

لێبڕام هەمان شەو هەڵیم. بەلام نەمتوانی هەڵیم. لە کاتێکا خەریکی گەرم کردنەوەی چێشتەکە بووم، دەبیرەوە چووم، خەیاڵم ڕۆیی، کاتێ وەخۆهاتمەوە، مەنجەڵەکە قوڵپی دەدا، خێرا پڕم دایە تەباخەکە تا وەیکوژێنم، مەنجەڵەکە قلپەوە بوو و بەسەر دەستمدا ڕژا، خێرا بۆ نەخۆشخانەیان ناردم.

***

بیرەوەرییەکانی ئەونەخۆشخانەیە، ئێستاش کە بیرم دەکەونەوە، وەکو مۆتەکە ورمووزن، سواری یادگەم دەبن. خەڵکانێک، کە هەر پێست و ئێسقان بوون، لە فەزایەکی خاڵیدا وەکو ئێسکە پەیکەرانی کفن پۆش، باریک و بنێس، ڕەنگ زەرد و زەعیف، دەهاتن و دەچوون، قسەیان دەکرد، دەیان ناڵاند.. کابرایەکی درێژ داهۆڵیش، بە جووتێ برۆی پەیوەستەوە کە زیاتر لە سمێڵ دەچوون و بە دوو دار شەقەوە، ڕدێنە ڕەشە درێژەکەی دەجولاند و هەر بۆڵەبۆڵی بوو:

- ڕاوەستە بۆم بزانە چۆن لەلای جەنابی مەتران شکاتت لێدەکەم.

قەرەوێڵەکان، تابووتیان وەبیر دێنامەوە، لە یادگەی منا لە تابووت دەچوون. ئەو نەخۆشانەی لە سەر پشت ڕاکشابوون و لووتیان ڕووەو میچەکە بوو، لە چۆلەکەی مردوو دەچوون. دیوارە زەردەکان دەلەرینەوە. بن میچەکە وەکو باڵۆن پڕبا دەبوو، زەویەکە دەجولێتەوە و قەرەوێڵەکان دەهەژان. هەموو شتێک ترسناک بوو، لقی ڕووتی درەختەکان، لە پشت پەنجەرەکانەوە، وەکو ئەوەی قامچی بن و دەستێکی نادیار ڕایان بوەشێنێ، بەو ئاوایە دەجوولان.

جەستەیەکی مردەلۆخی قژ سوور، لە ناو دەرگاکەدا، بەخۆی و دوو باسکی چکۆلە و ڕەق و تەقەوە، لە ژێر

کفنەکەیەوە، خۆی با دەدا ودەیگوت:- ئێرە جێگای شێتان نییە! خۆ شێتخانە نییە، هیچ شێتێکتان لێرە وەرناگرم!

ئەو کابرایەی دوو دارشەقەکەی پێبوو، هاواریکرد:- بەگیانی جەنابی مەتران!

بابام ونەنکم و هەموو ئەو کەسانەی کە تا ئێستا قسەیان بۆ کردبووم، هەموو دەیانگوت نەخۆشان لە خەستەخانە بە سەلامەتی نایەنە دەرەوە، دەیانکوژن... بۆیە وام تەسەور دەکرد، ئەوەندەم نەماوە، هەمووی چەند ڕۆژێکە دەمرم و لێدەبمەوە.

ژنێکی، سپی پۆش لێم نزیک بووەوە، نازانم چی لە سەر ئەو تابلۆ ڕەشە نووسی کە لە ژوور سەرمەوە هەڵواسرابوو، ئەو پارچە دەباشیرەی کە شتی پێدەنووسی، شکا، وردە گەچەکانی بەسەرما ڕژا. لێی پرسیم:- ناوت چییە؟

- ناوم نییە.

- ناوت نییە؟

- نەخێر.

- خۆت گەوج مەکە، دەنا بەر شەلاقت دەدەن.

چونکە دڵنیابووم، لێدان دەخۆم، وەڵامم نەدایەوە. وەکو پشیلە فیشکاندی، ئەوجا وەکو پشیلە بە گورجی لە قەرەوێڵەکەم دوور کەوتەوە.

دوو چرایان هەڵکرد، هەردووکیان وەکو دوو چاوی کز لە میچەکەوە شۆڕ بوونەوە. بە پرتەپرت دایان لە چاوم، چاوم یەشان، گوێم لە دەنگێک بوو لە گۆشەیەکەوە گوتی:

- وەرە با یاری وەرەق بکەین.

دەنگێکی دی بەرسڤی دایەوە:- یاری؟ من یەک دەستم هەیە چۆن بە تاقە دەستێک وەرەقبازی دەکرێت؟

- ئەها، کەواتە دەستیان بڕیویتەوە، وایە؟

ئیدی لە میانی ئەو گفتوگۆیەوە وای بۆچووم، چونکە وەرەقبازی کردووە دەستێکیان بڕیوەتەوە. لە دڵی خۆدا دەمگوت، ئاخۆ بەرلەوەی بمکوژن چیم بەسەر دێنن؟

دەستە سووتاوەکانم، دەسووتانەوەو زۆر دەیەشان، دەتگوت یەکێک ئیسقانەکانی دادەتاشێت. من لەبەر خۆوە زۆر بە هێواشی دەگریام. چ لە ترسا و چ لە ئازارا دەگریام. بۆ ئەوەی کەس فرمێسکەکانم نەبینێت چاوم دەنوقاندن. بەڵام ڕوندکەکانم بەلا جانگەکانما دادەخزین و دەچوونە گوێچکەکانمەوە.

شەو داهات، هەموو نەخۆشەکان لەسەر قەرەوێڵەکانیان ڕاکشان وچوونەژێر چەرفە کەوەییەکانیانەوە. سات بەسات بێدەنگیەکە قووڵتر دەبوو، لەگەڵ ئەوەشا، دەنگی لە گۆشەیەکەوە بەرز دەبووەوە، بێدەنگیەکەی دەشڵەقاند و لەبەر خۆوە دەیگوت:

- فایدەی نییە، پیاوەکە حەیوانە و ژنەکەش کەرە.

خۆزگەم دەخواست نامەیەک بۆ نەنکم بنووسم، تکای لێبکەم تا کار لەکار نەترازاوە بێت بە فریامەوەو لێرە دەربازم بکات. بەڵام بە سەدەمی سووتانەکەی دەستمەوە، دەستم قەڵەمی نەدەگرت، کاغەزیشم نەبوو. باشە چۆن لێرە هەڵێم؟ ئاخۆ دەرباز دەبم یان نا؟

شەو زۆر درێژ بوو، لە تۆ وایە لە کۆتایی نایەت. بە ئارامی لە قەرەوێڵەکە هاتمەخوارەوە، بەرەو دەرگاکە چووم، لایەکی دەرگاکە کرابۆوە. لە سەر سەکۆیەکی ناو داڵانەکەداو لە ژێر تیشکی چرایەکدا، سەرێکی بۆزی قژ لوولم بینی، دووکەڵ دەوری دابوو، بەچاوە ڕەشەکانی کە لە قووڵەوە چووبوون تەمەشای منی دەکرد. من تیا مابووم چۆن خۆم بشارمەوە.

- زەلام کێی؟ وەرە بۆ ئێرە بزانم!

دەنگەکە نەرم بوو، مایەی ترس نەبوو. دەڕۆم، نیوە نیگایەکی ئەم دەم و چاوە خڕە، کە بە ئاستەم ڕدێنی هاتبوو، دەکەم، قژە لوولە درێژەکەی بە هەموو لایەکدا ڕژابوو، لە بەر چراکەدا وەکو زیو دەبریسکایەوە. چەند دەستە کلیلێک بە پشتێنەکەیدا شۆڕ بووبووەوە.. ئەگەر قژو ڕدێنی کەمێک زۆرتر بوان ڕێک لە قەشە پترۆس دەچوو. گوتی:

– تۆ ئەو کەسە نیت کە دەستت سووتاون؟ بۆ بەم شەوە تاریکە دەسووڕێیتەوە؟ نازانی قەدەغەیە؟

تۆپەڵێک دووکەڵی بە سەروچاوما کرد. ئەوجا باسکە فێنکەکەی نایەسەر ملم و لە خۆیی نزیک کردمەوە:– دەترسیت؟

– بەڵێ.

– هەموو ئەوانەی دینە ئێرە، هەوەڵجار دەترسن. بەڵام پێویست بە ترس ناکات، تا من لێرەبم ئاسیو بەکەس ناگات. نایەڵم ئازار بە هیچ کەسێک بگات. جگەرە دەکێشیت؟ نا، زۆر چاک دەکەی، تۆ هێشتا منداڵی، پێویستت بە جگەرەکێشان نییە– دوو ساڵێکی دی چاوەڕوان بکە تا تۆزێ گەورە دەبیت. داک و بابت نین؟ نیتن؟ باشتر– پێویستت بە داک و باب نییە. بەبێ ئەوانیش دەژیت. گرینگ ئەوەیە نەترسیت. تێدەگەیت؟

ماوەیەکی زۆر بوو، تووشی کەسێک بووبووم کە بەو سادەیی و ڕوونییە، قسان بکات. زۆر بە خۆشحاڵییەوە گوێم لە قسەکانی دەگرت.

وەختایەک کابرا بۆسەر قەرەوێڵەکەمی بردمەوە، تکام لێکرد:– تۆزێک لەلام بمێنەوە.

گوتی:– باشە.

– تۆ کێیت؟

- من؟ من بابایەکی سەربازم، سەربازێک کە لە قەفقازدا شەڕی کردووە. بەشداریم لە شەڕێن ڕاستەقینەدا کردووە. باوەڕ بکە ئیدی عەسکەرییە عەسکەری، سەرباز یانی شەڕ و شەڕ یانی سەرباز. شەڕی هەنگاریان، چەرکەسیان و پۆلۆنیانم کردووە. ئیدی شەڕ شەڕە براله، ئێستاش چ دەبێ با ببێت..

بەدەم قسەکانی کابراوە خەو بردمیەوە، کاتێ چاوم هەڵێنان چ ببینم باشە؟ سەیرم کرد نەنکم بە جلکی ڕەشەوە، لە جێگای کابراکە، بە دیارمەوە دانیشتووە و کابرای سەربازیش لەلایەوە وەستابوو و دەیگوت:- بەوجۆرە هەموویان مردن، ها؟

هەتاو دنیای زێڕ وەشان دەکرد، دەیدا لە ناو هۆڵەکان، ئەوسا وەکو منداڵێکی ڕوح سووک چاو شارکێ بکات، ون دەبوو، خۆی دەشاردەوە.

نەنکم بەسەرما دانەوییەوەو پرسی:

- چییە کۆترەکەم، ئەزیەتیان دایت؟ خۆ من ئەو کەمتیارە سەر سوورەم ڕاسپاردبوو..

سەربازەکە، بە دەم دوور کەوتنەوە گوتی:

- ئەرێ، هەنووکە دەچم، بە چاو تروکانێک هەموو شتێک بەپێی یاسا و ڕێسا تەرتیب دەکەم

نەنکم دەگریا، ڕوندکەکانی سەر گۆنای سڕی و گوتی:

- دەزانی ئەم سەربازە، خەڵکی شارۆچکەی بالاخنای لەمەڕ خۆمانە..

من بێدەنگ بووم، وام دەزانی خەون دەبینم. دکتۆرێک هات دەستەکانی تیمار کردم. مۆتەکەی خەستەخانەم لە کۆڵ بووەوە. کاتێکم بەخۆزانی دەگەڵ نەنکمدا، لە عەرەبانەیەکدا بووین و بە شەقامەکانی شاردا تێدەپەڕین. پیرەژن کەوتە باسی ماڵەوە وگوتی:

- بابات، خەریکە ئەقڵی لە دەست دەدات. ئەوەندە ڕژد بووە، مرۆڤ قێزی لێدەبێتەوە. لەم ڕۆژانەدا ' کلیست ' ی سەراج – ئەمە دۆستێکی تازەیە – ئەسکەناسێکی سەد ڕۆبڵی، لە نێو کتێبی نوێژەکانی، دەرهێنابوو و لێی دزی بوو. مەگەر خوا بزانێ چ فەرتەنەیەکی نابووەوە!..

کلیست، تازە بووبوو بە برادەری، باوە گەورەت سوێندی بەسەری دەخوارد. ئەم کارە لەبەر چاوی خست.

هەتاو، بە ئاسمانەوە دەبریسکایەوە، هەوران وەکو مەلانی سپی بە ئاسمانا دەسووڕانەوە. بەسەر پردە دارینەکەی سەر ڕوبباری فولگادا دەڕۆیین، دنیا بەستوویەتی، شەختە و بەستەڵەک، قرچەقرچ لە ژێر چەرخی عەرەبانەکەدا دەشکا، چۆڕاوگەی ئاو بە پایەی دارینی پردەکەدا دەچۆڕایەوە. خاچی زێڕین بەسەر قوبیەی سووری کڵێساکەی ناو بازاڕدا، دەدرەوشانەوە. تووشی ژنە جووتیارێکی دەموچاوپانی، ڕووگەش دەبین کە چەپکێک گوڵی بە دەستەوەیە، ئەمە نیشانەی بەهارە، مانای وایە جەژنی پاک بەڕێوەیە!

دڵم، خێراخێرا لێدەدات. خێرا دەڵێم:- چەندم خۆشدەوێی نەنەگیان!

ئەو قسەیەی پێ سەیر نەبوو، زۆر بە سادەیی گوتی:

- ئاساییە، چونکە تۆ کەسی منیت.. نەبێ بە خۆ هەڵکێشان لە خوا بەزیادبێ، بێگانانیش خۆشیان دەوێم! خودایا، حەزرەتی مریەم، لە مەرحەمەتتان بەزیادبێ!

بزەیەک، لێوی ترازاند و لەسەری ڕۆیی:

- بەو زووانە مریەمی پیرۆز خۆشحاڵ دەبێت، ئاخر کورەکەی زندوو دەبێتەوە، خەنی لەخۆی. بەڵام کیژەکەی من، فاریوشای من..

ئیدی هیچی نەگوت..

## (٢)

بابام له حه‌وشه‌دا بوو، چۆكی دادابوو و ته‌شوێیه‌كی به‌ده‌سته‌وه بوو و سه‌ری ئه‌ستوونێكی تیژ ده‌كرد، ته‌شوێیكه‌ی هه‌ڵبڕی وه‌كو ئه‌وه‌ی بیه‌وێ به سه‌رمیا بكێشێت، ئه‌وجا كڵاوه‌كه‌ی له سه‌ری داگرت، به ته‌وس وتوانجه‌وه گوتی:

- سڵاو عالی جه‌ناب، دیمانه‌ت به‌خێر! ته‌واو، ئیشه‌كه‌ت ته‌واوبوو؟ ده‌ی هه‌نووكه ده‌توانی به ئاره‌زووی خۆت، چۆنت پێخۆشه ئاوا بژیت. تفۆ له‌و شیره‌ی له ده‌مت نراوه!

نه‌نكم قسه‌كه‌ی پێبڕی و گوتی: ده‌ی به‌سه، ئه‌م قه‌وانه‌مان زۆر بیستووه.

ئیدی ئه‌ومان به‌جێهێشت و خۆمان به ژوورا كرد، نه‌نكم سه‌ماوه‌ره‌كه‌ی پێكرد وگوتی:- ئێستا بابات به ته‌واوه‌تی نابووت بووه! تاقه پولێكی قه‌ڵبی پێ نه‌ماوه، هه‌رچییه‌كی هه‌بوو، دای به نیكۆلای زڕكوڕی تا بۆی بخاته ئیشه‌وه، به‌بێ ئه‌وه‌ی هیچ وه‌سڵێكی پێ ئیمزا بكات، ئه‌نجام كه‌س نه‌یزانی چی ڕوویدا،گرینگ هه‌رچی دارونه‌داری هه‌بوو، له ده‌ستی دا، بووبه هه‌ڵم و چوو به‌ئاسمانا.. من هۆیه‌كه‌ی ده‌زانم، هی ئه‌وه‌یه هیچ سه‌ده‌قه‌یه‌كمان لێی نه‌داوه، ده‌ستمان به هه‌ژاران و نه‌دارانه‌وه نه‌بووه، به‌زه‌ییمان به كڵۆلاندا نه‌هاتووه‌ته‌وه. ئیدی خوا له دڵی خۆیدا گوتوویه‌تی: " بۆچی ئه‌م هه‌موو ماڵه به ماڵباتی كاشرین بده‌م؟ " ئیدی قه‌راری خۆی داوه‌و هه‌موو شتێكی لێوه‌رگرتینه‌وه‌و ته‌واو.

چاوێكی به ده‌وروبه‌ردا گێڕاو درێژه‌ی دایێ:

- من هه‌رچیم له توانادایه بۆ ڕازیكردنی خودا ده‌یكه‌م. لێی ده‌پاڕێمه‌وه، كه له‌وه‌ی زیاتر ئه‌م پیره‌مێرده نه‌ڕه‌نجێنێ. شه‌وانه ده‌چمه كۆڵان و به گوێره‌ی ده‌رامه‌تی خۆم، خێر

دەکەم، سەدەقە دەبەخشمەوە، تۆزێ پارەم هەیە، ئەمشەویش دەچم، ئەگەر حەزدەکەی، دەتوانی لەگەڵما بێیت.

سەر وکەڵلەی بابە گەورە لە دەرگاکەوە پەیدا بوو، نێوچاوانی بەیەکا دابوو، گوتی:- خواردنتان هەیە؟

نەنکم گوتی:- خۆ بە پارەی تۆ نەمان کڕیوە، ئەگەر حەزدەکەی دەتوانی بێی لەگەڵماندا دانیشیت و بخۆی، زۆرە.

قاییل بوو، هات دانیشت و گوتی:- کوا تۆزێکم بۆ تێبکە.

هیچ شتێکی ژوورەکە نەگۆڕابوو. تەنیا ئەو سووچە نەبێ کە جاران جێگای دایکم بوو، ئەم گۆشەیە چۆڵ وهۆڵ وخەمناک بوو. پارچە کاغەزێک بە دیوارەکەی پشت قەرەوێڵەکەی بابامەوە هەڵواسرابوو، کەبە پیتی درشت و خوانای وەکو پیتی چاپ ئەمەی لە سەر نووسرابوو: " ئەی عیسای مەسیح، ئەی زندووی نەمر!.. تا ئەو ڕۆژەی دەمرم، لە ڕەحمەت و میهری خۆت بێبەشم مەکە ".

پرسیم:- کێ ئەمەی نووسیووە؟

بابام، وەڵامی نەدایەوە. دایە گەورە دوای کەمێک بێدەنگی بەدەم بزەیەکی کاڵەوە گوتی:- ئەم کاغەزە سەد ڕۆبڵ لەسەرمان کەوتووە. ئەمە..

پیرەمێرد هاواریکرد:- ئەمە پەیوەندی بە تۆوە نییە، هەرچیم هەیە دەیدەم بە بێگانان!

دایە گەورە، بە ئارامی گوتی:

- هیچت نەماوە، لات پاڵەوانی خوای، ئەو کاتەی هەتبوو فلسێک دایکت بوو یەکێک باوکت، دەستت تێناچوو بۆ خۆتیشی خەرج بکەی چ جای بێگانان.

بابام قیژاندی:- بێدەنگ!

کولیای برام کە لە ناو سەبەتەی جلە وشکەکاندا خەوتبوو، سەبەتەکە لە سەر سەندووقێکی گۆشەی ژوورەکەدا دانرابوو،

لە دەنگی بابام خەبەری بووەوە. چاوە شینەکانی، بەزەحمەت لەژێـر پێڵـوە خەواڵوەکـانیەوە دەبینـرا. بووبـوو بە داسـک و دەرزی، وادیـاربوو منـی نەناسـییەوە، بە بێـدەنگی سـەری وەرگێڕاو چاوی نوقاندن.

لە دەرێ، خەبەر و نـووچەی ناخۆشـم بیسـت، یەکێـک لە دۆستەکانم بە نێوی ڤیاخیر، لە هەفتەی پیرۆزدا، بە نەخۆشی لەرز وتا مردبوو. خابی، برادەریشـم، چووبوو لە شـار بژی. یاز ˚ ی برادەرم تووشی باداری بووبوو، لە ماڵەوە زەمینگیر بووبـــوو. کوســـترومای چاوکــاڵ بەدەم گێـــڕانەوەی ئەو هەواڵانەوە بە تووڕەیی گوتی:- ئەم کوڕانە زۆر زوو خەریکە دەمرن!

- خۆ هەر فیاخیر مردووە.

- فەرقی چییە، ئەوەی لەپێ بکەوێ و نەتوانێت بێتە دەرەوە هەربە مردوو حیسابە. هەرکە دۆستایەتی و ئاشنایەتی دەگەڵ یەکێکدا پەیدا دەکەی و نـاکەی، خێرا دەکەویتەژێر گیـروداری کـارێکەوە و نـای پەرژێـتە سـەر تـۆ، یـان مـردن دەیبـاتەوە. کرێچییەکـی تـازە هـاتوونەتە حەوشـەی مە، واتـا هـاتوونەتە خـانووەکەی مـاڵی چیسـنوکوف، خـانەوادەی یێفسـینوکویان پێدەڵێن، کوڕێکیان هەیە ناوی نوشکایە، کوڕێکی زیرەک وبە ئەدەبە، دوو کچیـان هەیە، یەکێکیـان بچـووکە و ئەویتریـان شەلە، بە دوو دارشەق دەڕوات. جوانە. کەمێک دەبیرەوە چوو وئەوسا لەسەری ڕۆیی:- من و چۆرکا هەر دووکمان حەزمان لێکردووە. بەردەوام شەڕمانە.

- لە گەڵ کچەکە؟

- نە کەرە، من و کوڕەکە. زۆر کەم لەگەڵ کچەکەدا بەشەڕ دێین!

هەڵبەتە، دەمزانی کە کوڕان وپیاوان دەکەونە داوی ئەشقەوە.. مەسەلەی دڵداری و ڕامووسان و ڕابواردن و جەفای عەشقم دەزانی و لێم شاراوە نەبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش دڵم بەحاڵی کوستروما دەسووتا، کەبە جەستە لەڕ و لاواز و چاوڕەشەکانیەوە دەتگوت داری واوەیلێیە..

ئێوارەی هەمان ڕۆژ کیژە شەلەکەم بینی.. بە قاڵدرمەکاندا دادەگەڕا، بۆ ناو حەوشەکە دەڕۆیی، دارشەقەکە لە دەستی کەوت. لە جێگای خۆی ڕەق ڕاوەستا، نەیدەتوانی یەک هەنگاو بنێت، باریک و لاواز، کەپووت بگرتایە ڕۆحی دەردەچوو، دەستە لاوازەکانی بە محەجەرەکەوە گرتبوو، ویستم دارشەقەکەی هەڵگرمەوەو بیدەمەوە دەستی، لێ مخابن دەستم بریندار بوون و باش کاریان نەدەکرد. من لە بێ توانایی خۆم تووڕە بووم و بێهودە زۆرم لە خۆ دەکرد، ئەو لە سەر قاڵدرمەکە وەستابوو و بە میهرەبانی پێدەکەنی. ئەنجام لێی پرسیم:- دەستت چییەتی؟

- سووتاون.

- منیش وەکو دەبینی لەنگم. تۆش لەم خانووە ئاکنجیت؟ زۆر لە نەخۆشخانە مایتەوە؟ من زۆر لە خەستەخانە مامەوە.

کراسێکی سپی کۆنی لەبەر بوو، بەڵام زۆر خاوێن بوو، گوڵی وردی شینی پێوە بوو، قژە نەرمەکەی جوان داهێنرابوو، گوررزەهۆن کرابوو و بەسەر سینگیا هاتبووە خوارەوە. چاوە درشتەکانی لە من بوو، بەڵام خەمینی و ماندوویەتیان لێدەباری.. ناسکە بزەیەک بەسەر لێوە تەنکەکانیەوە سەمای دەکرد، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی نەچووە دڵمەوە. پێدەچوو ئازای نەخۆشی هاواربکات:- تکایە دەستم لێمەدەن..

حەزم دەکرد بزانم، چۆن هاوڕێ چکۆلەکانی من کەوتبوونە داوی ڤیانی ئەوەوە؟

دووباره هاتەقسان، بە ڕاوێژێکی پڕ غروور و شانازییەوە گوتی:

- من زۆر لە مێژە نەخۆشم. یەکێک لە دراوسێکانمان جادووی لێکردم، لەگەڵ دایکما بووبوو بە شەڕی و بۆ ئەوەی داخ بکاتە دڵی دایکمەوە، جادووی لێکردم. باشە کە تۆ لە خەستەخانە بوویت، نەترسایت؟

- با، زۆریش ترسام!

ڕەوشی کیژەکە و پرس و جۆیەکانی پەشۆکاندمیان، ئیدی بۆماڵ گەڕامەوە. نەنکم دەوروبەری نیوەشەو بە میهرەبانییەوە بێداری کردمەوەو گوتی:

- بڕۆین؟ ئەگەر یارمەتی هاونەژادی خۆت بدەیت، دەستەکانت زوو چاک دەبنەوە.

قۆڵی گرتم و وەکو کوێر بەناو تاریکیەکەدا بکێشی کردم. شەوێکی ئەنگوستەچاوی نمناک بوو، بایەکی توندی تەزی دەهات، گف وهۆڕی بایەکە لە دەنگی هاڕەو هاژەی ڕووبارێکی لەزگین دەچوو. پێمان لە قوڕ وسیان دەچەقی. نەنکم بە پارێزەوە ڕێی دەکرد، بەرەو پەنجەرە تاریکەکانی ماڵە هەژارە بێنەواکان دەڕۆیی. لەبەر هەر ماڵێکا سێ جاران نیشانەی خاچی دەکێشا و پێنج کوپیک و سێ پارچە پسکیتی لە قەراخ پەنجەرەکەیان دادەنا، دووباره نیشانەی خاچی دەکێشا. سەری بۆ ئاسمانی بێ ستێران هەڵدەبڕی و لەبن لێوانەوە دەیگوت:

- ئەی فریشتەی بێگەردی ئاسمانی پاک، یارمەتی هەموومان بدە، ئێمە هەموومان لە هەنبەر تۆدا کەمتەرخەمین، ئەی دایکی موبارەک و پیرۆز!

تا زیاتر لە ماڵی خۆمان دوور دەکەوتینەوە، دنیا تاریک و تاریکتر دەبوو، لە تۆ وایە ئاسمان بۆ هەمیشە مانگ و ئەستێرەکانی قووت داوە و جارێکی دی هەڵنایەنەوە. لە ناکاوا

سەگێکمان لێ پەیدا بوو، چاوەکانی لە تاریکیەکەدا دەبریسکانەوە، لە ترسا خۆم دایە پەنای نەنکم.

گوتی:- مەترسە. سەگە، قەت سەگت نەدیوە! وەختی شەیتانان بەسەر چووە، دەمێکە کەڵەباب خوێندوویەتی.

سەگەکەی بانگ کرد، دەستی بە سەریا هێنا وگوتی:

- سەگە جوانە چکۆلەکە ئەم منداڵە مەترسێنە، ئەمە نەوەی منە!

دوای کەمێک سەگەکە هێور بووەوە، خۆی لەلاق و لەتەری من هەڵدەسوو، ئیدی بە سێ قۆڵی کەوتینەڕێ. نەنکم لە دوازدە پەنجەران نزیک بووەوە و بەبێدەنگی خێر و سەدەقەکەی خۆی لە قەراخ ئەو پەنجەرانە دانا. ئاسمان خەریک بوو ڕوناک دەبووەوە. بەرەبەرە هەیکەلی کەوەیی ڕەنگی خانووەکان لە ناو جەرگەی تاریکیەکەوە بەدیار دەکەوتن. بورجی زەنگەکانی کڵێسای نابولنایا، دەرکەوت، وەکو شەکر لە دوورەوە سپی دەچووەوە. دیوار و حەساری گۆڕستانەکە، بە دیارکەوت، لە تۆ وایە تامان و پەرژینێکی مکووم و قایمە.

نەنکم گوتی:- نەنکە پیرەکەت کەنەفت بووە، پیری و هەزار عەیب. وەختی ئەوە هاتووە بۆ ماڵ بڕۆینەوە. کە ژنان بەیانی زوو لە خەو ڕادەبن و دەبینن پاکیزەی موبارەک ئەو پارەو پسکیتانەی بۆ منداڵەکانیان داناوە، زۆر خۆشحاڵ دەبن، خەڵکی هەژار بە شتی کەمیش ڕازین. ئەلیوشا، تۆ تەمەشا بزانە خەڵکی بێنەوا و هەژار لە دنیادا چەند زۆرن، کەچی هیچ کەسێک بە خەمیانەوە نییە، کەس ئاوڕێکی بەخێریان لێناداتەوە.

*دەوڵەمەند بیر لە خودا ناکاتەوە*

*ڕۆژی پەسلان و عەدالەتی لە بیر نییە*

*دڵی بە هەژار و بێنەوایان ناسووتێ*
*تەنیا لە خەمی کۆکردنەوەی زێری خۆیەتی*
*بۆ کوێ دەڕوا*
*ئاهی هەژاران*
*تا هەتاهەتایە*
*لە ئاگری دۆزەخا دەسووتێ!*

- مخابن! ئەرکی مە ئەوەیە پشتی یەک بگرین، یارمەتی یەکدی بدەین تا خوداش یارمەتی هەموو لایەکمان بدات، من زۆر خۆشحاڵم کە جارەکی دی هاتیەوە بۆلای من.

منیش هەمان هەستی ئەوم لەلا چێبووە، هەستدەکەم لە کارێکی فەرامۆش نەکردەنیدا بەشداریم کردووە. سەگە سورخنەکە، کە دەم وچاوی لە ڕێوی دەچوو، جۆرە ترسێک بە چاوە جوانەکانیەوە دیاربوو، بە کلکە سووتێ بە دەورماندا دەهات، بیر لە ئایندەی دەکەمەوە، دەپرسم:- باشە ئەمە لای مە دەمێنێتەوە؟

- بۆ نا؟ ئەگەر حەز دەکات با بمێنێتەوە. ئێستا پسکیتێکی دەدەمێ، هێشتا دوودانەم پێ ماوە، با کەمێک لەسەر ئەم سەکۆیە دانیشین. وادیارە زۆر ماندوو بووم.

لە سەر سەکۆیەکی نزیکی دەرگایەکی گەورە دانیشتین، سەگەکە لەبەر پێماندا وەرکەوت و دەستی بە خواردنی پسکیتە وشکەکە کرد. نەنکم گوتی:

- ژنە جوولەکەیەک لەمماڵەدا دەژی، نۆ منداڵی سەروپێچکەی هەیە.

جارێک لێم پرسی: " موسییڤنا تۆ چۆن دەژیت؟ " بەرسڤی دایەوە: " من لەگەڵ خوای خۆما دەژیم، ئەگەر ئەو نەبوایە چۆن دەمتوانی بژیم؟

خۆم بە بەدەنی نیمچە تەڕی نەنکمەوە دەقرسێنم و خەو دەمباتەوە.

ژیان، بەخێرایی و بەخۆشی دەست پێدەکاتەوە، هەموو ڕۆژێکی تازە شتێکی تازە ڕوحم ئاوەدان دەکاتەوە یان نیگەرانم دەکات، یان سەرنجم ڕادەکێشێت و لە فکران ڕادەچم. بیرکردنەوەی یەک لە دووی یەک بەرۆکم دەگرن. نازانم چ گۆڕانێکم بەسەرهاتووە. زۆری نەبرد دڵم کەوتە کەڵکەڵەی دیتنی کچە شەلەکە. حەزم دەکرد بیدینم، قسەی دەگەڵ بکەم، یان بەبێدەنگی و لەسەر سەکۆکەی بەر دەرگادا،لە نزیکیەوە دانیشم. تەنانەت دڵم بەوەش خۆشبوو کە بە بێدەنگی لەلایەوە دانیشم. لە پەڕەسێلکە دەچوو، زۆر بە جوانی باسی قوزاقەکانی کەناری دۆنی بۆ دەکردم، ماوەیەکی زۆر لەلای مامە میکانیکەکەی کە لەوێندەر لە کارگایەکی شیرا کاری دەکرد ژیابوو. پاشان بابی کە کابرایەکی بەڕاد بوو، بۆ نییجنی نوڤگرود نەقڵ بووبوو، ئەویش.

- مامێکی دیکەشم هەیە کە کار بۆ خودی تزار دەکات.

شەوانی جەژن، هەموو خەڵکی ئەو کۆڵانە لە ماڵ دەهاتنە دەرێ. کچان و کوڕان بۆ پیاسە و گەڕان وگۆرانی دەچوون بۆ سەرقەبران. پیاوان بۆ مەیخانان دەچوون، کەس لە کۆڵانەکە نەدەما جگە لە منداڵان وژنان، ژنان لە سەر سەکۆیان یان لە سەر ئەرزەکە لەبەر ماڵەکانیاندا دادەنیشتن و بەدەنگی بەرز حیکایەتیان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە، منداڵان، موشین یان تۆپانێیان دەکرد ودایکان دوور ونزیک چاودێریان دەکردن، ستایشیان دەکردن یان بە گەوجاتیان پێدەکەنین.ئیدی هەرا و زەنا و ژاوەژاو دنیای پڕ دەکرد، لە حوزووری گەورەکانا، هێندەی دی دەهاتینەجۆش ولە گەمە ویاریەکانماندا گەرم دەبووین ودەکەوتینە کێبڕکێ. ئێمە، من، کوستروما وچورکا، لە

گەرمەی یاریدا، ناوبەناو، بەهەشتاو خۆمان دەگەیاندە لای لودمیلا شەل و خۆمان بە گەمەکانمانەوە هەڵدەکێشا:

- لودمیلا،بینیت چۆن هەر پێنج سنگەکەم بەیەک زەربە خست؟

ئەویش بە ڕوومانا پێدەکەنی و سەری بۆ دەلەقاندین، وەکو ئەوەی ئافەرینمان بکات. جاران دەستەبەندیمان دەکرد و ئێمە هەرسێکمان لەیەک دەستەدا بووین، کەچی لەم دواییانەدا، دەمبینی کوستروما وچورکا، دەچوونە دوو دەستەی جیاوازەوەو بەجۆرەها شێوە هەڤرکی یەکیان دەکرد و توانای خۆیان دەنواند وهەندێجار کار دەگەییە شەڕ و پێکادان و گریانیش. جارێکیان بەجۆرێ ئامبازی یەک بوونەوەو بە گژ یەکدا چوون، کە گەورەکان ناچاربوون بۆ لێک کردنەوەیان، وەکو ئەوەی دوو سەگی هاربن، بە سەتڵ ئاویان پێدا بکەن.

لەم کاتەدا لودمیلا، کە لەسەر تەختێک دانیشتبوو، لاقە ساغەکەی لە عاردی دەجولاند و هەرکە دووڕەقیبەکە لێی نزیک دەبوونەوە بە دارشەقەکەی لە خۆی دووری دەخستنەوەو بەترسەوە هاواری دەکرد:- بەسە! لاکەون!

ئیدی دەم و چاوی گرژ دەبوو چاوانی لێڵ دەبوون، چی وای نەدەما ببورێتەوە.

جارێکیان کوستروما، بە شێوەیەکی نەنگین گەمەکەی بە چورکا دۆڕاند. کوستروما، بە تەریقی ڕۆیی، خۆی لە پەنا سەندوقێک شۆڤان، کە لەبەر دووکانێکی ئەو نزیکانە دانرابوو شاردەوەو بەبێدەنگی دەستی بەگریان کرد. دیمەنێکی خەمناک بوو. هێندە ددانی بە چیرەوە بردن، ماسولکەکانی چەناکەی ئاوسان، دەم و چاوە باریکەکەی بوو بە بەرد، ڕوندک وەکو بارانی بوهارێ، لە چاوە ڕەشە خەمینەکانیەوە دەباری. کە لێی

نزیک بوومەوەو ویستم دڵ خۆشی بدەمەوە، بەدەم فرمێسک ڕشتنەوەو لەبن لێوانەوە گوتی:

- ڕاوەستە، بزانە چۆن پێی نیشاندەدەم، هێشتا لە کوێیەتی، یەک کەرپوچ دەدەم بە تەپڵی سەریا، ئەوسا دەزانیَ من کێم!

چورکاش خۆی گێف کردبووەوە. بە کەش وفشەوە بەسەر شەقامەکەدا، دەڕۆیی و وەکو گەنجێک وەختیَ ژنهێنانی بیَ، خۆی دەنواند، کڵاوەکەی نابووە تیلاکەی سەری و هەر دوو دەستی لەبەرکی نابوو. ئیدی بێئەوەی دەمی بکاتەوە، لەبەینی ددانەکانیەوە تفێکی کرد و گوتی:

- بەو زووانە دەست بە جگەرەکێشان دەکەم، تا ئێستا دووجارم تاقیکردووەتەوە، بەڵام ناخۆش بوو، دەبیَ خۆم ڕابێنم.

من لەو ئەداو ئەتوارانەی بێزار بووم، پێم ناخۆش بوو. هەستم دەکرد خەریکە ئەو دوو هاوڕێیەم لە دەست دەدەم، هۆیەکەشیم بە لودمیلا دەزانی.

ئێوارەیەک لە حەوشەدا بووم، خەریک بووم، ئەو ئێسقان و خوردەوات و شڕو شیتاڵانەی کە کۆم کردبوونەوە، هاوێر دەکرد. لودمیلا بەخۆ و دارشەقەکەیەوە هات و لە بەردەمما وەستا، خۆی بە سەر دارشەقەکەیدا دا، دەستی ڕاستی خستە جووڵە، سێجار سەری لەقاند و گوتی:

- شەوباش! کوستروما لەگەڵ تۆدا هات؟

- بەڵیَ.

- ئەدی چورکا؟

- چورکا، هەنووکە کایە لەگەڵ مەدا ناکات. هەمووی خەتای تۆیە، ئەم دووانە حەزیان لە تۆ کردووە وشەڕ بە یەکدی دەفرۆشن.

کیژێ سوور بووەوە، بە پێکەنینەوە گوتی:- ئەم قسانە چییە؟ من خەتام چییە؟

- بۆچی ڕووت داونەتێ؟

تووڕە بوو وگوتی:- من چیم داوە لەوان، خۆ پێم نەگوتوون وەرن دوام بکەون.

ئەوجا بەدەم ڕۆیشتنەوە گوتی:- قسەی بەلاش! من لە هەردووکیان گەورەترم، من چواردە سالانم. چما کوڕان حەز لە کیژانی لە خۆ گەورەتر دەکەن؟!

بە ئانقەست و بۆ ئەوەی زیاتر تووڕەی بکەم، هاوارم کرد:

- وانییە! تەمەشای خاوەن دووکانەکە بکە، خوشکەکەی کلیست – گەورەشە و کوڕان دووی دەکەون!

لودمیلا، گەڕایەوەو بە هەشتاو بۆلای من هات، لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا، دارشەقەکەی لە گڵە نەرمەکە دەچەقی، گریان لە ئەوکی گیرابوو، گڕ لە چاوە جوانەکانی دەبووەوە، بلەز گوتی:

- تۆ گەمژەی، هیچ نازانی، خاوەن دووکانەکە، ژنێکی هەرزەیە، من لەگەڵ ئەودا بەراورد دەکەیت؟ من هێشتا بچووکم، کچۆڵەم. کەس حەدی نییە دەستم بۆ بێنێ یان نقورچم لێبگرێت. ئەگەر تۆ بەرگی دووەمی ڕۆمانی کامشادالکا ت بخوێنیباوە، ئەم قسانەت نەدەکرد!

بە دەم گریانەوە ڕۆیی، زۆرم بەزەیی پێدا هاتەوە. ئەلهەقی قسەکانی هەندێک ڕاستییان تیابوو، کە من دەرکم نەدەکرد. باشە هاوڕێکانم بۆچی نقورچیان لێدەگرت؟ خۆ هاوڕێکانم دەیانگوت خۆشیان دەوێت!

بۆ سبەینێ ویستم تەوازی بۆ بێنمەوە، ئاشتی بکەمەوە، ئیدی بایی حەوت کوپیکان، نوقڵ و نەباتم کڕی، نوقڵ و نەباتێک کە لودمیلا زۆری حەز لێبوو. لێم پرسی:- تۆزێکت لەمە بدەمێ؟

به ئانقەست خۆی توورە کرد وگوتی:- بڕۆ، من چیتر قسەت لەگەڵ ناکەم، بەعزم لەگەڵتا!

وێڕای ئەوەش، نوقڵ ونەباتەکەی لێوەرگرتم و گوتی:

- دەبوا بەلای کەمەوە لە کاغەزێکتەوە پێچابا، تەمەشای دەستی خۆت بکە بزانە چەند پیسن...

- من دەستەکانم شۆردوون، بەڵام پیس دیارن.

بەدەستە وشک وگەرمەکەی دەستی گرتم و جوان دیقەتی دا:- دەستەکانت خراپ شێواون.

- قامکەکانی تۆش بریندارن.

- جێگای دەرزییە، ئاخر من بە زۆری خەریکی خەیاتیم، سەروکارم لەگەڵ دەرزی و درومانداپە.

دوای ماوەیەکی کەم، دوای ئەوەی بە وردی دیقەتی دەوروبەری دا، گوتی:

- چۆنە بڕۆین لە پەنایەکدا ڕۆمانی " کامشادالکا " بخوێنینەوە؟

ماوەیەکی زۆر گەراین تا پەنایەکی چۆڵ و ئارام وەدۆزین. ئەنجام ڕاڕەوی حەمامەکەمان بەگەن کرد. جێگایەکی بەڕاستی تاریک بوو، بەڵام ئێمە دەمانتوانی لەبەر ئەو پەنجەرەیە دانیشین کە دەیڕوانییە سەر گوزەری قەسابخانەکەی دراوسێمان. خەڵکی بەدەگمەن ڕوویان دەکردە ئەو شوێنە.

لودمیلا، لەبەر پەنجەرەکە دانیشت، لاقە شەلەکەی ڕاکێشا و خۆی دا بەسەر لاقە ساغەکەیدا، کتێبێکی کۆنی لەچاوی نزیک کردەوە، ڕیزێک وشەی دا بە گوێما کە تەقەی سەرم دەهات. وام دەزانی کە گوێزم بۆ دەژمێرێت. بەڵام کە لە سەر ئەرزەکە دانیشتبووم و تەمەشای چاوە شینە جوانەکانیم دەکرد کە بەسەر دێڕ بە دێڕی کتێبەکەی دا دەگێڕان، وەکوئەوە بوو گریکی شینیان لێ ببێتەوە، جارجارێکیش تاقە فرمێسکێک لە

چاوە تەڕەکانیەوە بە سەر گۆنایدا دادەخزی، دەنگی بەدەم خوێندنەوەی وشە نامۆ ونامەفهوومەکانەوە، دەلەرزی... ئیدی هەوڵم دەدا ئەو وشانە هەڵگێڕ وداگێڕبکەم، بیانکەم بە شیعر، بەلام فایدەی نەبوو، هیچم نە لە کتێبەکە و نە لە وشەکان هەڵنەدەکراند، بە کورتی شتێکی ئەوتۆ حاڵی نەبووم.

سەگەکەم سەری نایە سەر ئەژنۆکانم ناوم نابوو ' با " جەستەیەکی باریک و درێژی هەبوو، تووکێکی گڤ و بژی هەبوو، کە ڕایدەکرد، بای بە قولاندا نەدەگەیی، کە دەڕۆیی، وەکو بای پاییز کە خۆی بە لوولەی سۆپاياندا دەکات، دەیلوراند.

کچەی تاین بەشپرزەیی لێی پرسیم:- ئەریّ تۆ گوێت لێمە؟

سەری ئەرێم بۆ لەقاند. بەڕاستی ئەو وشانە حەپەساندمیان. پڕ بەدڵ حەزم دەکرد، وشەکان بە جۆرێکی دی و لە شێوەی گۆرانیدا دابڕێژمەوە، بە جۆریّ دای بڕێژمەوە کە هەر وشەیەکی وەکو ئەستێرەیەکی ئاسمان بدرەوشێتەوە.

ئیدی دنیا بەرەبەرە تاریک بوو، لودمیلا وشەکانی نەدەبینی، دەستە زەردەکانی لە کتێبەکە بەردا و گوتی:- جوانە ها؟ پێم نەگوتی جوانە؟!

لەو ڕۆژە بە دواوە، زۆرجار دەچووینە ئەو شوێنە چەپەکە، خۆشبەختانە لودمیلا زوو دەستی لە خوێندنەوەی ' کامشادالکا ' هەڵدەگرت، کە ئەو دەستی لە خوێندنەوە هەڵدەگرت، خەنی دەبووم.. ئەوەندەی قارەمان و ڕووداو تیابوو، بەهیچ جۆریّ بۆم کۆنترۆڵ نەدەکرا، ناوەکانم بۆ ئەزبەر نەدەکرا، ڕۆمانێک بوو لەوە دەچوو کۆتایی نەیەت، ئێمە لە بەرگی دووەمەوە دەستمان پێکرد، بەرگی سێیەمیشی هەبوو، بە قسەی لودمیلا بەرگی چوارەمیشی هەبوو. خواخوامان بوو باران بباریّ، کە

بـاران بـوایە کەس لە مـاڵ وەدەر نەدەکەوت وکەس ڕێـی نەدەکەوتە خەڵـوەتگەکەی ئـێمە. بەڵام وێڕای ئەوەش لـودمیلا، دەترسا، یەکێک بێت بەسەرا و لەو شوێنەدا بە دوو قۆڵی بمان بیـنن وغافڵگیرمـان بـکەن..بە دەنگێکـی نەوی بەمنـی دەگـوت:- دەزانی ئەگەر خەڵکی لێرەدا بمان بینن چ دەڵێن؟

زۆرباش دەمزانـی ومنیشلەوە دەترسـام. ئـێمە بە سـەعاتان لەوێ دەمـــاینەوە. باســـی زۆر شـــتمان دەکـــرد، هەنـــدێجار حیکایەتەکانی داپیـرەمم بـۆ دەگێڕایەوە، لـودمیلاش ژیـانی ئەو قوزاقـانەی بـۆ بـاس دەکـردم کە لە گـوێی ڕوبـاری میدفیـدیتزا دەژیان و دەیگوت:

- جوانی ژیان لەوێیە! وەکو ئێرە نییە! ئێرە شـوێنی خەڵکی هەژار و بێنەوایە!

ئیدی لە دڵی خۆدا بڕیارم دا، هەرکە گەورە بووم، ڕۆژێک بڕۆم بۆ ئەوێندەر تا ڕوباری میدفیدیتزا بـدینم و بەو دیمەنـانە زاخاوی چاوم بدەم.

ئیدی زۆری پێنەچوو، وازمان لە دانیشتنی ئەو خەڵوەتگە و ڕاڕەوە هێنـا کە بـۆ حەمـامەکە دەچـوو. دایکـی لـودمیلا لە کـارگەی کـابرایەکی بازرگـانی پێسـت دامەزرا، خوشـکەکەی چـووە مەکـتەب، بـراکەی لە کوورەخـانەیەکی خشـت سـازیی دامەزرا. هەرکاتێ کەش و هەوا ناخۆشبایە، دەچووم بۆ مـاڵی وان و ئیـــدی لە چێشـــت لێنـــان و پـــاککردنەوەی ژوور و مووبەقەکەدا یارمەتیم دەدا. لودمیلا بە پێکەنینەوە دەیگوت:

- ئـــێمە وەکـــو ژن ومێـــرد پـــێکەوە دەژیـــن، تەنیـــا جیاوازیەکەمان ئەوەیە کە دەگەڵ یەکدا ناخەوین. ئێمە لە ژن و مێرد باشتر دەژین، چونکە مێردان یارمەتی ژنەکانیان نادەن.

هەرکاتێ چەند شـاهییەکم بەدەسـت هێنابـا، کەمێک نوقڵ و شیرینیم دەکڕی، پێکەوە چامان دەخواردەوە و پاشان بە ئاوی

سارد سەماوەرەکەمان دەکوژاندەوە، تا دایکی لودمیلا، کە ژنێکی بە پرتە و بۆڵە بوو، پێنەحەسێت کە ئێمە دامانگیرساندووە.

هەندێجار نەنکیشم دەهات لەلامان دادەنیشت، ئیدی دەکەوتە گوڵدۆزی و دەرزی و درووومان، ئەوسا چیرۆکی دوور و درێژ و خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە. هەرکاتێ بابام بۆ شار بچوایە لودمیلا بۆماڵی مە دەهات،ئیدی بێخەم و خەیاڵ سەرگەرمی گەمە و وازیان دەبووین. نەنکم دەیگوت:- ئێمە زۆر خۆش دەژین. وانییە؟ ئافەرین ماڵی خۆم، حەزکەم دەتخۆم، حەزکەم ناتخۆم؟

نەنکم، دۆستایەتی مەی پێخۆش بوو، دەیگوت:

- دۆستایەتی کوڕ و کچ زۆر خۆشە بەمەرجێ ماقووڵ بێ، هیچ گەوجایەتیەک نەکەن!

ئەوجا بە زمانێکی جوان و زۆر سادە مانای ئەو ' گەوجایەتیەی ' بۆ ڕووندەکردینەوە. وشەکانی سیحراوی بوون، ئیلهام بەخش بوون، ئیدی من لەلای خۆمەوە لەوە حاڵی بووم کە نابی بەرلە پشکوتن دەست بۆ گوڵ ببرێت، چونکە پەژمردە دەبێ نە گوڵ دەدات نە میوە.

من ئارەزووی کردنی هیچ ' گەوجایەتیەکم ' نەبوو. بەڵام وێڕای ئەوەش، من و لودمیلا، لە قسە و گفتوگۆکانماندا، باسی هەموو ئەو شتانەمان دەکرد کە خەڵکی بەبێدەنگی بەسەریا تێ دەپەڕین... هەڵبەتەجارجار و لە حاڵەتی زۆر زەروریدا نەبوایە باسی ئەو شتانەمان نەدەکرد. چونکە پەیوەندی نێوان دوو ڕەگەزی جیاواز هەندێجار ئازاری دەداین و کێشەی بۆ دروست دەکردین.

ییفسینکو، بابی لودمیلا، پیاوێکی جوان بوو، تەمەنی هەر چل ساڵێک دەبوو، کابرایەکی قژ لوول، ئەبرۆ چڕ وپەیوەست،

بەغرووڕەوە هەڵیدەبڕین. پیاوێکی یەجگار کەمدوو بوو، بیرم نایەت قەت گوێم لە قسەی بووبێت. کە مجامەلەی منداڵەکانی دەکرد وەکو کەڕ ولالان تەنیا بلمەبلمێکی دەکرد و تەواو، تەنانەت کە لە ژنەکەشی دەدا، نەدەهاتە قسان.

ئێوارانی یەک شەممووان، کراسێکی شین و پانتۆڵێکی کەتانیدەڵبی لەبەر دەکرد، جووتێ پێڵاوی بریقەداری لە پێ دەکرد، ئەوسا ئوکوردیونە گەورەکەی لەشانی دەکرد ودەچووە کۆلان، لەوێ وەکو سەربازێک بە خۆ و تفەنگەکەیەوە، ئامادەی سەلام کردن وئیکلام بێ، دەوەستا.. هەنگێ ئەهلی پیاسە یەک یەک بە بەردەرگاکەماندا دەهاتن، ژن و کچان وەکو قاز بەلار ولەنجە دەهاتن و تێدەپەڕین، ژێراوژێر سەیرێکی ' پیفسینکو ' یان دەکرد، یان زەقاوزەق و بەچاوانی برسیی و تامەزرۆوە تەمەشایان دەکرد. ئەو لەجێی خۆی نەدەجولا، لێوی خوارەوەی شۆڕ بووبووەوە. بە چاوە ڕەشەکانی دایدەبێژان، ئەم چاوبڕکێ بێدەنگانە جۆرە نەوسنیەکی سێکسی تیابوو.. کاروانی ژنان بە هێواشی بەبەردەمیا ڕەت دەبوون، پیاو وای هەستدەکرد، کامیان بگرێ، بە ئاماژەیەکی وی دێتە ڕەدا و، لە ئەرزەکەدا بۆی پاڵدەکەوێ.

داکی لودمیلا، دەیبۆلاند:- ئەم بەرازە لاسارە، ئەم سابرێنە پیسە چاویان لێدادەگرێت.

ئەم ژنە داماوە جوان نەبوو، بەرچاوی نەبوو، درێژ داهۆڵێکی لاوازی مردەلۆخ بوو. دەم وچاوی درێژکۆڵەو پەلەپەلاوی بوو، ڕەنگ و ڕوو سیسەڵە و چرچەڵە بوو، قژی کورت لە گسکێکی سواو دەچوو. لودمیالا لەلایەوە دانیشتبوو، بێهودە هەوڵی دەدا، سەرنجی پەرت بکات و بە پرسیاران سەرگەرم و مژوولی بکات، بەلام ژنەی تاین، بەوپەڕی بێتاقەتی هاواریدەکرد:

- وازم لێبێنە،شەلی نەگبەت!

چـــاوە مەنگـــولیە بچووکەکـــانی، کە لە کونجکاویـــدا دەدرەوشـانەوە، بەشـیوەیەکی سـەیر بەمـلا و بەولادا دەگێـڕا. لودمیلا دەڵێت:

- دایکە تووڕە مەبە، تووڕە بوون فایدەینییە. تۆ تەمەشـای ئەو بێوەژنە حەسیر فرۆشـە بکە، چۆن خۆی وەکو بـووکەڵە ڕازاندووەتەوە تۆش چاو لەو بکە.

دایکی بەدەم پەڵمە گریـان و فرمێسک ڕشـتنەوە، دەڕوانێتە بێوەژنە زەلامەکە و دەڵێت:

- ئەگەر ئێوە نەبان سـەد هێنـدەی ئەو خـۆم دەڕازانـدەوە و بەخۆم ڕا دەگەیم. ئێوە هەرسێکتان، بە زندوویەتی خواردتانم.

بێـوەژنەکە، لە خـانوویەکی بچـووک دەچـوو، سـینگ و بەرۆکـی هـاتبووە پێشـەوەو لە بـانێژە دەچـوو، دەموچـاوی لە مکیاجـــدا ســـوور دەچـــووەوە، سەرپۆشـــێکی کەســـکی بەسـەریادابوو، لە کۆنە بینـایەک دەچـوو، زەردەپەڕی ئێـواری لێی بدات.

ییفسـینکو، ئوکوردیـونەکەی بە سـینگیەوە دەنـێ، دەسـت بە ژەنین دەکات، بەرەبەرە دەنگی موزیقا بەرزدەبێتەوە، منـداڵان لە هەر چوارنکـــالی کـــۆلانەکەوە بەغـــاردێن و لە دەوری سـازڤانەکە خـڕدەبنەوە، ئەوجـا حـایر وحەپەسـاو، بە شـێوەی بازنەیی لە دەوری دادەنیشن.

ژنەکەی ئاگاداری کردەوە وگوتی:- کەمێک سـەبر بـکە! تـا دەم وفلقیان نەشکاندوویت!

بەلاچاو مۆڕەیەکی لێدەکات و وەڵامی ناداتەوە.

بیـــوەژنە حەســـیر فرۆشـــەکە، لە ســـەر ســـەکۆیەکی بەر دووکـانەکەی کلیسـت دادەنیشـێت، سـەری بە سەرشـانیا خـوار

کـــردووەتەوە وبە وردی گـــوێی شـــل کـــردووە، چاوەکـــانی دەدرەوشێنەوە.

دەشـــت ودەرەکەی پشـــت گۆڕســـتانەکە، لە تیشـــکی ئـــاڵی زەردەپەڕی ئێـوارەدا نقـووم بـووە.. ئافرەتـان بە جلکـی ئـاڵاو واڵاوە جمەیـان دێـت، منـداڵان لە ناویانـدا سـەرگەرمی هەڵـبەز ودابەز و گەمە وکـایەی خۆیـانن. شـنەیەکی فێنـک، ئـۆخژن دەخـــاتە دڵ ودەروونەوە. بـــۆنی خـــوێن لە قەســـابخانە و کوشـتارگەکانەوە دێـت. لە مەیـدانی دەباخخانەکـانەوە، بـۆنی چەرمـــی خۆشـــکراو بەرز دەبێـــتەوە. چـــەپەدووی ژنـــان و فسکەفســـکیان، هەراوزەنـــای منـــداڵان و عەربەدەی پیـــاوانی مەست، دەگەڵ ناڵەی ئوکوردیۆنەکەدا، تێکەڵ بوون، لە تۆوایە زەوی بە پیـت وبەرەکەت ئـاخ هەڵدەکێشـێت. هەمـوو شـتێک دژوار و سـەختە، ژیـانێکی سـەیرە، چ هەرا و هەنگـامەیەکە، لە نـــاو جەرگەی ئەم هەراو هەنگـــامەیەوە، وشـــەێن ســـەیر هەڵدەقوڵێن، ژێی دڵ دەهەژێنن، لە یادگەدا دەچەسـپن و نـایەنە سڕانەوە:

- نـاتوانن، بەکـۆمەڵ ولەناکـاو پـڕی بـدەنێ- کەواتە بـا هەرکەسە وبەتەنیا دەستی خۆی لێبوەشێنێ.

- ئەگەر خۆمان بەزەییمان بە خۆمانا نەیەتەوە، کێ بەزەیی پێماندا دێتەوە؟

- پێدەچێ خـوا ژنـی تەنیـا بـۆ سـەرگەرمی و ڕابـواردن دروست کردبێت.

## (٣)

شـــەو دادێ، هەوا فێنــک دەکـــات، هەراو زەنـــاکە هێـــور دەبێتەوە. خـانووە دارینە کۆنەکـان، لە تـاریکیەکەدا گەورەتـر دێـنە بەرچـاو، گەورەکـان، هەنـدێک لە منـداڵەکان بـۆ مـاڵ دەبەنەوە تـا بیـان خەوێنن، هەنـدێکی دی کە لە بیـر کـراون لە پـاڵ دیوارەکانـدا یـان لە باوەشـی دایکیانـدا خەوتـوون. منـداڵە گەورەکان کە شەو ڕادەکشێ ئارام دەگرن. بیفسینکو، بە خۆ و ئوکوردیـــۆنەکەیەوە، بەبـێ ئەوەی ســـەرنجی هیچکەســـێک ڕابکشـێت، لە تـاریکییەکەدا نقـووم بـووە. بێـوەژنە قەڵەو و خرپنەکە دیار نەماوە. لە شوێنێکەوە، لەپشت گۆڕستانەکەوە، دەنگی بەجۆشی ئوکوردیۆنەکە بەرز دەبێتەوە. دایکی لودمیلا، بەبێ جووڵە لەسەر کورسییەک دانیشتووە و بەجۆرێ کووڕ بـووەتەوە، پشـتی لە پشـتی پشـیلە دەچێـت. نەنکـم بـۆ چـا خواردنەوە چووەتە نک ژنێکی دراوسێمان، ئەم ژنە مامانێکی ناوزڕاوە. ژنێکی زەلامـی قەڵەوە، کەپووی لە دەنووکی سۆنە (مراوی) دەچێت. سینگ و بەرۆکی ساف دەڵێی سینگی پیاوە، میداڵێکی (فریاکەوتن) ی زێڕی پێدا شۆڕ بووەتەوە.

هەمـوو خەڵکـی کـۆڵانەکە لێـی دەترسـن و بە جـادووگەری دەزانن. وێڕای ئەمەش، هەموو دەڵێن و دەزانن کە کاتی خۆی لە شــەوات و ئـاگر کەوتنەوەیەکـدا، فریـای ژنە نەخۆشــەکەی کولۆنێلیـک و هەرســێ منــداڵەکەی کەوتــووە و لە مـــاڵە گـڕ گرتووەکەیان، دەربازی کردوون.

ئەم ژنە دۆستی نزیکی نەنکمە، کە لە جادە وباندا، یەکدی دەبینن، لە دوورەوە بۆ یەکدی دەگرژنەوە وسـڵاو لە یەکدی دەکەن.

مـن و كوسـتروما و لـودميلا، لەسـەر تەختێكـی گەورەی نزیكی بەردەرگای خۆمان دانیشتووین. بەڵام چورکا جوێنی بە براکەی لودمیلا دابوو و هەنووکە ئامبازی یەکدی بووبوون و دەسـتیان نـابووە یەخەی یەكـدی. یەكیـان دێنـا و دەبـرد، هەرکەسـە هەوڵیدەدا بەسـەر ئەویدیدا زاڵ بێ، بەڵام وادیـارە هەردووكیـان لەیەک ئاسـتدان. كیـژێ بە دەنگی ترسـاو هـاوار دەكات:- بەسە واز بێنن!

کوسـتروما، کە چـاوە ڕەشـەکانی بـڕی بـووە لـودمیلا، چیرۆکی کالینینی ڕاوچی دەگێڕایەوە. کالینین، پیرەمێرێکی پۆڕ چەرمـووی، چـاو باشـقاڵ بـوو. لە گەڕەک و بانـا بەدنـاو بـوو. ماوەیەکی کەم بـوو کە مردبوو. بەڵام کوسـتروما، دەڵێ وەکو خەڵکی نەیان ناشتووە بەڵکو جەنازەکەیان، دوور لە گۆڕەکانی دی بە تـابووتەکەوە لە ئەرزەکە دانـاوە. تـابووتەکە، تـابووتێکی ڕەش بوو، لە سەر چوار پایەی بەرز، بە بۆیەی سپی، وێنەی خاچێک و ڕمێک و دار عاسایەک و دووپارچە ئێسقانیانلە سەر نەخشـاندبوو.

دەگێـڕنەوە دەڵـێن ئەم پیرەمێـرە هەمـوو شـەوێ لە تـابووتەکەی دێـتەدەرێ و لە پەسـتا و بـێ پسـانەوە بەنـاو گۆڕستانەکەدا، تا كازیوەی بەیانی، تـا کەڵەشـێری بەیانی بانگ دەدات، هەر دەسووڕێتەوەو کەس نازانێ تاقیبی چی دەکات.

لودمیلا، لێی دەپاڕێتەوە:- تکایە باسی ئەم شتە ترسناکانە مەکە.

چورکـا، کە بە هەزار زەحـمەت خـۆی لە چنگـی بـراکەی لودمیلا دەرباز کردبوو، هاوار دەکات:- بەرمدە!

ئاوڕی لە کوستروما دایەوەو بە تەوسەوە گوتی:

- بـۆ درۆ دەکەی خـوێڕی! مـن لەکـاتی ناشـتنەکەیدا لە سـەرقەبران بـووم، بەچـاوی خـۆم دیتم کە بەخاکیـان سـپارد.

ئیدی تەختە داریکیان وەکو کێلی قەبر و بۆ ناسینەوەی، لەسەر گۆڕەکەی دانا. مەسەلەی ئەوەش کە شەوانە تارماییەکەی بەناو گۆڕستانەکەدا دەسووڕێتەوە، دەست هەڵبەستی ئاسنگەرە بەدمەستەکانە! دەنا شتی وانییە!

کوستروما، بەبێ ئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە، بە تەوسەوەگوتی:

- ئەگەر ڕاست دەکەی وانییە، بڕۆ شەوێ لە سەرقەبران بنووە.

ئەوان دەکەونە مشت ومڕ، لودمیلا ئاوڕ لە دایکی دەداتەوەو بە خەمینی سەری دەلەقێنێ و دەپرسێت:- دایکە، ڕاستە کە مردووان بە شەوان دەسووڕێنەوە؟

دایکی بە ڕاوێژێکی زەلال بەرسڤ دەداتەوە:- بەڵێ، دەسووڕێنەوە.

"فالیوک" ی کوڕی ژنە دووکاندارە گۆنا سوورەکە، لێمان هاتەپێشەوە، تەمەنی بیست ساڵ دەبوو، ماوەیەک گوێی بۆ قسەکانمان هەڵخست وگوتی:

- هەرکەسێک زات بکات تا بەیانی لە سەر قەبران بنووێت، من بیست کوپیک و دە جگەرەی دەدەمێ، بەڵام ئەگەر بترسێت و هەڵبێت، بە ئارەزووی خۆم گوێی دەسوومەوە، چ دەڵێن؟

هەموو بێدەنگ دەبن، شەرم دایان دەگرێت، پاشان دایکی لودمیلا هەڵیدایە و گوتی:- قسەی بەلاش، بۆچی ئەم منداڵانە بۆ کاری وەها هاندەدەیت!

چورکا، بەدەم مینگەوە دەڵێت:- ئەگەر یەک ڕوبڵم بدەیتێ من ئەو کارە دەکەم.

کوستروما، بە ڕقەوە گوتی:- ئەگەر بیست کۆپیکت بداتێ دەترسیت؟

ڕوودەکاتە فالیوک و دەڵێت:

- یەک ڕۆبلی بدەیە. ناڕوات. خوی هەڵدەکێشێت، دەنا کوڕێکی درۆزنی ترسنۆکە.

- دەی زۆرباشە، ئەوە کردم بە ڕۆبڵێک.

چورکا، بە بێدەنگی ڕادەبێت، لۆژلۆژ بە پەنا دیوارەکەدا دەکەوێتەڕێ. کوستروما قامکی لە زاری دەنێ و فیکەیەکی تیژ دەکێشێت. لودمیلا بە ڕاوێژێکی کز دەپرسێت: خودایا، بۆچی وەکو کەو چوو، کە ئەمە حاڵیەتی لەم خۆ هەڵکێشانەی چی؟!

فالیوک، هاواردەکات:

- ئەمانە کۆمەڵێک خوێڕی و تۆڕین. خۆش ئەوەیە ئەم نەگبەتانە خۆیان بە شەقاوەی کۆلان و گەڕەکەکە دەزانن، قوولی ڕەش و سپی لە بوارا دەردەکەوێ!

تەوس وتوانجەکانیم لە لا ناخۆشە، من وهاوڕێکانم خۆشمان ناوێ، کوڕێکی قەڵەوی خۆشگوزەرانە، هەمیشە منداڵان بۆ کاری خراپ هاندەدات، دەمی زۆر پیسە، جنێوی بە شیرەوە مژتووە، کوڕێکی بێ تەربێتە، چیرۆکی نەنگین دەربارەی کچان و ژنان بۆ منالان دەگێڕێتەوە، هانیان دەدات گاڵتە بەکچان و ژنان بکەن. منداڵانیش بە قسەی دەکەن و باجی گەورەش دەدەن. نازانم بۆ حەزی لە سەگەکەم نەدەکرد، لە هەرشوێنێ بیدیبا بەردبارانی دەکرد، جارێک نان و دەرزی دەرخوارد دابوو، بەڵام من ترسنۆکیەکەی چۆرکام, کە بە ملشۆڕی دوور دەکەوتەوە، زۆر لەگیان ناخۆشبوو.

بۆیە خێرا بە " فالیوک " م گوت:- کوا ڕۆبڵەکە بدە بەمن، من بۆ گۆڕستانەکە دەڕۆم.

بۆ ئەوەی بمترسێنێ، قاقایەکی توندی لێداو ڕۆبڵەکەی بۆ دایکی لودمیلا درێژ کرد. دایکی لودمیلا بە تووڕەیی دەستی ڕەتکردەوەو گوتی:- نا، من وەری ناگرم!

ئەوجــا هەســتا وبە تــووڕەیی دوورکەوتەوە، لــودمیلاش ئامــادە نەبــوو پــارەی گریــوەکە وەربگریــت. ئەمە هێنــدەی دی فــالیوکی پەســت کــرد. مــن لەزگ بــوو بەبــێ پــارەی ئەم کەر پیاوەش گرێوەکە ئەنجام بدەم کە لەو کاتەدا نەنکم بەســەردا هــات، کە حــاڵ و حیکایەتەکەیــان بــۆ گێــڕایەوە، بەبــێ چەنــد وچــوون پــارەکەی وەرگــرت و بە کــاوەخۆ بە منــی گــوت:- پــاڵتۆکەت لەبەر بــکە، چەرچەفەکەت لەگەڵ خۆتــا ببە، چــونکە بەرەبەیان دنیا سارد دەبێت..

قسەکانی پیرەژن، هەم دڵخۆشیان کردم و هەم بەڕادەیەک زاتیان وەبەرنام کە دڵنیابووم، هیچ شتێکی ترسناک ڕوونادات.

مەرجەکانی فالیوک ئەوەبوو کە تا بەیانی لەسەر تابووتەکە ڕاکشێم یان دابنیشم و بە هیچ بیانوویەک لە سەر تابووتەکە نەیەمە خوارەوە، تەنانەت ئەگەر تابووتەکە کەوتە جووڵەجووڵ و ' کالینین ' ی پیر ویستی لێی بێتە دەرەوە. ئەگەر پا بنەمە ســەر ئەرزەکە، مــانەی وایە گــرەوەکەم دۆڕانــدووە، دواقســەی ئەمە بوو:- ئاگادار بە، بە درێژایی شەو چاودێریت دەکەم ها!

وەختایەک لێبڕام بەرەو گۆڕستانەکە بڕۆم، نەنکم نیشانەی خــاچی بەســەرما کێشــاو ئامۆژگــاری کــردم:- ئەگەر شــتێکت هاتەبەرچاو، مەترسە، لەجێی خۆت مەجووڵێ، وێردی سڵاو لە تۆ مریەمی پاکیزە، بخوێنە.

بە هەنگـــاوی هەڕاوەوە بەڕێ کەوتـــم، دەمویســـت بە زووترین کات کۆتایی بەم گاڵتەبازارە بێنم. فالیوک وکاستروما و چەنــد منــداڵێکی دی بەگەڵــم کەوتــن. کە بەســەر دیــوارەکە کەوتم، چەرچەفەکە لە دەستم ئالا وکەوتم، غل بوومەوە، بەڵام یەکســەر هەســتامەوە، کورەکــان لەو دیــو دیــوارەکەوە پــێم پێدەکەنین. تەزوویەکی سارد لە تەوقی سەرمەوە، بە گازەرای پشتمدا هاتەخوارەوە و لە بنی پێمەوە دەرچوو.

بە هەنگاوی لەرزۆکەوە گەییمە تابووتە ڕەشەکە. لایەکی لە گڵەکە ڕۆچووبوو، لایەکی تری بەدوو پایەی بچووکەوە لە سەر ئەرزەکە بوو، پێدەچوو کەسێک ویستبێتی دەری بێنێ، بەڵام دەرەقەتی نەهاتبوو. لەسەر تابووتەکە ڕۆنیشتم و ڕوانیمە دەوروبەری خۆم: ئیدی بارستایی گۆڕەکان و خاچە کەوەییەکان بە ئاسانی دەبینران، دەتگوت بازووی ڕەق و تەقن ولە ملی گۆڕەکان وەرێنراون، لێرەو لەوێ دەوەن و بنجە بەتولا لە بەینی خاچەکانەوە ملەقووتێیان دەکرد، لقەکانیان لەسەر گۆڕەکان ئالکاوی یەکدی دەبوون، چیمەنی گۆڕستانەکە لە تاریکەکەدا نەدەبینرا، دیمەنی کڵێساکە لە دوورەوە وەکو کولبەیەکی بەفرگرتوو دەهاتە بەرچاو، کەمێک دوورتر، لە داوێنی ئاسۆوە، لەبەینی پەڵە هەورە مات و خامۆشەکانەوە، هەیڤۆک سەرەتاتکێی دەکرد.

باوکی یاز کە بە " پیاوە بۆگەنەکە " ناسرابوو، بەدەستە خاوەکانی پەتی زەنگی نیگابانیەکەی ڕاکێشا. دەنگی زەنگەکە دێ، ناڵەی منداڵێکی نەخۆش دێتەگوێ، دوای ئەوە دەنگی وشک و کورتی زەنگێک دێت، ویەکسەر، وتەکانی یارۆی پاسەوانم وەبیرهاتەوە:- " خودایا، لە شەڕی بێ خەوی و خەوزران بمانپارێزە ".

جەوەکە ترسناک بوو. زۆر گەرم و خەفە بوو، خۆشم نازانم بۆ هەستم بە گەرمایەکی زۆر دەکرد، لەزگ بوو بخنکێم. هەرچەندە شەوەکەی سارد و نمسار بوو، کەچی ئارەقە لە سەراپام دەچۆڕا. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر کالینینی دان عەمر، لە نێو تابووتەکە هەستێتەوە فریای ئەوە دەکەوم خۆم بگەیەنمە کولبەی پاسەوانەکە (زێوان)؟

بست بە بستی گۆڕستانەکە شارەزابووم، دەیانجار لەگەڵ ڤیاز وهاوڕێکانی دیدا، لەم گۆڕستانەدا یاریم کردووە، بەبەینی

گـۆڕەکەدا ڕاکەڕاکمـــان کـــردووە. دایکـــم لەوێ، لە نزیکـــی کڵێساکەدا ڕاکشاوە.

هێشـــتا هەمـــوو خەڵکـــی نەخەوتـــوون، لە گەڕەکەکـــانی دەوروبەرەوە دەنگی پێکەنین، گفتوگۆ و گۆرانی دێت. لە سـەر گردە لمەلانەکەی نزیکی وێستگەی قیتارەکەوە، یان لە نزیکی گوندی کاتیزوفکاوە، دەنگی ئوکوردیۆن دێت. هەبێ و نەبێ میـاچوف ی ئاسـنگەرە، کە هەمیشـــە سەرخۆشـــە. دەنگـــی گۆرانییەک لەودیو شوورەی گۆڕستانەکەوە دێت!

*دایکمان زۆر بێ ئەمەکە*

*خۆیمان لێ نەبان دەکا*

*هەموو منداڵەکانی دەچەوسێنێتەوە*

*لەپێناوی ڕازی کردنی بابما*

دەنگی مەستانەی میاچوفە، هەر ئەو ئەم گۆرانیە دەڵێت. بە هەرحـاڵ ئەم دەنـگە زنـدووانە ورەم بەرز دەکەنەوە. لـێ بـۆ نەگبەتـی مـن، لە بەد شانسـی منـدا، هەرکە دەنگـی زەنگـی کڵێساکە بەرز دەبێتەوە دەنگەکان دەنیشنەوە و بێدەنگی باڵ بە سەر دنیادا دەکێشێت و هەموو شـتێک لە خۆیدا غەرق دەکات ودەسـڕێتەوەو ڕێـک لە ڕەوتـی ڕووبـارێکی مەنـدی بێـدەنگ دەچێت. ڕوحـم لە فەزایەکی بـێ سـنوورا سـەرگەردان دەبـێ، دەکەوێتە هەڵدێری هەزار بە هەزاری عەدەمەوە، لە ژینگەیەکی بـۆش وخاڵیـدا دەتـوێتەوە، لە ژینگەیەکـدا، جـگە لە جریـوەی ستێران، هیچی تری تیا ناژی، کە ئەویش دوای خامۆش بوونی هەموو شتەکانی دی، دەچێتە خانەی مردووانەوە.

جـوان خـۆم لە چەرچەفەکەوە پێچـا، بەچوارمشـقی لەسـەر تـــابووتەکە دانیشـــتم و ڕووم کـــردە کڵێســـاکە. هەرکە دەجووڵێمەوە تابووتەکە لە ژێرما دەکەوێتە جیڕەجیڕ. لە ناکاو شتێک لە پشتمەوە دای بە عاردیدا، خۆم شلوێ نەکرد، لەجێی

خۆم نەجوولام، نەخێر دووبارە بووەوە. تەمەشا دەکەم: پارچە کەرپـوچێکە، پـارچەیەکی دی لە نزیـک تـابووتەکە کەوتەوە، یەکەمجار ترسم لێنیشت، لێ خێرا بۆم دەرکەوت، ئەمە کاری فـالیوک و برادەرەکـانیەتی و دەیـانەوێ مـن بترسـێنن. بەڵام خەیاڵیان خاوە، کە هەستم کرد، خەڵکانێک لە دەوروبەرم هەن، لە جیـاتی بترسـم، بە پـێچەوانەوە ترسـم ڕەویـیەوە و تەواو ئەرخایەن بووم.

بیـر لە دایـکە مـردووەکەم دەکەمەوە.. لەبیـرمە جارێـک بـۆ یەکەمجـار جـگەرەم نـا بەدەمــمەوە هــات بەســەرا. بە لێـدان دایگرتمەوە، بگـرە کوێت دێشـێت، هـاوارم کـرد:- بەسـە، تەواو تۆبەم کـرد، وازم لێبێنە نەخۆشـم، دڵـم تێک هەڵدێت، خەریـکە دەڕشێمەوە، وازم لێبێنە!

دوای ئەوەی لێدانی خۆم خوارد، چووم لە پشت سۆپاکەوە دانیشتم، گوێم لێبوو، بە نەنکمی دەگوت:- کە منداڵێکی دڵـڕەقە! کەسی خۆشناوێ، دنیای داوەتە بەر کلکان.

ئەو قسـەیەم لەبەر گران بوو، بێ ویژدانـانە بـوو. کە دایکـم لە خـوت و خـۆڕایی و بەبـێ هـۆ لێـی دەدام، کە زۆرجـار ئەمە ڕووی دەدا، زۆرم دڵ بەحــــاڵی دەســــووتا. ئــــاخر هـــیچ هاوسـەنگییەک لە نێوان سـەرپێچی و لێدانەکانمدا نەبوو. بیـرم لەوە دەکــــردەوە کە بەم تەمەنە کــــورتەوە چ حەقــــارەت و سەرزەنشـتانێکم تەحەمـوول کـردووە، بەڕاسـتی زۆر شـت لەم ژیــانەدا هەیە کە مــایەی داخ و کەســەرانە. بـۆ نمــوونە ئەو کوڕانەی ئەو دیوی شورەکە، ئەمانە زۆر چـاک دەزانن کە مـن بە تـاقی تەنیـا لەم گۆڕسـتانەدا، خەریکە لە ترسـا زیـرە بکەم، زراوم بتۆقێ، کەچی هەوڵ دەدەن زیـاترم بترسـێنن، ئـاخر بۆ؟ دەمویست هاوار بکەم:- ئەهای شەیتانینە! بڕۆن، واز بێنن!

جورئەت ناکەم، ناوهێنانی شەیتان ئاسان نییە. کێ دەڵێ هەنووکە لەم ناوەدا خەریکی پیاسە نییە، لەم دەوروبەرەدا ناسوڕێتەوە! لمەلانەکە پڕ بوو لە وردە کانزایان، کە بەخەمینی لەبەر ڕوناکی تریفەی مانگەکەدا دەدرەوشانەوە، ئەمە کەناراوەکانی روباری ئوکای وەبیر هێنامەوە، جارێک لە سەر قەیاغێک لە ڕوباری ئوکادا پاڵ کەوتبووم و تەمەشای ئاوەکەم دەکرد، لە ناکاوا ماسییەکی بچووک هاتە سەر ئاوەکە، خۆی خستە سەر لا، ڕێک لە گۆنای بەشەر دەچوو. چاوە خڕەکانی کە لەچاوی چۆلەکە دەچوون بڕینە من، ئەوجا وەکو چۆن گەلایەک لە درەختێک بەر دەبێتەوە، یەک دوو پێچی خوارد وخۆی بە ژێر ئاوەکەدا کرد.

ئیدی سەری یادگاریان کرایەوە. ژیان و دەورانی منداڵیم، ڕووداوەکانی دەوروبەرم، دووبارە زندوو دەبوونەوە، دەهاتنەوە بەرچاوم. من وەکو کەسێک لە حاڵی خنکاندا بێ، خۆم بە یادگاریانەوە هەڵدەواسی تا بەدەم ئەو خەیالانەوە، خۆم لەو ترسی تەنیاییە ببوێرم.

ئەوە ژیژکێکە، هێدی هێدی چنگە چکۆلەکانی لە عاردی گیردەکات و هێواش هێواش دێتەپێشێ، دەنگی پێیەکانی دێتەگوێم، ئەوجنۆکە چکۆلە ودزێوانەم وەبیردێنێتەوە کە لە مالاندا دەسوڕێنەوە..

ئەنکم دێتەوە خەیاڵ، کە چۆن لەبەردەم سۆپاکەدا هەڵدەتروشکا و دوعا ونزای دەخوێند:- ئەی جنۆکە چکۆلەکان، سیسرکەکان بخۆن، دوایان ببڕنەوە..

لە شوێنێکی دوور، لەوسەری شار، ئاسمان خەریک بوو ڕوناک دەبووەوە، سەرمای سپێدە ختووکەی گۆناکانی دەدام. چاوم قورس دەبوون، پێڵوەکانم دەهاتنەوە یەک. وەکو تۆپ گرمۆڵە بووم، چەرچەفەکەم دا بەسەرما. دەیسا چ دەبێ با

ببێت!ئەنکم لە خەوی هەستاندم. بە دیارمەوە وەستابوو، چەرچەفەکەی لە سەرم لابرد، گوتی:- ڕابە ! سەرماتە؟ ئێ، ترسایت؟

- ئەرێ، ترسام. بەڵام بەکەس مەڵێ، پێویست ناکا کەسی دی بەمە بزانێت.

بە سەرسامی پرسی:- چ قەیدیە! ئەگەر ترس نەبێ، ئازایەتی هیچ بایەخێکی نییە، ئەوە نایەنێ خۆتی پێوە ڕابنەیت.

بە دوو قۆڵی بۆ ماڵ زڤڕینەوە، لە ڕێگا بە میهرەبانی گوتی:

- دەبێ بەخۆت هەموو شتێک تاقیبکەیتەوە چۆلەکەکەم. دەبێ بۆخۆت هەموو شتێک فێر بیت، ئەگەر بەخۆت نهێنییەکان کەشف نەکەیت، کەس نایە فێرت بکات.

بۆ ئێواری، بووم بە قارەمانی گەڕەک. هەر خەڵک بوو لێیان دەپرسیم:

- باشە، ترسناک نەبوو، نەترسایت؟

من بەرسڤم دەدانەوە:- با، ترسناک بوو، ئەی مانای چی!

ئەوان سەریان دەلەقاندو دەیانگوت:- ئەدی پێمان نەگوتی!

ژنە دووکاندارەکە هەڵیدایە وگوتی:

- کەواتە ئەوانەی دەڵێن کالینینی پیریان بە خاک نەسپاردووە، درۆ دەکەن، ئەگەر ڕاست بوایە و بە خاکیان نەسپاردبوایە، ئەم بستە منداڵە نەیدەتوانی شەو لەوێندەر ڕۆژ بکاتەوە، خوا دەزانێ پیرە ڕاوچی چ بەڵایەکی بەسەریا دێنا.

لودمیلا، بە کونجکاوی و دڵبەندییەوە لێی دەڕوانیم. تەنانەت هەستم دەکرد باباشم، زۆر دڵی بەم سەرکەوتنەی من خۆشە. تەنیا چورکا، چاوی پێمدا هەڵنەدەهات و بە خەمبارییەوە دەیگوت:

- ئەم کارە بۆ ئەو ئاسانە، ئەنکی جادووبازە، جادووی بە سەرا خوێندووە.

# (٤)

کولیای برام بەرەبەرە دەیدایە کزی، ڕێک وەکو ئەو ئەستێرانەی لەگەڵ هەلاتنی خۆرا ئاوادەبوون. من ونەنکم و ئەو لە عەمارێکا لە سەر کۆمەڵێک دار وتەختەدا کە بە جلە شڕ داپۆشرابوو، دەخەوتین. خاوەن ماڵەکە، بە تیغە دیوارێکی لە تەختە، عەمارەکەی مەی لە کولانە مریشکەکانی جیا کردبوونەوە. شەوان لە قدقدو باڵە فڕێی مریشکانی تێرو پڕ خەومان لێنەدەکەوت و بەرەبەیانیانی زووش لە دەنگی زەلامی کەڵەبابە زێڕینەکەی وەخەبەر دەهاتین.

نەنکم، هەموو بەیانییەک کە ڕادەبوو، بە ڕوخساری خەواڵووەوەو لەبن لێوانەوە دەیگوت:- وەی دەردم لێدایت، حەیوانی پیس... دەک سەرت بە بڕین بچێت!

منیش ڕادەبووم، نەمدەتوانی بخەومەوە، هەتاو لە درزی تیغە دیوارە تەختەکەوە، دەیدا لە جێگاکەم، گەردیلەی زیوینی تۆزەکە، لە نێو لوولە تیرۆژەکەدا، سەمای دەکرد، سەمای ئەو وشانەی بیر دەخستمەوە کە لە ناو حیکایەت و ئەفسانانداا بەرچاو و بەرگوێم دەکەوتن. مشکان، لە بەینی داروتەختەکاندا تەراتێنیان دەکرد، مێرووی ئامال سووری باڵ نەخشین، فڕکان فڕکان ئەم سەر و ئەوسەریان دەکرد.جی گۆڕکێیان دەکرد.

هەندێجار، بۆ ئەوەی لە بۆنی بۆگەنی ڕێقنە مریشکان دەرباز بم، لە عەمارەکە وەدەر دەکەوتم و دەچووم بۆ سەربان و لەوێندەرەوە بە کەماڵی ئارەزوو دەمڕوانیە ماڵ دراوسێکان و ئەو خەڵکانەم دەبینی، کە ڕادەبوون، هێشتا خەو بەری نەدابوون و تەمەڵ و بێتاقەت دەهاتنە بەرچاو.

سەری بۆزی " فرمانوف "ی دەریاوانی هەمیشە مەست لە بەر پەنجەرەیەکەوە بەدیار دەکەوێ، چاوە خەواڵوو و

ئاوساوەکانی دەبڕێتە هەتاوەکەو وەکو بەراز دەمرێنێ. بابام، بەهەر دوو دەستان سەرە سوورەکەی دەگرێ بە هەشتاو خۆی بەناو حەوشەکەدا دەکات، دەچێت بۆ حەمامەکە تا بە ئاوی سارد خۆی بشوات. کارەکەر وشێفی خاوەن ماڵەکە، بە کەپووە دەندووکە دالاشی یەکەیەوە لە کوکو دەچوو. بەلام خاوەن ماڵەکە لە کۆترێکی قەڵەو دەچوو، ڕەنگە سەیر بێتەبەرچاو کە هەر کەسێک دەبینم، جۆرە باڵندەیەک یان گیانلەبەرێکم وەبیر دێتەوە.

بەیانیەکی خۆش کە هەتاو دنیای زێڕوەفشان دەکرد، بەلام من فرە دڵتەنگ بووم. حەزم دەکرد بچمە دەشت، بە ناو کێڵگەکان بکەوم، هەوایەک بگۆڕم و بایەکی باڵی خۆم بدەم. ماوەیەک بە تەنیا لەگەڵ خۆمدا بژیم. بەیانیەکی خۆشە، بەلام من دڵنیابووم کە خەڵکی ئەم ڕۆژە خۆشە دەشێوێنن و نایەڵن بە دڵمەوە بنووسێت.

جارێک کە لە سەربان ڕاکشابووم، نەنکم بە ئەسپایی گازی کردم وبەسەر ئاماژەی بۆ تەختەخەوەکە کرد وگوتی:- کولیا مردووە.

منداڵەی داماو وبەلەنگاز سەری لە سەر بالیفەکە داخزی بوو، کەوتبووە سەر حەسیرەکە، بەدەنی شین هەڵگەڕابوو. کراسەکەی هەلکشابوو، ورگە ئاوساوەکەی و لاقە باریک وخوار وخێچەکانی بەدەرەوەبوون. هەردوودەستی بەسەر پاشەڵیەوە گیرسابوونەوە، وەکو ئەوەیتەقەلا بدات کە هەستێت. سەری کەمێک بەسەرشانیا خوار بووبووەوە.

نەنکم دەستێکی بەقژیا هێنا وگوتی:

- سوپاس بۆ خوا کە نەجاتی بوو، کەی ئەوە حاڵ بوو کە ئەو منداڵە بەستەزمانەی تیابوو؟!

بابـــام، بە تەپەتەپ، وەکـــو ئەوەی بڕەقســـێت هـــات، بە پارێزەوە دەستی خستە سەرچاوە نوقاوەکانی کولیا. نەنکم هاواریکرد:- بەو دەستە پیسانە، دەستی تیوە مەدە جارێ بڕۆ دەست بشۆ.

بابام بۆڵاندی:- تۆ تەمەشا، هاتە دنیاوە، ژیا، خواردنی خوارد و پاشان..

نەنکم قسەکەی پیبڕی:- ئەوە چیتە، وڕاوە دەکەی، ئاگات لە دەمت بێ..

بابام، مۆڕەیەکی لێکرد وچوو بۆناو حەوشەکە. گوتی:

- مـن پارەی کفن و دفنەکەیم نییە، خۆت چۆنی تەگبیر دەکەی بیکە. چی لێدەکەی، بیکە!

- شڕ شێتی نەگبەت!

من لە مال وەدەرکەوتم، شەوێ گەڕامەوە. سبەی بەیانی کولیا بەخاک سپێردرا. من نەچووم بۆ کلێسا، تا ڕێوڕەسمی جەنـــازەکە ئەنجـــام درا، مـــن بە دیـــار قەبـــرەکەی دایکـمەوە ڕۆنیشـــتم. لەگەڵ ســـەگەکەما ولەگەڵ بـــابی یـــازدا لەوێنـــدەر دانیشتم. بابی یاز لە هەقی هەڵکەندنی گۆڕەکەدا، پارەیەکی کەمی وەرگرتبوو، منەتی ئەوەی دەکرد ودەیگوت:- مادامێکی ئێوە دەناسم، قەیدێ ناکات خاترتان دەگرم، دەنا هەرکەسێکی دی بوایە لە ڕۆبلێک کەمترم لێوەر نەدەگرت.

کە ڕوانـــیمە ئەو کـــونە زەردەی کە بـــۆنیکی ناخۆشـــی لێدەهات، چاوم بە چەند تەختەدارێکی ڕەشەوە بووی نمسار کەوت. بە بچووکترین جووڵە، لم وزیخی کەنار چاڵەکە دەڕژایە ناو چاڵەکەوە.من بە ئاقەست دەجولامەوە تا لمەکە برژێتە ناو چاڵەکەوە و تەختە ڕەشەکانم، کە دلم لێیان تێک هەڵدەهات، لەبەرچاوم ون بکات.

باوکی یاز، بەدەم کێشانی سەبیلەکەیەوە گوتی:- وامەکە کوڕۆ.

نەنکم بە خۆ و تابووتێکی سپی بچووکەوە هات. ' پیاوە بۆگەنەکە' خۆی هەڵدایە ناو چاڵەکەوە، تابووتەکەی لە دەستی نەنکم وەرگرت و لەسەر تەختە ڕەشەکان داینا، دووبارە لە چاڵەکە هاتەدەرێ، ئیدی بە بێڵچە و بە پێیان کەوتە پڕکردنەوەی چاڵەکە، دووکەڵ لە سەبیلەکەیەوە بەرز دەبووەوە. بابام و نەنکم بەبێدەنگی، بەبێ ئەوەی چ قسەیەک بکەن، یارمەتیان دەدا. نە قەشەی لێبوو نە سواڵکەر و گەدا، تەنیا ئەو چوارکەسە بووین، لەناو چڕە خاچستانێکی بێ کۆتاییدا.

وەختایەک نەنکم کرێی گۆڕ هەڵکەنەکەی دا، بەگلەییەوە گوتی:

- بەڵام تۆ وێڕای ئەمەش ڕوحی کچەکەمت ئازاردا!

- چارم نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، تۆزێک گڵم لە دراوسێکانی دزییەوە، خراپ نییە، کەسمان ئازار نەدا.

پیرەژن، بەسەر گۆڕەکەدا دانەوییەوە، کەمێک گریا و یەک دوو هەنسکی هەڵدا. ئەوجا کەوتەڕێ، مێردەکەی کە پاڵتۆیەکی شڕ و شەپڕێوی لەبەربوو وکڵاوەکەی هێنابووە سەرچاوانی و دیمەنێکی یەجگار دزێوی پەیداکردبوو. دوای کەوت، لەناکاوا پێشمان کەوت وبەدەم بۆڵەبۆڵەوە گوتی:- ڕەنج بەخەسار خۆمان، وەکو ئەوە وایە هەرچی دانەوێڵەمان هەیە، بە زەویەکی بەیارەوەمان کردبێ..

بە هەڵتەک هەڵتەک پێشمان کەوت، لە قەلەڕەشێکی پیر دەچوو.

لە نەنکم پرسی:- مەبەستی چییە، چی گوت؟

نەنکم گوتی:- خوا دەزانێ مەبەستی چییە، خۆشی نازانێ چ دەڵێ، وازی لێبێنە، ئەو بیرکردنەوەی تایبەتی خۆی هەیە.
دنیا گەرم بوو، نەنکم بە کاوەخۆ ڕێی دەکرد، لاقی لە لمە نمسارەکە ڕۆدەچوو، هەر تاو نا تاوێ دەوەستا و ئەو دڵۆپە ئارەقانەی دەسڕی کەبە ڕوخساریەوە دەدرەوشانەوە.
دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر زاتمان وەبەر خۆنا و پرسیم:
- نەنە، ئەو تەختە ڕەشانەی ناو گۆڕەکەی، تابووتەکەی دایکم بوو؟
بەخەمینییەوە بەرسڤی دایەوە:
- بەڵێ، ئەو گۆڕ هەڵکەنە زۆر کەرە، هێشتا ساڵێک بەسەر مەرگی ڤاریادا نەبووریوە، قەبرەکەی هەوای کێشاوەو جەنازەکەی ڕزیوە، هی ئەوەیە کە بە لم پڕی کردووەتەوە، لم ئاوکێشە. گڵ باشترە، دەبوایە بەخاک و خۆڵ پڕی بکردباوە.
- یانی هەموو کەسێک دەڕزێ، تەنیا پێغەمبەر و وەلیان نەبێت.
- تۆ قەت ناڕزیت!
ڕاوەستا، کڵاوەکەمی کە بە سەرمەوە خوار بووبوو، بۆ ڕاستکردمەوە و گوتی:- بیر لەو شتانە مەکەوە، تۆ هێشتا منداڵی کوڕم، تێدەگەی؟
بەڵام لەدڵی خۆدا گوتم: " بەڕاستی مردن ترسناکە، چەند ڕقم لە مردنە! " لەناخی خۆما ئازارم دەچەشت.
کە گەیینە ماڵەوە بابام سەماوەرەکەی پێکردبوو و سفرەی ئامادە کردبوو، گوتی:- دنیا گەرمە، با چایەک بخۆینەوە، لە چایەکەی خۆمتان بۆ لێدەنەم، هەردووکتان دەعوەتی چای منن.
چوو بەلای نەنکمەوە، دەستێکی بە شانیا دا وگوتی:- چ دەڵێی ژنەکە؟

ئەنكم دەستی تەكانداو گوتی:- چ بڵێم؟
- بزانە، خوا لەمە ڕازی نییە، یەک بە یەكی ئەندامانی ماڵباتەكەمان دەباتەوە. ئەمە جۆرە سزایەكە، ئەندامانی خانەوادە دەبێ وەكو ئەنگوستی یەک دەست یەكگرتووبن..
زۆر لە مێژ بوو، گوێم لێنەبووبوو كە بەو نەرم و نیانیە قسان بكات، گوێم بۆ هەڵخست، بە ئومێدی ئەوەبووم كە ئەو قسانە خەمەكانم بڕەوێنێتەوەو بكاتە كارێک كە ئەو چاڵە زەرد و تەختە ڕەش و نمسارانەم لەبیر بچێتەوە.
بەڵام ئەنكم بەتووندی قسەكەی پێبڕی:
- بەسە پیاوەكە لەوەتای هەی ئەم قسانە دووبار دەكەیتەوە، بە عەمرانت یارمەتی كەسێكت داوە؟ لەوەتای هەی وەكو چۆن ژەنگ لە ئاسن دەدات و دەیڕزێنی، بەو ئاوایە دەمان خۆیت.
پیرەمێرد، كۆكەیەكی كرد، تەمەشایەكی ژنەكەی كرد وبێدەنگ بوو.
ئێواری، لەبەر دەرگای حەوشەدا، بە دووورودرێژی واریقاتەكانی سەر لە بەیانیم بۆ لودمیلا گێڕایەوە، وام هەست كرد، قسەكانم هیچ كارێكیان لێنەكرد.
گوتی:- مرۆڤ بە هەتیوی بژی باشترە، ئەگەر داک و بابم بمرن، خوشكەكەم بە برایەكەم دەسپێرم و بۆخۆ دەچمە كڵێسایەک و بۆ هەتا هەتایە دەبم بە ڕەبەنیتە، لەوە زیاتر چیم لە دەست دێت؟ بەم لاقە شەلەوە نە دەتوانم شوو بكەم. نەدەتوانم كارێک بكەم. ئەگەر شووش بكەم منداڵكانم شەل و نوقسان دەردەچن.
وەكو هەر ژنێكی كۆلان و گەڕەكەكەمان، ئاقڵانە و بەجدی قسەی دەكرد. بەڵام لەو ئێوارەیە بە دواوە، ئیدی ئەو مەیلەی

جارانم له سەری نەما، وەکو دەڵێن چارەنووس لێکدی هاوێر کردین، سەرقاڵی ژیان، بەدەگمەن دەرفەتی دیتنی ئەوی دەدام.

چەند ڕۆژێک دوای مردنی کولیای برام، بابام پێی گوتم:

- ئەمشەو زوو بنوو. بەیانی زوو بێدارت دەکەمەوە، پێکڤە دەچینە لێرەوار، دار کۆدەکەینەوە.

نەنکم گوتی:- منیش گژوگیا کۆدەکەمەوە.

- لێـــرەواری ســـپیدار و کـــاژان، کە هەر ســـێ چـــوار کیلومەترێک لە گەڕەکی خۆمانەوە دوور بوو، پڕ بوو لە نقی شکاو و چڵ و چێوان. لە ئالی ڕوباری ئوکاوە تا نزیکەی دە کیلومەتران دەڕۆیی، لە سەمتەکەی دییەوە، تا شا ڕێگاکەی موسکۆ دەڕۆیی. گومەزێکی ڕەشی دار کاژان، بەسەر هەموو ئەو گیا وچڵ وچێوانەوە خۆنوێنی دەکرد. ئەم لێرەوارە گەورەیە بە " یاڵ و بژی ساڤیلوف " بەناوبانگ بوو.

ئەم هەموو سەروەت وسامانە هی کۆنت شوڤالوف بوو، کە بەباشی پاسەوانی لێنەدەکرا، خەڵکی کونافینو، بە موڵکی خۆیانیان دەزانی و بەردەوام لقە وشکەکانیان دەبڕییەوە و سوودیان لە گیا و سەوزەجاتەکانی دەبینی. هەرکە پاییز دادەهات، خەڵکی بە تەور وگوریسەوە ڕوویان دەکردە ئەو بێشەیەو دار و قەڵاشکەریان بۆ وەرزی زستان خڕدەکردەوە.

ئێمە، بەسێ قوڵی سپێدە زوو، بەناو سەوزەزارانی ئاونگ گرتوودا کە لەبەر تیشکی هەتاوا وەکو زیو دەدرەوشایەوە، بەرەو بێشەکە کەوتینەڕێ. بە سەمتی چەپی ئێمەدا، هەتاوی خاوی ڕووسیا بەسەر ڕوباری ئوکاو بە سەر بناری سووورباوی زورگ وهەڵەتەکانی دیاتلوف و بەسەر شارە سپییەکەی نیژنی نوڤگوردی پڕ باخ و باخات و گومەزێن زێڕین دادەخزی و دنیای زێڕوەشان دەکرد. شنەبایەکی فێنکی خەواڵو، لە قوڵی ڕوباری ئوکاوە دەهات. ئیدی خونچە گوڵان،

لە ژێر قورسایی شەونم و ئاونگدا، بە لق و پۆپانەوە سەریان خواربوووبوووەوە، لاولاوی کێوی و هەزار ڕەنگ بە کەناری جادەکەدا دادەخزین. گوڵە مێخەکان، گوڵی کێوی وەکو ستێرانی قرمز بەسەر چیمەن و سەوزەزارەکانەوە، چەسپی بوون و خۆنوێنیان دەکرد.

لێرەوارەکە، دەهاتە پێشوازیمان، دار کاژەکان بە لقە بلاوەکانیانەوە، لە باڵندەی گەورە دەچوون، سپیدارەکان لە کچانی پاکیزە دەچوون. بۆنی توندی زەلکاوەکان بەسەر مێرگوزارەکاندا دادەخزی. سەگەکەم، کە شانبەشانی من ڕێدەکات، زمانە قرمزیەکەی دەرهێناوە، ناو بە ناو هەڵوەستەیەک دەکات، بۆنی دەوروبەر دەکات، حایر وحەپەساو سەرە ڕێوی ئاساکەی دەلەقێنێ.

بابام، پاڵتۆ کورتەکەی نەنکمی لەبەر کردبوو، کڵاوێکی کۆنی بێ قەراخی لەسەر کردبوو. بەردەوام چاوان دەتروکێنێ ولە دڵی خۆیدا بزەیەک دەکات. مەگەر هەرخوا بزانێ بەچی پێدەکەنێ، بە لاقە درێژەکانیەوە پێش کەوتووە، زۆر بە پاریزەوە، وەکو ئەوەی لە شتێک بترسێت، هەنگاو دەنێت. نەنکم کراسێکی شین و تەنوورەیەکی ڕەشی لەبەرە، سەربەستێکی سپی لەسەری بەستووە، ئەوەندە بە خێرایی ڕێدەکات لە تۆوایە غل دەبێتەوە، من دووی کەوتووم و هانکەهانکم پێکەوتووە.

تازیاتر لە جەنگەڵەکە نزیک دەبینەوە بابام خوشحاڵتر و سەرحاڵتر دەبێت. پڕ بە سییەکانی هەوا پاکەکە هەڵدەمژێت ولەبن لێوانەوە ورتەورتێکی پچڕپچڕ ونامەفهووم دەکات، ئەوجا لە ناکاوا وەکو ئەوەی مەست بووبێ، هەڵدەکاتە گۆرانی شاد و سووک:

- جەنگەڵان باغی خوان. جگە لە خوا کەسی دی لێرەی نەڕواندوون، جەنگەڵ زادەی بایە، با هەناسەی فێنکی خوایە. جاران کە گەنج بووم، لە گیگولی کارم دەکرد، ئا حەماڵیم دەکرد. ئەلکسی حەیفێ تۆ هەرگیز ئەوە نابینی کە من دیتوومە. لەوێ، لە کەناری ئوکاوە، یەکپارچە لە کازیموفەوە تا مووروم هەر هەمووی جەنگەڵ و بێشە بوو! یان لە پشت ڤولگاوە — لێرەوار و دارستان تا چیایەکانی ئورال دەڕۆیی! بە ڕاستی دیمەنێکی ئەفسووناوی بێ کۆتایی بوو!

داپیرەم ژێراوژێر سەیری دەکرد وچاوێکی لە من دادەگرت. پیرەمێرد بەر قەدی بڕاوی درەختێک دەکەوێ و ڕەت دەبات، بەزەحمەت خۆیدەگرێتەوە و لە کەوتن دەخەلەسێت. چنگێ وشەی وشک لە زاری دەڕزێ، قسەکانیم هێشتا لەبیر ماون، لە یادگەمدا نەخش بوون.

- بەلەمێکی گەورەی پڕ لە زەیتی گولەبەڕۆژەمان ڕادەکێشا، جەژنی ماکار بوو، بەلەمەکەمان لە ساراتوفەوە بۆ بازاڕ ڕادەکێشا. چاودێرێکمان بەسەرەوە بوو ناوی کیریللو بوو، خەڵکی شاری بوریک بوو، کابرایەکی تاتاری خەڵکی ' کازیموف ' مانش لەگەڵدا بوو، درۆم نەکردبێ ناوی عەساف بوو. وەختایەک گەیشتینە گیگولی، ڕەشەبایەکی بەترەف هەڵیکرد، دێوی دەدا بە عاردیدا، ناچار لەنگەرمان خست، هەموو شپرزەو ماندوو خۆمان گەیاندە کەنارەکە، تا شۆربایەک لێبنەین، هەیڤی پێنج بوو.

ڤولگا، ئەوەندە پان بوو لە دەریا دەچوو. شەپۆل بە شەپۆلی دەگوت بەولاوە، لە دوورەوە لە پۆلە قاز وقوو دەچوون، کە پۆل پۆل بەرەو دەریای قەزوین دەچوون. شاخەکانی گیگولی، سەوزی بەهاری لە تۆ وایە سەر لە ئاسمان دەسوون.

هەورێـن سـپی، بە سـەریانەوە لەنگەریـان گرتبـوو، هەتـاو عەرد وبەردی زێڕوەشـان دەکرد. بەوجۆرە پشـوومان دا، بەو دیـــمەنە جوانـــانە زاخـــاوی چاومـــان دا، ئـــۆخژن لە دڵ و دەروونمـــان گەڕا. ڕوبـــارەکە هەوایەکـــی ســـارد و ناخۆشـــی هەبـــوو، بەڵام کەش و هەوای کەنـــارەکە فێنـــک و خۆشـــبوو. هەوەڵی شـەو بـوو، کیریللو لە جێی خۆی ڕاپەڕی، کابرایەکی توونده تەبیعەت بوو، گەنجیش نەبوو، یانی تەمەنێکی هەبوو، هەسـتا، کڵاوەکەی تـووڕ دا وگـوتی: " کـوڕینە مـن لە ئێسـتا بە دواوە هیچی ئێوە نیم، نە ئاغاتانم نە نۆکەر. بۆخۆتان بەبێ من بڕۆن! من دەمەوێ بدەمە ئەو جەنگەڵانە! "

هەمـوو واقمـان وڕمـا، شـتی وا چـۆن دەبـێ، ئـاخر ئەمە قسـەیە؟! ئاخر ئەو بە ئەمری ئەربـاب لەمە بەرپرسـە. نـاتوانین بەبێ بەرپـرس بڕۆین، خەڵکی بەبـێ سـەر هیچیـان پێناکرێت. هەڵبەتە کاری ئێمە لە سـەر ڤولگـا بـوو، بەڵام لەگین بـوو ڕێگـا گوم بکەین.

بەشـــەرش بـــوونەوەرێکی ناڕەســـەنە، چـــۆن لەکـــاتی وادا هاوڕێکـانی بەجێدێڵێت! ئێـدی ترسـمان لێنیشـت. بەڵام کـابرا سـوور بـوو لەسـەر بڕیـاری خـۆی: " تەواو، بەسـە، نـامەوێ لەوەی پتر لەسەر ئەم ژیانە بەردەوام بم و چاودێری ئێوەبم. تەواو دەدەمە ئەو جەنـگەڵ و لێـرەوارە! " ئێـدی خەڵکانێکیـان لەگەڵ بوون، ڕایان وابوو، لێی بدەن، دەست ولاقی ببەسـتنەوە، خەڵکـــانێکی دی هەبـــوون، پشـــتیوانیان دەکـــرد وهەمـــان بیرکردنەوەی ئەوەیـان هەبوو، لەم کـاتەدا بەلەمڕانە تاتـاریەکە هەڵیدایە و گوتی: " منیش لەگەڵیا دەڕۆم! تەواو بە جێتان دێڵـم! " ئەمە زۆر خـــراپ بـــوو، ئەربـــاب، هەقـــی دوو ســـەفەری بەلەمڕانەکە قەرزداربوو، هەنووکە لە نیوەی سەفەری سێیەمدا بـووین – ئەمە بـۆ ئەو ڕۆژگـارە پـارەیەکی زۆر بـوو. ئێـدی

مشـــت ومـــڕ و گەنگەشـــەیەکی زۆرمـــان کەوتە بەیـــنەوە، هەراوهەنگامە تـا درەنگانی شـەو بەردەوام بـوو، لەگەڵ تاریک بـوونی شــەوا حەوت نەفەرمـان ڕۆییشـتن وبەتەنـێ بە جێیـان هێشتین نزیکەی پازدە شازدە کەسێک مـاینەوە، ئەمەش کەتنی بێشە وجەنگەڵ!

- باشە ئەوانە چوون تا ببنە چەتە و ڕێگر؟

- ببنە ڕێگر یان پارسا و تەرکە دنیا. ئەو زەمـانە خەڵکی بیریان لەم شتانە نەدەکردەوە.

نەنکم، نیشانەی خاچی کێشا.

- ئـاه، خــودای بـانی ســەرا کە ئینســان بیـر لە بەشــەر دەکاتەوە سەری دەسوڕمێ، چ نەگبەتێکە ئەم بەشـەرە، ئەوەی ئەقڵ نایبڕێ لە بەشەڕ دەوەشێتەوە!

- خـوا ئەقڵـی بە بەشــەر داوە، دەبـێ خێـر وشــەڕی خـۆی بزانێت.

لە ڕێگەیەکـی زەلکـاوی بە قــوڕ ولیــتەوە، بە نێـوان دوو سـپیدارا خۆمـان بە لێرەوارەکەدا کـرد، بیـرۆکەیەکم بە مێشـکا دێت و لە دڵی خۆدا دەڵێم چەنـد خۆشـە پیاو وەکـو کریللـوی خەڵکـی یـورک بـۆ هەمیشــە بـداتە لێرەواران. هەر هـیچ نەبـێ لەوێ ئەم هەرا و هەنگـامەیە نیـیە، شـەڕ و ئـاژاوە نیـیە، کەس بەدمەستی ناکات، بار سووک وسـەر سـەلامەت بۆخـۆت دەژی، هەمـوو شـتێک لە بیـر دەکەیـت، خـوتەو بـۆڵەی بابـات, گـۆڕی دایکت و هەر خەم و پەژارەیەکی ژیان لەبیر بکەیت.

کە دەگەینە، پانتاییەکی وشکانی نەنکم دەڵێت:- با دانیشـین شتێک بخۆین!

هەندێ نانی جۆ، تەڕە پیاز، خەیـار، خـوێ و تـۆزێ پەنیـری خۆمـــاڵی، لە تـــوورەکەیەک دەردێنێـــت. بابـــام بە تەریقـــیەوە

تەمەشـای ئەو شـتانە دەکـات ولەبـن لێـوانەوە بە شـەرمێکەوە دەڵێت:

- خەجاڵەت خۆم، خۆ من هیچم لەگەڵ خۆدا نەهێناوە!

نەنکم دەڵێت:- ئەمە زۆرە بەشی هەرسێکمان دەکات.

لە ژێر دارکاژێکی قەد ئەستووری بەرزا دادەنیشین. بۆنی کەتیـرە لە هەمـوو لایەکەوە دێ، نەرمە بـایەک لە کێڵگەکـانەوە هەڵدەکات و گیایەکـان دەخـاتە کەروێشـکە. پیـرەژن، بەدەسـتە بۆرەکانی هەندێ گیـای زوانە بەرخە و گیـای قەشـە یوحەنـا و ڕووەکــێن شفابەخشـــی دیـــکەی کـــرد و کەوتە ستایشـــی نوژداریان.

بابام، دەوەنـان دەبڕێتەوە و داوام لێدەکات، هەرهەموویـان بگـوازمەوە و لەیەک شــوێندا کۆیــان بــکەمەوە. بەڵام مــن بە بێئەوەی بـێڵم ئەو پێبزانــێ، دووی نەنکـم دەکەوم و خـۆم بە قـولایی لێـرەکەدا دەکەم، نەنکـم بە نێـو درەخـتە بەرزەکانـدا تێــدەپەڕێ، نــاو بە نــاو بەســـەر چــڵ وچێــوە وشـــک و بەرەکاژەکاندا دادەنەوێتەوە و لەبەرخۆوە قسان دەکات:

- ئەمسـاڵ، دنیـا وشـکە، کـارگ و قارچـک کەم دەبـن، ئەی خـوای بـانی سـەر، تـۆ بەنـدەکانی خـۆت لەبیـر کـردووە! ئـاخر قارچک و تووترک خواردنی هەژاران و نەدارانە.

مـن، بەبـێ ئەوەی ورتەم لێـوەبێ، لەدووی ئەو دەڕۆیشـتم، بە گوێرەی توانا هەوڵدەدەم نەمبینێت. نامەوێ قسـەکانی لەگەڵ خـوا و قورباقە و ڕووەکانـدا ببـڕم. بەڵام وێـڕای ئەوەش هەر دەمبینێ.

- بابات بەجێهێشت ها؟

کڕنۆشـێکی بــۆ زەویە ڕەشـــەکە، کە بە جۆرەهــا ڕووەک ڕازابووەوە برد و، گوتی، کاتی خۆی، زۆر زوو، خودا لە بەنی بەشەران تووڕە دەبێ، لێیان دەچێ بە قینا، لافاوێک دەنێرێت و

هەموو گۆی زەوی غەرق دەکات. بەڵام دایکە پاکیزەکەی، لەکاتی گونجاوا، هەموو تووەکان کۆدەکاتەوە و لە زەمیلەکەیا دەیان شارێتەوە. دوای ئەوەی لەهی ولافاوەکە دەنیشێتەوە دەچێت بۆلای هەتاو و پێی دەڵێت: " هەتاوی میهرەبان، سەرانسەری زەوی وشک بکەوە! هەنگێ بەشەر لە چاکەی تۆ دەرناچن و هەتاهەتایە گۆرانیت پێدا هەڵدەڵێن. " بەو ئاوایە هەتاو زەوی وشک کردەوە، پاکیزە هەموو ئەو تووانەی کە شاردبوونیەوە، لە زەویا دادەچێنێ. کە خودا دەبینێ، زەوی دووبارە بە ڕووەک و گیانلەبەران و بەشەران خەملیوەو ئاوەدان بووەتەوە، دەپرسێت: " کێ، پرکێشی کردووەو لە ئیرادەی من دەرچووە؟ ئیدی پاکیزەی میهرەبان ئیعتراف دەکات. خوا کە چۆڵەوانی سەر زەمینی لەبەر گران دەبینت، بە پاکیزەی پیرۆز دەڵێت: " کارێکی چاکت کردووە، دەست خۆش دایکە. "

چیرۆکەکەم بەدڵ بوو، بەلامەوە جوان بوو، کەمێک دامام و ئەوجا بە جدی پرسیم:

- باشە ئەمە ڕاستە؟ خۆ پاکیزە، زۆر لە دوای لافاوەکە لە دایک بووە.

پیرەژن، دەکەوێتە گومانەوە، بە سەرسامی دەپرسێت:- کێ پێی گوتی؟

- لە قوتابخانە فێر بووم، لە کتێباندا نووسراوە.

قەناعەت بە وەڵامەکەم دەکات، دەڵێت:

- گوێ لەو شتانە مەگرە، ئەوەی لە کتێباندا نووسراوە، درۆیە، باوەڕ بە کتێبان مەکە.

لە بەرخۆوە سووکە بزەیەک دەکات.

- نـازانم ئەم گەوجـانە ئەو قسـانە لە کوێـوە دێـنن؟ باشـە ئەگەر پاکیزە لە دایک نەبووبێ، ئەدی خـودا لەکوێـوە هـاتووە، کەس بێ دایک دێتە ئاراوە؟

- من نازانم.

- دەبینی، لە مەکتەب تەنیا " من نازانم " یان فێر کردوویت و ئەمە ناتگەیەنێتە هیچ جێیەک.

- قەشە دەڵێت پاکیزە کچی یواکیم و حەنەیە.

مـن دەزانـم نەنکـم بەو قسـانە نـاڕەحەتە. چـاوی تێبـڕیم و گوتی:

- جارێکی دی ئەو قسانە بکەی، گوێت ڕادەکێشم.

هەمدیس لە سەری دەڕوات:

- پـــاکیزە لە قـــالو بەلاوە هەر هەبـــووە، لە پـــێش هەر خەلقەنـدەیەکی دیکەوە هەبـوو، دایکـی خـوایە، خـوا لەوە بـووە، پاشان..

- ئەدی مەسیح، مەسیح لە کێ بووە؟

نەنکـم هـیچ وەڵامێکـی پێنەبـوو. حـایر وحەپەسـاو گـوتی:- مەسیح؟ ئا، بەڵێ - مەسیح..!

من سەرکەوتوو بووم، بەڵام پەشیمان بـووم لەوەی کە بەو مەسەلە لاهوتیانە ئیحراجم کرد.

بەو تەمتومانە شینباوەی ژێر تاریک و ڕوونـی هەتـاوەکە سات بە سات پتر خۆمـان بە قـولایی لێرەوارەکەدا دەکرد. نـاو دارستانەکە فێنک بوو، لێرەوار دەنـگ و ئـاوازی تـایبەتی خـۆی هەیە، دەنگ و ئاوازێکی خەیاڵاوی. بولبولان دەخوێنن، چۆلەکە دەجریوێنن، کوکو پێدەکەنن، کەو دەخوێنن، ئاوازی پەڕەسـێلکە لە بـڕانەوە نـایەت، تەیرێکـی غەریـب کە " دەنـووک گەورە "ی پێـدەڵێن سەرمەسـتانە دەخـوێنێ و هـاوار دەکـات، قورپـاقەی چکـۆلەی سـەوز لە ژێـر پێمـانەوە بە بەینـی درەختەکانـدا بـاز

دەدەن. مـــاران، ســـەرە زەروەکانیـــان لە نێـــو گیـــاکەوە بەرز دەکەنەوە و چـــاوەڕوانی نێچیـــری خـــۆدەکەن. لە ناکـــاوا ســـمۆرەیەک، بەدەم جیڕەجیـــڕی ددانەکـــانیەوە بە بەرپێمانـــا دەردەفڕێ و لەپای دار کاژێکدا کلکە تووکنەکەی ئەڵقە دەکات، خودایا ئەم هەموو دیمەنە جوانانە چییە؟!

کەچـی بەشـــەر هەر ســـووکنایی نـــایە وحەز دەکـــات شـــتی زیاتر ببینێت، زیاتر بچێتەناو قولایی لێرەوارەکەوە.

وام دێتە خەیاڵ، لە پشت درەختەکانەوە، هەندێ تارماییـان دەبیـنم و دوای تۆزێـک لە قـولایی سـەوزباوی لێـرەکەدا ون دەبن، دەبـێ پەری جەنـگەڵان بـن، هەنـدێجار ئاسـمانی سـاف وشـین بەســەر درەختەکـانەوە دەدرەوشـێتەوە. ژێـر پێیەکـانم یەکپـارچە قرێـژە بەرد و خەنەتـیلکەیە، دەڵێـی مـافوورە و لە ئەرزەکە ڕاخراوە. بۆنی جۆرەها گیا و تووتڕک و تووی کێوی مەستم دەکەن و گەڵای بەیبوون وگوڵە قەوان لە ناو گیاکانەوە وەکـــو دڵـــۆپە خـــوێن دەنـــوێنن، بـــۆنی قارچـــک کەپـــووم دەزووڕێنێـــتەوە. نەنکـــم بە دەم هەناســـە هەڵکێشـــانەوە و بە دەنگی بەرز دوعا و نزا دەخوێنێت:

– ئەی دایکی پاکیزە، ئەی ڕۆشنایی هەموو جیهان!

لە تـۆ وایە، لەگەڵ هەمـوو شـتێکی نێو بێشـەکەدا ئاشـنایە، ئەو بەشێکە لە بێشەکە و بێشەکە بەشێکە لەو. وەکو ورچێکی گەورە، بەخۆی دەنازی و بە ویقارەوە ڕەفتاری دەکرد و لەبن لێـــوانەوە شـــوکرانەی دەکـــرد. وەکـــو ئەوەبـــوو ئـــارامی بە لێرەوارەکەدا پەخش بکاتەوە، کە پێی بەسـەر گیاوگوڵاندا دەنا و تێدەپەڕی و من بە دوویدا دەڕۆیشتم هەستانەوەی گیاکـانم دەبینی، هەر لەخۆمەوە زۆر شاد دەبووم.

بەدەم ڕێگاوە بیرم لەوە دەکردەوە خۆزگە دەبووم بە چەتە و ڕێگر، سەروەت و سامانی دەوڵەمەندانی پیسکەم دەدزی و بە سەر هەژاراندا دابەشم دەکرد. هەنگێ هەرکەسە بەشی خۆی دەبوو، ئاهی دڵی دەشکا و تێر بەسکی خۆی دەخوارد، ئیدی بەغیلی و حەسوودی نەدەما و کەس وەکو سەگی هار پەلاماری براکانی خۆی نەدەدا! واچاکە بڕۆم بۆلای خوا و پاکیزەکەی نەنکم و هەموو ڕاستیەکانی ژیانی هەژاران و بێنەوایانیان بۆ بگێڕمەوە. ئەوەیان بۆ بگێڕمەوە کە وەختێ مرۆڤ، هاونەژادی خۆی لەژێر لمەلانی زەردباوی بۆگەندا دەشارێتەوە هەست بە چ ئازارێک دەکات؟ کە چۆن دنیا پڕە لە نەهەقیانی زیادە و ناپێویست! ئەگەر پاکیزەی بێگەرد باوەڕی پێکردم و قەناعەتی بە قسەکانم کرد، هەنگێ داوای لێدەکەم بەهرەو حیکمەت و توانایەکی ئەوتۆم بداتێ کە هەموو ئەم بێدادی و ناهەقیانە لە دنیادا نەیەڵم، کە هەموو خەڵکێ بە گوێم بکەن و باوەڕ بە قسەکانم بکەن، هەنگێ باشترین ڕێگا بۆژیان دەدۆزمەوە! ڕاستە هێشتا منداڵم، بەڵام چ قەیدیە؟ خۆ مەسیح یەک ساڵ لە ئێستای من گەورەتر بوو، کە خەڵک و خوا، ئەقڵمەندان، لە پەرستگەکەیدا دەوریان دا و گوێیان لە قسەکانی دەگرت.

جارێکیان بە ڕادەیەک لەم جۆرە بیرانەم ڕۆچووبووم، کە کەوتمە چاڵێکی قووڵەوە، پشتی سەرم بریندار بوو، لایەکم کەوت بە چڵە دارێکی وشکا و بە تەواوەتی ڕوشا. لە کاتێکا لەناو قوڕاوی چاڵەکەدا دانیشتبووم خەریک بوو لە تەریقیدا بمرم، هەرچیم دەکردو دەکۆشا نەمدەتوانی لەچاڵەکە وەدەربکەوم، نەشم دەویست هاوار بکەم و نەنکم دڵی دابخورپێ و بترسێت.. بەڵام جگە لە هاواریش هیچ چارێکی دیکەم نەبوو.

نەنکم بە هەشتاو بە هاوارمەوە هات، لە چاڵەکەی دەرهێنام و نیشانەی خاچی کێشا وگوتی:

- سوپاس بۆ تۆ خودایە! بەس نەبوو چاڵەکە خاڵی بوو، ئەگەر ورچێ، دڕندەیەکی تیا بوایە چیمان دەکرد..؟

بەدەم ئەو خەیاڵانەوە ڕوندک لە چاوانی بەربوو، بردمی بۆ سەر جۆگایەکی ئەو نزیکانە، پاک شۆردمی، ئیدی هەندێ گەڵای لە زامەکانم نا و بەپەڕۆ بەستی، ئازارم کەمێک شکا، چونکە نەمدەتوانی بە پێ بۆماڵ بگەڕێمەوە، دیاربوو بە پێیان تا ماڵەوە بڕم نەدەکرد، ئیدی بردمی بۆماڵی پاسەوانی وێستگەی قیتارەکە.

لەو ڕۆژە بە دواوە، تەقریبەن هەموو ڕۆژێ بە نەنکم دەگوت:- بابچین بۆ لێرەوار!

زۆرجار بە گوێی دەکردم، ئیدی بەو شێوەیە، هەموو هاوینەکە وتا کۆتایی پایزمان لە بێشەکەدا، بە دەم کۆکردنەوەی سەوزەوات و تووترک و کارگ و گوێزان بردە سەر. ئیدی بەوجۆرە هەم خۆمان دەمان خوارد و هەم نەنکم لێی دەفرۆشتن و بە پارەکەی ژیانی خۆمان دابین دەکرد، هەرچەندە هیچ خەرج و ئەرکێکمان لەسەر بابام نەبوو، کەچی بەردەوام، وەکو پیرەژنی دۆ ڕژاو، هەر دەی بۆلاند:- مشەخۆرانی مێمڵ!

لێرەوارەکە، ئارامی ودڵنیاییەکی خۆشی بە دڵ ودەروونم دەبەخشی، ئەم هەستە، هەموو ناخۆشی و کارەساتەکانی لە بیرم دەبردەوە، ئۆخژنی لە دڵ و دەروونم دەگێڕا. لە هەمان کاتدا خەیاڵ هەڵی دەگرتم، دەیخستمە سەرباڵی خۆی، هەردوو هەستۆکی ژنەفتن و بینایيم هەستیار دەبوون، یادگەم دەژیایەوە، کەوشەنی خەیالم بەرین دەبوو.

ئیدی نەنکم نموونەو ئایدیالی بالآی من بوو، لە هەموو کاتێ زیاتر دڵبەندی بووم. هەمیشە بە نموونەکی بالآتر لە خەڵکانی دیکەم دەزانی، بە قەناعەتی من نموونەی هەموو چاکی و زانیاریەکانی سەر رووی زەوی بوو، تا گەورەتر دەبووم، زیاتر دڵبەندی دەبووم، ئەو بە خۆیشی، بە کردەوە، ئەو قەناعەتەی لە لام دەسەلماند و دەچەسپاند..

شەوێکیان کە لە قارچک کردن دەگەڕاینەوە، کە گەیشتینە قەراخ بێشەکە، نەنکم ڕۆنیشت تا پشوویەک بدات. من ئەمەم بەهەل زانی، خێرا خۆم بە بێشەکەدا کرد، تا چەند کارگێکی دیکە وەدۆزم. لە ناکاوا دەنگی نەنکم هاتەگوێ. سەرم هەڵبڕی، سەیرم کرد لە کەنار ڕێگاکە دانیشتووە و کارگەکان پاک دەکات. سەگێکی تووکنی لەڕ ولاوازی بۆڕەقنە، زمانی دەرهێنابوو و بە دیارییەوە وەستابوو. نەنکم قسەی لەگەڵ سەگەکەدا دەکرد ولێکدا لێکدا دەیگوت:

- بڕۆ، لێرە بڕۆ. خوا بە هاناتەوە بێت.

ڤالیوک، ماوەیەک لەوە پێش سەگەکەمی ژەهرخوارد کردبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم سەگە ڕابگرم و بیکەم بە هاوڕێی خۆم. بە هەشتاو بۆ سەر جادەکە ڕۆیشتم، کە نزیک بوومەوە، سەگەکە بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بەجۆرێکی سەیر پشتی بۆ کووڕ کردمەوە. نیگا سەوز و ئاگرین و، چاوە برسیەکانی بڕییە من. هەنگێ کلکی لە گەڵۆزی ناو خۆی بە ناو لێرەکەدا کرد. ڕێکردنەکەی لە ڕێکردنی سەگ نەدەچوو. فیکەیەکم بۆکێشا، بەلآم ئەو لەجیاتی بگەڕێتەوە، خێراتر خۆی بە نێو چڕە دارستانەکەدا کرد ولە چاو ون بوو.

نەنکم بەدەم زەردەخەنەوە پرسی:

- ئەوەت بینـــی؟ هەوەڵجـــار وامزانـــی ســـەگە، بەڵام کە بۆجـــاری دووەم تەمەشـــام کـــردەوە، بەســـەر وگەردن و کەڵبەکانیا زانیم گورگە. ترسام. لە دڵی خۆدا گوتم: " ئێستا کە گـورگی، بـڕۆ، شـــەڕم لــێ لابە " خۆشـــبەختانە گورگـــان لە هاویناندا خەتەر نین.

نەنکـــم قەت لە لێـــرەکەدا ون نەدەبـــوو، هەرگیـــز ڕێگـــای گەڕانەوەی لــێ گـوم نەدەبـوو. هەر بەبـۆنی ڕوەک وگیاکانـدا دەیزانـــی چ جـــۆرە قارچـــک و کارگێـــک لەو دەڤەرە دەڕوێ. هەموو کاتێ تاقی دەکردمەوە، لێی دەپرسیم:

- کارگی سوور لە ژێر چ درەختێکدا دەڕوێت؟ چۆن کارگی ژەهراوی لە کارگی ئاسایی جیا دەکەیتەوە؟ چ جۆرە کارگێک لەبن گیای سەرخەسدا دەڕۆێ؟

هەر بە شوێنەواری چرنۆکی سەرقەدی درەختاندا، هێلانە سمۆرانی دەدۆزییەوە، ئیدی بە دارەکاندا هەڵدەزنام و هەرچی گوێزێکیـان بـۆ زسـتان دەشـاردەوە، هەرهەمـوویم دەردێنـا. جاری واهەبوو یەک کیلۆ گوێزم دەردێنا. جارێک کە خەریکی ئەم کـارەبووم، کـابرایەکی ڕاوچـی تـاپڕێکی پێوەنـام، بیست و حەوت ساچمەی لە کەفەڵی ڕاستما خاڵی کرد. نەنکم بەدەرزی و سـنجاق یـازدە سـاچمەی بـۆ دەرهێنـامەوە و ئەوانـی دی لە گیانما مانەوە، تابە تێیەڕبوونی ڕۆژ، خۆبەخۆ دەرهاتن.

نەنکم کە دەیبینی، ورەم بەرزە و پیاوانە تەحەمـوولی ئـازار دەکەم، لە خۆشیا لە پێستی خۆی نەدەهێوری و پێی دەگوتم:

- ئافەرین بۆخۆت، بەڕاستی ئازایت. ئەگەر وا بـڕوات زۆر ئاقڵ دەردەچیت، ژیان ئەزموونە!

هەرجارێ لە فرۆشی گوێز یـان قارچک پارەیەکی بهاتبـایە دەسـت، ئەو خێـر وحەسـەناتەکەی خـۆی لەبیـر نەدەکـرد و

پارەیەکی لە قەراخ پەنجەرەی ماڵە هەژاران دادەنا. لە دەمی خۆی دەگرتەوە بۆ خەڵکانی بێنەوا، تەنانەت ڕۆژانی جەژنی یەک شەمموانیشی بە جلکی کۆن و شڕوشەپڕێوەوە بە سەر دەبرد.

جارێکیان بابام بە ڕوویا هەڵشاخی وگوتی:

- دیمەنت لە هی سواڵکەرانیش خراترە، بەڕاستی من شەرمەزار دەکەی.

- تۆ هەقت چییە؟ نە کچتم و نە کچە عازەبم بۆ شوو بکەڕێم.

شەڕ و دەعوایان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوو. پیرەمێرد هەر خوتە و بۆڵەبۆڵی بوو:

- من گوناحم لە خەڵکی دی زیاتر نین، بەڵام سەد هێندەی وان لە عەزابام.

نەنکم هێندەی دی تووڕەی دەکرد و بە تەوسەوە دەیگوت:

- چ قەیدییە، شەیتان پیاوی خۆی دەناسێت.

کە بە تەنیا دەبووین، نەنکم مانای ئەو قسەیەی بۆ شرۆڤە دەکردم:

- ئەو پیرە پیاوەی من زۆر لە شەیتان دەترسێت.. ئەو داماوە لە ترسا پیر بووە، نابینی چۆن پیر بووە؟

من ئەو هاوینە، بە هۆی هاتوچۆی لێرەوارەوە، کەمێک بوژابوومەوە و تین و تاوێکم تێکەڕابوو. لە هاوڕێکانم دوور کەوتبوومەوە، وازم لە گەمە و کێبڕکێ و ڤیانی منداڵانە و بێهودە هێنابوو، تەنانەت لودمیلاشم لەبەرچاو کەوت.

شەوێکی پاییزی شەستەباران، بابام، کە سەراپای لە ئاوا هەڵکشابوو، لە شار گەڕایەوە، لەبەر دەرگا وەکو چۆلەکەیەکی لە ئاو هەڵکێشراو خۆی تەکاند و بە کەش و فشەوە گوتی:

- کـوڕەکەم، هەی تەمەڵباشـی، لە سـبەیەوە دەبـێ بچیـتە سەرکار!

نەنکم بە تووڕەیی پرسی:- لە کوێ؟

- لە لای کوڕەکەی ماتریونای خوشکت.

- بەڕاستی کارێکی باشت نەکردووە پیاوەکە!

- دە کەرەکەر، ئـافرەت! دوور نیـیە لە بەردەسـتی ئەوانـدا فێری نیگاکێشی ببێت.

نەنکم سەری لەبەرخۆ نا و هیچی تری نەگوت.

هەر ئەو شـەوە لـودمیلام بینـی و پێمگوت لەمەولا لە شـارا دەژیم. کەمێک دەبیرەوە چوو و گوتی:

- منـیش، بەو زووانە بـۆ شـار دەبەن، بـابم دەیەوێ لاقـم ببـڕنەوە، گـوایە ئەگەر لاقـم ببـڕدرێتەوە، تەندروسـتیم بـاش دەبێت.

کچـۆڵەی دامـاو ئەم هـاوینە تەواو باریـک وبنـێس بووبـوو، ڕوخساری شین هەڵگەڕابوو، چاوەکانی ئەبڵەق بووبوون. لێم پرسی:- دەترسیت؟

بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ.

بەبێدەنگی کەوتە گریـان. نەمـدەتوانی بە تـاقە وشـەیەکیش دڵنەوایی بکەم. من خۆشـم لە ژیانی شار دەترسام. مـاوەیەک بە بێدەنگی لە پاڵ یەکدا دانیشتین. ئەگەر دنیا هـاوین بـا، داوام لە نەنکم دەکرد، چۆن بە کچی دەچووە سواڵ، بەو ئـاوایە بۆ سـواڵ بچووبـاین و لودمیلاشـمان لە گەڵ خـۆدا ببـردایە. دەمانخستە عەرەبانەیەکی بچکۆلەوەو من پاڵم دەنا. لێ مخـابن، ناوەنـدی پـاییز بـوو، بـایەکی سـارد بە کـوچە و کۆڵانەکانـدا دەهات، هەور بەری ئاسمانی گرتبوو، زەوی شـەقار شـەقار و خەمین و خەمناک بوو.

## (٥)

ئەمە جاری دووەمە کە بۆ شار هاتووم، لە ماڵێکی گەورەی سپیدام کە لە دوو نهۆم پێکهاتووە. ماڵەکە لە تابووت دەچێت، بە جۆرێ دروستکراوە کە خەڵکێکی زۆر بگرێت. خانووەکە تازەیە بەڵام جوان نییە. لە بابایەکی هەژار دەچێت کە لە ناکاوا میراتێکی گەورەی پێبڕابێ و ئەوەندەی خواردبێ ئێنتەلای کردبێت.

خانووکە دەڕوانێتە سەرجادەکە، خانووەکە هەشت پەنجەرەی هەیە کە دەڕوانن سەر جادە. هەر نهۆمە چوار پەنجەرەی هەیە و دەڕواننە ئەو سەمتەی کە بە ڕووکاری ئەو نهۆمە دادەنرێ. بەلامپەنجەرەکانی نهۆمی خوارەوە دەڕوانێنە سەر ڕاڕەوێکی تەنگ و بارێک. پەنجەرەکانی سەرەوە دەڕواننە سەر کەندێکی پیس و خانوویەکی چکۆلە کە ئافرەتێکی جلشۆری تیایە.

هەڵبەتە، هیچ شەقامێک، بەمانای باوی شەقام لە ئارادا نەبوو. بەڵکو ئەو کەندە پیسە بەبەر ماڵەکەدا دەڕۆیی، کە دوو بەربەستی تەنگ کردبووی بە سێ بەشەوە. بەدەستە چەپا و لەلای قاوشی زندانیەکانەوە، چالاییەک هەبوو، خەڵکی ماڵەکە هەرچی زڕو زبڵ وبەرماوەو پاشماوەیان هەبوو فڕێیان دەدایە ئەو کەند وچاڵەوە. لە قووڵایی کەندەکەدا گۆلاوێک هەبوو، لەبەر پیسی سەوز دەچووەوە. کەندەکە بە دەستە ڕاستا دەچووەوە سەر تالاو و قۆپی زڤیزدینی کە بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێدەهات.

ناوجەرگەی کەندەکە ڕێک بەرانبەر ماڵەکەی ئێمە بوو، نیوەی پڕبوو لە زبڵ وخاشاک و جۆرەها ڕووەک، نیوەکەی

تری قەشە دوریمودنت بوکروفسکی، کردبووی بە باخ. کۆشکێکی دارینی سەوزی لە ناو باخەکەدا قوت کردبووەوە، هەر کە بەردێکی بەسەرا دەکەوت، تەق و هوڕێکی زۆر ناخۆش و ترسناکی لێبەرز دەبووەوە.

شوێنێکە تابلێی ناخۆش، زبڵدانێک بوو لەو گۆڕە.. ئیدی بارانی پاییز هێندەی دی ناخۆشی کردبوو، کردبووی بە قوڕە لیتەیەکی ئەوتۆ کە بەراز لێی دەرنەدەچوو، کە بە پێتەوە دەلکا بە ئامان و زامان لێی نەدەبووەوە. بە عەمراتم، ئەو هەموو قوڕ وزڕ وزبڵەم لە شوێنێکی وا بچووکدا نەبینی بوو.. من کە بە پاکی و خاوێنی مەزرا و لێرەواران ڕاهاتبووم، کە ئەو هەموو زڕ و زبڵ و سەرانگوێلک و گوڤەکەی ئەو گۆشەیەی شارم بینی، زۆر دڵتەنگ و بێتاقەت بووم.

لەو دیوی ئەو کەندە بەرتەنگەوە، چەند شوورەیەکی قاوەیی داڕوخاو هەبوو، کەمێک دوورتر، ئەو خانووە پەڕپووتەم ناسییەوە کە زستانێ، ئەوسای شاگردی پێڵاوفرۆشییەکە بووم، تیایدا دەژیام. نزیکی ئەو خانووە هێندەی دی پەستی کردم. بۆ دەبوایە جارێکی دی گرگر بێمەوە هەمان جادە وکۆڵان؟

وەستا تازەکەم دەناسی. جارێک هێشتا دایکم مابوو، لەگەل براکەیدا سەری دابووین. براکەی بە ڕاوێژێکی گەپجاڕییەوە دەیگوت:- ئەندرێ بووە بەباوک، ئەندرێ بوو بە باوک!

ئەم دوو کەسە بە هیچ جۆرێ نەگۆڕابوون، برا گەورەکە کە کەپوویەکی دەندووکە دالاشی و قژێکی درێژی هەبوو، بە ڕواڵەت لە پیاوێکی باش ومیهرەبان دەچوو، بەلام ڤیکتوری برا بچووکی کە ڕوخساری لە سەر وکەللەی ئەسپ دەچوو ویەکپارچە نمووس بوو. دایکیان خوشکی نەنکم بوو. ژنێکی

تووڕە و تڕۆ و دەم بەهاوار بوو. برا گەورەکە ژنی هێنابوو، ژنەکەی جوان و ئارەزوو بزوێن بوو، سپیەکی ناسکۆڵەی شەنگوڵی چاوڕەشی چاو گەورە بوو. هەرکە خۆم بە ماڵەکەیاندا کرد لە ڕۆژێکا دووجاری پێگوتم:

- من جارێک پاڵتۆیەکی ئاوریشمی گوڵداری دوگمە کارەمانی ڕەشم دابوو بە دایکت.

خۆشم نازانم بۆچی باوەڕم نەدەکرد کە ئەو ڕۆژێ لە ڕۆژان دیارییەکی بە دایکم دابێ و دایکم قەبووڵی کردبێ، کە بۆجاری دووەم ئەو قسەیەی بە گوێمدا دایەوە، وەڵامم دایەوە:

- ئەگەر ڕاستە و دیارییەکت داوەتێ، چ پێویست دەکات ئەوەندەی بڵێیتەوە؟

وەکو کەسێک تووشی شۆک بێ، ڕاچڵەکی و چووە دواوە.

- چی چی؟ تۆ دەزانی لەگەڵ کێدا قسان دەکەی؟

ڕوخساری سوور بووەوە، چاوەکانی ئەبڵەق بوون، هاواری مێردەکەی کرد، کابرا، بەڕاستە و پرگالێکەوە خۆی بە مووبەقەکەدا کرد، قەڵەمێکی نابووە پەنا گوێی. دوای ئەوەی گوێی لە ژنەکەی گرت، بەمنی گوت:- دەبێ لەگەڵ هەمووانداا بە ئەدەب بی و لاساری نەکەیت.

ئەوجا ئاوڕی لای ژنەکەی دایەوە و بە تووڕەیی گوتی:- بەم شتە تووڕەهاتانەوە سەرقاڵم مەکە!

- مەبەستت لە تووڕەهات چیە! کە کەس وکارەکەت..

هاواریکرد:- کەس و کاری چی..

یەکسەر بۆ ژووری کارەکەی گەڕایەوە.

بەڕاستی پێم حەیف بوو ئەوانە خزم و کەس وکاری نەنکم بن. ئیدی بە تەجرەبە بۆم دەرکەوتبوو کە کەس وکار ڕەفتاریان دەگەڵ بێگانەدا باشترە تا لەگەڵ یەکدیدا. چونکە یەکتر دەناسن، خاڵی بەهێزو لاوازی یەکدی دەزانن، هەرکە

هەلیان بۆ هەڵدەکەوێ بەیەکدا هەڵدەشاخن و بەگژ یەکدادەچن.. بیانوو بە یەکدی دەگرن و زوو زوو بەشەڕ دێن.

وەستام خۆشدەویست. بە شێوەیەکی جوان قژەکەی بۆ دواوە هەڵدەدایەوە و دەیخستە پشت گوێچکەکانییەوە. نازانم بۆچی کابرای " ئەمە جوانە "یوەبیر هێنامەوە. کە پێدەکەنی لە کانگای دڵەوە پێدەکەنی. چاوە قاوەییەکانی دەدرەوشانەوەو چرچ ولۆچی قەراخ کەپووە دەندووکە دالاشیەکەی بە شێوەیەکی کۆمیدی بەرجەستە دەبوون..

بە دەم ناسکە بزەیەکەوە، کە ددانە ورد و سفتەکانی بەدیار دەکەوتن، ڕووی دەکردە دایکی و ژنەکەی ودەیگوت:- بەسە، واز لەم شەڕ وهەرایە بێنن!

خەسوو و بووک هەموو ڕۆژێک شەڕیان بوو، سەیر لەوەدا بوو، زۆر بە ئاسانی لێیان دەبوو بەشەڕ. ئەم دوو ژنە لەبای بەیانییەوە، بە قژی گڤەوە، بە سینگی ڕووتەوە، وەکو ئەوەی ئاگر لە ماڵەکە بەربووبێ، بە ژوورەکاندا دەهاتن و دەچوون. هەرا وزەنایان بە درێژایی ڕۆژەکە نەدەبڕایەوە. مەگەر لە کاتی فراڤین و شێودا هەندێک کڕ ببوایەن، ئەوەندەیان دەخوارد تا مڕ دەبوون، خاو دەبوونەوە و خەو دایدەگرتن، لە سەر خوان و سفرە، گەنگەشەی کاروباری خواردن و چێشت لێنانیان دەکرد، و قسەیان لێک هەڵدەبەزییەوەو زەمینەی شەڕخۆش دەبوو. خەسوو هەر خواردنێکی لێنابایە، بووکێ بە نارەزاییەوە دەیگوت:

- دایکم ئەو خواردنە بە شێوەیەکی دی لێدەنێت.

- مانای وایە خراپتر دەردەچێت.

- نەخێر، زۆریش باشتر دەردەچێت.

- زۆرچاکە، کەوایە بڕۆ لەگەڵ دایکتدا بژی!

- من لێرە خانم و کەیبانووی ماڵم!

- ئەدی من چ کارەم؟

پیاوە، هەڵیدەدایێ:- بەسە، بیبڕنەوە، مردووتان مرێ، خۆ شێت نەبوون؟

هەموو شتێکی ئەم ماڵە، سەیر و نائاسایی بوو. ئەگەر بتویستبا لە مووبەقەکەوە، بۆ ژووری نانخواردن بڕۆیت، دەبوایە بەو تەوالێتە بچووکەدا بڕۆیت کە کەوتبووە نێوان مووبەقەکە و ژوورەکەوە و تاقە تەوالێتی ماڵەکەش بوو.. بەو شوێنەدا، خواردن و سەماوەرەکە بۆسەر مێزی نانخواردن دەبرا کە بەڕاستی مایەی نوکتە و پێکەنین بوو. یەکێک لە ئەرکەکانی من ئەوەبوو، هەرکاتێ حەوزی تەوالێتەکە بەتاڵ بێ، پڕی بکەمەوە لە ئاو. من لە مووبەقەکەدا و ڕێک لە بەرانبەر دەرگای تەوالێتەکە دەنووستم، هەمیشە سەرم بەهۆی ئاگری وەجاخەکەوە کە بەرەبەرە سارد دەبووەوە گەرم دەبوو، لاقیشم بەهۆی ئەو تەوژمە بایە ساردەوە لە ژێر دەرگاکەوە وەژوور دەکەوت، تەزی بوون. ئیدی بەرلەوەی بخەوم، هەرچی شڕ وشیتاڵێک لەوناوە با کۆم دەکردەوەو بەلاقی خۆمدا دەدان تا سەرمام نەبێت.

هۆڵی میوان و پێشوازی، کە دوو ئاوێنەی بالآنما لە نێوان پەنجەرەکانیا دانرابوون، دوو مێزی گەورەی وەرەقبازی تیابوو، دوازدە کورسی دەسکداری تیابوو، چەند تابلۆیەکی چوارچێوە زێڕین بە دیوارەکانیەوە هەڵواسرابوون کە دیاری بەشدارانی گۆڤاری " نیڤا " بوون، بەڕاستی خەمینی لێدەباری. بەلآم هۆڵە بچووکەکە هەرچەندە بڕێک جەم وجۆرتر بوو، بەلآم ئەویش خەمئەنگێز بوو. جۆرەها مافووری تیابوو، پڕ بوو لە ڕەفە و دۆلابی پڕ لە قاپ و ئامانی زیو بوو، قۆری و کتری چای، ئەمانە بەشێک بوون لە جیازی بووکێ. سێ چرای قەوارە جیاواز، کە لووتکە ونموونەی جوانی بوون. ژووری

نووستن که پەنجەرەی تیا نەبوو، تەختەخەوێکی گەورەی تیابوو، چەند کۆمەدی و سەندوقێکی تیابوو، بۆنی گەڵا تووتنی ڕزیوی لێدەهات. ئەم سێ ژوورە بە بەردەوامی چۆڵ بوون، کەچی ئەندامانی خێزانەکە، هەر هەموویان خزابوونە ژووری نانخواردنەکەوە و، چووبوون بە یەکا و دەکەوتن بەسەر یەکدا. وەستا و براکەی دوای قاوەڵتی و تێشت ڕێک لە سەعات هەشتی تەواودا، مێزەکەیان ئامادە دەکرد، بە کاغەزی سپی دایان دەپۆشی، کەرەستەی ڕەسم و نیگارانیان دێنا، قەڵەم، کاغەز، ڕاستە، پرگاڵ و مەرەکەبی چینیان دێنا و لەم سەر و لەوسەری مێزەکە بەرانبەر بەیەک دادەنیشتن و دەستبەکار دەبوون. مێزەکە هەرچەند بچووک و باریک بوو، بەڵام پڕ بە پڕی ژوورەکە بوو.

ئەگەر خانم و دایەنەکە، پێکەوە بهاتبانە ئەم ژوورە، بێگومان بەریەکدی دەکەوتن. فیکتۆری برای وەستا هاواری لێ هەڵدەستا:

– ئەرێ ئێوە ناتوانن ڕێگاکەتان بگۆڕن، چ کارێکتان بێرە هەیە؟

خانم، بە ڕوویەکی گرژەوە نیگایەکی مێردەکەی کرد وگوتی:

– ڤاسیا، پێی بڵێ هاوارم بە سەردا نەکات.

ڤاسیا، وەکو هەمیشە، بەڕووی خۆشەوە گوتی:– ئێوەش مێزەکە مەجووڵێنن.

– ئاخر من دووگیانم و شوێنەکەش ئەوەندە تەنگە، ناتوانی لەجێی خۆت بجووڵێیت.

– دەیسا باشە، لە ئێستا بەداوە دەچینە هۆڵە گەورەکە و لەوێندەر کاردەکەین.

بەڵام ژنەی تاین کە گوێی لەو قسەیە بوو وەکو فیشەکە شێتە چوو بە ئاسمانا وگوتی:

- لا حەولە وەلا، ئەرێ کەستان دیوە لە ژووری پێشوازیدا کاربکات؟

لە ناکاوا، ماتریونا ئیڤانوڤنا لەبەر دەرگای تەوالێتەکەوە پەیدا بوو، دەم وچاوی لەبەر گەرمای وەجاخەکەدا وەکو چەوەنەر سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد:

- دە تەمەشای ئەمە بکە، ڤاسیا تۆ لێرە کاردەکەیت و ڕەنج دەدەیت و ڕازیت، کەچی ئەو دەڵێت چوار ژوور بەشی تووتەڵەکانی ناکات، لە تۆ وایە دۆتمیرە!.. ئەگەر نەمدیبا باوکی دەمردم لە عەزرەت دایکی!.

ڤیکتۆر، بەو قسانە زۆر کەیفی هات، دەتگوت ڕۆنی سەی لە قالبی دەدەن، بۆیە قژقژ کەوتە پێکەنین. بەڵام وەستا لە هەمووان پەست و بێزار بوو، هاواریکرد:- بەسە! بیبڕنەوە!

ئیدی خەسوو بەو ئاسانیە دەستبەردار نەدەبوو، بارانی جنێو وقسەی ناشیرین بەسەر بووکەکەیدا دادەباراند. بووکەی شڕشێت، خۆی بەسەر کورسییەکدا دا، دوای ئەو شورت و شۆی لە خەسووی بڕی، وەکو منداڵ کەوتە گریان و زاری:- من دەڕۆم، دانانیشم! خەریکە دەمرم!

وەستا، وێرای خوێنساردی و حەوسەڵەداری خۆی دەتەقێتەوە:

- ئەی هاوار، هەی داد وبێداد لە دەست ئێوە! ئاخر چۆن بەم حاڵەوە کار دەکرێت؟ چۆن بەم شێتانەوە گیرۆدە بووم! ئاخر من بە ناخێرم لەپێناو ئێوەدا ڕەنج دەدەم. بۆ ئەوەی ئێوە برسی نەبن ئەم هەموو ڕەنجە دەدەم! ئاخ لە دەست ئێوە!

لە هەوەڵەوە لەم شەڕ وقەرقەشانە دەترسام، بەتایبەتی جارێک دوای شەڕ وفەرتەنەیەک، وەستا ژن، چەقۆیەکی

هەڵگرت و بەهەشتاو خۆی بە تەوالێتەکەدا کرد و دەرگاکەی توووند لە سەر خۆی داخست، ئەوجار بەڕاستی ترسام! ئیدی ژنەی تاین وەکو ئەوەی جنۆکان دەستیان لێوەشاندبێ، هاواری دەکرد ئەمما هاوار، بە ئامان و زامان نەیدەبڕییەوە. دوای بێدەنگییەکی کەم، وەستا ڕایکردەبەر دەرگاکە، پشتی دانەواند ومنی گازکرد:

- وەرە سەر پشتم، شووشەکە بشکێنە و سورگی دەرگاکە بکەرەوە!

یەکسەر خۆم هەڵدایە سەر پشتی، شووشەی بەشی سەرەوەی دەرگاکەم شکاند، کە دەستم برد سورگی دەرگاکە بترازێنم، خانم بە دەسکی چەقۆکە بەربووە سەر و کەللەم. بە هەرحاڵ هەرچۆنێ بوو دەرگاکەم کردەوە، وەستا وەکو هەڵۆ پڕی دایە ژنە و بۆ ژووری نانخواردنی ڕاکێشا، چەقۆکەی لە دەستی دەرهێنا. لە کاتێکا لە ژووری نانخواردن دانیشتبووم ودەستم بەسەرە برینداره‌کەمدا دێنا، هەستم کرد ئەو فیداکاریەی من لە زیادە بوو، دەمی چەقۆکە ئەوەندە کول بوو نانی پێنەدەبڕا، چ جای ملی بەشەر؟ هەروەها پێویستی بەوە نەدەکرد من بچمە سەر پشتی وەستا، خۆ دەمتوانی بچمە سەر کورسییەک و بە ئاسانی شووشەکە بشکێنم و هەنگێ وەستا دەیتوانی دەست ببات و سورگی دەرگاکە بترازێنێ و دەرگاکە بکاتەوە. ئیدی لەوە بەدواوە، ئەم قەرەقەشە و ئاژاوانەی لەم ماڵەدا ڕوویاندەدا، نە دەیان ترساندم و نە کاریان تێدەکردم و دەمزانی دەبێ چ بکەم و چ نەکەم.

جووتە برا ئەندامی تیپی کڵێسا بوون، هەندێجار بەدەم کارکردنەوە، گۆرانییەکیان دەگوت. گەورەکە بەمجۆرە دەستی پێدەکرد:

*ڕۆژێک من موستیلەکەی یارم،*
*توورڕدایە نێرینەی ڕوبارەوە*
بچووکەکە بۆی دەسەنەندەوە:
*بەو موستیلەیە هەموو شادی*
*دنیام لە کیسی خۆم دا*

دەنگی وەستاژن لە ژووری منداڵانەوە بەرز دەبووەوە و بە ئارامی دەیگوت:- ئەوە چیتانە، شێت بوون؟ چما نازانن منداڵەکە نوستووە؟!

یان دەیگوت:

- ڤاسیا تۆ ژن و منداڵت هەیە، ئیدی چیت داوە لە گۆرانی دڵداری، وا وەختی نوێژە، هەر بینا و زەنگی نوێژی ئێوارە لێی دا.

- دەی چاکە، کەواتە با سروودی ئاینی بێژین.

وەستاژن، بە ناڕەزاییەوە لە سەری ڕۆیی کە سروودی ئاینی لە هەموو شوێنێک ناگوترێت، بە تایبەتی لێرەدا، بە دەست ئاماژەی بۆ دەرگای تەوالێتەکەد کرد.

وەستا بۆڵەیەکی کرد:- فایدەی نییە، دەبێ ماڵەکەمان بگۆڕین، بۆ شوێنێکی دی باربکەین.

زۆرجار ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە، سێ دانەساڵ بوو هەمان ئەو قەوانەی لێدەدایەوە. کە گوێم لە گفتوگۆیەکانی وەستاکانم دەبوو، هەمان دیمەن و ڕووداوەکانی دووکانی پێڵاو فرۆشییەکەم بیردەکەوتەوە، زۆر لەیەکدی دەچوون. وەستاکانم لە هەموو کەسێک، لە ڕیڤینگ، دراوسێ، بێگانە، بە گازن وگلەیی بوون، خۆیان لە هەموو خەڵکی شار پێ باشتر بوو، ئیدی بەوپەڕی بێ ئینسافی باسی خەڵکیان دەکرد، کەس لە تیغی تیژی زمانیان نەدەخەلەسی، زۆرم خەفەت بەو ئەتوار

و تەبیعەتەیـــان دەخـــوارد، لە هەلێــک دەگەڕام، لەو یاســـا و ڕێسایانە لابدەم کە ئەوان بۆ خەڵکیان دادەنا..

کارێکی زۆرم بە ملدا درابوو، دەوری نۆکەری ماڵم دەبینی، چوارشـەممـوان مـووبەقەکەم دەسـڕی، سـەماوەرەکە و هەمـوو ئامــانە مســەکانم پــاک دەکــردەوە. ڕۆژانـــی شــەممە دەبــوایە زەمینەی هەموو مـاڵەکە، بە هەردوو قاڵدرمەکەوە پاک بشـۆم، دار بۆ هەموو سۆپاکان بشکێنم و لە شوێنێکدا کەڵەکەی بکەم، قـاپ و ئامانەکـان بشـۆم، سـەوزەوات بـژار وخـاوێن بـکەمەوە، دەگەڵ وەســتاژندا بـۆ بـازاڕ بـڕۆم و زەمـیلەکەی بـۆ هەڵبگـرم، وەکو سەگی پێ سووتاو لە بەینی نانەوایی، عەتاری، بەقاڵی و دەرمانخاناندا بێم و بچم.

خــانمی گەورەی مــاڵێ – خوشــکە چەنەبــاز و تــووڕە و تـڕۆکەی – نەنکـم سـەعات شەشـی بەیـانی لە خەو ڕادەبـوو. دوای ئەوەی شــڵپێ ئــاوی بەســەر وچاویــا دەدا، هەربە جلــی خەوەوە، لەبەردەم ئیکۆنەکەی مەسیحدا نوێژی دادەبەستا ولە خوا دەپاڕایەوە و باسی ژیانی خۆی دەکرد، دەکەوتە گلەیی لە کوڕەکـانی و بەتـایبەتی لە بـووکەکەی. بە ڕاوێژێکـی خەمنـاک، دەســـتی دەنوقانــد و بە هەنیەیــدا دێنــا و لە کــانگەی دڵەوە دەیگوت:

– خودایا، ئەی خوای بانی سەر من هیچم لە تۆ ناوێ، تەنیا کەمێـک ئاسـوودەیی، تۆزقاڵێـک دڵنیـایی و ئاشــتەوایی نەبــێ، ئەگەر لوتف بفەرمووی و پێمی ڕەوا بدینیت.

ئەوەندە دەپاڕایەوەو دەلالایەوە کە من لە خەو ڕادەبووم، و گـوێم بـۆ نـزاو دوعــا گەرمەکـانی ڕادەدێـرا. ڕۆژێکـی پـاییزی، ڕەمـــــگ زەرد، لە پشــــت پەنــــجەرە تەڕ و بارانــــاویەکەی مـووبەقەکەوە لە ژوورەوەی دەدا. لەم سـپێدە سـەهۆڵبەندانەدا، تارمـایی تـاریکی کەسـێک، دانەویـیەوە و تـا نزیکـی ئەرزەکە

کڕنۆشی دێنا ونیشانەی خاچی دەکێشا، سەرپۆشەکەی لە سەری دادەخزی و قژە بۆزەکەی بە سەرشان و ملیا پەخش دەبوو، ئەویش بە دەستی چەپی پەیتا پەیتا سەرپۆشەکەی بەسەریا دەدایەوەو توورەو پەست دەیبۆلاند:- تۆ تەمەشای ئەم سەرپۆشە میراتیە!

لێکدا لێکدا، بەدەم لاڤە وپاڕانەوەوە دەیکێشا بە نێوچەوان و شان وملی و ورگی خۆیدا و نیشانەی خاچی دەکێشا:

- ئەی پەروەردگاری میهرەبان، ئەگەر منت خۆشدەوێ، بووکەکەم بگرە، سزای بدە. تۆڵەی ئەو سووکایەتی و بێڕێزییانەی لێبکەوە کەدەرهەق بەمن دەیکات، سەد قات تۆڵەی لێبکەوە! چاوانی کوڕەکەم بکەوە، بەڵکو جەوهەری بناسێت و ببینێت. چاوی ڤیکتوریش بکەوە، یارمەتی بدە، لە مەرحەمەتی خۆت بێبەشی مەکە..

ڤیکتوریش، لە مووبەقەکەدا، لە سەر تەختێک خۆی لە چەرچەفێکەوە پێچابوو و لە غورابی خەودا بوو، لە ناڵە ولاڤە و پاڕانەوەکانی دایکی خەبەری بووەوە و بەدەنگی خەواڵووەوە هاواری کرد:

- دایکە بەم سبایساڵحانە، نە خێر بەشکراوە و نە شەڕ، دیسان بەزمەکەیە؟ ئەمە تۆ چ بەلایەکی!

ژنەی تاین، لەبن لێوانەوەو بە نیمچە شەرمەزارییەکەوە دەڵێت:

- ئێ، ئێ، دە پاڵکەوەو بۆ خۆت بنوو.

چەند خولەکێک بە بێدەنگی، خۆی ڕاژەند و ئەوجا بە ڕاوێژێکی کینەکێشانەوە گوتی:

- خودایە مۆخی بەدەنی دژمنانمان وشک بکە، خوێنی دەمارەکانیان بماسێنە، بەردێکیان پێ ڕەوا مەبینە بیکێشن بەسەری خۆیاندا.

تەنانەت نەنکیشم ئەوجۆرە نەفرین و تووکە ترسناکانەی نەدەزانی. هەرکە لە نوێژ ونزایان دەبووە، دەهات بە سۆراغی منەوەو تەکانی دەدام، خەبەری دەکردمەوە:- هەلو، ڕابە، خەوت کرد بەچی. خۆ بۆ خەوتن بە کرێمان نەگرتووی. سەماوەرەکە پێکە! هەرە ئێزنگ ودار بێنە، دیارە چیلکە و چەوێلی وشکیشت ئامادە نەکردووە.

ئیدی تا هێزم تیایە دەکەومە تەقەلا بۆ ئەوەی لە بۆڵەبۆڵ و خوتەخوتی پیرەژن بخەلەسێم، بەڵام کوڕم دەوێ بتوانێ پیرەژن ڕازی بکات. ڕێک لە تۆفی زستان دەچێت، بەناو مووبەقەکەدا دێ و دەچێ، دەڵێت:- وس س س س، هەی شەیتانی لە شەیتان بوو! هەراوزەنا مەنەوە، ڤیکتور خەبەر نەکەیەوە، ئەگەر خەبەری بکەیەوە مەگەر خوا بزانێ چ بەڵایەکت بەسەر دێنم! خێرا بڕۆ بۆ دووکانی بەقاڵەکە!

بۆ نانی بەیانی ڕۆژانی هەفتە دوو هۆقە نانی گەنممان دەکڕی و بایی دوو کۆپیکیش کێکم بۆ وەستاژن دەکڕی. کە لە نان کڕین دەهاتمەوە جووتە ژن بە گومانەوە نانەکانیان دەژمارد و هەڵدەسەنگاند و ئەوجا دەیانپرسی:

- کوا نانێکی کەمە، هەر ئەوەندە بوو؟ چیت لێکردووە؟ کوا وەرە دەمت بکرەوە، بزانین بەڕێوە نەتخواردووە!

دەمم دەکردەوە، دەیانکرد بە هەرا:

- ئەوەتا خواردوویەتی! شوێنەواری نانەکە بە ددانەکانیەوە دیارە!

... زۆر دڵسۆزانە کارم دەکرد. پاک کردنەوە و گسکدانی ماڵەکە و، شۆردنی هیرباره مسەکان و، دەسکی دەرگاکانم زۆر لاخۆش بوو. زۆرجار جووتە کەیبانوو، کە ئاشت بوایەن و شەڕە جنێو و دەمەقاڵەیان نەبوایە، گوێم لێبوو ستایشیان دەکردم:- خوا هەڵناگرێ ئیشکەرە.

- پاک وخاوێنە.
- وەستاش چاوی تێوەیە.
- بەڵام زۆریش گۆساخە.
- ئەدی مەعنای چی، مەگەر کێ پەروەردەی کردووە؟
هەر یەکێکیان هەوڵیەدا بەچە ترسێنم بکات و بە خورتی خۆیم بەسەردا بسەپێنێ، بەڵام من بە نیمچە شێتم دەزانین، گوێم بە قسەی ئەوان نەدەدا، بەرپەرچم دەدانەوەو، هەڵبەتە خانمی بچکۆلە پەی بەوە بردبوو، کە من گوێ بە قسەی وان نادەم، بۆیە بەردەوام بە گوێیدا دەدامەوە:
- ئەوە بزانە کە ئێمە لە خانەوادەیەکی گەدا ڕزگارمان کردوویت. من جارێک بالاپۆشێکی ئاوریشمی گوڵ گوڵیم دا بە دایکت.
ڕۆژێک، خوام نەما وگوتم:- چیە، خۆ لە سەر ئەو پاڵتۆیە بە زندوویەتی کەوڵم ناکەیت؟
قیژەیەکی ترسناکی کرد:
- ئەیەڕۆ! تەمەشا چەند ڕوو قایمە! دوور نییە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاگر لە ماڵەکەمان بەربدات!
کە گوێم لەو قسەیە بوو حەپەسام. ئاگری چی! بۆ ئاگر لە ماڵەکە بەر دەدەم؟
جووتە کەیبانووی ماڵ، لە وەخت وناوەختا، کە مەسەلە دەهاتە سەر گلەیی لەمن، شەڕ و دەعوای خۆیان لەبیر دەبردەوەو موو بە بەینیانەوە نەدەچوو، لەلای وەستا شکاتیان لێکردم، ئەویش بە توندی دەیگوت:- کوڕم ئاقڵ بە، ڕاستگۆ و سەرڕاست بە،ئیشی خۆت بکە و هەقی هیچت نەبێ، شاباشی خۆت بدە وقنج هەڵپەڕە!
وێڕای ئەوەش ڕۆژێک کە پەست بوو، بە هەردووکیانی گوت:

- ئەریّ خۆتان زۆر باشن! ئێوە وەکو ئەسپ سواری ئەم منداڵە دەبن، هەر کەسێکی دی لە جێی ئەو بوایە لە مێژبوو هەڵاتبوو، یان لە برسا مردبوو!

ئەو قسەیە، جووتە ژنی تووڕە کرد، کەوتنە پەڵمە گریان. وەستاژن لاقی بە عاردیدا دەکوتا و بە تووڕەیی هاواری دەکرد:- تۆ چۆن ئەم قسەیە لە بەردەم ئەم هەتیوچەیەدا دەکەی هەی بێ ئەقڵ، تۆ تەمەشای خۆت کردووە! سەیری قژی بکە! ئاخر کە گوێی لەم قسەیە ببێت چۆن بەگوێی من دەکات، چۆن ڕێزم لێدەگریت؟ لەبەرچاوی دەبم بە بەڵمە برنج. ئەوەشت لە بیر بێ کە من دووگیانم!

دایکی بە پەڵمە گریانەوە گوتی:

- ڤاسیلی، خوا دەست بە باڵتەوە بگریّ. من مردوو و تۆ زندوو، ئەمە ڕۆژەکەیە! کار وابڕوات تۆ خووی ئەم منداڵە شەڕ دەکەی.

جووتە ژن بە تووڕەیی وەدەرکەوتن.

وەستا ئاوڕی لای منی دایەوە، بە توندی گوتی:

- تەمەشا، بزانە بە هۆی تۆوە، چ فەرتەنەیەک بەرپابوو، هەی لاسار، ئەگەر کار وابڕوا ناچار دەبم بۆلای باباتت بنێرمەوە، هەرواش دەکەم. ئاقیبەت دەبیت بە کۆنە فرۆش.

ئەو سووکایەتیەم لەبەر گران بوو، بۆیە گوتم:

- کۆنەفرۆشیم پێ باشترە لە شاگردی تۆ. تۆ بە ناوە منت بە شاگردی ڕاگرتووە، هاتووم شتم فێر بکەی، بەڵام کوا چیت فێر کردووم؟ من خەریکی زبڵ ڕشتنم، بەمە دەڵێن شاگردی، شاگردی وایە؟!

وەستا، بە ئەسپایی قژی گرتم، چاوی لە دوڕ چاوم بڕی و گوتی:

- بزانە کوڕۆ، تۆ لاساری لاسار، من ئەمەم پێخۆش نییە!..

من لە دڵی خۆدا، دڵنیابووم کە دەرم دەکات ودەمنێریتەوە بۆلای کەس وکارم . بەلام بۆ سبەینێ بەخۆ و بەستەیەک کاغەز و ڕاستەیەک و قەڵەمێکەوە خۆی بە مووبەقەکەدا کرد. گوتی:

- کە لە خاوێنکردنەوەی چەقۆ و چەتاڵەکان بوویتەوە، ئەم وێنەیەم بۆ کۆپی بکە. یان وێنەیەکی وەکو ئەمەم بۆ بکێشە.

وێنەکە، بریتی بوو لە ڕووکاری خانوویەکی دوو نهۆمی پڕ لە پەنجەرە و وردە جوانکاریی لە گەچ دروستکراو. ئەوسا لە سەری ڕۆیی:

- وەرە، ئەمە پڕگاڵە، ئەندازەی هەموو هێڵەکان بگرە. لە سەرەتا و کۆتایی هەر هێڵێکدا خاڵێک دابنە. کە خاڵەکانت دانان، هەنگێ بە ڕاستە و قەڵەم ڕەساس خاڵەکان بگەیەنە یەکدی. یەکەمجار هێڵە ئاسۆییەکان بکێشە و پاشان بچۆ سەر هێڵە ئەستوونیەکان. یاڵلا دەستبەکاربە!

زۆر خۆشحاڵ بووم کە ئەم کارە خاوێنەم پێدرا، کە یەکەمین قۆناغی فێربوون و شاگردیم بوو، بەلام حایر وحەپەساو دەمڕوانیە کاغەز وکەرەستەکانی دی کە هەڕم لە بڕیان نەدەکردەوە. بە هەرحاڵ، دەست و دەم وچاوم شت و دەستم بەکار کرد. هەوەڵجار هەموو هێڵە ئاسۆییەکانم دۆزینەوەو گەیاندمنە یەک. لەگەڵ وێنە ئەسڵەکەدا بەراوردم کرد، سەیرم کرد سێ هێڵی زیادەم کێشاوە. پاشان هێڵە ئەستوونیەکانم کێشا. زۆر حەپەسام، سەیرم کرد دیمەنی خانووەکە، زۆر سەیر گۆڕاوە. پەنجەرەکان لەشوێنی خۆیان داخزی بوون، کەوتبوونە بۆشاییەوە، یەکێکیان کەوتبووە پشت خانووەکەوەو بە ئاسمانەوە لە مۆلەق وەستابوو، دەروازەی

سەرەکی خانووەکە، تا نهۆمی دووەم ڕۆیی بوو، بانێژەکە لە ناوەنـدی مـیچەکەدا بـوو، بەڵام پەنـجەرەکەی سـەرەوە، لە تروپکی دووکەڵکێشەکەدا گیرسابووەوە.

ماوەیەکی زۆر لە جێی خۆ هەڵکوڕمام. کە دەمروانیە ئەو عاجباتیەی دروستم کردبوو، گریانم بۆخۆم دەهات، خۆشم نـازانم ئەو دیمەن و شێوەیە چۆن دروست بووبوو. ئەنجام بڕیارم دا، بە کۆمەکی خەیاڵی خۆم، قەرەبووی بکەمەوە، هەر لەخـۆمەوە، لە بانێژەکـان ولە سـەر گوێسـەبانەکان، کۆمەلێـک چۆلەکە، کۆتر وقەلەڕەشم دروستکرد، لە ئەرزەکە و لەبەردەم خـانووەکەدا، کۆمەڵێـک خەڵکـی لاق خـواری چەتـر بەدەسـتم دروسـتکرد. ئیـدی چەنـد هێڵێکی خـواروخێچم بەسـەر هەمـوو ئەوانەدا کێشا وبە هەشتاو بۆ وەستام برد. نێوچاوانی تێکنـا، سەرێکی لەقاند و بە پاوێژێکی ناڕازی گوتی:- ئەمە چییە؟

وەلامم دایەوە:

- دنیا بـارانە، وەختـایەک بـاران ببـارێ هەمـوو خانووەکـان خواروخێچ دەنوێنن، چونکە باران بە خواری دەبارێ، ئەمانەش هەموو تەیر و تون، لە ژێر گوێسـەبانە و قەراغ پەنجەرەکـان و لـوولەی سـۆپاکاندا کزکۆڵەیـان کـردووە و خۆیـان مـات داوە. هەرکاتێ باران ببارێ تەیـر وتـۆ بەو ئـاوایە خـۆ دەدەنە پەنـا و پاسـاران.. ئەم خەڵکـانەش پەلەیـانە خـۆ بگەیەنـنە مـاڵەوە، ئەمە کچێکە هەڵنوتاوە، ئەم کابرایەش میوە فرۆشە.

وەسـتام، بەسـەر مێـزەکەدا دانەویـوەتەوە، سـەی قـژە درێژەکەی لە کاغەزەکەی سەر مێزەکەدەخشێت.. بە دەم کوڵی پێکەنینەوە دەڵێت:- دەستەکانت نەڕزێ، مەمنوونی تۆم.

ولەسـەری ڕۆیـی:- هەقە لە دنیـادا نەتهێڵم، هەی چـۆلەکەی چەقەچناوە!

لەم کاتەدا خانمی چکۆلە هات بەسەرا، ورگی لەپێش خۆیەوە وەکو بەرمیل سەمای دەکرد، تەمەشایەکی ڕەسمەکەی کردم، بە مێردەکەی گوت:- دارکاری بکە!
مێردەکەی بە شێنەیی وەڵامی دایەوە:
- نا، منیش کە یەکەمجار دەستم دایە ئەم کارە، لەو باشتر نەبووم. نابێ چاوەڕوانی شتی گەورە لە خەڵکانی تازە کوورە بکەی..
بە قەڵەمی سوور، خەتی بە ژێر هەڵە و پەڵەکانما هێنا و پاشان کاغەزێکی دیکەی دامێ:
- سەر لە نوێ ئەم ڕەسمە دروست بکەرەوە، دەبێ فێری بی. دەبێ ئەوەندە کاغەز ڕەش بکەیتەوە، تا بە تەواوەتی فێر دەبیت.
دووەمین هەوڵم لە یەکەمین هەوڵ باشتر بوو. بەڵام پەنجەرەیەکم لە جێگای دەرگای چوونە ژوورەوە دانابوو. حەزم نەدەکرد ئەم خانووە بە چۆڵی بدینم، ئیدی پڕم کرد لە خەڵکی جیاواز و جۆراوجۆر. کچۆڵانم لە قەراخ پەنجەرەکان دانان، باوەشێن بەدەست خۆیان باوەشێن دەکرد، کوڕانێک کە سەبیلیان دەکێشا. یەکێک لە کوڕەکان سەبیلی نەدەکێشا، لووتی خۆی گرتبوو و گاڵتەی بەوانی دی دەکرد. گالیسکەیەکی چکۆلەم لەبەر دەرگاکە ڕاگرتبوو، سەگێک لەبەردەمیا بە کەماڵی ئیسراحەت وەرکەوتبوو. وەستام بە تووڕەییەوە گوتی:
- بۆچی دیسان تێکەڵ و پێکەڵت کردووە، هەی غەزەب؟
بۆم ڕوونکردەوە، کە وێنەکە بەبێ ئاوەدانی، بەبێ خەڵکی زۆر خەمناک بوو، ئەمجارەیان شۆخییەکەم سەری نەگرت، لێم تووڕە بوو وگوتی:

- تـۆ زۆر سەرسـەختی هـا! بە ئـارەزووی خـۆت دەكەی، ئەگەر بتەوێ شتێک فێربی، دەبێ بە جدی كاربكەی، لاساری نەكەیت. ئەمەی كردووتە هیچ نییە، شەڕە پشیلەیە.

ئەنجام كۆپیەكی تەقریبەن تەواوی وێنەكەم دەرهێنا، ڤاسیا زۆر خۆشحاڵ دیاربوو، گوتی:

- بـزانە، ئەگەر هەوڵبـدەی، فێـر دەبـی؟ ئەگەر بەم شـێوەیە بەردەوام بی، دەبی بەشتێک.

هەنگێ ئەركێكی تازەی بەسەرما دا:

- نەخشەی خانوویەكم بۆ بكێشە خۆت شوێنی ژوورەكـان، پەنجەرەكان، دەرگاكان و هەموو شتەكانی دی دیاری بكە، مـن بۆتی ڕوون ناكەمەوە.. بە خۆت، بەبێ پرسی من دروستی بكە.

خـۆم بە مـووبەقەكەدا كـرد، دانیشـتم و دەبیـرەوە چـووم، نەمـدەزانی چـۆن و لە كوێـوە دەسـت پێـبكەم. بەڵام دەرس و دەوری هونەری مـن لەوێدا وەسـتا... داكی وەسـتام هـات و بە هەڕەشـــەوە گـــوتی:- تـۆش دەتەوێ ببیـت بە نەخشـــەكێش و نیگاركێش؟

چنگی لە قژم نا، سەری بەرز كردمەوە وتاتوانی كێشای بە قەراخ مێزەكەدا، لووتم پژا، دەم ولێوم پڕبـوو لە خـوێن.. وەكـو شـێت كەوتە هەڵـبەرزو دابەز، كـاغەزەكەی بەردەسـتی دڕیـم، كەرەسـتەكانی تـووڕ دامە ئەرزەكە، كە لەو كـارانە بـووەوە، ڕاســت بـووەوە، دەسـتەكانی نـایە كەلەكەی و بە ڕاوێژێكـی سەركەوتووانە گوتی:

- ئەگەر ئـازای جـارەكی دی دەسـت بـۆ ڕەسـم كـردن دەبەیـت، هەنگـێ خـۆت دەبینیـتەوە، نـۆبەتی ئەو قەوانەیە، دەیەوێ ببێت بە وەستا؟ دەتەوێ فێری كارەكە ببیت و جێ بە براكەی، كە لە گۆشت وخوێنی خۆیەتی! لەق بكەیت!

وەستا بە هەشتاو خۆی گەیاندینێ، ژنەکەشی، ئەوەندەی سکەکەی دەرفەتی دەدا، لە دووی غاری دەدا. ئیدی شەڕ و فەرتەنەیەکی توند لە نێوان هەرسێکیاندا قەومی، ئیدی بەگژ یەکدا دەچوون، بەسەر یەکدا دەکەوتن، بەسەر وبەچکی یەکیاندا دەکێشا وجنێو وسخێفیان دەدا. ئەنجام جووتە ژن بەدەم گریان وڕوندک ڕشتنەوە پاشەکشەیان کرد ولە ژوورەکە وەدەرکەوتن. وەستا ڕوویکردە من و بە میهرەبانی گوتی:

- چەند ڕۆژێک واز لەم کارە بێنە، واز لە مەشق و ڕاهێنان بێنە. بەخۆت دەبینی ئەمانە چ غەزەبێکن، با بەلایەکت بەسەر نەیەنن.

دڵم بە حاڵی دەسووتا، کەوتبووە بەینی بەرداشی ئەو دوو ژنەوە، هیچ دەسەلاتێکی نەبوو. من پێش ئەم بوویەرەش هەستم بەوە کردبوو کە پیرەژن نایەوێ هیچ شتێک فێر ببم، هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە تەرخان کردبوو، لەو بوارەدا هیچ بە هیچ نەکەم. بۆیە هەرکاتێ بمویستبا ڕەسم بکەم، لەوم دەپرسی:- هیچ کارێکت بە من نییە؟

بە نەبەدڵی وەلامی دەدایەوە:

- هەر کارێکم هەبوو ئاگادارت دەکەمەوە. هەنووکە بڕۆ بەلای ڕەسم و مەسمتەوە، هەر لە تۆمان کەم بوو! خوێڕی..

ئیدی دوای تۆزێک بە ئیشێکی دەناردم، یان دەیگوت:

- قاڵدرمە واهی گسک دەدرێ؟ تەمەشا بزانە چەند پیسە، هەر تەپ وتۆزە، شەرم لە خۆت ناکەی! هەلو، ڕابە، هەڕە دووبارە خاوێنی بکەوە.

لە ژوورەکە وەدەر دەکەوتم، دیقەتی قاڵدرمەکانم دەدا، پاک و خاوێن بوون، پێم دەگوت کوا خۆ لە گوڵ پاکترن.

تـا دەیتـوانی دەیقیژانـد:- یـانی چـی؟ قسـه له قسـەی مـن دەکەی، هـا؟ دەتەوێ مـن به درۆ بخەیـتەوە، گـوایه مـن درۆ دەکەم ها؟!

جارێکیان شەرابی کڤاسی کرد بەسەر هەموو ڕەسمەکانما، جـاری دووەم یەک شووشـه زەیتـی ئیکونـانی به سـەر کەرەستەکانما قلْپ کردەوە.

دەتگوت کچۆڵەیەکی منداڵە، خەڵکی وا ڕکونی و کینەکێشم نەبینـی بـوو، دەیویسـت هەمـوو ڕقـی خـۆی به مـن برێژێـت.. کەسم نەبینی بوو، وەکو ئەو زوو و له سەر شتی تورەهات و بێ مانا هەڵبچێت و تووڕه ببێت، خەڵکی بەزۆری له بەختی خۆ به گلەیـین، بەڵام ئەو لەتـامی دەرکردبـوو، نه له هـیچ و نه له کەس ڕازی نەبـوو، شـەو و ڕۆژ هەر خەریکـی گـریه و زاری بوو.. لەزەتی لەو شێتاتیەی خۆی دەبینی.

کوڕه بچووکەکەی، ڤیکتـوری له ڕادەبەدەر خۆشدەویسـت، خۆشەویستی نەبوو، بەڵکو جۆره شـێتاتیەک بـوو. مـن سـەرم لەم لێشاوی خۆشـەویستیه دەسوڕما، سرەکەیم نەدەزانی، بۆیه لەلای خۆمەوه ناوم نابوو نێروی شێتاتی..

هەندێجار بەیانیان دوای نوێژ، دەچووه سەر یەکەمین پلەی مـوغەیریەکە، هەردوو ئانیشـکی دەنـانه قەراخ سـۆپاکه و، بەدڵ و بەگیان، لەبن لێوانەوە، به کوڵ دەیگوت:

- کـوڕه پـاکەکەم ئەی خـوێنی پـاکی مـن! ئەی فریشـتەکەم بنوو به ئارامی، بنوو گیانەکەم، هیڤیدارم خەونی خۆش بدینیت. جـوانترین دەزگیـران له خەوتـا ببیـنه، دۆتمیرێـک یـان کـچه بازرگانێـک ببیـنه. بـا دژمنانـت بەرلەوەی له دایـک بـن بمـرن، دۆسـتانت سـەد سـاڵ بژین. بـا کیـژان پۆل پۆل دوات بـکەون، وەکـو چـۆن سـۆنه دوای نێـرەکەی دەکەوێ، ئـاوا ڕەدووت بکەون.

من پێکەنینم بەو قسانە دەهات. ڤیکتوری کوڕی ئەو تا حەزکەی کوڕێکی زبر، تەمەڵ و تەوەزل و هیچ لەبارا نەبوو بوو، ڕێک لە دار کونکەرە دەچوو. ڕەنگ دێز، دفناک، کەسێکی سەرسەخت و گەوج، لە کەرێتیدا بەشی کەسی نەهێشتبووەوە.

هەندێجار، لە ورتەورتی دوعا و نزای دایکی خەبەری دەبووەوە. هەنگێ بە دەنگێکی خەواڵوو، دەیگوت:

- دایکە بەسە، ماڵم بە قوڕگرتی! ئەمە چیە بە فسکەفسک بە دیارمەوە وەستاوی؟ بۆ کوێ بڕۆم لە دەست تۆ.

هەندێجار بە ئەسپایی لەسەر پلەی موغەیریەکە دادەبەزی و بەدەم زەردەخەنەوە دەیگوت:

- باشە باش بنوو، بنوو هەی نارەسەن.

هەندێجار پێی دادەخزی، دەم و قەپۆزی بە قەراخ سۆپاکەدا دەکەوت، هەنگێ دەمی دادەچەقی، وەکو مەکینەی قیتار دەکەوتە فیشکەفیشک و خوتەخوت:

- چییە؟ ماڵی دایکت بە قوڕێ دەگریت، بە دایکت دەڵێی بەسە، بیبڕەوە هەی حەرامزادەی سپڵە و پێ نەزان؟ هەی نانەجیبی نارەسەن، هەی توخم و تۆی شەیتان! خۆزگە لەبارم دەبردیت، فڕێم دەدایتە بەر سەگ و کسۆکان، کە دڵنیام سەگیش بۆنی پێوە نەدەکردی.

یانی هەمان جنێوانی پیسی لات و لەوێر و بەدمەستانی سەرجادە و شەقامەکانی دەدا، پیاو کە گوێی لەو جنێوە بازاڕیانە دەبوو، بە ڕاستی دەترسا.

پیرەژن کەم دەنووست، شەوی وا هەبوو دوو سێ جار ڕادەبوو، لە تەختەخەوەکە دەهاتە خوارەوە، خۆی دەکێشا بەو تەختەخەوەدا کە من لەسەری خەوتبووم، یەکسەر خەبەرم دەبووەوە، دەمپرسی:- چییە؟

هێمای خاجی دەکێشا، چاوی دەبڕییە تاریکیە ئەنگوستە چاوەکە و لە تۆ وایە شتێک دەبینێ، لە بن لێوانەوە دەیگوت:

- وس. بێدەنگ.. خودای من.. ئەی نەبی ئیلیا.. ئەی ڤارڤاران شەهیدی بێگەرد.. لە مەرگی مفاجات بە دوورم بکەن.

بە دەستەلەرزێ مۆمێکی دادەگیرساند. دەم وچاوە خڕەکەی، کەپووە زلەکەی، چاوە قاوەییەکانیم دەبینی کە پەیتاپەیتا و بە تووڕەیی دەتروکان و لەبەر ڕۆشنایی مۆمەکەدا دەیڕوانیە، ئەو سێبەرە لەرزۆکانەی بەجۆرەها شێوە بە دیار دەکەوتن.. جۆرە نیگەرانییەک بە سیمایەوە دیاربوو. مووبەقەکە گەورە بوو، بەڵام ئەوەندەیان کۆمەدی و سەندووقە شکاویان تێ پەستا بوو، شەوان زۆر بچووک دەهاتە بەرچاو. تریفەی مانگ بە کاوەخۆ لە ژوورەوەی دەدا، ڕوناکیەکی کز کە بە ئاستەم دەگڕا، نەدەگەشایەوە و نەدەکوژایەوە، پرتەپرت لەبەردەم ئیکۆنە پیرۆزەکاندا، دەسووتا. چەقۆ و کێردەکانی ناو مووبەقەکە، بە قەد دیوارەکانەوە، وەکو شووشە سەهۆڵی نێو ئەشکەوتان دەبریسکانەوە. قاپ وئامانە مسینەکان بەسەر ڕەفەکان ولە نێو تاقچەکاندا، لە ڕۆخسارێن کوێری دزێو دەچوون.

پیرەژن، هەمیشە بە پارێزەوە، لە تەختەخەوەکەی دەهاتە خوارەوە، لەتۆ وایە لە کەناری ڕووبارێکەوە بۆ ناو ئاوەکە دیتەخوارەوە. ئەوجا بە ئەسپایی، بە پێ خاوسی دەچوو بۆ سووچێکی ژوورەکە، کە شەربەیەکی ئاوی خواردنەوەی لێبوو، لە سەرووی تەنەکەی خۆڵەکە هەڵواسرابوو، کە دیقەتت دەدا ڕێک لە سەرێکی بڕدراوی هەڵواسراو دەچوو. بەرمیلێک ئاوی پاکیش لەوێ هەبوو.

دوای ئەوەی چەند قومێک ئاوی دەخواردەوە، ئەوجا چاوی دەنـــا بە شووشــــەی پەنـــجەرەکەوە، کە لە دیـــوی دەرەوەڕا سـەهۆڵ گرتبـووی و، دەیویســـت دەرەوە بـــدینێ، ئەوســـا بەدەنگێکی نەوی دەستی بە لاڤە و پاڕانەوە دەکرد:

- ئەی پەروەردگاری توانا بە ڕەحمەتی خۆت ڕەحمم لێبکە، بەزەییت بەم کارەکەرە پیرەی خۆتا بێتەوە!

هەندێجار مۆمەکەی دەکوژاندەوە، دەکەوتە سەر چۆکان و بەتووندی دەیگوت:

- ئەی خوای گەورە، کەس خۆشی ناوێم، کەس منی ناوێ، کەس پێویستی بە من نییە.

دووبارە، دێتەوە بۆ سەر جێگاکەی کە لە سەر موغەیریەکە ڕاخرابـــوو، لە هەنـــبەر دەرگـــای سۆپاکەدانیشـــانەی خـــاچ دەکێشێت.. ئەوسا دەستێک بە دەرگای سۆپاکەدا دێنێ تا بزانێ داخراوە یان نا، دەستی لە تەنی و هیسدا ڕەش دەبێت، ئیدی دەکەوێــتە جنێـودان. دوای تۆزێــک وەکــو ئەوەی خەوەکە لە مشتیا بێ، دەخەوێتەوە.

وەختایەک من پەست و بێزار دەکات، لەدڵی خۆدا دەڵێم: " حەیفێ کە ژنی بابام نەبوو، ئەگینا تێی دەگەیاند بەری دنیا بەکوێوەیە.. "

بە ڕاستی ژنێکی دەم بە گلەیی بوو، زۆر لەم ڕەشبینییەی بێزار وبێتاقەت بووم.. بەڵام هەندێجاریش ڕوخسارە قەڵەو و لۆکە ئاساکەی تێکدەنا و خەم دایدەگرت. چاوانی تەژی ڕوندک دەبوون، بە دەنگێک کە بەگوێی منیدا دەدا دەیگوت:

- ڕەنگە وابزانی من زۆر ئاسوودە و بێخەم و خەیاڵم! نا، وا خەیـاڵ نەکەی ئەلکسـی! مـن ئەم منـاڵانەم هێنـانە دنیـاوە، بەخێوم کردن، شەونخونیم بەدیاریانەوە کرد، گەورەم کردن،

فێری کارم کردن، له پای چی؟ تا له ماڵی ئەواندا ئاشپەزی بکەم؟! پێت وایە لەم ژیانە، لەم کارە ڕازیم؟ ڤایسا، ژنێکی بێگانەی هێناوە، بە هەموومانی ناگۆڕێتەوە، من ناڵێم تۆ بڵێ: ئەمە باشە؟ ڕەوای هەقە!

ڕاستگۆیانە بەرسڤم دایەوە:- نە ئەشەدو کارێکی باش نییە، ڕەوای هەق نییە.

- دەبینی؟

ئیدی دەمی لێ بەڕەڵلا کرد، ئەوەی دەشێ و ناشێ بە بووکەکەی وت:

- من لە گەڵیا چوومە گەرماو. ئازای لەشیم بینی. نازانم ئەم هەتیوەی من خۆشی بە کوێیا چووە؟ ئاخر بەمەش دەگوترێ جوان؟ هێی دنیا..

بێ پەردە باسی پەیوەندییە تایبەتییەکانی ژن و مێردی دەکرد. هەوەڵجار زۆر لە قسە بێتام و بازاڕیەکانی پەست بووم، بەڵام پاشان کە بە وردی گوێم بۆ ڕادێرا، هەستم کرد، لە پشت پەردەی قسە بێ تامەکانیەوە، هەندێک ڕاستی هەن.

لەپێکی بەسەر مێزەکەدا کێشا و بە کەسەرەوە گوتی:

- ژن، خوا ناناسن. هەر ژن نەبوو کە تەنانەت خوداشی خاپاند. هەر حەوای دایکی بەشەران نەبوو کە هەموو خەڵکی کێشایە دۆزەخ! ئەمە قەت لەبیر مەکە، وەکو گوارە لە گوێی بکە.

قسەکردنی سەبارەت بە ژن و هێز وتوانای ژن، لەبن نەدەهات. هێزی ژن، داستانی بەردەوامی سەر زاری بوو. پیاو وای وێنا دەکرد کە گەرەکیەتی بەو قسانە کەسێک بترسێنێت.. ئەوەی لە قسەکانیا بۆ من زۆر مایەی سەرنج بوو، ئەم قسەیە بوو کە: حەوا خودای فریو داوە.

(٦)

ئەپارتمانێکی گەورەی دوو نهۆمی دیکەش دەیڕوانیە سەر حەوشەکەی مە، ڕێک وەکو خانووەکەی مە بوو، ئەپارتمانەکە هەشت جەناحی هەبوو، کە چواریان لە لایەن ئەفسەرانەوە گیرابوون، ڕەبەن و کەشیشی لەشکرەکە لە جەناحێکی دی دەژیا. مەیدانەکە لە خوڵام و ئاشپەز و قاپشۆر و کارەکەراندا جمەی دەهات. مووبەقەکان هەمیشە شانۆی کارەسات و ڕووداوێن دڵتەزێن و قەرقەشە و دەمەقاڵە و شەڕە جنێوان بوو. سەربازەکان هەمیشە لە شەڕ و دەعوادا بوون، شەڕ لە بەینی خۆیاندا، لەگەل کرێکارانی سەنگەر لێداندا، لەگەڵ کرێکارانی خانووەکەدا، یان لەگەڵ ماشقەکانیاندا. ئەم مەیدان و حەوشەیە بەردەوام بۆنی گەندەڵی وداوێن تەڕی لێدەهات. ئەم پیاوە ساغ و سەلامەتانە لە سێکس تێر نەدەبوون. جۆرە سادیزمێک، ئارەزوویەکی بێ مانای خۆنوێنی و هەرا و هەنگامە دەی جووڵاندن. لە کاتی نان خواردن یان چا خواردنەوە، یان شێودا گوێم لە وەستا و وەستاژن دەگرت کە بە لەزەتەوە، بە بێ پەردە، بە دووروودرێژی باسی ژیانی شەهوەتڕانی و حەیوانیەتی ئەوانیان دەکرد. پیرەژنیس ئاگای لە ورد و درشتی بویەروڕووداوەکانی دەرودراوسێکانی ناوحەوشەکە هەبوو، بەجۆش و خرۆشێکی تەوسامێزەوە دەیگێڕانەوە. کەیبانووی بچووکی ماڵ، بەبێدەنگی گوێی لەو قسە بێتامانە دەگرت و، بزەیەک بە سەر لێوە ئەستوورەکانیەوە دەکەوتە باڵەفرکێ. ڤیکتور بە قاقا پیدەکەنی. بەڵام برا گەورەکەی، نێوچاوانی تێکدەنا و بە بێزارییەوە دەیگوت:- دایکە بەسە، واز لەو قسانە بێنە.

دایکی بە ڕاوێژێکی گلەیی ئامێزەوە دەیگوت:
- هەی داد وهەی بیـــداد، مەگەر چیتـــر دەم هەڵـــنەیەنم. نۆبەتی ئەو قەوانەیە!
بەڵام ڤیکتور، بە پێچەوانەوە، هـانی دەدا:- دەی دایکە گوێ مەدەیە، بە ئـارەزووی خـۆت قسـە بـکە، خـۆ هەر خۆمـانین، کەسی بێگانەمان تیا نییە!
من هەرچی سەرم دێنا و سەرم دەبرد، نەمدەزانی بۆچی لە حاڵی نەبوونی بێگانەدا، هەموو قسەیەکی بێهودە وبازاڕی ڕەوا بوو. بە هەرحـاڵ وەسـتام کە نۆبەرەی دایکی بوو، هەرچەندە بەزەیـی بە دایکیـا دەهـاتەوە، بەڵام خۆیشـی لێدەبوارد، حەزی نەدەکرد بە تەنیا بیدینێت، خۆ ئەگەر بەڕێکەوت بکەوتبانە یەک، ئەوا دایـکە یەکسـەر دەکەوتە سـکاڵا و گلەیـی لە بـووکەکەی، پاشـان داوای خەرجـی گیرفـانی لە کوڕەکەی دەکـرد. کـوڕەش خێرا دوو یـان سـێ ڕۆبـڵ و هەنـدێک دراوی وردەی دەخسـتە دەستی پیرەژنەوە.
- دایـکە هەق نیـیە ئەم پـارەیە لە مـن بسـەنیت، خـۆ لەبەر پارەکەم نییە، لەبەر ئەو کارەمە کە بەو پارەیە دەیکەیت.
پیـرەژن، بە دەم گـازنەوە، دەیگـوت:- دەیـدەم بە هەژاران، چەند مۆمێکی پێدەکڕم و دەیبەم لە کڵێسا دایدەگیرسێنم..
- هەژارانـی چـی! ئەوەی ڕاسـتی بـێ، تـۆ خەریـکە خـووی ڤیکتور شـەڕ دەکەی، تەمەڵـی دەکەی، نـایەڵی بە ڕەنجـی شـانی خۆی بژی.
- ڤاسیا، تۆ براکەتت خۆشناوێ، ئەمە عەیبەیەکی گەورەیە!
ئیدی کوڕە شانی هەڵدەتەکاند و دەڕۆیی. بەڵام ڤیکتور هیچ منەتێکـی لە دایکـی نەدەزانـی و بگـرە گـاڵتەی پێـدەهات، هـیچ زۆرخۆرێـک بە تـۆزی پایـدا نەدەگەیـی، هەمیشـە برسـی بـوو.. پیـــرەژن ڕۆژانـــی یەکشـــەممە کـــولیچە و چـــۆرەکێکی زۆری

دروست دەکرد و بەشێکی زۆری بۆ ڤیکتور دەشاردەوە، دەیخستە گۆزەیەکەوەو لە ژێر ئەو تەختەی دەنا کە من لەسەری دەنووستم. ڤیکتور هەرکە لە نوێژ دەهاتەوە، بە مل ومۆش لە گۆزەکە دەگەرا و کە دەیدۆزییەوە، بەدەم خوتە و بۆڵەوە دەیگوت:- ئەریَ نەتدەتوانی تۆزێ زیاترم بۆ بدەیە لاوە، هەی پیرەژنی ڕەزیلی سەرسواڵکەر؟

- تا کەس نەیبینیوی جارێ ئەمە بخۆ.

- ئەگەر هەرکەسێک بمبینێ، پێی دەڵێم تۆ لە کولیچە و چۆرەکەکە بۆمن دەدزیت، پیرەژنی سەر ئاسنین.

جارێک دوو چۆرەکەم لە گۆزەکە دەرێنا و خواردم. ڤیکتور بینی و لە سەر ئەوە لێدانێکی باشی لێدام. من و ڤیکتور حەزمان لە چارەی یەکدی نەدەکرد. زۆری ئەزیەت دەدام، ناچاری دەکردم ڕۆژێ سێ چەل قۆندەرەکانی بۆ بویاغ بکەم، کە لە سەر تەختە خەوەکەی ڕادەکشا بە ئانقەست تەختەکانی لێکدی دەترازاند، تا لە درزی تەختەکانەوە، تف بکات بە سەرما.

وادیاربوو غیرەی لە براکەی دەکرد، ئەو برایەی بە هەموو خەڵکی دەگوت " فەرخەێن چەقە چناوە " ئیدی کۆمەڵێک وشە و زاراوەی داهێنابوو و زۆر حەزی دەکرد بیانڵێتەوە. بەڵام ئەو زاراوەو وشانە زۆر گەوجانە وسەخیف بوون.

- دایکە، کوا گۆرەوییە کورتەکانم؟

بە پرسیارە، بێ ماناکانی بێزاری دەکردم، بۆ نموونە دەیپرسی:

- ئەلکسی دەزانی بۆچی دەنووسن " مائە " و بە " مئە " دەیخوێننەوە؟ ئەدی بۆ لە جیاتی " عامود " دەڵێن " عمود " بۆچی دەڵێن " نددبە " لە جیاتی " زمە "؟

زۆر لە جۆری قسەکردنیان بێزار بووم. من کە بە زمانی نەنکم و بابام، بە زمانە جوان و ناسکەکەی ئەوان گۆشکرابووم و ڕاهاتبووم، لە هەوەڵەوە سەرم لەو ڕستە و وشە ناکۆک و نەکوڵۆکانە دەرنەدەکرد کە ئەمان بەکاریان دەبرد: " مایەی گاڵتەجاڕیەکی ترسناکە " ، خۆشیەکی ترسناک "، "لە برسا مردووە ". من وام هەست دەکرد کە " گەپجاڕی " ترسناک نابێت، خۆشی ترسناک نابێت. هەستم دەکرد هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ئیشتیا و مردندا هەبێ.

جارێک لێم پرسین:- ئەرێ ئەم ڕستانەی ئێوە دروستن؟

بە تووڕەیی وەڵامیان دایەوە:- تەمەشای ئەمە ناکەی، خۆی لێمان کردووە بە مامۆستا، وادیارە پێویستی بە گوێ هەڵولێنە!

هەستم کرد دەستە واژەی " گوێ هەڵۆلین " دروست نییە. بۆ نموونە ڕووەک، گوڵ، بەر و میوە دێنە هەڵۆلین، بەڵام بۆ گوێ بەکارنایەت، چونکە گوێ نایەتە هەڵۆلین.

گوێیان ڕاکێشام، دەیانویست بۆمی بسەلمێنن کە گوێ دێتە هەڵۆلین. بەڵام من هەر نەهاتمە ڕەدایە. بە ڕاوێژی کەسێکی سەرکەوتووەوە گوتم:- خۆ بینیتان گوێم نەهاتە هەڵولین!..

بە شێوەیەکی گشتی ڕەوشم زۆر خراپ بوو. زۆر لەو کاتانە خراپتر بوو کە لە شەقام و کۆڵانەکانی کونافینو دەژیام، ئەو کوچە و کۆڵانانەی کە بە ڕواڵەت پاک و خاوێن، بەڵام پڕ بوو لە ئافرەتی بەڕەڵلا ولەشفرۆشخانە، هەزار خۆزگە بە کوچە و کۆڵانەکانی کونافینو، بەلای کەمەوە پیاو دەیزانی کە هۆی بەدبەختی و نەگبەتیەکان، بێکاری، بێ نانی و سەگمەرگییە.. بەڵام لێرە خەڵکی ڕەوشیان باشە، کار هەیە، نان بە ئاسانی دەست دەکەوێ بەڵام بێهوودەیی و بێ

سەروبەرییەکی لە وەسف نەهاتگ باڵی بەسەر ژیاندا کێشاوەو شەڕو دەعواو بێزاری جێگای هەموو شتێکی گرتووەتەوە.

مـــن لە ڕادەبەدەر بێزاربـــووم. بەڵام کە نەنکـــم دەهـــاتە دیـدەنیم، هێنـدەی دی بێـزار وبێتـاقەت دەبـووم. هەمیشـە لە دەرگاکەی پشتەوە خۆی بە مووبەقەکەدا دەکرد، دوای ئەوەی لەبەردەم ئیکۆنەکاندا نیشانەی خاچی دەکێشا، ئەوجا تا ناوقەد دادەنەویـیەوەو کڕنۆشـی بـۆ خوشـکە چکۆلەکەی دەبـرد، مـن زۆر لەو چەمیـنەوەیە پەسـت دەبـووم. خەریـک بـوو لە داخـا دەمردم وام دەزانی قورساییەکی گەورەم بەسـەردا دەکەوێ و پـان و پلیشـم دەکـاتەوە. خوشـکە چکـۆلەکەی بە سـاردییەوە دەیگوت:- ئاە، ئەمە تۆی ئاکولینا؟

نەنکـم، ژنەکەی جـاران نەبـوو، مـات و بێـدەنگ، بەڕواڵەت شـەرمن و خـاکی، لە سـەر تەختێکی نزیکـی دەرگـاکە و لەلای بەرمـیلە ئـاوە پیسـەکەوە بەبێـدەنگی دادەنیشـت وەکـو ئەوەی تـاوانێکی کردبێـت، بە تـۆنێکی نەوی وەڵامـی پرسـیارەکانی خوشکەکەی دەدایەوە.

ئەوحاڵەم لەبەر گران بوو، بە توورەییەوە گوتم:- بۆ لەوێ دانیشتوویت؟

بە میهرەبـانیەوە، چـاوێکی لێداگرتم وگـوتی:- دەمـی خـۆت بگرە! خۆ تۆ خاوەن ماڵ نیت.

خانمی گەورە بە گلەییەوە گوتی:

- ئەمە هەمیشـــە هەروایە. خـــۆی لە هەمـــوو کاروبارێـــک هەڵدەقورتێنی، چەندیش گوێی ڕابکێشیت فایدەی نییە.

ئەوجـا، بە تەوسـەوە لە خوشـکەکەی دەپرسـی:- ئاکولینـا، ئێستا چی دەکەی، هەر سواڵ دەکەی؟

- دەتەوێ چ بکەم؟ ئیدی نەگبەتیە.

- نا، تۆ خۆت حەزی لێدەکەی..
- دەڵێن ' مەسیح ' ش بەخێر وسەدەقەی خەڵکی دەژیا.
- ئەمە قسەی خەڵکانی گەوج و خوانەناسە، تۆ هەرما گوێ لەو قسانە بگری پیرەژنی خەڵەفاو! مەسیح هەرگیز سواڵکەر نەبووە. کوڕی خوا بووە. مەسیح بە هەموو شەوکەت و شانازییەکەوە دەگەڕێتەوە تا لێپێچینەوە لە گەڵ زندووان و مردوواندا – تەنانەت مردوانش بکات! ئیدی کەسی لێ ون نابێت، تەنانەت ئەگەر خۆشمان بسووتێنین و ببین بە خۆڵەمێشیش. لێپێچینەوە لە تۆ و ڤاسیلی دەکات، لە سەر غروورو لەخۆبایی بوونتان لێپێچینەوەتان لەگەڵ دەکات، لەسەر ئەوەی کە من هانام بۆ هێنان و داوای کۆمەکم لێکردن و ئێوەی خزمانی دەوڵەمەندم دەرتان کردم!
نەنکم بە کاوەخۆ وەڵامی دایەوە:
- من هەمیشە بەگوێرەی توانای خۆم درێغیم لە تۆ نەکردووە، بەڵام خوا لە بری پاداشت سزای داین، بەخۆت دەزانی..
- ئەوەندە بەس نییە، هێشتا لە کوێتانە!
خوشکەکەی نەنکم لە پەستا و بێ پسانەوە و بەدەم تەشەرەوە نەنکمی ئازار دەدا، من کە گوێم لە هەڵەوەڕییەکانی دەگرت لە دڵی خۆدا دەمپرسی ئەوە نەنکم چۆن تەحەمولی ئەو قسە ناخۆشانە دەکات، لەم جۆرە هەڵوێستانەدا خۆشم نەدەویست. لەم کاتەدا خانمی بچکۆلە خۆی بە مووبەقەکەدا کرد، بەگەرمی خێرهاتنی نەنکمی کرد وگوتی:- وەرن بۆ ژووری نانخواردن، فەرموون ئەوێ باشترە!
خانمی گەورە، لە کاتێکا نەنکم خەریک بوو بچێتە ژوورەوە، قیژاندی:- لاقت بسڕە هەی خەڵەفاو!
وەستام بە ڕووخۆشی پێشوازی کرد:

- ئاه، ئاكولینای بەردەبار! چۆنی، چۆنە وا ڕێت هەڵە کرد؟ ئەدی پیرەمێرد، کاشرین چۆنە، هەرماوە؟

نەنکم بزەیەکی پڕ میهری بەڕوویدا دا:

- ئەدی تۆ چۆنی؟ هێشتا هەر خەریکی کار وکاسبیت؟

- هەمیشـــە هەر خەریکـــی کـــارم، ئیـــدی مەحکـــوومم بەکارکردن.

نەنکـــم بە میهرەبـــانی قســـەی لەگەڵ ئەودا دەکـــرد. ئەو هەندێجار ناوی دایکمی دێنا:

- ئێی دنیا – ڤارڤارا ڤاسیلییڤنا، چەند ژنێکی باش بوو!

هەنگێ ژنەکەی، ئاوڕی لای نەنکمی دایەوە گوتی:

- لە بیرتە، پاڵتۆ ڕەشە ئاوریشمە گوڵ سپیەکەم داێێ؟

- ئەی مەعنای چی، باشم لە بیرە.

- پاڵتۆیەکی باش بوو، تەقریبەن تازەی تازە بوو.

وەستام لەبن لێوانەوە گوتی:- هم. پاڵتۆ. هێی. دنیا فشـەیە، ژیان هیچ نییە.

ژنەکەی بە گومانەوە پرسی:- ئەوە چیە، چیتە؟

- هیچ، ڕۆژانی شادی زوو دەبڕێتەوە، خەڵکی باشیش زۆر ناژین..

ژنەکەی بە نیگەرانیـــیەوە گـــوتی:- ئەرێ ئەو قســـانە بـــۆ دەکەی؟

ئەنجام نەنکمیان برد بۆ تەمەشای منداڵە نۆزاوەکەیـان، مـن قۆڕی و کتری و پیاڵەکانی سەر مێزەکەم کۆکردەوە تا بیـانبەم بـۆ شـۆردن. وەســتام، کەمێـک لە فکـران ڕاچـوو، ئەوجـا بە ڕاوێژێکی، خەواڵووەوە گوتی:- نەنکت چەنـد پیرەژنێکی باشـە، گەشبین و دڵ زندووە.

من بەو قسانە زۆر خۆشحاڵ دەبووم. کە لەگەڵ نەنکمدا تاک دەکەوتمەوە، بە دڵێکی بریندارەوە پێم دەگوت:- باشە تۆ بۆ دێی بۆ ئێرە؟ نابینی ئەمانە چتۆ بەشەڕێکن؟

- ئەلکسی گیان، با دەبینم، من هەموو شتێک دەبینم.

بەدەم ئەو وەڵامەوە، نیگایەکی میهرەبانی کردم، بزەیەکی ناسک نیشتە سەر ڕوخسارە جوانەکەی، لە دڵی خۆدا تەریق بوومەوە، دڵنیابووم پەی بە هەموو شتێک بردووە، تەنانەت ناخی ئەوساتەی منیشی دەخوێندەوە. دەیزانی لەو ساتەدا چیم لە دڵدایە. ئەوسا ئاوڕێکی دەوروبەری دایەوە، تا بزانێ کەس لەو نزیکانە هەیە یان نا. دەستی لە ملم وەریناو ماچێکی کردم و بەڕاوێژێکی ناسک گوتی:

- هەڵبەتە ئەگەر تۆ لێرە نەبای هەرگیز نەدەهاتم- چ کارم بەمانەیە؟ بابات نەخۆشە، من خەریکی پەرستاری ئەوم و هیچ کارێک ناکەم، بۆیە بێ پارە و پولم.. میخائیلۆی کوڕم ساشای کوڕی دەرکردووە، دەبێ نان و ئاوی ئەویش بدەم، دەبێ ئەویش بەخێو بکەم. ئەمانە، لێرە قەولیان داوە ساڵانە شەش ڕۆبڵ بە تۆ بدەن ئیدی واهاتووم ئیدی نازانم ئەمانە ئاخۆ یەک ڕۆبڵم لەو شەش ڕۆبڵە دەدەنێ؟! نزیکەی نیوساڵە تۆ لێرە کاردەکەیت، وانییە؟!

ئەوسا زیاتر بە سەرما دانەوییەوەو دەمی لە پەنا گوێم نا ولەبن لێوانەوە گوتی:- داوایان لێکردووم سەرزەنشتت بکەم، گوێت بابدەم، دەڵێن تۆ زۆر لاسار و نەژنەوی، بەگوێی کەس ناکەیت. کەمێک لە سەرخۆبە گیانەکەم، هەر ساڵێ دووانی ترت زەحمەتە، ئیدی گەورە دەبیت و منەتت بەکەس نامێنێ و دەکەویتە سەر پێی خۆت، کەمێک ئارامت بێ..

من بەڵێنم بە نەنکم دا، بەلام جێبەجێ کردنی بەڵێنەکە بۆمن بڕێک ئەستەم بوو. لەم ژیانە دژوارە، کە دەبوایە لە بەیانییەوە تا ئێوارێ، وەکو سەگی پێ سووتاو لە ڕاکەڕاکەدا بم، لەپێناوی پاروە نانێکی بە منەتدا. بەڕاستی حاڵم حاڵ نەبوو، دەتگوت هەموو دنیام بەسەردا ڕوخاوە.

هەندێجار لێدەبڕام هەڵێم. بەلام چلەی زستان بوو، بەفر وزریان دەرفەتی هیچی نەدەدا، با وباهۆز بەلووره لوور خۆی بە نهۆمی سەرێ ڕا دەکرد، دەستەک وئالوداری میچەکە، لەژێر باری قورسی بەفرا، قرچەقرچیان لێهەڵدەستا، ئیدی لە کوێ دەمتوانی هەڵێم، ڕووم بکردایە کودەرێ؟

ڕێگەی چوونە دەرەوەیان نەدەدام بۆ خۆ تاوێک یاری بکەم، ئەوەی ڕاستی بێ دەرفەتی چوونە دەرەوەم نەبوو، لە بەر پرکاری نەم دەپەژرا. ڕۆژانی کورتی زستان، لە نێوان کارێن پڕ زەحمەتی ماڵەوەو دووکاندا بە خێرایی دەبوورین. ناچاریان دەکردم، ڕۆژانی شەممە بۆ نوێژی ئێوارێ و ڕۆژانی یەک شەممە بۆ نوێژی بەیانی بچمە کلێسا. حەزم دەکرد بچمە کلێسا، لە گۆشەیەکی تاریکدا دەوەستام و لە دوورەوە دەمڕوانیە وێنەکانی مەسیحی لە خاچدراو و ئێکۆنە پیرۆزەکان. وام دەهاتە بەرچاو کە پەیکەرەکەی مەسیح لەژێر گڕی زێڕینی مۆمە داگیرساوەکەدا دەتوێتەوە و دەبێت بە ئاو و وەکو دڵۆپی ڕوندکان بە زەمینەی میحرابەکەدا دەڕژا. ڕوخساری ئیکۆنە ڕەشەکان بە ئاستەم دەلەرزین و پەردەی نوێژخانەکان دەلەرینەوە. گڕی مۆمەکان، وەکو هەنگی زێڕین، بە ئاسمانی شینباودا دەهاتن ودەچوون. سەری ژنان وکچۆلان، لە گولان دەچوون.

دەوروبەرم، هەرهەمووی، لە هاوئاهەنگی وڕیتمی ئاوازی سروود خوێنەکاندا دەتوایەوە، هەموو شتێک ژیانێکی

ئەفسانەیی وەردەگرت، ژیانی ناسکی ئەو پەری وفریشتانەی بیر دەخستمەوە کە لە حیکایەت و ئەفسانانددا دەمبیست.
کڵێساکە، لە تاریکیەکەدا وەکو جۆلانە، بە ئەسپایی دەهەژی.
هەندێجار وام دەهاتە بەرچاو، کە کڵێساکە لە دەریاچەیەک ڕۆدەچی، تا لە دیدەی جیهانیان ون ببێت و ژیانێکی تایبەت بەخۆی هەڵبژێرێت، کە لە هەر ژیانێکی دی جیاواز بێت. گومانی تیا نەبوو کە ئەم وێنا و تەسەورەی من زادەی حیکایەتێک بوو کە نەنکم دەربارەی شاری " کیتیز " ی ئەفسانەیی و خەیاڵی بۆی گێڕابوومەوە. زۆرجار لە گەرمەی سروود ونوێژ ونزا و دوعاکاندا خەیاڵم دەڕۆیی ودەبیرێکی قووڵ و دوور ودرێژەوە دەچووم وئەم حیکایەتە خۆش و خەمناکەم بۆخۆم دەگێڕایەوە.

**ئیدی تاتارانی گاور،**
**بەسواری ئەسپەوە، هەموو لە چەکا نقووم**
**هاتن، بە لێشاو هاتن**
**شارە جوانەکەی " کیتیز " یان**
**ئابلۆقە دا.**
**لە کازیوەی بەیاندا**
**دەوری شاریان دا.**
**ئاە، ئەی خاوەنی گەردوون**
**ئاە، ئەی دایکی پاکیزەی خوا**
**وەرن، وەرن**
**فریای بەندەکانی**
**خودا بکەون**
**تکایە با بەم سەبای ساڵحانە**
**نوێژەکانمان بکەین**
**گوێمان بە وشەکانی تۆ**

زاخاو بدەین..
مەیەڵن، تاتارانی ناپاک
پەرستگەکەتان پیس بکەن
شەرەف و ناموسی ژنان
وکیژان بەرن
مندالانی بێتاوان بکوژن
پیرەمێرانی داماو وبەلەنگاز
بکوژن.
خوای مەزن دەژنەوێ
پاکیزەی پیرۆز دەبینێ
ئەم ئاهونالەیەی مەسیحیان
هەنگێ خوای مەزن، یەهوە
ئەمر دەفەرمووێ
بە فریشتەی ڕوناکی، بە میکائیلی میهرەبان
دەلێت: ئەی میکائیل، سەرۆکی فریشتان
دابەزە، بڕۆ بۆ سەرزەوی
زەوی ژێر شاری کیتیز بهەژێنە
چواردەوری شار بکە بە دەریاچە
هەنگێ خەلکی شار
دەتوانن بە کەماڵی ئیسراحەت
نوێژی خۆ بکەن
بێخەم، بێترس نوێژ بکەن
لە بەیانیەوە تا ئێواری
نوێژی خۆ بکەن..
پشتاوپشت، نەوە بە نەوە
هەتاهەتایە، جەژنی
خۆ بگێڕن

ئەوکاتانە، ڕوحم لە بەیتەکانی نەنکم سەرشار بوو، ڕێک وەکو پوورەی هەنگی پڕ لە هەنگوین، هیچ نابێ بە زیدەڕۆیی ئەگەر بڵێم بە زمانی شیعر بیرم دەکردەوەو بیرەکانم خۆ بەخۆ قاڵبی بەیتەکانی ئەویان وەردەگرت.

من لە کلێسادا قەت نوێژم نەدەخوێند - نەمدەتوانی لەهەنبەر خواکەی نەنکمدا، نوێژ و نزا کینە ئامێز و سروودە خەمناکەکانی بابام دووبارە بکەمەوە. دلنیابووم کە خواش وەکو من حەزی لەو شتانە نییە.. ئەمە جگە لەوەی هەموو ئەو شتانە لە کتێباندا تۆمار کرابوون و مانای وابوو خوا وەکو هەر پیاوێکی خوێنەوار، هەرهەمووی ئەزبەر بوو. بۆیە، لە کلێسادا، لەکاتی نوێژا کە دڵم دەگوشرا یان ئازارێکی بچووک ڕوحی دادەگرتم، هەوڵمدەدا خۆم نوێژ و نزایەکی تایبەت بەخۆم دا بهێنم. کە بیرم لە چارەنووس و کلۆڵی خۆم دەکردەوە، ئیدی ئیلهامم بۆ دەهات، وشە وپەیڤان خۆبەخۆ، بێهیچ خۆ ماندوو کردنێک، لە شێوەی شیعرا بەسەرمدا دادەبارین:

**ئوف خودایە چەند بەدبەخت و چارەڕەشم**
**خودایا لێت دەپاڕێمەوە کە زوو گەورەبم**
**خودایە، لێم مەگرە ئەگەر خۆم بکوژم**
**چونکە بێتاقەت بووم و لەم ژیانە بێزارم**
**لێرە، هیچ شتێکم فێر ناکەن**
**خوشکەکەی نەنکم، ئەم جادووبازە دەعەجانیە**
**بەردەوام سەرزەنشتم دەکات، گوێم بادەدات**
**ئاغام پیرەپیاوێکی خەڵەفاوە**
**بەردەوام وەکو ڕێوی هاوارم لێدەکات**
**خودایە، ژیان چەند تاڵە.**

من تاکو ئێستاش، ژمارەیەکی زۆری ئەم نوێژ و نزایانەم لە بیرماون، بیری منداڵی تیژە، ئەوشتانەی بەمنداڵی لە یادگەدا تۆمار دەبن، ڕۆژگار نایان سڕێتەوە و تا مردن لەبیر دەمێنن.

حەزم بە هاتوچۆی کڵێسا هەبوو، هەمان ئەو ئاسوودەییەی کە جاران، لەدەشت ودەر، مەزرا و لێرەوارەکاندا دەمبینی، هەنووکە لە کلێسادا دەمبینی. دڵی منداڵانەم لەگەڵ زام و دژوارییەکانی ژیانا ڕاهاتبوو، لێرە لە کڵێسادا خەون وخەیاڵ، بیرو ئەندێشەیەکی گونگ ونامەفهووم دەیشۆردەوە، سوکنایی پێدەبەخشی. تەنیا بە ڕۆژانی تۆف وسەرما، یان ئەو کاتانەی بەفر وزریان دەیدا بە سەر شارا، یان هەورێن بەفرزا بەری ئاسمانی دەگرت، یان زەوی دەیبەست و لەژێر بەفرا بەجۆرێ مت دەبوو، لەتۆ وایە قەت هەڵناسێتەوە.. تەنیا ئەوکاتانە بۆ کڵێسا دەچووم..

بەڵام کە هەوا خۆش و ئارام بوایە حەزم دەکرد بە ناو شار بکەوم، ئەم کۆڵان و ئەو کۆڵان بکەم، گۆشە وکەناری دوورە دەست تەی بکەم. هەندێجار وام هەست دەکرد، دوو باڵم لێ ڕواون و لەگەڵ خۆدا دەمبەن، وەکو هەیڤی ئاسمان، بەتاقی تەنیا ماومەتەوە. سێبەرەکەم لە پێشمەوە دەڕۆیی، دەکەوتە سەر بەفر وعامود و ئەسکەلەکان. حەسحەسی شەو هێدی هێدی بەسەر شەقامەکاندا ڕێی دەکرد، خۆی لە پاڵتۆیەکی فەرووی ئەستوورەوە پێچابوو، دووپارچە داری بەدەستەوە گرتبوو و لێکدا لێکدا بەیەکیدا دەکێشان. سەگەکەی بە هەڵبەز و دابەز شانبەشانی دەڕۆیی.

دیمەنی کابرای حەسحەس لە کەسێک دەچوو، لە ماڵ دەرکرابێ و بێهودە بە جادە و بانەکاندا بسووڕێتەوەو سەگەکەی بە نیگەرانیەوە دوای کەوتبێت.

هەنـدێجار، تووشـی کـوڕان و کچـانی گەنـج دەبـووم، کە بەدەم پێکەنیـنەوە ڕێیـان دەکـرد، لە دڵـی خـۆدا دەمگـوت، ئەمانەش لە نوێژی ئێوارەی یەک شەممە خۆیان دزیوەتەوە و هەڵاتـــوون. لەبیـــرمە کە هەنـــدێجار لە درزی پەنـــجەرە نیوەکراوەکانەوە بۆنێکی خۆش و نەزانراوم بە سـەردا دەهـات. هەنگـــێ دەمزانـــی کە ژیـــانێکی دیـــکەی جیـــاواز لە ژیـــانی مەینەتبـاری مـن هەیە و کە ڕەنـگە هەرگیـز پەی پـێ نەبەم. لە ژێـر پەنجەرەکانـدا دەوەسـتام، بـۆنی هەواکەم دەکـرد، گـوێم هەڵدەخست، هەوڵمدەدا بزانم کێ لەوێ دەژی و چۆن دەژین. هەنـووکە ڕێـک کـاتی ئەوەبـوو کە هەمـوو خەڵکـی لە نـوێژی ئێوارە بن، کەچی ئەوانە لەودیو پەنجەرەکانەوە خەریکی کەیف و سـەفابوون، قاقـای پێکەنینیـان سـەعاتە ڕێـیەک دەڕۆیـی و خەریک وخجڵی گیتار ژەنین بوون.

خـانوویەکی یەک نهـۆمی کە کەوتبـووە سـەر دوو ڕێیـانی چۆڵی هەردوو شـەقامی مارتیوسـکا و شـەقامی تیخونوفسـکایا، لە هەمووشـتێک پتـر سـەرنجی ڕادەکێشـام. ئەم خـانووەم لە هەیڤە شـەوێکی ساردی سـەهۆڵبەندانا بەدی کرد. لە پەنـجەرە نیـوەکراوەکەوە سـووکە هەڵمێـک بەرز دەبـووەوە. بەڵام لە سـەرەوە دەنگێکـی نـامەفهووم و سـەیر دەهـات، دەتگـوت، کەسێک بەدەمی بەستراوەوە و لە بن لێوانەوە سۆزە دەکات. وشـەکان خۆیـا نەبـوون، بەڵام ئـاوازەکە زۆر سـادە و تەواو خۆیـا بـوو. جارجـار دەنگـی سـازێکی هەوایـی زۆر ناوەخـت و چاوەڕوان نەکری، یەکنەوایی ئاوازەکەی دەبڕی و نەیدەهێشت بە ئاسانی بگاتە گوێم. ئیدی لە سەر کۆتەرە دارێک دانیشـتم و بڕیـارم دا تـا کۆتـایی گـوێ لەو ئـاواز و گـۆرانیە بگـرم. بە مەزەنـدەی مـن موزیقـاکە هـی کەمانێـک بـوو کە جارجارێـک

هارمۆنیەکەی خۆی لە دەست دەدا. هەندێجار سازەکە ئەوەندە بەتووندی لێدەدرا لە تۆ وایە ماڵەکە لە هێم و بناخەوە دەلەرێتەوە. شووشەی پەنجەرەکان وەکو زەنگۆڵە دەزرینگانەوە. لە سەربانەوە، دڵۆپەێن بەفری تواوە بەسەرما دەڕژا. لە هەمان کاتدا ڕوندک لە چاوم دەهاتەخوارێ و گۆناکانمی تەڕ دەکرد. هەستم بە نزیک بوونەوەی حەسحەسەکە نەکرد، لە ناکاوا گەییە سەرم پاڵێکی بە شانمەوە نا، لە سەر کۆتەرە دارەکە کەوتم. پرسی:

- چی دەکەی لێرە، چما لێرە دانیشتوویت؟

بۆم ڕوون کردەوە:- گوێ لەو موزیقایە دەگرم..

- ئەوە قسەیە؟ خێرا هەستە و لێرە بڕۆ!

بە هەشتاو ڕۆیشتم، سەرێک بە دەوری گەڕەکەکەدا سوڕامەوە، دووبارە هاتمەوەو لە هەمان شوێن دانیشتمەوە. بەڵام موزیقاکە تەواو بووبوو. لە پەنجەرەکەوە، دەنگی هەرا و زەنایەکی شاد و مەستانە دەهات کە بە هیچ جۆرێ لە موزیقا خەمینەکە نەدەچوو، وام وێنا دەکرد کە خەون دەبینم.

زۆربەی ڕۆژانی شەمموان بۆلای ئەو ماڵە دەهاتم. بەڵام تەنیا یەک جار، ئەویش لە بەهارا بوو، گوێم لەو چەلۆیە بوو، کە تا نیوەشەو، لە پەستا و بێ پسانەوە دەی ناڵاند. ئیدی مەستی ئاواز بووبووم. لێ کە بۆماڵ گەڕامەوە، لێدانێکی باشم خوارد.

ئەم شەوگەڕە لە ژێر ستێرانی زستانی تاریک و نوتەکدا و بە شەقامە چۆڵەکاندا هەستێکی تازەی لە لا دروستکردم، بە ئانقەست شەقامە دوور و تەریکەکانم هەڵدەبژارد، چونکە شەقامە سەرەکیەکان ڕوناک بوون، لەگین بوو دۆستان و ئاشنایانی وەستام بمبینن و خەبەرم لێبدەن کە خۆ لە نوێژی ئێواران دەدزمەوەو ناچمە کڵێسا. ئەمە جگە لەوەی کە لە

شەقامە سەرەکییەکاندا سەرخۆشان و پۆلیس و ئافرەتانی لەشفرۆش، گەڕان و پیاسەکەیان دەشێواندم. بەڵام لە شەقام و گەڕەکە چۆڵ و تەریکەکاندا، دەکرا بەبێترس، لە پەنجەرانی قاتی خوارەوە، ئەگەر بەستەڵەک نەیگرتبان یان پەردەکانیان دانەدراباوە، تەمەشای ناو ژوورەکانت بکردبایە.

جۆرەها دیمەنم لەو پەنجەرانەوە دەبینی، خەڵکانێکم دەبینی نوێژیان دەکرد، یەکیان ماچ دەکرد، بەشەڕ دەهاتن، یان وەرەقبازیان دەکرد. یان بە ئارامی، بەبێ هیچ ژاوەژاو و هەرا و زەنایەک گفتوگۆیان دەکرد، کۆمەڵێک دیمەنی کڕوکپ، وەکو ژیانی ماسییان خامۆش، بەبەرچاوما تێدەپەڕی.

جارێک لە پەنجەرەی ژێرخانێکەوە دوو ژنم بینی کە یەکێکیان کچۆڵە بوو و ئەویتریان گەورە بوو، لە دەوری مێزێک دانیشتبوون. قوتابییەکی قژدرێژ لە هەنبەریاندا دانیشتبوو، بەدەم دەست تەکاندانەوە کتێبێکی بۆ دەخوێندنەوە. کچۆڵەکە پشتی دابوو بە پشتی کورسیەکەیەوە، برۆکانی وێکهێنابوونەوەو گوێی هەڵخستبوو. بەڵام ئافرەتەکەی دی کە لاوازێکی قژ درێژ بوو، لە ناکاوا بە هەر دوو دەستان ڕوخساری خۆی داپۆشی و بەدەم هەنسک هەڵدانەوە شانەکانی کەوتنە لەرزین. قوتابییەکە کتێبەکەی فڕێدایە سەر مێزەکە. هەرکە کچۆڵەکە هەستا و لە ژوورەکە وەدەرکەوت، قوتابییەکە لەبەردەم ژنە قژ درێژەکەدا بەچۆکا هات و کەوتە ماچ کردنی دەستەکانی.

لە پەنجەرەیەکی دیکەوە، پیاوێکی باڵابەرزی ڕیشنم بینی، ژنێکی ئێلەک سووری نابووە سەر ئەژنۆکانی و وەکو منداڵێک ڕایدەژەند و وەکو ئەوە بوو لای لایەی بۆبکات، دەمی دەکردەوە و چاوانی ئەبڵەق دەبوون. ژنەکە قاقا پێدەکەنی و

خۆی لە باوەشیا ڕادەکێشاو، لاقی لە حەوادا تەکان دەدا. کابرا دووبـارە دای نیشـاندەوە و لەسـەر گـۆرانی و لای لایەکەی خـۆی بەردەوام بـوو. ژنە دەسـتی بە پێکەنـین دەکـردەوە. لە تەمەشاکردنیان تێر نەدەبووم، ماوەیەکی زۆر تەمەشام کردن، کە هەستم کرد ئەم دیمەنە زۆر دەخـایەنێ، ئیدی لەوێ دوور کەوتمەوە.

زۆر دیمەنانی لەم جۆرە بۆ هەتاهەتـایە لە یادگەمدا نەخش بـوون. ئەو دیمەنـانەم زۆر بەلاوە جـوان بـوون. زۆرجـار درەنگـانی شـەو بـۆ مـاڵ دەگەڕامەوە، ئەمە دەبـووە مـایەی گومانی وەستاکانم و لێیان دەپرسیم:

- تـۆ چووبـوویتە کـیهە کڵێسـا؟ ئەو ڕەبەنەی پێشـنوێژی دەکرد کێ بوو؟

ئەمـانە هەمـوو قەشـە و ڕەبەنەکـانی شـاریان دەناسـی. ئاگایـان لەو خـوتبە و ئایەتـانە هەبـوو کە لە هەر کڵێسـایەکدا دەخوێنرانەوە، ئیدی زەحمەت بوو، فریو بدرێن، ئیدی گیـرۆدە دەبووم و درۆکانم ئاشکرا دەبوو.

جـووتە کەیبـانوو، خـودایە تـووڕەکەی بابامیـان دەپەرست، ئەو خـودایەی حەزی دەکـرد، خەڵکـی لێـی بترسـن. ئیـدی ئەم جـووتە هەمیشـە نـاوی خوایـان لە سـەر زار بـوو، تەنـانەت کە شـەڕ و دەعواشـیان دەبـوو، هەڕەشـەی خوایـان لە یەکـدی دەکرد:

- ڕاوەستە بزانە خواکەی من چیت بەسەر دێنێت؟

پیـرەژن لە یەکەمـین یەک شـەممەی ڕۆژووی گەورەدا، کێکێکی دروستکرد کە بەبنی تاوەکەوە دەنووسا.

بە تووڕەیی هاواریکرد، دەم وچاوی لەبەر گڕی ئاگرەکەدا سوور دەبووەوە:- سندانم لێدایت! شەیتان بە نەعلەت بێ!

له ناکاوا، بەدەم بۆنکردنی تاوەکەوە، ڕوخساری ڕەش داگەڕا، تاوەکەی فڕێ دایە سەر ئەرزەکە و قیژاندی:

- خوا مەرگ خوا! تاوەکە ڕۆنی تیابوو! من بیرم چوو لە ڕۆژی دووشەممەی سوجدەدا ئەو ڕۆنە بسووتێنم و تاوەکە خاوێن بکەمەوە، ئەی خودای!..

کەوتە سەرچۆکان، ئەوجا بەدەم لاڤە و پاڕانەوەوە کەوتە گریان:

- خوا گیان، لێم مەگرە، من هەڵەم، بە ڕەحمی خۆت بمبەخشە. خوا گیان، سزای پیرەژنێکی بێ ئەقڵی وەکو من مەدە..

کێکە سووتاوەکەیان دایە سەگەکە. تاوەکەی بەباشی خاوێن کردەوە، بەڵام کەیبانووی بچووک بەردەوام ئەو ڕووداوەی بە ڕووی پیرەژندا دەدایەوە، کە شەڕ و دەعوایان دەبوو، پێی دەگوت:

- تۆ هەر ئەوەنیت کە لە مانگی ڕۆژووی گەورەدا، لە تاوەیەکی پیسدا، کێکت سوور کردەوە!

ئەمانە خودایان دێنایە ناو هەموو شەڕ وقەرقەشەیەکی خانەوادەییەوە، دەیان هێنایە ناو هەموو گۆشەیەکی تاریکی ژیانی ناچیزی خۆیانەوە. وادیاربوو ئەمە مانا و بایەخێکی بەبوونی کلۆڵیان دەدا. ئیدی بەرەبەرە ئەم نەخۆشیە بۆ منیش سیرایەتی کرد و کەسایەتی خوام دێنایە ناو هەموو تووڕەهاتەکانەوە، ئیدی بەبێ ئەوەی بەخۆ بحەسم چاوم دەبڕییە هەموو گۆشە و کەنارێک، وام هەست دەکرد چاوێکی پەنهان چاودێریم دەکات. کەچی بەشەو، تەزووی ترسێکی سارد لە سەراپام دەنیشت. ئەم ترسە لە سووچی مووبەقەکەوە هەڵدەقولا، لەو شوێنەوە کە چرایەک لەبەردەم ئیکۆنە تاریکەکاندا دەسووتا.

پەنجەرەیەکی گەورە لە تەنیشت ڕەفەی ئیکۆنەکەوە هەبوو، شیشـێکی ئاسـن هەردوو تـاکی پەنـجەرەکەی لێکـدی جیـا دەکردەوە. لەودیو پەنـجەرەکەوە، بۆشـاییەکی شـینباوی بەرین هەبوو، لەوە دەچوو مـاڵەکە و مـووبەقەکە و هەمـوو شـتەکانی دی و تەنـــانەت منـــیش، بە پەراوێـــزی ئەو بۆشـــاییەوە هەڵواسـرابین و، بچـووکترین جـووڵە بمانخـاتە هەڵـدێرێکی شـینباوی سـاردەوە لەو دیـو ئەسـتێرەکانەوە، وەکـو بەردێـک تـووڕ بـدرێتە ئـاوێکەوە. ئیدی بـۆ مـاوەیەکی دوور ودرێـژ، لە سەر جێگاکەم ڕادەکشام، نەمدەوێرا لە پێستی خۆم بجووڵێم، چاوەڕوانی کۆتایی ترسناکی دنیام دەکرد.

نها لە بیرم نییە کە چۆن لەو ترسـە ڕزگاربووم، بەڵام بە ڕاستی زۆر زوو و بە تەواوەتی لێی دەرباز بووم. دیارە خودا میهرەبانەکەی نەنکم بە هانامەوە هـاتبوو. لەوە دەچـێ، مـن لەو کاتەدا پەیم بەم حەقیقەتە سادەیە بردبێ کە: من هیچ خەتایەکم نەکردووە، کە هیچ خەتایەکیشـم نەبێ، هیچ یاسـایەک نـاتوانێ سزام بدات، خۆ ناشکرێ بە گوناحی کەسانی دی سزا بدرێم.

زۆرجـار، بەتـایبەتی لە وەرزی بەهـارا، خـۆم لە نـوێژی عەسران دەدزییەوە. دەچوومە پیاسە و گەڕان، مەیلێکی سـەیر و لە مقـاوەمەت نەهاتـگ، هـانی دەدام کە لە کڵێسـا دوور بـکەومەوە. خـۆ ئەگەر جارجارێـک بـۆ کڕینـی مۆمێـک بـۆ پەرستگە، پێنج کوپیکێکیـان بدامایە، ئیدی لە کەیفان لە پێسـتی خۆم نەدەهێوریم، بەپارەکە ' قاپم ' م دەکڕی (قاپ: جگ، میچ، چوو) دەکڕی و بە درێژایی ماوەی نوێژەکە و زیـاتریش قاپـانم دەکرد، پاشان وەکو هەمیشە بە درەنگەوە بۆمـاڵ دەزڤڕیمەوە. ڕۆژێـک ئەو دە کـوپیکەم، کە بـۆ کڕینـی نـانی پیرۆز و نـوێژی سـەر مـردووان دابوویـانمێ، دۆڕانـد. ئەنجـام ناچـار بـووم

قوربانی کەسێکی دی لەو سەبەتە نانە بدزم کە کابرای قەشە لە میحرابەکەوە هێنابووی.

من شێت وشەیدای قومار بووم، زۆر بەجۆش و خرۆشەوە قومارم دەکرد. زۆر بەتوانا و لێهاتوو بووم، هەربۆیەش زۆر بلەز لە گەڕەکی خۆماندا، وەکو قارەمانی تۆپانێ، قاپانێ نێونێو بانگم دەکرد.

لە مانگی ڕۆژووی گەورەدا، واداریان کردم نان نەخۆم و ناچار بم بۆ خواردنی نانی قوربان، لە هەموو ڕێ ورەسمە ئاینییەکاندا بەشداری بکەم. ئیدی چووم بۆلای قەشە دوریمیدونت بوکروفسکی، تا لە بەردەمیا ئیعتراف بکەم. من بە پیاوێکی خراپ و سەختگیرم دەزانی، سوور دەمزانی کە هەڵەی زۆرم دەرهەق بەو کردووە: هەمیشە کوشکەکەی ناو باخەکەیم بەردباران دەرد، شەرم بە منداڵەکانی دەفرۆشت، ئەمە جگە لە زۆر هەڵە و خەتای دیکە کە بەدڵی ئەو نەبوون. نها کە لە سووچی کڵێساکەدا وەستابووم و چاوەڕوانی نۆرە ئیعترافی خۆم دەکرد، هەموو ئەو بیرەوەریانەم لە مێشکی خۆدا وەردەوە دەدا، دڵم بە توندی لێی دەدا.. خەریک بوو زراوم دەتۆقی. کەچی قەشە دوریمیدونت، زۆر بەگەرمی پێشوازی کردم. گوتی:

– ئاه دراوسێکەی خۆمان! خێرهاتی، کوا بکەوە سەرچۆکان و خەتا و گوناهەکانی خۆتم بۆ بگێڕەوە.

پارچە مەخمەلێکی قورسی دا بەسەرما. بۆنی بخورد و مۆم گێژیان کردم. قسەم بۆ نەدەکرا. ئیدی خۆی زەحمەتی کێشا و کەوتە پرسیارکردن:– بە گوێی خەڵکانی لە خۆت گەورەتر دەکەی؟

– نەخێر.

- بلێ: " گوناحبارم ".

یەکسەر لەخۆوە گوتم:- من نانی قوربانم دزیوە.

قەشــەکە، کەمێـک دەفکـرەوە چــوو، ئەوجــا بە کــاوەخۆ پرسی:- کەی؟ چۆن؟

- لە کڵێســای سـێ ئەولیـا، لە کـاتەدرایەی بوکـوروف و، لە کڵێساکەی سن نیکولای.

- هێواش هێواش، یانی لە هەموو کڵێساکان دزیت کردووە؟ ئەمە کـارێکی زۆر دزێـوە، کـرێتە، ئەمە یەکـێکە لە گوناحـانی گەورە کوڕی خۆم، تێدەگەی؟

- بەڵێ.

- دەبڵـێ: " مـن گوناحکـارم " هەی دامـاو. باشــە تـۆ بـۆ خواردنی خۆت ئەو نانەت دەدزی؟

- هەنــدێجار دەمخــوارد، بەڵام زۆرجــاریش پــارەکەم لە قومـاردا دەدۆڕانـد و دەبـوایە نـانی قوربـان بـۆ مـاڵ بەرمەوە، بۆیە ناچار دەمدزی.

قەشــە دوریمیـدونت، بەدەنگێـکی نەوی هەنـدێ ورتەورتـی نامەفهوومی کرد، نەمزانی چی گوت. ئەوسـا هەندێ پرسـیاری دیکەی لەمن کرد و لە ناکاوا بەڕاوێژێکی توونـد پرسـی:

- بڵێ بزانم، کتێبی یاساغت خوێندوونەوە؟

لە پرسیارەکەی حاڵی نەبووم، گوتم:- چۆن؟

- کتێبی قاچاغ، هیچت خوێندووەتەوە؟

- نەخێر، هەرگیز.

- دەی هەستە گوناهەکانت پاک بوونەوە.

بە سەرســامی ڕوانـیمە سەروســیمای، ســیمای کەســێکی هزرڤـان وزانـای پێوە دیـاربوو، لە هەنبەریـا هەسـتم بە جـۆرە تەریقــی و ژێــوان بــوونەوەیەک کــرد. وەختــایەک جــووتە کەیبـانووی مـاڵ بـۆ ئیعتـراف کردنیـان نـاردم، هەنـدێک شـتیان

پێگوتم تا بمترسێنن و دان بە هەموو شتێکدا بنەم. هەر بەو خەیاڵەوە بە قەشەکەم گوت:

- زۆرجار کوشک و کەپرە هاوینەکەی ناو باخەکەی تۆشم بەردباران دەکرد.

قەشەکە سەری هەڵبڕی و گوتی:- ئەمەش کارێکی خراپە، دەی قەیدێ ناکات، برۆ.

- سەگەکەشتم بەردباران دەکرد.

ئیدی قەشە دوریمیدونت، چاوی لە من گواستەوەو گوتی:- نها نۆرەی کێیە؟

بە شەرمەزاری رێگای خۆم گرتەبەر، تۆمەز خاپاندبوویانم و بەم ئیعترافە ترساندبوویانم. ئیدی ئەم دیمەنە هیچ شتێکی نە ترسناک و نە سەرنجراکێشی تیا نەبوو. تاقە شتێک کەمایەی سەرنج بوو، پرسیاری کتێبانی یاساغ بوو، کە من نەمزانی مەبەستی چی بوو.

سەرم لەو پرسیارە دەر نەکرد. ئەم قوتابییەم بیر کەوتەوە کە لە ژێرزەمینەکەدا کتێبی بۆ دوو ژنەکە دەخوێندەوە. هەروەها کابرای ' ئەمە جوانە 'م وەبیر هاتەوە، کە کۆمەڵێک کتێبی ئەستوور، رەش و وێنەداری گۆنگی هەبوو.

بۆ سبەینێ پازدە کوپیکیان دامێ کە بۆ کڵێسای ببەم. ئەم پارەیەیان بەبۆنەی جەژنی پاکەوە کردبوو بە نەزر. ئەو ساڵە جەژنی پاک درەنگ کەوت. بەفر لەمێژ بوو توابووەوە.

تەپ ویۆز و گەردەلوول لە جادەوبانە وشکەکانەوە هەڵدەستا، رۆژێکی هەتاوی خۆشبوو.

کۆمەڵێک کرێکار لەبن دیواری کڵێساکە سەرگەرمی گەمەی قاپانێ بوون. هێشتا زۆری مابوو بۆکاتی نوێژ، لە کرێکارەکانم پرسی:- شەریکم دەکەن؟

کـوڕێکی گەنجـی سـەر سـۆری دەم وچـاو نمـووس، بە ڕاوێژێکی شانازی ئامێزەوە گوتی:- گێمی بە یەک کۆپیک.

بە شـانازی زیـاترەوە گـوتم:- مـن سـێ کوپیکـان لە ژێـر سنگی سێیەمی دەستی چەپ دادەنەم.

- کوا پارەکەتمان پێ نیشان بدە.

ئیدی یاریەکە دەستی پێکرد!

پـازدە کـۆپیکەکەم خـورد کـردەوەو سـێ کـۆپیکم لە ژێـر سنگەکەدا دانا: ئەوەی بیخات پارەکە دەباتەوە، ئەوەی نەیخـات سـێ کۆپیکـانم دەداتێ. بەختم هەبوو، دووکەس، نیشـانەیان لە سنگەکەم گرتەوەو نەیان پێکا، یانی شـەش کۆپیکـانم لەو پیـاوە گەورانە بردەوە! ئیدی متمانەیەکی زۆرم بە خۆم پەیدا کرد، بـا چووە کەولمەوە. یەکێک لە یاریچیەکان گوتی:

- کـوڕینە ئاگاتـان لێـی بێـت، ئەگینـا لە ناکـاوا هەڵـدێ و پارەکەمان دەبات.

ئەو قسەیەم لەبەر گران بوو. خۆم فش کردەوە و بەدەنگی بەرز گوتم:

- نۆ کۆپیک لە سەر دوا سنگی دەستە چەپ.

وادیاربوو قسەکەم کارێکی ئەوتۆی لە یاریچیەکان نەکرد، بەڵام کوڕێکی هـاوتەمەنی خـۆم، ئاگاداری کـردنەوەو گـوتی:- باش چاودێری بکەن! شەیتانێکی بە شانسە! من دەیناسم!

کرێکـارێکی لاوازی درێـژ داهـۆڵ، لەوە دەچـوو دەبـاغچی بێت، بە تەوسەوە گوتی:

- گوتت شەیتانە؟ ئێستا شەیتانی پێ نیشان دەدەم!

نیشانەی لە سـنگەکەم گرتەوە، ڕێـک پێکـای. ئەوجـا ئـاوڕی لای منی دایەوەو گوتی:

- یاری دەکەیت یان بەسە؟!

گوتم:- سێ کۆپیکی دیکە لە ژێر دوا سنگی دەستەڕاست.

یارۆ دەباغچی کەوتە خۆ هەڵکێشان: ئەویش دەبەمەوە.
بەڵام دۆڕاندی.
ڕێسای گەمەکە وابوو کە لە سێ کەڕەتی دوا بە دوای یەک زیاترگرەو لە سەر هیچ سنگێک نەدەکرا. دەستم بە نیشانەگرتنەوە لە سنگی ئەوانی دی کرد، چوار کۆپیک و ژمارەیەک قاپی زۆرم بردەوە، هەرکە نۆرەم هاتەوە، هەرچیم پێبوو هەر هەموویم دۆڕاند، ڕێک لەوکاتەدا نوێژی جەماعەت تەواو بوو. زەنگەکان کەوتنە لێدان وخەڵکەکەش بە هەشتاو لە کڵێساکە وەدەرکەوتن.
یارۆی دەباغچی، کە خەریک بوو قژم ڕابکێشێت، پرسی:- تۆ ژنت هێناوە؟
بەڵام من خۆم لێی دزییەوەو، پێم وەغارێوە نا. تووشی گەنجێک بووم کە جلی ڕۆژی یەک شەممەی لەبەربوو، زۆر بە ئەدەبەوە لێم پرسی:- لە نوێژ بووی؟
بە گومانەوە سەیرێکی کردم و بەرسڤی دایەوە:- ئا، بۆچی؟
تکام لێکرد کە تێم بگەیەنێ نوێژی جەماعەت چۆنە و، یارۆی قەشە لەم نوێژەدا چ دەڵێت، ئەو کەسەی لە نوێژەکەدا بەشداری دەکات دەبێ، چ بکات.
کورەکە سەری داخست و وەکو گاجووت بە ڕووما هەڵشاخی:
- وادیارە خۆت لە نوێژەکە دزیوەتەوە، وایە هەی خوانەناس؟ دەیسا هیچت پێ ناڵێم، بۆ ئەوەی بابت حەسیر مەیدانت بکات!
بە هەشتاو بۆماڵ چوومەوە، دەمزانی پرسیار پێچم دەکەن و بۆیان دەردەکەوێ کە بەشداریم لە نوێژی مناوەلەدا نەکردووە.

بەلام پیرەژن تەنیا یەک پرسیاری لێکردم، دوای ئەوەی پیرۆزبایی لێکردم، گوتی:- چەندت بۆ قەشە دانا؟
هەر لە خۆوە، بێ هیچ بیرکردنەوەیەک گوتم: پێنج کۆپیک.
- سێ کۆپیکانی بەس بوو، هەنگێ حەوت کوپیکانت بۆ دەمایەوە هەی گەوجە.
بەهار هات، دنیا ڕۆژ لە ڕۆژ جوانتر دەینواند. بۆن وبەرامەی خۆشی گژ وگیا و ڕووەکان و گەلای سەوزی سپیداران، پیاوی مەست دەکرد، خەریک بوو سوێم بۆ دەشت ودەرو کێڵگە و مەزرایان ببێتەوە، چەندم حەز دەکرد ڕوو بکەمە دەشت و دەر لە سەر گازی پشت لەسەر ئەو ئەرزە گەرمە ڕابکشێم و گوێ لە چریکەی مەل و قاسپە قاسپی کەو بگرم. بەلام سەد حەیف و مخابن، من ئەوەتا دەبێ جل وبەرگی زستانە خاوێن بکەمەوە، قەدیان بکەم و یەک یەک لەناو سەندوقیان بنەم و گەلا تووتنیان بە سەردا بوەرێنم. گەردوتۆزی سەر موبیلەکان بتەکێنم - لە بەیانیەوە تا شەوێ خەریکی کارێن بێهودە و بێمانا بم.
هیچ شتێک شک نابەم کە کاتی دەستبەتالی خۆمی پێ بەرمەسەر. کۆلانەکەمان چۆڵ و ناخۆشە، چوونە دەرەوەیان لێ قەدەغە کردووم. حەوشەکەمان لە خەڵکی بێنەواو هەژار ولات و لەوێرا جمەی دەهات، کرێکارانی شەڕانی، ئاشپەزان و جلشۆران.. هەموو ئەم دیمەنانە دڵیان دەگوشیم، عەزابیان دەدام، هیوا بڕاویان دەکردم، حەزم دەکرد کوێر بم و ئەو دیمەنانە نەبینم.
ئیدی بێزار و بێتاقەت نەمدەزانی چ بکەم، بەهەرحاڵ مقەستێک و بڕێک کاغەزی ڕەنگاوڕەنگم هەلگرت و چووم بۆ نهۆمی سەرەوە، بە مقەستەکە کەوتمە بڕینی شێوەێن جیاوازی ئەندازەیی و بە کۆڵەکەکانمەوە دەنان. ئیدی بەلای کەمەوە

بێتاقەتی خۆم بەو کارەوە دەردەکرد. حەزم دەکرد بڕۆم بۆ شوێنێک خەڵکی کەمتر بنوون و زیاتر بێداربن، کەمتر بەشەڕ بێن، کەمتر لە سەر بچووکترین شت خوا بە شایەدبگرن، کەمتر بە بۆچوونە ناخۆشەکانیان خەڵکی بێزار بکەن..

لە ڕۆژی شەممەی پێش جەژنی پاک دا، پەیکەرێکی یەجگار سەیری ڕەبەنیتە فلادیمیرسکایایان لە دێری ئورانسکییەوە بۆ شارەکەی مە هێنا. ئەم پەیکەرە تاکو نیوەی هەیڤی حوزەیران بە میوانی لە شاردا دەمایەوە لەو ماوەیەدا بە هەموو ماڵەکاندا دەگێڕدرا، تا هەموو مەسیحیانی شار زیارەتی بکەن. وەختایەک نۆرە هاتە سەر ماڵی ئاغام بەیانی ڕۆژی یەکەمی هەفتەبوو، من لە مووبەقەکەدا خەریک بووم قاپ و مەنجەڵە مسەکانم دەشۆرد، گوێم لە خانمی بچکۆلە بوو، بە تۆنێکی ترساو لە ژوورەکەی دیکەوە هاواریکرد:

- ڕاکە دەرگا بکەوە، پەیکەرەکەی ئورانسکایایان بۆ ماڵمان هێناوە.

بەبێ ئەوەی دەستم بشۆم، چەوری و ڕەشییەکەی لێبکەمەوە، بە هەشتاو بە قاڵدرمەکەدا داگەڕام ودەرگام کردەوە. کەشیشێکی گەنج کە لە تافی لاویدا بوو، لەبەر دەرگا وەستابوو، بەدەستێک چرایەکی هەڵگرتبوو و بەدەستەکەی دی داری عودێک. لەبن لێوانەوە کەوتە خوتەخوت:- بۆ نایەن بە دەنگمانەوە! هێشتا خەوتوون؟ وەرە یارمەتیمان بدە.

دوو کەس پەیکەرە گەورەکەیان هەڵگرتبوو و بە قاڵدرمە تەسکەکەدا سەردەکەوتن. منیش شانم دایە بەر سووچێکی پەیکەرەکە و، بەهەر دوو دەستە پیسەکەم گرتم. چەند قەشەیەکی ورگ زل لە دوامانەوە هاتن، لەبەرخۆوە و جارجار بە دەنگێکی گڕ، نزایان دەکرد:

- ئەی دایکی پیرۆزی خوا، شەفاعەتمان بۆ بکە..

من له دڵی خۆما، به نیگەرانیەوه گوتم: " بێگومان دایکی پیرۆز نامبەخشێت چونکه بەدەستی پیس ئیکۆنەکەم (پەیکەر) هەڵگرتووه.. هەرخوا بکا هەر دوو دەستم وشک نەبن."

ئیکۆنەکەیان، له سووچی ئیکۆنەکان، له سەر دوو کورسی که پەردەیەکی سپی پێدا درابوو، دانا. دوو قەشەی جوان که له تافی لاویدا بوون و بەچاوە پرشنگدار وقژە درێژەکانیانەوە له فریشتە دەچوون، لەملا و لەولای پەیکەرەکەوە وەستان.. تەشریفات ورێورەسمی مەزەبی دەستی پێکرد. قەشەیەکی کەتەی زەلام، به قامکه ئەستوورەکەی نەرمەی سوور و ئاوساوی گوێی، که کەوتبووه ژێر قژەکەیەوە، دەخوراند، به دەنگێکی تیژ هەڵیدایێ:- ئەی دایکه موبارەکەکەی خوا!

قەشەکانی دی بەدەنگێکی ماندوو بۆیان سەندەوە:

- ئەی دایکی موبارەک، ڕەحمەتی خۆتمان به سەرا ببارێنه.

من مریەمی پاکیزەم خۆشدەویست، به گوێرەی چیرۆک و حیکایەتەکانی نەنکم، ئەو، دنیای به گوڵ و گوڵزار دەڕازاندەوە، چاکه و جوانی بڵاو دەکردەوە، دڵنەوایی هەژارانی دەکرد. که وەختی ماچکردنی پەیکەرەکه هات، من له سەرقاڵی خۆما، ئاگام لەوە نەبوو که گەورەکان چۆن ماچیان دەکرد، بۆیە که نۆرە هاته سەرمن ئیکۆنەکه ماچ بکەم، ڕێک لێوم خستەسەر لێوی. یەکسەر دەستێکی زبر وبەهێز تووڕی دامه گۆشەیەکی نزیکی دەرگاکەوە. بیرم نایەت که قەشەکان چۆن پەیکەرەکەیان هەڵگرت و ڕۆیشتن. بەڵام ئەوەم له بیره که من له ئەرزەکه دانیشتبووم و ئاغاکانم به دیارمەوە وەستابوون و به ترس و نیگەرانیەوە گەنگەشەی ئەوەیان دەکرد که ئەمه له جوملەی گوناحانی گەورەیە و مەگەر هەرخوا بزانێ چ بەڵایەکم بەسەربێت.

وەستام، به سووکه سەرزەنشتێکەوە گوتی:

- دەبێ پرس بە زاناترین قەشە بکەین، چونکە ئەو لە ئێمە باشتر سەر لەم مەسەلانە دەردەکات. ئاخر هەی گەوجە، تۆ تا ئێستا نازانی کە نابێ لێوی پاکیزە ماچ بکرێت؟ ئەدی لە قوتابخانە ئەمەیان پێنەگوتوویت، ئەمەیان فێر نەکردوویت!

ماوەیەکی زۆر، بەوپەڕی نیگەرانی ودڵەڕاوکێوە چاوەڕوانی سزا بووم. ئاخر بەدەستانی پیسەوە پەیکەری پاکیزەم هەڵگرتبوو، لەوەش خراتر، لێوی پاکیزەم ماچ کردبوو. ئەمەم لێ بەسەر ناچێت، بەڵایەکم بەسەر دێت! ئەم هەموو خەتا و گوناحە هەروا بە ئاسانی تێناپەڕێت، باجی خۆی هەیە! دەبێ ئەو باجە بدەم!

بەڵام لەوە دەچوو پاکیزە لە خەتا وهەڵە نەخوازراوەکانم، کە زادەی مەحەبەت و خۆشەویستی خالیسە بوون، خۆش بووبێ. یان سزایەکی ئەوەندە سووک بووبێ کە هەستم پێنەکردبێ، لە چاو ئەو هەموو سەرزەنشت و سەرکۆنانەوە کە ئەم خەڵکەی دەورم، دەیانکردم، هەر هیچ نەبووبێ.

هەندێجار، هەر بۆئەوەی سەر بکەمە سەر پیرەژن، بە ئانقەست دەمگوت:- لەوە دەچێ دایکی پیرۆز، سزاکەی منی لەبیر کردبێت. بەتووندی بەرسڤی دەدامەوە:

- چاوەڕێ بکە، هێشتا منداڵی، با گەورە ببیت ئەوسا دەبینی..

لە کاتێکا لە نهۆمی سەرەوە کۆڵەکە و دیوارەکانم بە کاغەزێن پەمەیی و سورباوی سەندووقە چایانەوە، دەنا بە کۆڵەکە و دیوارەکانەوە، بەدەم کارکردنەوە، کەڵکەڵە و خولیاکانی خۆم لە شێوەی هۆنراوەدا دادەڕشت و وەکو سروودێن ئاینی، بە ئاوازەوە دەمگوتنەوە، ڕێک وەکو ئەو کالمیکانەی بە سواری ئەسپەوە دەسووڕانەوە:

**لە نهۆمی سەرەوە دانیشتووم**

**قەیچی بە دەست**
**کاغەزان دەبڕم**
**دەبڕم، بێزار دەبم**
**خۆزگە سەد خۆزگە**
**تولە سەگێک دەبووم**
**توانیبام، بە ئازادی**
**هەڵێم...**
**لێرە هەمووان دەدەن ئازارم، سەرکوتم دەکەن**
**خەفەبە، هەی حەیوان**
**تۆ هیچ نازانی**
**فێربە، گوێ لە گەوران بگری**

وەختــایەک پیــرەژن، نەخــش و نیگــارو مینیــاتۆری ســەر دیوارەکـانی نهـۆمی سـەرەوەی بینـی، بەدەم سـەرلەقاندنەوەو لەبـن لێـوانەوە گـوتی:- شـەڵڵا، دیـوارێن مووبەقەکەشـت وا لێدەکرد.

ڕۆژێـک وەسـتام هـاتە نهـۆمی سـەرەوە، چـاوێکی بە فانتازیاکاریەکانما گێڕا، ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

- بشکوف، تۆ کەسێکی سەیری، مەگەر هەرخوا بزانێ لە ئایندەدا دەبی بەچی؟ جادووگەر؟ لێبۆک؟ نازانم.

ئەنجام چەند سکەیەکی پێنج کۆپیکی سەردەمی نیکولای یەکەمی دامێ، من زنجیرێکی باریک و ناسکم دروست کرد و کۆپیکەکـانم پێـوەکرد و وەکـو میـداڵ، لە شـوێنێکی دیـار و بەرچـاوەوە، لە نـاو کـارە ڕەنگاوڕەنگەکـانی دیکەمـدا بە دیـوارەکەمەوە هەڵواسـی. بـۆ سـبەینێ سـکەکان گـوم بـوون، دڵنیابووم کە پیرەژن دزی بوونی.

## (٧)

دوای ئەم ڕووداوە، لە گەڵ دەستپێکی بەهارا، قەراری هەڵاتنم دا. بەیانیەک بۆ کڕینی نانی بەیانی چووبووومە نانەواخانە، کابرای نانەوا و ژنەکەی شەڕیان بوو، کابرای نانەوا تووڕە بوو، پڕی دایە کیلۆیەک و ڕێک کێشای بە تەوێڵی ژنەکەیا، ژنەی داماو بە ڕاکردن خۆی گەیاندە سەر جادەکە و لەوێندەر کەوتە سەر ئەرزەکە. خەڵکی لەدەوری خڕبوونەوە، لە گالیسکەیەکیان ناو بۆ خەستەخانەیان فڕاند. منیش بە هەشتاو دوای گالیسکەکە کەوتم. کاتێکم بەخۆزانی، خۆم لە لەنگەرگاکەی ڤۆلگادا بینییەوە و بیست کۆپیکم پێبوو.

ڕۆژێکی بەهاری خۆش دنیای ڕوناک کردبووەوە، ڤۆلگا هەستابوو و لەجاران پانتر دیاربوو، دەوروبەرم زۆر کراوەو فراوان بوو. کەچی من تاکو ئەو ڕۆژە، وەکو مشکی ناو کونان ژیابووم. بڕیارم دا چیتر بۆماڵی ئاغاکانم نەگەڕێمەوە. هەروەها حەزم نەدەکرد بۆ کونافینو، بۆلای نەنکم بگەڕێمەوە. چونکە من بەڵێن و قسەی خۆم نەبردووە سەر و شەرمم دەکرد، جارێکی دی ڕوو بە ڕووی ببمەوە، ئەمە جگە لەوەی گەر بگەڕابامەوە، لە تەوس و توانج و جنێوانی بابام نەدەخەلەسیم.

دوو سێ ڕۆژی دی بێهودە لەو بەنەدەر و بارانەدازانەدا سووڕامەوە، حەماڵ و کوڵبەرانی دڵاوا دەست و دڵ تێر خواردنیان دەدامێ، شەوان هەر لە بەندەرەکە و لە نزیکی ئەوانەوە دەنووستم. ڕۆژێ یەکێکیان پێی گوتم:

– بچکۆل، تۆ لەم ناوە کارت دەست ناکەوێ، کاری ئێرە قورسە، بە تۆ ناکرێ، بۆچی ناچی لە سەر کەشتی " دوبری " کاربکەیت، لەوێ پێویستیان بە قاپشۆر هەیە.

ئەو پێشنیازەم بە دڵ بوو، یەکسەر بۆ ئەوێندەر چووم. کابرای بەرپرس، کە کابرایەکی بالآبەرزی ڕیشن بوو و کلاوێکی ڕەشی بێ لێواری لەسەر بوو، بە دوو چاوی لێڵەوە و لەژێر چاویلکەکەیەوە لێم ورد بووەوە. بەڕاوێژێکی نەرم گوتی:

- مانگی دوو ڕۆبڵ.. کوا ناسنامەت پێیە؟

بچووکترین بەڵگەنامەم پێنەبوو، یارۆی بەرپرس کەمێک دەفکرەوە چوو، ئەوجا گوتی:- بڕۆ دایکتم بۆ بێنە.

بەهەشتاو چووم بۆلای داپیرەم، داپیرەم ئەم هەڵوێستەی بەدڵ بوو، مێردەکەی وادار کرد کە بڕوات بۆ ئەنجوومەنی سەندیکای پیشەوەران و ناسنامەم بۆ دەربێنێت.. بەخۆیشی هەتا لای کەشتیەکە لەگەڵما هات.

یارۆی بەرپرس، تەمەشایەکی ناسنامەکەی کرد و ژێراوژێر چاوێکی بە سەراپاماندا گێڕا و گوتی:- باشە، دەی سواربە با بڕۆین.

کابرا، بۆ بەشی دواوەی کەشتیەکەی بردم. ئاشپەزێکی کەتەی زەلامی لێبوو، بالآپۆشێکی سپی لەبەر وکلآوێکی سپی لە سەر بوو، لەبەردەم مێزێک دانیشتبوو وبەدەم چا خواردنەوە سیغارێکی ئەستووری دەکێشا. کابرای بەرپرس بەرەو ئاشپەزەکە دەڵەکی دام و گوتی:- قاپ شۆرە.

ئەوسا بە هەشتاو ڕۆیی. یارۆی ئاشپەز، هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا، سمێڵە ئەستوور و ڕەشەکانی فش بوونەوەو لە دوای کابرای بەرپرسەوە گوتی:

- تۆ ئامادەی شەیتانیش ڕابگری، بەو مەرجەی کرێکەی کەم بێت!

سەری بە قژە ڕەشە کورتەکەیەوە بردە دواوە و، بە چاوە لێڵەکانی تێی ڕوانیم و بەرخەبەبەی پڕباکرد و گوتی:- تۆ کێی؟

ئەو کابرایەم نەچووە دڵەوە، هەرچەندە جلکی سپی لەبەربوو، بەڵام لە کەسێکی پاک وخاوێن نەدەچوو، قامکەکانی یەکپارچە موو بوون، داوە مووی درێژ لە هەر دوو گوێیەوە هاتبوونەدەرێ، گوتم:- من برسیمە.

چاوەکانی دەتروکێنێ، سەروسیمای دەکرێتەوە، تووڕەییەکەی دەڕەوێتەوە، بزەیەکی ئاشکرا لە سەروسیمای دەنیشێت، گۆناکانی سوور هەڵدەگەڕێن، ددانە درشتەکانی، کە لە ددانی ئەسپ دەچوون، بەدیارکەوتن. سمێڵەکانی دەجووڵان، ڕێک لە کەیبانوویەکی قەڵەوی دڵاوا دەچوو.

لە سەر کەشتیەکەوە، پاشماوەی چایەکەی ڕشتە ناو ڕووبارەکەوە، پەرداخەکەی لە چا پڕکردەوە، دەگەڵ نانێکی سپی و پارچەیەک قاورمەی گەورەدا بۆی درێژ کردم. گوتی:

- بخۆ، داک وبابت ماینە؟ دزی دەزانی؟ گوێ مەدەیە، ئەوانەی ئێرە هەموو دزن. خەمت نەبێ بەم زووانە فێرت دەکەم.

کە قسەی دەکرد، دەتگوت سەگە و دەوەڕێ، ڕدێنی بە ڕادەیەک لە بنەوە تاشی بوو، هەموو وردە دەمارەکانیگۆناکانی سوور دەچوونەوە، کەپووە زەلام و سوورەکەی بەسەر سمێڵەکانیا شۆڕ بووبووەوە. لێوە ئەستوورەکەی خوارەوەی داچۆڕابوو، سیغارێکی ئەستوور بەلا لێویەوە دووکەڵی دەکرد. دیاربوو تازە لە حەمام هاتبووە دەرێ، بۆنی گەڵای سپێداری لێدەهات، ئارەقە بەلاجانگەکان و لاملیدا دەهاتە خوارەوە.

کە پەرداخە چایەکەم تەواو کرد، ڕۆبڵێکی دامی وگوتی:

- هەرە دوو بەرکۆش بکرە.. نە، سەبرکە! باخۆم بڕۆم بیکرم.
کڵاوەکەی لە سەری ڕێکخست و لە کەشتیەکە دابەزی، بەلارەلار کەوتە ڕێ، کە هەنگاوی دەنا لە تۆ وایە ورچە و پێ بە عاردیدا دەنێت..

... شەو داهات. مانک بە ئاسمانەوە دەدرەوشێتەوەو شان بەشانی ئێمە، لەدەستی چەپی کەشتیەکەوە، بەسەر مێرگ و سەوزەزارەکاندا پەخش دەبێتەوە، کەشتیە سورباو و کۆنەکەمان، بە دووکەڵکێشە بازگەکەیەوە، بە تەقگەرێکی ناهاوئاهەنگەوە، پەروانەکانی بەخاوی بەئاوە زیوینەکەدا دەکێشێت وشەقی دەکات.
ئەم بەرو ئەوبەری ڕوبارەکە ڕەش دەچنەوە، لە تۆ وایە تارمایین وبەپیری کەشتیەکەوە هاتوون، ڕوناکی کوختەکانی ئەم بەرو ئەوبەری ڕوبارەکە، لەسەر ئاوەکە نەخش دەبێت. دەنگی گۆرانی و ستران لە گوندەوە دێ – کیژان دەڕەقسن و ئەم پاشبەندە دەڵێنەوە: " ئای لولێ " و ئەم ئاوازە لەگوێما دەزرنگێتەوە.
کەشتییەکەمان بەلەمێکی ڕەشی بارهەڵگر لە دووی خۆی ڕادەکێشێت، بەزنجیرێکی درێژ بە کەشتییەکەمانەوە بەستراوە. بەلەمەکە سپیواژە، قەفەزێکی ئاسنی گەورەی لە سەر دابەستراوە. قەفەزەکە پڕە لە زندانیانی دوورخراوە و مەحکووم بە کارێن سەخت. نێزەی پاسەوانەکە کە لە پێشی بەلەمەکەوە وەستاوە، وەکو مۆم دەدرەوشێتەوە، ستێران بە بەرۆکی ئاسمانی قوول و شینەوە، وەکو وردە شەمالکان ورشە ورش دەدرەوشێنەوە. بێدەنگی باڵ بەسەر کەشتیەکەدا دەکێشێت، هەیڤەشەو ڕوناکی دەکاتەوە. لە ناو قەفەزە

ئاســنەکانەوە، هەنــدێ تارمــایی ســپیواژ ، بە نــاو تــاریکیە گونگەکەدا دێن و دەچن. ئەمانە ئەو زندانیانەن کە تەمەشای ڤولگا دەکەن، ئاوەکە بە خورە خوڕ دەڕوات. ناتوانی بڵێی دەگری و دەناڵێنێ یان بەنەرمی پێدەکەنێ. کەش و هەوایەکی کڵێسایی باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو، تەنانەت بۆنی مۆم و بخوریش دەهات.

کە تەمەشــای ئەو بەلەمە دەکەم، دەورانــی منداڵی خــۆمم بەبیردێتەوە. سەفەرم لە ئەستراخانەوە بۆ نیژنی نۆڤگورد، دەم و چاوی دایکم کە لە دەمامک دەچوو، هەروەها نەنکم کە تووشی ئەم ژیانە دژوارە و لە هەمان کاتدا خۆشەی کردم. هەرکــاتێ نەنکــم وەبیــردێتەوە، هەمــوو شــتە خــراپ و ناخۆشەکانی ژیانم لە بیر دەچنەوە. هەموو شتێک دەگۆڕێت و جیلوەیەکی باشتر پەیدا دەکەن. خەڵکی لەبەرچاوم باشتر ومیهرەبانتر دەنوێنن، جوانی ئەو شەوە بە ڕادەیەک کاری تێکردم نزیک بوو لە هۆڕژنی گریان بدەم. دیمەنی ئەو بەلەمە، کە بەســەر ئەو ڕوبارە پان و بەرینەوە، بەم شــەوە کڕوکپ ومەندە، لە تابووت دەچوو. ئیدی کەنارە دژوار وسەختەکانی ئەم بەرو ئەوبەری ڕوبــارەکە کە هەوراز ونشــێو دەبــووەوە جۆرە دڵەخورپەیەکی لەلا دروست دەکردم، پڕ بە دڵ حەزم دەکرد بوونەوەرێکی باشبم وسوودم بۆ خەڵکەکان هەبێت.

ڕێبوارانی کەشتیەکەمان هەر هەموویان، بە پیر وگەنج و پیاو و ژنەوە لەیەکدی دەچوون. کەشتیەکەمان زۆر بە ئارامی دەڕۆیی، ئەو ڕێبوارانەی کە پەلەیان بوو، بەکەشتی و بەلەمێن خێراتر سەفەریان دەکرد. کەشتیەکەی مە، هی ڕێبوارانی بێکار و دەولەمەنــد بــوو، لە بەیــانییەوە تــا شــەوێ هەر خەریکــی خواردن و خواردنەوە بوون، قاپ و ئامان و، چەقۆ و چەتاڵ

و، کەوچک و مراکێکی زۆریان پیس دەکرد. ئیدی ئیش وکاری من بریتی بوو لە شۆردن و پاککردنەوە و وشک کردنەوەی ئەم قاپ و چەقۆ و چەتالانە، لە سەعات شەشی بەیانییەوە تاکو نیوەشەو، ئاو بوەستایە من نەدەوەستام، لێ هەندێجار، بەرێکەوت لە نێوان سەعاتی دوویدوانیوەڕۆوە بۆ شەشی ئێوارە یان لە سەعات دەی شەوێوە بۆ دوازدە ئیش و کارم برێک کەم دەبوو، چونکە ڕێبوارەکان لەو ماوەیەدا پشوویان دەدا، تەنیا چای وعارەق وڤۆدکایان دەخواردەوە. لەو کاتانەدا خزمەتگوزارانی خواردنگەکە تەقریبەن ئیسراحەت بوون. ئیدی بەدەم چا خواردنەوە، هەموویان لە دەوری مێزێکی نزیک دووکەڵکێشەکە خڕ دەبوونەوە، لەوانەیە: سموری ئاشپەز، یاکوف ئیڤانوڤیچی یاریدەدەری، ماکسیمی شاگردی خوارنگەکە، سێرگی کە خزمەتی ڕێبوارەکانی سەر کەشتیەکەی دەکرد، ئەمە پیاوێکی قەمووری دەم وچاو پانی کونج و ئاولاوی چاو زەیتوونی بوو. یاکوف ئیڤانوڤیچ، حیکایەتی بێتامی بۆ جەماعەت دەگێڕایەوە، بەدەم پێکەنینە پچرپچرەکەیەوە ددانە زەرد و کرمۆڵەکانی بەدیار دەکەوتن. سێرگی، دەمی کە لەدەمی قورباقە دەچوو، تا بناگوێی دەکرایەوە. ماکسیمی، مەند وخەمین، بە بێدەنگی گوێی هەڵدەخست، بە چاوانێکەوە کە کەس نەیدەزانی چ ڕەنگن، چاودێری ئەوانی دی دەکرد.

یارۆی ئاشپەز ناو بە ناو هاواریدەکرد:- هۆ ئاسیاییانی کێوی!

من هیچ یەکێک لەو خەڵکانەم نەچووە دڵەوە. جاریّ یاکوف ئیڤانۆڤیچی قەڵەوی سەرساف، سەری زمان و بنی زمانی باسی ئافرەت بوو. جا بە شێوازێکی تا بڵێی قیزەون. دەم و چاوە سافەکەی یەکپارچە پەڵەی شینباو بوو، خاڵێک لە سەر

یەکێک لە گۆناکانی بوو، مووی ئامال سوور داپۆشی بوو، ئەو مووانەی بە جۆرێ بادەدا، دەیکردن بە یەک داوە مووی باریک. کە ژنێک دەهاتە سەر کەشتیەکە ئەو بە شەرمەوە، وەکو گەدا دوای دەکەوت، بەدەنگێکی شەرمنانە دەیدواند، لالغاوەی کەفی دەکرد، زمانە پیسەکەی پێدا دێنا و پاکی دەکردەوە. خۆشم نازانم بۆچی وام وێنا دەکرد کە جەلادان دەبێ وەکو ئەم پیاوە قەڵەو بن. جارێکیان قسەی بۆ سێرگی و ماکسیم دەکرد، کە بە وریاییەوە گوێیان بۆ ڕادێرابوو، گوتی:- پیاو دەبێ بزانێ چۆن ئافرەت بوروژێنێ.

سموری بە بێزارییەوە بە ڕوویا هەڵشاخی:- هەی کێوی هیچ نەدیتگە!

بە ئەسپایی هەستایە سەرپێیان وبەمنی گوت:- پشکوف وەرە بۆ ئێرە!

بۆ ژوورەکەی خۆی بردم، کتێبێکی چکۆلەی بەرگ چەرمی دامێ، لە سەر جێگاکەی تەنیشت یەخچاڵەکەوە ڕاکشا وگوتی:- ئەمە بخوێنەوە!

لە سەر سەندووقێکی مەعکەرۆنی دانیشتم و بەگەرمی دەستم بە خوێندنەوە کرد:

- " ئیمبراکۆلم " ی ئەستێرەنیشان، یانی پەیوەندی ئاسمان بە ئاسمانەوە، ئەمە مانەی وایە خۆیان لە درۆزنان و پەیغەمبەران ڕزگار کردووە. (مەبەست لەم کتێبە " ماسۆنی بێ دەمامک " لە نووسینی ولسونە. ئەمە کتێبێکە دەربارەی ڕێورەسمەکانی ماسۆنیەت و ڕاڤەی زاراوەکانی).سموری، کە تازە جگەرەیەکی داگیرساندبوو دووکەڵەکەی بەبا دەدا، گوتی:

- ئەمە وشترانە، نازانم ئەم قۆڕیاتە چییە دەینووسن!

- ئەگەر سینەی چەپی کەسێک کراوە بێ نیشانەی دڵپاکییە.

- سینەی چەپی چی؟ شتی وا نە نووسراوە.

- کەواتا مەبەستیان مەمکی ژنە. کە داوێن پیسن!

چاوەکانی نووقاندن، هەردوو دەستی لە ژێر سەریا تێک ئالاند. بەزمان سیغارەکەی لالێوی جوولاند، نەفەسێکی قووڵی لێدا، خیزەخیزی سینگی بەرز بووەوە، دووکەڵ سەروچاوی داپۆشی. جارجار وا هەستدەکەم خەو بردوویەتیەوە، دەست لە خوێندنەوە هەڵدەگرم و دەڕوانمە ئەم کتێبە نەفرەتیە کە تەواو وەڕەزی کردووم. بەڵام سموری، دەمرێنێ:- بخوێنەوە!

- کابرای بە ویقار بەرسڤی دایەوە:- تەمەشا ئەی برای فەرمانڕەوای بەڕێزم..

- سەرکوتکار، زاڵم.

- نووسیویانە: فەرمانڕەوا.

- وێڵی بکە! لە پایینی لاپەڕەکەوە، شیعرێک هەیە. لەوێوە بیخوێنەوە!

دەست بە خوێندنەوە دەکەم:

*ئەی بێ دینان، ئێوە دەتانەوێ*

*سەر لە کارەکانی ئێمە دەربکەن*

*خەیاڵی خاوی ئەنگۆ هەرگیز*

*پەی بە مانای کارێن ئێمە نابات*

*هیچ کاتێک ڕازی سروودی*

*برایانی پیرۆزی مە*

*بە ئێوە هەڵنایەت.*

سموری هاواریکرد:- بەسە! ئەمەش بوو بە شیعر؟ کوا کتێبەکەم وێدە.

بە تووڕەیی لاپەڕە ئەستوور و شینباوەکانی کتێبەکەی هەڵدەداتەوەو ئەوجا هەڵیدەداتە ژێر جێگاکەیەوە و بە من دەڵێت:- با کتێبێکی دی تاقیبکەینەوە.

بۆ نەگبەتی من کۆمەڵێک کتێبی زۆری لە باوەڵێکی ڕەشدا هەبوو، لەوانە: ئامۆژگاریەکانی ئومیر، بیرەوەری تۆپچیەک، نامەکانی لۆرد سیدینگاڵی، و کتێبێک بە ناونیشانی: " پێشکە، ئەو مێروە موزێرە و چۆنیەتی لەناودانی و چۆنیەتی خۆپاراستن لە زیانەکانی. " کتێبی وەهای هەبوو کە نەسەریان هەبوو نەبەر. یارۆی ئاشپەز هەندێجار داوای لێدەکردم، کتێبەکانی بۆ ڕێکبخەم و هەموو ناونیشانەکانی بۆ بخوێنمەوە. لەکاتێکا ئەم کارەم بۆ دەکرد، ئەو لەبن لێوانەوە دەکەوتە بۆڵەبۆڵ:

- تۆ تەمەشا ئەم کەرانە چ دەنووسن؟ پیاو هەرچی دەکۆشێ هیچیان لێ حاڵی نابێت، بۆ نموونە جیرفاسی، ئاخر من چیم داوە لەم جیرفاسیە؟ یا لەم ئیمپراکولومە!

وشە غەریب وناوە نائاشناکان لە یادگەمدا نەخش دەبوون، زۆر لەسەر زمانم قورس بوون و لە ماناکانیان حاڵی نەدەبووم، وادیار بوو دەبوایە وەختێکی زۆریان بەسەردا بڕوات ئەوجا ماناکانیانم بۆ ئاشکرا ببێت. لەودیو پەنجەرەکەوە شڵپ وهۆڕی شەپۆلان کە خۆیان بە کەشتیەکەدا دەکێشا، هەر تەواو نەدەبوو و نەدەبڕایەوە.

پڕ بەدڵ حەزم دەکرد بچە بەشی ژێرینی کەشتیەکە، کە دەریاوان و شاگردەکانیان لەوێندەر، لە سەر کارتۆنی کەل وپەلەکان دادەنیشتن و گۆرانیان دەگوت یان گفتوگۆیان دەکرد، یان قوماریان لە گەڵ ڕێبوارەکان دەکرد وجۆڕیان دەدان، تالانیان دەکردن. چەند خۆشە پیاو لە مەجلیسی ئەوانەدا دابنیشێت و گوێبۆ پەیڤە سادەو ڕوونەکانیان بگرێت، و چاوی ببڕێتە کەنارەکانی ڕوباری کاما و قەدی دار کاژە بەرزەکان و ئەو مێرگانەی کە سێلاو کردبوونی بە گۆلاوی بچووک و وێنەی ئاسمانی شینیان دەنواندەوەو لە تۆ وایە

ئاوێنەی شکاون. کەشتیەکەمان لە وشکانیەوە دوور بوو، تا دەهات پتر لە وشکانیەوە دوور دەکەوتەوە.کەچی دەنگی زەنگی کلێسایەکی نادیار، لە بولێلی ئێوارەدا ،لە دووری دوورەوە دەهاتەگوێ و مژدەی ئاوەدانی دەدا. بەلەمێکی ڕاوی بچووک، وەکو پارچە نانێک بەسەر ئاوەکەوە سەمای دەکرد. تارمایی گوندێک لە دووری دوورەوەدەرکەوت. چەند منداڵێک لە ئاوەکەدا شەڕە ئاویان دەکرد،جوتیارێک بە کەوایەکی سوورەوە بەسەر لمەلانەکەدا ڕێی دەکرد. هەموو شتێک لە دوورەوە جوان دەهاتە بەرچاو، لە بووکەڵەی بچووکی ڕەنگاوڕەنگ دەچوون، پڕ بەدڵ حەزم دەکرد قسە لەگەڵ کەناراوەکەدا بکەم و هەرچیەکم لە دڵدا پەنگاوەتەوە، بۆئەو و بۆ بەلەمەکەی دوای خۆمانی بگێڕمەوە. ئەم بەلەمە قاوەییە سووورباوە خولیا و کەڵکەڵەیەکی سەیری لەلا دروست کردبووم . دەمتوانی یەک سەعاتی تەواو بەبێ ئەوەی بێتاقەت وبێزار ببم تەمەشای بکەم کە چۆن لووتی دەژەنیە ئاوە لێڵەکەوە، کەشتیە هەڵمیەکەی ئێمە وەکو بەرازێک لە دووی خۆی ڕادەکێشا، ئەو پەتەی کە پێکەوەی بەستبووین هەندێجار خاو دەبووەوە، لە ئاوەکەدا نقووم دەبوو، پاشان توونـد دەبووەوە، دەکەوتە سەرووی ئاوەکەوە، دڵۆپی درەخشانی ئاوەکەی پێدا دەچۆڕایەوە. زۆرم حەز لە تەمەشای ئەو خەڵکانەبوو کە وەکو حەیوانات لە ناو قەفەزەکە ڕۆنیشتبوون. کاتێ کە لە پیرم، دایان بەزاندن، بەهەشتاو بە ناو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا خۆم گەیاندە ڕاڕەوەکەی سەرەوەی کەشتیەکە، نزیکەی دە کەسی بۆرەقنە، بەدەم هەنگاوی قورسەوە، بەدەم زڕەی زنجیرەکانی پێیانەوە، بەبەردەمما ڕەت بوون، دوو لۆ لە ژێر قورسایی کۆڵەپشتیەکانیاندا کۆمابوونەوە. ئەمانە

تێکەڵەیەک بوون لە ژن و لە پیاو، لە پیر ولە گەنج، لە جوان ولە ناشیرین، واتا وەکو هەر کۆمەڵگەیەکی بەشەری دیکە. بەڵام جلی زندانیان لەبەر بوو، سەریان سفر کرابوو، سەر وسیمایان تەواو گۆڕابوو. ئەوەی ڕاستی بێ ئەمانە ڕێگر بوون، بەڵام نەنکم زۆر چیرۆکی جوانی دەربارەی ڕێگران بۆ گێڕابوومەوە!

سموری کە لە هەموو کەس زیاتر لە ڕێگر دەچوو، نیگایەکی بەلەمەکەی کرد و بە پەستیەوە گوتی:- خودایە، لەم جۆرە نەگبەتیەم بەدوور بکە! حاڵم بەحاڵیان نەبێت.

جارێک لێم پرسی:

- باشە تۆ چۆن بوویت بە ئاشپەز، لە کاتێکا هەموو دەوروبەرەکەت دز و پیاوکوژن؟

بەدەم بزەیەکەوە بەرسڤی دامەوە:

- من ئاشپەز نیم. من سەرۆکی ئاشپەزانم. تەنیا ژنان ئاشپەزن.

کەمێک لە فکران ڕاچوو و ئەوسا لە سەری ڕۆیی:

- جیاوازی بەشەر لە بیرکردنەوەیاندایە، خەڵکانێک هەن زیرەکن، خەڵکانێک هەن کەودەنن و هی واش هەن پەنا بەخوا کەرن، لە گەوجاتیدا بەشی کەسیان نەهێشتووەتەوە، جا بۆ ئەوەی لە گەوجاتی بخەلەسین پێویستە کتێبانی هەڵبژاردە بخوێنینەوە، تەنانەت کتێبی سیحر و جادووش بخوێنینەوە، دەبێ هەموو کتێبێک بخوێنینەوە، تا بزانین کامیان باش و بەسوودە.

هەمیشە بە گوێیدا دەخوێندم:- بخوێنەوە. زۆر بخوێنەوە. گەر لە کتێبێک تێنەگەیشتی، حەوت جاری دی بیخوێنەوە، ئەگەر هەر تێی نەگەیشتی دوازدە چەلی دی وەیخوێنە!

سموری، لەگەڵ هەموو خزمەتگوزاری سەر کەشتیەکەدا، بەهەمان ڕاویـژی وشـک قسـەی دەکـرد، تەنـانەت دەگەڵ سەرۆکە بێدەنگ و کەمدووەکەی خزمەتگوزارەکاندا، بە هەمان ڕاوێژ و شێواز قسەی دەکرد، وەختایەک قسەی دەکرد، لێوی هەڵدەقورتاند، سمێڵی گڤ دەبووەوە، لە تۆ وایە لەجیاتی پەیڤ و وشـە، بەرد بەسـەروچاوی بەرانبەرەکەیدا دەکێشـێت. بەڵام لەگەڵ منـدا، بەلوتـف و میرەبـان بـوو، بەڵام وێـڕای ئەوەش، شتێک لە ڕەفتاریا هەبوو، دەی ترساندم، هەستم دەکرد یارۆی ئاشـپەز، وەکـو خوشـکەکەی نەنکـم نائاسـاییە. هەنـدێجار پێـی دەگوتم:

- بەسە، مەخوێنەوە!

ئەوجـا چـاوی دەنوقانـدن و مـاوەیەک پـاڵی دەدایەوە و دەکەوتە مشـەمش، ورگە زلەکەی بەرز و نـزم دەبـووەوە، هەر دوو دەستی لەسـەر سینگی، خاچ ئاسـا تێک هاڵاندبوو، هەر لە مـردوو دەچـوو. قـامکە سـووتاوە تووکنەکـانی بەجـۆرێ دەجووڵانـدن، لە تـۆوایە، بە قـولاپێن شـاراوە، گـۆرەوییەکی پەنهان دەچنێ..

ئەوجا لە ناکاواو لەبن لێوانەوە دەڵێت:

- بۆ نموونە دەماغ! تۆ تەمەشاکە بەکەڵکی چی دێ! دەماغ زۆر خـراپ دابەش کـراوە، هـیچ عەدالەتێکی تیـا نییە. خـۆزگە هەموو بەشەر هەمـان ئەندازەیان دەبوو. بەڵام شـتی وانییە و نابێ. ئەم گەنـجە تێدەگات، ئەویتر تێناگـات، یەکێکی دی لەبنی ئارەزووی تێگەیشتنی نییە.

ئیدی، بەدەم وشە جوینەوە، سەربهورده و چیرۆکی ژیانی عەسکەری خۆیم بۆ دەگێڕێتەوە. ئێستاش نەمزانی فایدەی ئەو چیرۆکـانەی چیـیە، هەمیشـە بێفایـدە بـوون، بەتـایبەتی لە

هەوەڵەوە دەستی پێنەدەکرد، بەڵکو لەو شوێنەوە دەستی پێدەکرد کە ئەقڵی بیبڕایە.

- بەوجۆرە ئامیر فیرقە بانگی سەربازەکەی کرد و پێی گوت: ملازم چ ئەمرێکی پێکردیت؟

ئیدی هەموو شتێکی لە سیری تا پیازی بۆ گێڕایەوە، چونکە سەرباز لە سەرێتی ڕاستی بڵێت. یارۆی ملازم تەمەشایەکی کرد، ئەوجا وەرگەڕا و چاوانی نوقاندن.هەم.

یارۆی ئاشپەز، هەناسەیەکی بێزاریی هەڵکێشا و لەبن لێوانەوە گوتی:

- وەکو ئەوەی من بزانم پیاو دەبێ چ بڵێ یان چ نەڵێت!.

یارۆی ملازمیان بۆ زندان ڤڕێکرد، بەلام دایکی... ئوف خوای میهرەبان! کەس هیچی پێنەگوتم!

دنیا گەرمە، هەموو شتێک دەجووڵێت و دەنگدانەوەیەکی نەرم و ناسکی هەیە. ئاوی ڕوبارەکە، خۆی دەکێشا بەقەد کەشتیەکەدا. کە لە پەنجەرەی ژوورۆچکەی کەشتیەکەوە سەیرت کردبا لەبەر ڕۆشنایی بلاجکتۆرەکەدا جەرەیانی ئاوەکە وەکو نەوارێکی پان دەینواند، لە دووری دوورەوە، تا چاو هەتەری دەکرد هەر مێرگ بوو، یەکپارچە درەختی بەرز بوو و چووبوون بە ئاسمانا. گوێم بەم دەنگانەی کە لە کەشتیەکەوە بەرز دەبوونەوە، لە ڕوبارەکەوە هەڵدەستان، یان لە دەشت و بیابانە دوورەکانەوە دەهاتن ڕاهاتبوو، ئەو دەنگانە سەرنجیان ڕانەدەکێشام، تەنیا بێدەنگی سەرنجی ڕادەکێشام. یەکێک لە دەریاوانەکان، لە پێشی کەشتیەکەوە بوو، بەردەوام، بەدەنگێکی گڕ و زبر هاوری دەکرد:- حەوت، حە. و. ت!

خۆزیام دەخواست لە هەموو شتێک دووربم، گوێ لە هیچ نەگرم، هیچ کارێک نەکەم، پەنجە بە ئاوا نەکەم. بەڵکو لە

سـێبەرێکا دابنیشـم و لە بـۆنی گەرم و چەوری مـووبەقەکە دووربم. دابنیشم و بەچاوی خەواڵووەوە تەمەشای ئەو ژیانە دژوار وناخۆشە بکەم کە بەم ئاو و ڕووبارەوە پەیوەست بوو.. بەڵام بڕیـار بەدەسـت خـۆم نیـیە، بەڵکـو بە دەسـت یـارۆی ئاشپەزە کە دووبارە ئەمری پێکردم:- بخوێنەوە!

هەمـوو خزمەتگوزارەکـان، بە سەرۆکەکەشـیانەوە کە پیـاوێکی بێـدەنگ و کەم دوو بـوو، لێـی دەترسـان و سـڵیان لێدەکردەوە.

سموری، هاواری لە خزمەتگوزارانی خوارەوەی کەشتییەکە دەکرد:

- ئەهای بەراز باوکینە لەگەڵ ئێوەمە، کوا وەرن بەلامەوە، دزینە، هۆقیانە!

دەریـاوان وشـاگردەکانیان زۆریـان ڕێـز دەگـرت، بگـرە ڕوپامـایی و مەرابیـان لەبەر دەکـرد. بە قـاورمەی مەنـجەڵەکە دەمی چەور دەکردن و هەواڵی خانەوادەو کەس و کار و ئەو گونـدانەی دەپرسـی کە لێـوەی هـاتبوون. دەریـاوانە بێلەڕووسەکان، هەموو چڵکن وپلکن، سەراپا لە گریس و ڕۆنـا، بە لۆمپەنی کەشتیەکە دەژمێردران. ڕووسەکان پێیان دەگوتن مانگا. جا بۆئەوەی زیاتر تووڕەیان بکەن بانگیان دەکردن:- مانگا، مانگا، ئەو چاڵە چی تیایە؟!

سموری ئەمەی زۆر لەبەر گران بوو، خۆی گف دەکردەوە، دەم وچاوی سوور دەبووەوە، هاواری بەسـەر کەشتیرانەکاندا دەکرد:

- بـۆچی ڕێگەیـان دەدەن گاڵتەتـان پێـبکەن، چمـا ئێـوە بەشەرنین؟ دەم ودانیان بشکێنن، خوێڕیانە!

عەریفـی کەشـتیەکە کە پیـاوێکی بـوغزنی شـیکپۆش بـوو، ڕووی تێکرد وگوتی:

- ڕووسی و بێلەڕووسی فەرقیان نییە.

یارۆی ئاشپەز پڕی دایە، توونـد پشـتێنەکە و یەخەی گرت وبەرزی کـردەوە، وەکـو چـۆلەکە سـەمای پێدەکرد. هـاواری بەسەردا کرد:- دەتەوێ بت پلیشێنمەوە!

زۆرجار دەبوو بە شەڕ، بەڵام کەس زاتی نەدەکرد خۆی لە قەرەی سـموری بـدات، نەک هەر لەبەر ئەوەی زۆر بە قـوەت بـوو، بەڵکو لە بەر ئەوەش کە بەینـی لەگەڵ ژنەکەی ' کـاپتن ' شـدا خۆشـبوو، کە ژنێکـی بـاڵابەرز و ڕێـک وپێـک و ڕوخسـار پیاوانە و قژکورتی قژ کوڕانە بوو.

ئەم پیــاوە ڤۆدکــایەکی زۆری دەخــواردەوە، بەڵام قەت مەسـت و سـەرخۆش نەدەبوو. لەگەڵ گەردی بەیانیـدا دەسـتی بە خـواردنەوە دەکـرد، یەک بـوتڵی بە چـوار قـوم هەڵـدەدا، بە درێژایــی ڕۆژ بیــرەی دەخــواردەوە. بەرە بەرە ڕوخســاری سـوور هەڵـدەگەرا. چـاوە ڕەشـەکانی لە ڕادەبەدەر دەکـرانەوە، وەکو ئەوەی لە شتێک حەپەسابێت.

هەنــدێجار ئێــواران، بە ســەعاتان لە ســەر تەپلەکێــک ڕۆدەنیشــت، بە کەلەشــی زەلام و ڕوخســارە ســپیەکەیەوە، بەبێـدەنگی، مــات وخەمــین دەیـڕوانیە ئاسـۆ. لەم حـاڵەتەدا هەمووان لێی دەپرینگانەوە. بەڵام من دڵم بەحاڵی دەسووتا.

یاکوف ئیڤانوڤیچ لە مووبەقەکەوە سـەر دەکێشـێ، ئـارەقەی دنیـای کـردووەتەوە، دەموچـاوی سـوور هەڵـگەڕاوە، سـەرە سافەکەی هەڵدەکرێنێت، ئەوجا بەدەست ئاماژە دەکـات یـان لە دوورەوە هاوار دەکات:- ماسیەکە بۆگەنی کرد.

- بە کەلەرمەوە لێی بنە .

- ئەدی ئەگەر یەکێک شۆربای ماسـی، یـان ماسـی برژاوی داواکرد؟

- بۆیان ئامادە بکە. هەرچییەکیان بدەیتێ دەیخۆن.

هەندێجار، زاتم وەبەرخۆ دەنا ولێی نزیک دەبوومەوە. ئاوڕی لێدەدامەوە و دەیگوت:- ها، چیت دەوێ؟

- هیچ.

- دەی باشە.

جارێک لێم پرسی:- باشە ئەمانە بۆچی لێت دەترسن، خۆتۆ پیاوێکی باشیت.

بەپێچەوانەی مەزەندە و وێنای خۆمەوە، تووڕە نەبوو، بەرسڤی دامەوە:

- من تەنیا لەگەڵ تۆدا باش و میهرەبانم.

کەمێک لە فکران ڕاچوو و بە ڕووخۆشی گوتی:

- ڕەنگە دەرهەق بە هەمووان میهرەبان بم، بەڵام دەری نابڕم. پیاو نابێ باشی و میرەبانی خۆی بۆ خەڵکی دەرببڕێت. چونکە دەتخۆن، خەڵکی سواری کۆڵت دەبن، وەکو چۆن لە قوڕی و زەلکاوێکدا، خۆ هەڵدەدەنە سەر بچووکترین وشکانی و پێ شێلی دەکەن. ڕاکە بیرەیەکم بۆ بێنە.

هەرکە بیرەکەی، پێک لە دوای پێک خواردەوە، سمێڵەکانی سڕی وگوتی:

- ئەگەر تۆزێ گەورەتر بوایەی زۆرشتم فێر دەکردی. من گەرما و سەرمای ژیانم جەڕباندووە، زۆریش گەمژە و گەوج نیم. تا دەتوانی کتێبان بخوێنەوە. هەرچیت بوێ لە کتێبدا هەیە. کتێب گاڵتەی پێناکرێ، شتێکی زۆر بەنرخە. بیرە دەخۆیتەوە؟

- نا، حەزم لێی نییە.

- زۆرچاک دەکەی، مەخۆرەوە، مەیگوساری بەڵایەکی گەورەیە. ڤودکا ئاوی حەیات نییە، ئاوی شەیتانە. ئەگەر دەوڵەمەند بوایەم لە سەر حیسابی خۆم بۆ قوتابخانەم

دەناردیت، دەمخستیتە بەرخوێندن، خەڵکی نەخوێندەوار وەکو گاجووتە، یان نیری لە مل دەکەن یان سەری دەبڕن، هیچ ڕێگەیەکی دی لەبەردەم نییە.

ژنەکەی کاپتن، کتێبی ' تۆڵەی سامناک 'ی گۆگۆڵی بە ئەمانەت دایێ. من ئەم کتێبەم خوێندەوە، زۆرم بەدڵ بوو، بەڵام سموری توورەبوو، هاواری دەکرد:

- کە کارێکی گەوجانەیە! ئەمە چ گاڵتەبازارێکە! من دڵنیام کتێبی دیکە هەن.

کتێبەکەی لێوەرگرتمەوە، کتێبێکی دیکەی لەلای ژنەکەی کاپتن هێنا. بە ڕاوێژێکی توند ئەمری پێکردم:- هانێ ' تاراس ' بخوێنەوە، ناوەکەی تری چییە، لە بیرم نەماوە؟ ئەم کتێبە بخوێنەوە. خانم دەڵێت کتێبێکی باشە. بۆ کێ باشە؟ ڕەنگە بۆ خانم باش بێ، بۆمن باش نەبێ. خۆ دیوتە چۆن قژی بڕیوە؟ ئەدی بۆ گوێی نەبڕیوە؟

کە گەیشتینە ئەو پەرەگرافەی کە تاراس، ئوستاپی کوڕی بۆ شەڕ هاندەدات، یارۆی ئاشپەز بە دەنگێکی گڕ پێکەنی وگوتی:

- بۆچوونت بەرانبەر ئەمە چییە؟ یەکێکیان ئەقڵی هەیە و ئەویتریان قوەتی هەیە. قسەی بەلاش، بە ڕاستی کەرن!

بە وردی گوێی دەگرت، ناو بە ناو بە دەم مینگەمینگەوە دەیگوت:

- قسەی هیچ ! کێ دەتوانێ بەیەک جەزرەبە، مرۆڤێک لە تەپڵی سەرەوە تا ناوقەدی شەق بکات؟ ئەمە مەحاڵە، قەت ناکرێ کەسێک بە نێزەیەک بەرز بکرێتەوە، چونکە نێزەکە دەشکێ. من بەخۆم سەرباز بووم و ئەم شتانە باش دەزانم.

زۆر بە خیانەتەکەی ئەندرێ پەست بوو، گوتی:

- که پیاوێکی خوێڕی و بوودەڵەیە! هەرهەموو ئەمە لە پێناوی ژنێکدا، تفو عەمرت نەمێنێ بۆ خۆت وغیرەتت!

کاتێ تاراس، بە دەستی خۆی کورەکەی دەکوژێت، یارۆی ئاشپەز لە سەر قەرەوێڵەکە دادەنیشێت، لاقی شۆڕ دەکاتەوە، هەردوو دەستی بەقەراخ قەرەوێڵەکەوە گرت، پشتی کووڕ کردەوە، دەستی بەگریان کرد. ڕوندک بە ئەسپایی بەچاوانیا هاتنەخوارێ، بەدەنگی بەرز ئاهێکی هەڵکێشا و لەبن لێوانەوە گوتی:- خودایە! ئەی خودای بێخەم!

لە ناکاوا هاواریکرد:- بەردەوام بە، بخوێنەوە هەی توخمە شەیتان!

کە ئوستاپ، بەرلە مردنەکەی ئەم قسەیەی بە باوکی گوت: " باوکە، گوێت لێمە؟ " یارۆی ئاشپەز، کەوتە هەنسک هەڵدان و گریان، گریانێکی بەکوڵ و بەجۆشتر لەوەی پێشوو. سموری بەدەم ڕوندک ڕشتنەوە گوتی:

- تەواو، هەموو شتێک تەواوبوو. هەموو شتێک کۆتایی هات، بەڵام چ کۆتاییەکی کارەساتبار! ئەوانە بەڕاستی پیاو بوون، خەڵکانی جوامێر بوون، ئەم تاراسە، بەڕاستی پیاو بووە، ئۆباڵ بە ئەستۆم جوامێر بووە.

کتێبەکەی لە دەستم ڕاپسکاند، بە وردی دیقەتی دەدا، بە فرمێسکان، بەرگەکەی تەڕکرد:- کتێبی باش نیعمەتە!

دوای ئەوە چیرۆکی "ئیڤانیکو" مان خوێندەوە. سموری بە تەواوەتی دڵبەندی ڕیچارد پلانتاجینێ بوو، پاش ئەوەی سۆزی هاتنەجۆش، بە ئارامی گوتی:- ڕاستە، وایە، بەڕاستی ئەمە کتێبە نە گاڵتە!

من ئەو چیرۆکەم بە دڵ نەبوو. بە شێوەیەکی گشتی زەوق و سەلیقەمان وەکو یەک نەبوو. بۆ نموونە من " چیرۆکی

تۆماس جون ' م زۆر بەدڵ بوو. ئەمە پاچڤەیەکی کۆنی کتێبی (مێژووی تۆم جونی بیژوو' بوو.

سموری، بە ناڕەزاییەوە گوتی:

- قسەی بەلاش! چم داوە لەم تۆماسە؟ چی لێبکەم؟ کتێبی لەمە باشتر نەبوو!

ڕۆژێک پێمگوت با کتێبی دی – کتێبی یاساغ هەیە، ئەو کتێبە نهێنیانەی، کە دەبێ شەوان و لە ژێرزەمیناندا بخوێنرێنەوە.

چاوەکانی ئەبڵەق بوون، سمێڵەکانی کەوتنە لەرزین، گوتی:- ئەوە چ دەڵێی؟ وڕینە دەکەی؟

- نا، وڕینە ناکەم. جارێک قەشەیەک کە بۆ ئیعتراف چووبوومە لای پرسیاری ئەوجۆرە کتێبەی لێکردم، هەروەها بەچاوی خۆم خەڵکانێکم بینی، لە ژێرزەمینێکدا بەدەم خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانەوە دەگریان.

سموری، بە خەمینییەوە لێی ڕوانیم و پرسی:- کێ دەگریا؟

- ئەو خانمەی گوێی لە خوێندنەوەی کتێبەکە دەگرت. ئەو ژنەی کە کتێبەکەی دەخوێندەوە هەڵات، دیاربوو زۆر ترسابوو.

سموری، چاوەکانی بە ئەسپایی بچووک کردنەوەو گوتی:

- بەزاتی خوا خەو دەبینی، لەزێکە ڕابە.

کەمێک دەفکرەوە چوو ئەوسا درێژەی دایێ:

- بێگومان... لە شوێنێک هەندێک شت هەن.. هەندێ شتی نهێنی.. بەڵام من پیرم.. لەو جۆرە کەسانە نیم کە.. وێڕای ئەوەش کە بیر لەو شتانە دەکەیەوە..

بە سەعاتان، بەو شێوازە قسانی دەکرد..

ئیدی بەبێ ئەوەی بەخۆ بزانم ڕموودەی خوێندنەوە بووم، زۆر لەزەتم لێدەبینی. بەڕاستی چیرۆکی ناو کتێبان هەموو ئەو

ڕەنــج و ئــازارانەی لە بیــر دەبــردمەوە کە لە ژیــانی واقعیــدا تووشــی دەبــووم. " سـموری " ش وەکـو مـن ڕمـودەی کتێبــان بـوو، زۆرجـار، لە سـەر ئیشــەوە بـانگی دەکـردم و دەیگـوت:- پشکوف! وەرە کتێبم بۆ وەخوێنە.

- قــاپ و ئامــانی دنیــام بە ســەرا کەڵەکە بــووە دەبێــت بیانشۆم.

- گوێی مەدەیە ماکسیم لە جیاتی تۆ دەیانشوات.

ئیدی ئەمری بە گەورەی قاپشۆرەکان دەکرد کە کارەکەی من بکات، ئەویش لە ڕقا، پەرداخەکانی دەشکاند.

جارێک، بەرپرسی خزمەتگوزارەکـان، بەشـێنەیی ئاگاداری کـردمەوە وگـوتی:- ناچـارم مەکە دەرت بـکەم و دوو پێــت نەیەتەوە ناو ئەم کەشتیە.

جارێک ماکسیم، بە ئانقەست هەندێک پیاڵە و پەرداخـی لە نـاو تەشـتە ئـاوە پیســەکە بەجـێ هێشـتبوو، وەختـێ تەشـتە ئـاوەکەم لە سـەر کەشـتیەکەوە هەڵڕشـتە نـاو ڕوبـارەکە، پیـاڵە وپەرداخەکـانیش کەوتـنە ڕوبـارەکەوە. سـموری بە بەرپرسـی خزمەتگوزارەکـانی گـوت:- خەتــای مــنە، خەمــت نەبــێ مــن پارەکەیت بۆ دەبژێرمەوە.

خزمەتگوزارەکان مۆرەیان لێم دەکرد، تەشەریان لێدەدام و دەیانگوت:

- دەی برادەر، کرمی کتێبان، بڵێ تۆ لەم کارە چیت دەسـت دەکەوێ؟

ئیـدی بە ئانقەسـت کارەکانیـان بە سـەرمەوە زیـاد دەکـرد، قاپەکانیــان پــیس دەکــرد. هەســتم دەکــرد، ئەم ڕقبەڕقــێ و دژایەتیە، بە زەرەری من دەشکێنەوە، کە هەرواش دەرچوو.

شەوێک، لەبەندەر ولەنگەرگایەکی بچووکا، ژنێکی ناقسالی دەم وچاوئـــاڵ، لەگەڵ کچێکـــی جەوان دا کە سەرپۆشـــێکی زەردی بەســـەریا دابـوو و ئێلەکێکـی پەمەیـی لەبەردا بـوو، سەرکەوتنە سـەر کەشتیەکەمان، هەردووکیان کەمێک مەست بوون. ژنەی تاین پێدەکەنی و بە ئاماژەی سەر بە ڕاست و بە چەپدا سڵاوی لە هەمووان دەکرد ودەیگوت:

- هاوڕێیـان ببـورن، کەمـێکم خواردبـووەوە و بردیـانم بـۆ دادگا، کە لەوێ بەریاندام، ئیدی لە خۆشیا بەو بۆنەیەوە چەند پێکێکم خواردووەتەوە.

کـچەکەش، قژقـژ پێـدەکەنی. تەمەشـای دەوروبەری خـۆی دەکـــرد و هـــاوڕێکەی دەڵەک دەدا و دەیگـــوت:- ڕێـــکە، دە بجوولێ، تەمەڵ.

لە ژووره نمره دووەکان، ڕوو بە ڕووی خەوگاکەی یاکوف ئیڤـانوفیچ و سـێرگی ماکسـیم دابەزیـن. دوای مـاوەیەکی کەم ژنەکە دیار نەما، سێرگی لەولاوه هات و لە لای کچەکەوە جێی خۆی خۆشکرد، دەمە قوڕباقە ئاساکەی نەدەهاتەوە یەک.

دوای ئەوەی ڕۆژ ئـاوابوو و لەکـار بـوومەوە، وەختـایەک خەریک بوو دەخەوتم، سێرگی هات بە سوراخمەوە و دەسـتی گرتم و گوتی:- وەره دەمانەوێ ژنت بۆ بێنین.

مەسـت بـوو، ویسـتم دەسـتم لە دەسـتی دەربێـنم، بەڵام زللەیەکی خێواندمێ و گوتی:- وەره!

ماکسـیم، کە ئەویـش مەست بوو، خـۆی گەیاندینێ، بە نـاو ڕێبـواره نووســتووەکاندا بـۆ ژوورەکەی خۆیانیـان بـــردم. ســـموری لە بەر دەرگـــای خەوگـــاکەدا وەســـتابوو، یـــاکوف ئیڤـانوڤیچ بەر دەرگـاکەی لە کیـژێ گرتبـوو ونەیدەهێشـت لە

ژوورەکە بێتەدەرێ، کچەی تاین بە مست بەربووبووە، شان و شەپیلکی و مەستانە هاواریدەکرد:- ڕێمکەن با بڕۆم!
سموری، لە دەستی سێرگی و ماکسیمی دەرهێنام، قژی گرتن و سەری کێشان بە یەکدا و تووڕی دانە سووچێکەوەو کەوتنە سەر ئەرزەکە. هەنگێ، ڕووی کردە یاکوف، دەرگاکەی بە ڕوویا داخست و بەدەم جنێودانەوە گوتی:- حەیوانینە!
ئەوجا، منی لە خۆی دوور خستەوە وگوتی:- بڕۆ، لەم ناوە نەمێنیت!

بە هەشتاو چووم بۆ بەشی دواوەی کەشتیەکە. دنیا هەور بوو، ڕوبارەکە زۆر تاریک دەینواند. ئێمە لە دوای کەشتیەکەی خۆمانەوە دوو هێڵی سپیوازمان بەجێ دەهێشت.. کە تا کەنارە نادیارەکان بڕیان دەکرد، بەلەمەکەی دوامان بەبەینی ئەو دوو هێڵەدا دەهات. هەندێک ڕوناکی سورباوی کز، لەم بەرو لەو بەرمانەوە، لە ڕاست و لە چەپمانەوە ناو بە ناو چاوبڕکێیان لەگەڵ دەکردین و پاشان بلەز لە بەینی هەوراز و نشێوی شەپۆلەکاندا گوم دەبوون. شەو سات بەسات تاریکتر دەبوو و منیش پەست و پەست تر دەبووم. ئاشپەزەکە هات، لەلامەوە دانیشت، بۆنێکی تیژی لێوە دەهات، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، سیغارێکی پێکرد و ئەوجا گوتی:
- دەیانویست بۆلای ئەو کچەت بەرن؟ کە زۆڵ و دایک خۆگێن! گویم لێبوو کە تەگبیریان دەکرد. گوێم لێبوو کە هێرشیان بۆ کیژێ برد.
- کچەکەت لە دەستیان ڕزگار کرد؟
- کچەکە؟
جنێوێکی بە کچەکە دا و، بە ڕاوێژێکی پڕ ئازارەوە گوتی:

- ئەمانە، لێرە هەموویان هۆڤین. کەشتیەکە لە گوندی خراترە. قەت لە گوندا ژیاوی؟

- نەخێر.

- بە کورتی گوند پیسە، بۆگەنە. بەتایبەتی لە زستاندا. قونکە سیغارەکەی لە سەر کەشتیەکەوە فڕێ دا، کەمێک بێدەنگ بوو و ئەوجا درێژەی دایێ:

- تۆ لە نێو ئەم بەراز باوکانەدا تیادەچیت، دیق دەکەیت، دڵم بەحاڵت دەسووتێ، مشکە چکۆل. بەڕاستی تیاماوم، نازانم چی بکەم. هەندێجار ئەگەر جڵەوی خۆم نەگرم، لەگینە بڕۆم، بکەومە خاک وپایان و لێیان بپاڕێمەوەو بڵێم: " ئەمە چ کارێکە ئێوە دەیکەن کەر پیاوینە؟ مەگەر کوێرن؟ هەی وشترینە! "

دەنگێکی دوور ودرێژی شووت ئاسا لە کەشتیەکە بەرز بووەوە، ئەو پەتەی کە بە بەلەمەکەوە بەسترابوو، خاو بووەوە و بەرز بووەوە و شلێپ وەکو قامچی بەسەر ئاوەکەدا داهاتەوە. ڕوناکی فانۆسێک دڕی بە تاریکی شەوەکە دا. ڕوناکی دیکەش لە ناو جەرگەی تاریکییەکەوە هەڵدەقولا.

یارۆی ئاشپەز، مینگە مینگێکی کرد:

- ئێرە وێستگەیە، جاران پێیان دەگوت وێستگەی " غابة سکری " و ڕووبارێکی لێیە پێیان دەگوت: " نهر سکران ". کاتی خۆی ژمێریارێکی لێبوو پێیان دەگوت سکیروف، فەرمانبەرێکی لەگەڵ بوو پێیان دەگوت مخموروف... دەبێ دابەزم و سەرێک بدەم.

ژنانی قوت وقەڵەوی بە داروباری دەڤەر وکەنارانی ڕووباری کاما بەدەستەبەرە، ئێزینگ قەڵاشکەرییان بۆ سووتەمەنی وشەواتەکی کەشتیەکەی ئێمە دێنا، ئەمانە لە ژێر بارە قورسەکانیاندا چەمی بوونەوەو زۆر بە ئەسپایی و نەرم

وهاوسەنگی هەنگاویان دەنا و دووبە دوو بەرەو ئاگردان و کوورەی کەشتیەکە دەهاتن و بارەکانی خۆیان لەوێندەر بەتاڵ دەکرد.. دەریاوان و کەشتیڕانەکان، بەدەم ڕێوە دەستیان بۆ سینگ و مەمکیان دەبرد و نقورچیان لە سمت و لاڕانیان دەگرت. ژنەکان دەیانقیژاند و تفیان دەکردە چارەیان. بەلام لە گەڕانەوەدا، کە بارەکانیان دانابوو، ڕێگەیان لەو کارانە دەگرت و بە دەستە بەرەکانی دەستیان بەرەڤانیان لە خۆ دەکرد. ئەم دیمەنانە زۆرجار و لە هەر سەفەرێکماندا دووبارە دەبوونەوە. هەرجارێ لەنگەرمان بگرتایە و پێویستیمان بە ئێزینگ و قەلاشکەری بوایە، ئەم دیمەنانە دووبارە دەبوونەوە.

وام هەست دەکرد زۆر پیربووم و زۆر لەمێژە و سالانێکە لەسەر ئەم کەشتیە کاردەکەم. دەمزانی سبەینێ یا هەفتەی ئاینده یان پاییزی داهاتوو چ ڕوودەدات.

سپێدە خەریک بوو ڕوناک دەبووەوە، کاژستانێکی گەورە لە سەر گردۆلکەی لمەلانی سەرووی وێستگە و بەندەرەکەوە بەدیارکەوت. کۆڕی ژنان بەدەم قاقا و گۆرانی و سترینەوە، بەو گردەدا سەر دەکەوتن کە دەچوو بۆ ناو کاژستانەکە، هەموو دەستەبەرە بەدەست و بەشان وەکو سەربازان ڕێیان دەکرد. زۆر دلم تەنگ بوو، ڕوندک لە ناخمەوە هەلدەقولا، حەزم دەکرد تێرتێر بگریم، بەلام شەرمم دەکرد بگریم، بۆیە چووم بۆلای " بورین "ی دەریاوانی کەشتیەکە و لە گەل ئەودا کەوتمە شۆردنی سەری کەشتیەکە.

بورین گەنجێکی سیمالێل، بێڕەنگ، بێدەنگ، گۆشەگیر بوو. هەمیشە کونجێکی دەگرت، بەچاوە بچووکەکانی دەیڕوانی، جارێکیان پێی گوتم:- ئەلهەقی نازناوی من بورین نییە، بەلکو " عورین " ە چونکە گوایە دایکم سۆزانی بووە! خوشکێکم

هەبوو، ئەویش لەشفرۆش بووە، ئیدی وادیارە قەدەریان ئەوە بووە. قەدەر، برام بەردێکە و بەملتەوە هەڵواسراوە، تۆ دەتەوێ هەستیت، بەردەکە ڕێگەت نادات.

ئەمجارەیان بەدەم سڕینی حەوشی کەشتیەکەوە، بەڕاوێژێکی نەرم گوتی:

- دەبینی چۆن بەسەر ئەو ئافرەتانەدا دادەبارین؟ تۆ بیر بکەوە، ئەگەر بتەوێ، چەرمێکی تەڕ بسووتێنی، ئەگەر کۆڵنەدەیت و هەر سوور بی لە سووتاندنی، ئەنجام دەیسووتێنی و ئاگر دەگرێت. من ئەم کارانەم لا پەسند نییە، حەزم لەو کارانە نییە، بۆم هەرس ناکرێت. من ئەگەر ژن بوایەم، خۆم لە گۆلاوێکی قوولا غەرق دەکرد... زۆر زەحمەتە مرۆڤ بەدڵی خۆی بکات، ئەوە بکات، کە حەز دەکا بیکات، ئیدی بەو جۆرە، هەست وسۆزت دەهاڕوژێنن! خوات نایەڵن! بە قەناعەتی من خەسیوان شێت نین. هیچت دەربارەیان بیستووە؟ ئەمانە خەڵکانێکی زۆر زیرەکن- باشترین شێوازیان بۆ ژیان هەڵبژاردووە. هەموو کاروبارە ناچیزەکانی ژیانیان وەلاوە ناوەو بەو پەڕی پاکی و بێگەردی خزمەتی خوا دەکەن.

ژنەکەی کاپتن بەلاماندا تێپەڕی، چمکی تەنوورەکەی هەڵکرد تا تەڕ نەبێت. هەمیشە بەیانیان لەپێش هەموانەوە لەخەو رادەبوو، ژنێک بوو بەژن زراڤ، بەداروبار، دەم وچاوێکی سادە و ڕوناکی ئەوتۆی هەبوو، کە پڕ بەدڵ حەزم دەکرد بەغار دوای بکەوم و لە ناخی دڵەوە پێی بێژم:

- خانم، تکایە، شتێکم بۆ بگێڕەوە!..

کەشتیەکە بە ئەسپایی جوڵا، بەرەبەرە لە وێستگەکە و لەنگەرگاکە دوورکەوتەوە.

بورین، نیشانەی خاچی کێشا وگوتی:- ئەوا دەرچووین.

## (٨)

ماکسیم لەساراپول، بە ئەمری کاپتن لە کەشتیەکە دابەزی، بە بێدەنگی بێئەوەی دوعاخوازی لە کەس بکات، بە هێمنی دابەزی. ژنە دەم بەپێکەنینەکە و کیژە ماندووە چاو ئاوساوەکەش دوای کەوتن. بەڵام سیرگی ماوەیەکی زۆر لەبەر دەرگای ژوورەکەی کاپتن کەوتە سەرچۆکان، لا شیپانەی دەرگاکەی ماچ دەکرد و تەوێڵی بە دەرگاکەدا دەکێشا و دەلالایەوەو دەپاڕایەوە:

- بمبورە، خەتای من نەبوو. خەتای ماکسیم بوو.

دەریاوان و خزمەتگوزارانی کەشتیەکە و هەندێک لە ڕێبوارەکانیش دەیانزانی کە درۆ دەکات، کەچی وێڕای ئەوەش هانیان دەدا:- دەی دەی بەردەوام بە! دڵنیابە کە لێت دەبورێت..

لە ڕاستیا کاپتن، لێی خۆشبوو، ئەمری پێکرد کە خۆڵ وخاشاکەکان پاکبکاتەوە، لە دواوە شاپێکی خێواندێ کە لەسەر کەشتیەکە هەڵی پەڕاند. دوای تۆزێک سێرگی، بە دەم کۆکردنەوەی قاپ و پەرداخەکانەوە، بە ناو خەڵکەکەدا دەڕۆیی و وەکو سەگێکی کوتەک خواردوو، بە ڕووگرژی دەیڕوانیە خەڵکەکە.

لە جیاتی ماکسیم سەربازێکی دێرینی خەڵکی فیاتکایان دامەزراند، ئەمە گەنجێکی ڕیوەڵەی سەرچکۆلەی چاو قاوەیی بوو. ئاشپەزی دووەم یەکسەر ناردی کە چەند مریشکێک سەر ببڕێت، کابرای کۆنە سەرباز دووانی سەربڕی ومریشکەکانی دی بە حەوشەی کەشتیەکەدا بڵاوبوونەوە. ڕێبوارەکان هەوڵیان دا بیانگرنەوە، سیانیان لە سەر کەشتیەکەوە هەڵفڕین. کابرای سەرباز خەم دایگرت، لە سەر کۆمایەک داردا،

لەبەردەم مووبەقەکەدا ڕۆنیشت و دەستی بە گریانێکی بەکوڵ کرد.

سموری بە سەرسامیەوە لێی پرسی:

- ئەوە چیتە گەوجە؟ کێ دیویتێ سەرباز بگری؟ سەرباز وگریان کوجا مەرحەبا!

سەربازەکە بە نەرمی وەڵامی دایەوە:- من جەنگاوەر نەبووم.

بەو قسەیە خۆی کرد بە گەپجاڕ، ڕێبوارەکان دوای نیو سەعاتێک سەریان بووەوە، بەکۆمەڵ دەهاتنە تەمەشای سەربازەکە ودەیانپرسی ئەمەیە، ئەوجا لە قاقای پێکەنینیان دەدا. کابرای سەرباز لە هەوەڵەوە نەیدەزانی بۆ وادەکەن، گوێی بە پێکەنینەکەیان نەدا، بەڵکو لە جێی خۆی دانیشتبوو بە قۆڵی کراسە کۆنەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی. دەتگوت گەرەکیە بە قۆڵەکانی چاوی لە خەڵکی بشارێتەوە. بەڵام زۆری پێنەچوو چاوانی لە تووڕەییدا سوور بوون، بەزمانی خەڵکی ڤیاتکا کەوتە بۆڵەبۆڵ:- بۆچی تەمەشام دەکەن؟ بڕۆن بە نەعلەت بن لەگەڵ شەیتانا!

ئەو قسانە هێندەی دی دەیهاروژاندن، ئیدی ختووکەیان دەدا، کراسەکەیان ڕادەکێشا، بەبێ هیچ بەزەییەک سەریان دەکردە سەری و پێیان ڕادەبوارد، تا کاتی فراڤین هات. دوای نیوەڕۆژە، یەکێکیان توێکڵە لیمۆیەکی کرد بەسەری چنگاڵێکەوە و لە دواوەوە بە پەتی بەرکۆشەکەیەوە بەست. ئیدی کەوچکەکە لەگەڵ هەر جووڵەیەکی سەربازەکەدا بەم لاو بەولادا سەمای دەکرد. ئیدی خەڵکەکە لەپێکەنینا دەبوورانەوە. کەچی ئەو وەکو مشکێک بە نیگەرانی لەناو قەفەزێکدا بێ و

بچێ، هەرچی دەکرد و دەکۆشا سەری لە سەدەمیپێکەنینەکەی ئەوان دەر نەدەکرد.

سموری، بە بێئەوەی ورتەی لێوەبێ، تەمەشای دەکرد و بەچاویا دیاربوو خەفەتی بۆ دەخوارد. هەر لە خۆمەوە بەزەییم بە سەربازەکەدا دەهاتەوە. لە ' سموری ' م پرسی:- مەسەلەی چنگاڵەکەی پێ بڵێم؟

بە ئاماژە تێی گەیاندم کە ئا، هەرکە پێمگوت بۆ پێدەکەنن، بەتووندی چنگاڵەکەی ڕاپسکاند، پەتەکەی پچڕی، چنگاڵەکەی بە عاردیدا کێشا و خستیەژێر پێ لەقە، ئەوجا بە هەر دوو دەستان لە قژم نەوی. بوو بەشەڕ و زۆرانبازیمان و بووین بە مایەی پێکەنین و گەپجاڕی ئەو خەڵکەی کە لە کەفلە کونێکا لێمان خڕ بوونەوە.

سموری، دڕی بە ئاپۆڕای جەماوەرەکە دا ولێکی جیاکردینەوە. کەمێک گوێی سوومەوەو ئەوسا گوێی سەربازەکەی گرت. خەڵکەکە کە ئەو سەربازە مردەلۆخەیان بینی بەو جۆرە هەڵدەبەزییەوەو دەیویست خۆی دەرباز بکات، کەوتنە فیکەکێشان و لاق بە ئەرزا کوتان وخەریک بوون لە پێکەنینا دەخنکان.

- ئافەرین، سەر بە ورگی ئاشپەزەکەدا بکێشە، بەر قۆچی بدە!

هەراوزەنای شادی شێتانەی ئەو خەڵکانە زۆری پەست کردم، حەزم دەکرد دەست بدەمە تێلایەک وبەربیمە سەر و گوێلاکیان.

سموری، سەربازەکەی بەرەڵلا کرد و وەکو ورچێکی هۆڤی ئاوری لای خەڵکەکەی دایەوە، ددانەکانی جیڕ کردنەوە، سمێڵەکانی کەوتنە لەرزین.

- هەرکەسە بچێتەوە جێی خۆی – یاڵڵا دەی، کێویانە!

سەربازەکە بۆ جاری دووەم پەلاماری دامەوە، سموری بە تاقە دەستێک لە ئەرزەکە بەرزی کردەوە و کەوتە هەڵگلۆفینی، دەتگوت بووکەڵەیە بە دەستییەوە.

هەنـــدێ دەریـــاوان و عەریـــفەکە و وەکیلـــی یەکەم بە هەڵەداوان هـاتن. کـۆمەڵە خەڵکێکـی دیکەمـان لێخڕبـوونەوە. ڕوخساری بەرپرسی خزمەتگوزارەکان، وەکو هەمیشـە، هێدی و هێمن لە نێو ئاپۆڕای خەڵکەکەوە بە دیارکەوت.

سەربازەکە لە سەر کۆمایەک دار ڕۆنیشت، بە دوو دەستی لەرزۆک قۆندەرەکانی داکەند و کەوتە گوشینی ئەو خەڕگە و پەڕۆیانەی لە هەردوو پێوەی پێچابوون بەڵام وشک بوون. ئاو لە قـژە گـڤ و لـوولەکەی دەچـۆڕا، کە بـووە مـایەی شـەپۆلە پێکەنینێکی تازە. کابرای سەرباز بە دەنگی بەرز هاواریکرد:

- ڕاوەستن، پەلە مەکەن، بزانن چۆن ئەو منداڵە دەکوژم!

سموری، چنگی بە شانما کرد و هەڵیگرتم، شـتێکی بەگوێی وەکیلـی یەکەمـدا چپانـد، دەریاوانەکـان، کەوتـنە بڵاوەپێکردنـی ئـــاپۆڕای خەڵـــکەکە. دوای ئەوەی ئـــاپۆڕاکە بڵاوەیـــان کـــرد، ســـموری ڕووی کـــردە ســـەربازەکە وگـــوتی:- ئێســـتا چیـــت لێبکەین؟

ســـەربازەکە، ورتەی نەکـــرد. بەدووچـــاوی دڕنـــدانەوە تەمەشـای منـی دەکـرد، سـەراپای دەلەرزی. سـموری ئەمـری پێکرد:- وریابە! هەی چەنەباز!

سەربازەکە وەڵامی دایەوە:- قسەی بەلاش! خۆ ئێرە سوپا نییە!

هەستم کرد، یارۆی ئاشـپەز بەو قسـەیە دەهـری بوو. گۆنـا گۆشتنەکانی داچەکینەوە، تفێکی ڕۆکرد ومنی لە گەڵ خۆی برد

ولەوێندەر دوورکەوتەوە. هەرچوارپەلم دەلەرزین، ژێراو ژێر نیگای سەربازەکەم دەکرد، بەڵام سموری ورتە ورتێکی کرد:

- کوڕێکی شەڕانیە، ئەمە چییە؟ یاڵلا با بڕۆین.

سێرگی خۆی گەیاندینێ و لەبن لێوانەوە گوتی:- دەیەوێ بە چەقۆ سەری ببڕێت!

سموری هاواریکرد:- چی؟

بە هەشـــــتاو گەڕایەوە. ســــــەربازەکە لەبەر ژووری خزمەتگوزارەکــــان ڕاوەســــتابوو، چەپەچــــاخێکی، کە لەو چەپەچاخانەی بۆ سەربڕینی مامر و کەڵەبابان و بڕینەوەی دار بۆنـاو سۆپا بەکار دەبرا، بەدەستەوە بوو، دەمەکەی مشـاری بـوو. خەڵکانێـک لەبەردەم ژوورەکە خڕبووبـوونەوەو سـەیری ئەو کـابرا ڕێـویەڵە قـژ تەڕەیـان دەکـرد. کەپـووە پسـەکەی دەلەرزی، دەمی کردەوە، لێوەکانی کەوتنە تەتەڵە، لە پەستا و بێ پسـانەوە دەیگـوت و دەیگوتەوە:- شـەیتانینە! شـەی... تـا... نینە!

خۆم هەڵدایە سەر شتێک کە نها بیرم نایە چ شتێک بوو، لەو ســـەرەوە، ســـەیری ســـەر وســـیمای خەڵـــکەکەم دەکـــرد. پێدەکەنین، قاقایان لێدەدا، یەکدیان دەدواند:

- تەمەشاکەن، تەمەشا!

کە ســـەربازەکە بە دەســـتە ڕەق وتەقەکـــانی کە لە دەســـتی منداڵ دەچوون،کراسـەکەی خسـتەوە نـاو پانتۆڵەکەی، پیـاوێکی گەنـج کە لەلای مـنەوە وەسـتابوو، هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و گـوتی:- کە بەتەمـای خۆکـوژییە، چمـا کـراس و پـانتۆڵەکەی ڕێکدەخاتەوە؟

ئـاپۆڕاکە لە قاقـای پێکەنینیـان دا. دیـاربوو کەس بـاوەڕی نەدەکرد بتوانێ خۆی بکوژێت. منیش باوەڕم نەدەکرد کاری

واهی بکات. بەڵام سموری دوای ئەوەی نیگایەکی کورتی کرد، بە ورگ دڕی بە خەڵکەکە دا و هاواریکرد:

- فەرموو، لاکەون، لێرە بڕۆن، گەوجە!

حەزی دەکرد ئەم وشەیە، بەمانای کۆ بۆ کۆ بەکار بەرێت. بۆنموونە کە لە کۆمەڵە خەڵکێک دەچووە پێشەوە، پێی دەگوتن:- فەرموو دوو بکەونەوە، گەوجە!

ئەوە زۆر خۆشبوو، ئەوەی ڕاستی بێ ئەو ڕۆژە لە بەیانیەوە تا ئێوارە، هەموو خەڵکەکە بووبوون بەیەک کەسی گەورەی گەوج.

هەرکە حەشیمەتەکە دوور کەوتنەوە، چوو بۆلای سەربازەکە، توند دەستی گرت و گوتی:- کوا ئەو کێردەم بدەیە.

سەربازەکە، کێردەکەی دایە و گوتی:- فایدەی نییە.

ئاشپەزەکە، سەربازەکەی کردە ژوورەوە.

- پاڵکەوە، بۆخۆت بخەوە. چییە، چیت بەسەر هاتووە؟

سەربازەکە، بەبێئەوەی هیچ وەڵامێک بداتەوە لە سەر تەختەکە ڕۆنیشت.

- ئێستا خوارنت بۆ دێنێت لەگەڵ کەمێک ڤۆدکادا. ڤۆدکا دەخۆیتەوە؟

- کەم.

- نەکەی ئازاری بدەی ها. ئەو گاڵتەت پێناکات، گوێت لێیە؟ من پێت دەڵێم دڵنیات دەکەم ئەو گاڵتەت پێناکات.

سەربازەکە بەنەرمی پرسی:- چما بەمجۆرە عەزابی ڕۆحم دەدەن؟

سموری، کەمێک دەفکرەوە چوو، ئەوجا بەرسڤی دایەوە:- چوزانم؟

به دووقۆڵی بۆ مووبەقەکە گەڕاینەوە. بەدەم ڕێگاوە لە بن لێوانەوە گوتی:

- هم، بزانە چۆن ئەو پیاوە داماوەیان بەگیر هێناوە. خۆ بەچاوی خۆت بینیت! خەڵکی شێتت دەکەن برام. دەتوانن، لە دەستیان دێت. وەکو مێشوولە تێت دەورووکێن، لە ناوت دەبەن، چیم دەگوت:- مێشوولە؟ ئەمانە هەزار قات لە مێشوولە وپێشکە خراترن!

کە تۆزێ خواردن وگۆشت وقۆدکام بۆ سەربازەکە برد، لە سەر تەختەکە ڕۆنیشتبوو، خۆی بە پێش و بە پاشا ڕادەژەند و بە ئارامی وەکو ژنان دەگریا. قاپەکەم لە سەر مێزەکە دانا و گوتم:- بخۆ.

- دەرگا دابخە.

- ئاخر تاریک دەبێت.

- دەرگاکە داخە، دەنا دێنەوە سەرم.

چوومە دەرێ. حەزم لە چارەی ئەو سەربازە نەدەکرد. هیچ سۆز وبەزەییەکی لەلا دروست نەکردم. ئەمەم لەبەر گران بوو. نەنکم هەموو جارێ دەیگوت:

- دەبێ بەزەییمان بە خەڵکدا بێتەوە.. بە هەموو کەسێکی کڵۆڵ و بێنەوادا، ژیان قورسە.

کە گەڕامەوە، ئاشپەزەکە لێی پرسیم:- شتەکانت دایێ؟ ئێستا حاڵی چۆنە؟

- دەگریا.

- نەبابە! ئای لەوە! ئەمە چۆن سەربازێکە؟

- من هیچ بەزەییەکم پێیدا نایەتەوە.

- ئەمە چییە؟

- پیاو دەبێ بەزەیی بە خەڵکیدا بێتەوە.

سموری دەستی گرتم و بۆلای خۆی ڕایکێشام. بە کەسەرەوە گوتی:

- تۆ ناتوانی خودی خۆت ناچار بکەی هەست بەبەزەیی بکات، درۆش ئاکامی باش نابێت، گوێت لێمە؟ لە هیچ شتێکدا دوودڵ مەبە، من تەبیعەت و ئەقڵیەتی تۆ دەناسم.

لە خۆیی دوور خستمەوە، بەڕووگرژییەوە گوتی:

- ئێرە بەکەڵکی تۆ نایەت، شوێنێکی باش نییە بۆتۆ. هانێ سیغارێک پێکە.

ڕەفتاری ڕێبوارەکان، خەمباری کردم. زۆر زاڵمانە کابرای سەربازیان دەبوغزاند، کە سموری گوێی گرت، قاقا پێی پێکەنین، ئاخر کەی ئەوە هی پێکەنین بوو، چۆن خەڵکی بە زوڵم پێدەکەنن؟ ئاخر کەی ئەوە هی ئەو هەموو گاڵتە و پێ ڕابواردنە بوو؟

جارێکی دی دادەنیشنەوە، لە سەر تەختەکان پاڵ دەکەون، دەخۆن و دەخۆنەوە، وەرەقبازی دەکەن، هێدی و هێمن گفتوگۆ دەکەن و یەکدی دەدوێنن و، لە ڕووبارەکە دەنۆڕن، وەکو ئەوەی هەرگیز خەڵکەکەی سەعاتێ لەوەپێش نەبن، کە دەیانقڕاند و دەیان شیڕاند و فیکەیان دەکێشا و دەتگوت هۆڤین. سەرلەنوێ هێور بوونەوە، هێدی هێدی بەسەر کەشتییەکەوە پیاسە وڕاوێچکەیان دەکرد، لە ژێر تیشکی هەتاوەکەدا دەتگوت پێشکە یان گەردی غوبار وتۆزن. هەندێکیان ئێستا بەسەر ئەو لەوحە درێژەوە بوون، کە لەبەینی کەشتیەکە و ئەرزەکەدا ڕایەڵ کرابوو، بەرلەوەی بگەنە سەر شۆستەی بەندەرەکە نیشانەی خاچیان دەکێشا. جەماعەتێکی دیکە کە کوت ومت لەوان دەچوون و هەمان جلو بەرگیان لەبەردا بوو، لە ژێر کۆڵەپشتیە قورسەکانیاندا دانەوی

بــــوونەوە، بە پـــێچەوانەی ئەوانەوە بۆســـــەر کەشـــتیەکە سەردەکەوتن..

ئەم ئـاڵوگۆڕە بەشـەریە، جـوونێ سـەردەکەوتن و جـوونێ دادەبەزین تەنیا گۆڕانی دەم وچاو بوو، بەڵام هیچ گۆڕانێک لە ژیـانی سـەر کەشـتیەکە ڕووی نەدەدا، هەمـان تـاس و هەمـان حەمام بوو، هەموو گفتوگۆ ومشت ومڕ وگەنگەشـەکان وەکو پێشووتر، دەربارەی زەوی وزار، بەروبووم، ئیش وکار، خوا و ژنان بوو، تەنانەت هەمان وشە و زاراوەشیان بەکار دەبرد.

- ویسـتی خـوایە کە بەشـەر دەبـێ ڕەنـج ببیـنن، ئەوەتـا ئێمەش شانمان داوەتە بەر ڕەنج، ئیدی چـارچییە، ئەوە قەدەر و چارەنووسمانە، چ شتێک لە گەڵ چارەنووسدا ناکرێت.

بە ڕاســـتی ئەو قسەوباســـانە پەســـتیان دەکـــردم. نە تەحەمـوولی پیسی و پۆخڵیەکانیانم دەکرد ونە هەڵس وکەوتی هۆڤیانەیانم بەدڵ بوو.. مـن بەهـیچ جۆرێ خـۆم بە شایستەی ئەو هەمــوو ڕەنــج و کڵـۆڵیە نەدەزانـــی کە ئەوانە بەوجـۆرە مامەڵەم لەتەکدا بکەن، ئاخر چ خەتایەکم کردبوو تا ئەو هەموو باجە بدەم. کابرای سەربازیش شایستەی ئەو مـامەڵەیە نەبوو. وابزانم ئەو خۆی حەزیدەکرد ببێت بە قەشمەڕ و گەپجاڕ..

" ماکسیم "یان کە کوڕێکی باش و دڵپاک بوو، لە کەشتیەکە دەرکـرد، کەچـی " سـیرگی "یـان کە کـوڕێکی بـوودەڵەی لەگـام بوو، هێشتەوە. کە نەدەبوو شتی وەهـا ڕوویـدات. هەنـدێجار لە خۆم دەپرسم باشە ئەم ڕێبوارانە، کە هەموو بە ڕواڵەت زاڵم و شـــەقی وتوونـــدە تەبـــیعەتن، بـــۆچی بەو ئاســـانیە مـــل بـــۆ دەســـــتوراتی گۆســـــاخانەی دەریاوانەکـــــان دەدەن وبـــــێ چەندوچوون، قسەی ڕەق و جنێوی پیسیان لێ قبووڵ دەکەن؟!

بۆنموونە بەڕێوەبەری کەشتیەکە، چاوە جوانەکانی بچووک دەکاتەوەو هاواریان بە سەردا دەکات:

- لاکەون لێرە، بۆچی هەمووتان لێرە کەڵەکە بوون، مەگەر نابینن کەشتیەکە خواربووەتەوە؟ دەی دوور کەونەوە، گەندەڵینە!

ئیدی ئەم گەندەڵانە بەبێئەوەی فزەیان لێوەبێت، بۆ لایەکەی دیکەی کەشتیەکە دەچوون کە سەر لەنوێ وەکو مێگەلە مەڕ لەوێندەرش دەردەکران.

- لاکەون، هیچ وپووچانە!

شەوانی گەرم، کوڕ نەبوو، لە ژێر ئەو جەمەلۆنە چینکۆیەدا کە بەدرێژایی ڕۆژ گەرمای هەتاوەکەی هەڵمژی بوو، هەڵبکات وبحەوێتەوە، ئیدی ڕێبوارەکان وەکو سیسرک پەراگەندە دەبوون و هەر کوێیەکیانبەدڵ بوایە، لەوێندەر لێی پاڵدەکەوتن. لە هەرشوێنێک کەشتیەکە لەنگەری بگرتایە، ئیدی دەریاوانەکان، بە لەقە و شاپان بێداریان دەکردنەوەو لەخەویان هەڵدەستانن.

- دەی هەستن، ڕێگای خەڵکیتان گرتووە، بچنە شوێن و ژوورەکانی خۆتان!

سووک و باریک هەڵدەستان، بە چاوی خەواڵووەوە بڵاوەیان لێدەکرد و هەرکەسە و گۆشەیەکی تەریکی دەگرت. دەریاوانەکان، تەنیا بە جلەکانیانا لە ڕێبوارەکان جیاوازبوون، کەچی وەکو پۆلیس ئەمریان بە سەردا دەکردن.

ئەوەی مایەی سەرنجە و پیاو پەست دەکات، ئەو گوێڕایەڵی و ملکەچییە نەنگینەیە کە ئەم ڕێبوارانە قەبووڵی دەکەن، کەچی هەندێجار ئەم ملکەچی وگوێڕایەڵیە کوێرانەیە، زۆرخراپ دەتەقییەوە و ئاکامی زۆر خراپ و خەمینی لێدەکەوتەوە! هەستم دەکرد، ئەو خەڵکە نازانن بۆ کوێ دەبرێن، لەوە دەچوو بەلایانەوە گرینگ نەبێت کەشتیەکە لە هەرشوێنێ هەڵیانڕێژێ. لە هەرشوێنێ دابەزێنرابان، بۆ

ماوەیەکی کەم لە بەستێن وکەنارەکاندا پشوویەکی کورتیان دەداو ئیدی بەلایانەوە گرینگ نەبوو سواری هەمان کەشتی یان کەشتیەکی تازە ببنەوەو بەرەو شوێنێکی نادیار ببرێن. ئیدی ئەمانە هەموو خەڵکانی خەمسارد و بێموبالات و بێ پەنا بوون، هەموو شوێنێک بۆ ئەوان هەر غوربەت و غەریباتی بوو، هەر هەمووشیان، خەڵکانی زۆر ترسنۆک و بێ غیرەت بوون.

جارێک، بە ماوەیەکی کەم دوای نیوەشەو، ئامێرێک لە ژووری مەکینەی کەشتیەکە وەکو تۆپ تەقییەوە، لەماوەیەکی کەمدا، هەڵم و بوخارێکی سپیواژ، سەرانسەری کەشتییەکەی داگرت. دەنگێک، لە گۆشەیەکەوە بەرز بووەوە:

– گاڤریلۆ، هۆ گاڤریلۆ! کوا پارچە لبادێک و تۆزێ مسی سوورم بدەیە.

من لەلای ژووری مەکینە وئامێرەکان، لە سەر ئەو مێزەی کە قاپەکانم لە سەری دەشت، دەخەوتم. لە دەنگی تەقینەوەکە و غەڵبەغەڵب و ژاوەژاوی خەڵکەکە خەبەرم بووەوە. هەموو شتێک لە سەر کەشتیەکە کڕوکپ و ئارام بوو. هەڵم و بوخار لە ئامێرەکانەوە بەرز دەبووەوە و بە فسەفس دەچوو بەئاسمانا، تەق وهۆڕی چەکوش و چەکوشکاری دەهاتەگوێ، دوای کەمێک هەموو ئەو ڕێبوارانەی لەسەر کەشتیەکە نووستبوون بێدار بوونەوە، کردیان بە هەرا وزەنا و غەڵبەغەڵبێکی ئەوتۆ کە تەواو ترسام.

ئیدی لە نێو ئەو هەڵمە سپییەوە کە زۆر زوو دەڕەوییەوە، ژنان بە قژی پەرێشانەوە، پیاوان بە چاوانی وەکو چاوی ماسییەوە، شپرزەو پەشۆکاو پێکدا دەهاتن، بە یەکدا دەکەوتن، خۆیان بە کیسە وجانتایاندا دەکێشا، دەکەوتن و خل دەبوونەوە، هاواریان بۆ خوا دەکرد ولە قەشە نیکۆلای پیرۆز

دەپاڕانەوە کە ڕەحمیان پێیدا بکات. هەندێکیان بە گژ یەکدا دەچوون. دیمەنێکی زۆر ترسناک و مایەی سەرنج بوو، بە هەشتاو دوای خەڵکەکە کەوتم تابزانم چ بووە و چ قەوماوە.

ئەمە یەکەمجارم بوو کە کارەساتێکی شەوانەم دەبینی. بەڵام هەر زوو بۆم دەرکەوت کە هیچ مەترسییەک لە سەر کەشتیەکە نییە. ڕێبوارەکان، لە خۆڕایی ترسابوون. کەشتیەکە بە هەمان خێرایی ئاسایی خۆی دەڕۆیی و دەچووە پێشێ. بەدەستی ڕاستا، لە بەستێن و کەناراوەکەدا، هێشتا وەجاخی درۆینەوانی گژوگیا تروسکەیان لێ هەڵدەستا. شەوێکی ڕوناک بوو، مانگی چواردە بە حەوێقی ئاسمانەوە، لە مۆلەق وەستابوو.

خەڵکەکە، شپرزەو پەشۆکاو، دەسەپاچە وترساو، شێتانە پێکدا دەهاتن. ئەو ڕێبوارانەش کە لە ژوورەکاندا نووستبوون بە هەشتاو دەهاتنە دەرێ. یەکێک لە قەراخ کەشتیەکەوە بازی دا، دوانی دیکە دووی کەوتن. دووکەس لە ڕێبوارەکان کە قەشەیەکیان لەگەڵدا بوو، دەستیان دایە تێلا ولە سەر تەختەیەک کە بە سەر کەشتیەکەوە داکوترابوو، بەربوونە یەک و تەختەکەیان لەبن و بێخەوە هەڵکەند. قەفەزێکی پڕ لە مریشک و جووجەڵە قڵپەوە بوو و کەوتە ڕوبارەکەوە. جوتیارێکی دێهاتی کە لە ژێر ئەو پەیژەیەی دەچوو بۆ ژوورەکەی کاپتن، خۆی مات دابوو، هەر ڕێبوارێک بەلایدا ڕەتبایە، کڕنۆشی بۆ دەبرد وبەدەنگێک کە لە لوورەی گورگ دەچوو، پێی دەگوت:

- ئاخ، ئەی ئیماندارانی ڕاستەقینە، من بابایەکیگوناحباری مەلعوونم.

کابرایەکی قەڵەو، بە ڕووتی بە توێی دەرپێ قوتەیەکەوە، لێکدا لێکدا بە کۆڵەمست بەسینگی خۆیدا دەکێشا و، بە دەم هەراوزەنایەکی زۆرەوە هاواری دەکرد:

- کوا بەلەمی فریاکەوتن هەی نەگریسانە؟

دەریاوانەکان، بە هەڵەداوان، دەهاتن ودەچوون، توونند یەخەی ڕێبوارەکانیان دەگرت و، بە مست بەردەبوونە سەر وپۆتەلاکیان و لە سەر ڕێگاکە لایان دەدان. سموری، کە هەر بە جلی خەوەوە بوو، پاڵتۆیەکی بەسەر ئەو جلانەدا لەبەر کردبوو، بەدەنگە گڕەکەی خۆی کە دەتگوت هەورە گرمەیە هاواری بەسەر خەڵکەکەدا دەکرد:

- ئەرێ شەرم لەخۆتان ناکەن، بۆ وەکو مریشک شپرزە بوون، شێت بوون؟ کەشتیەکە زۆر توونودوتۆڵە، هیچ ترسێکی لەسەر نییە، کەنارەکەش دیارە. تەمەشا دروینەوانەکان، ئەو گەوجانە دەردێننەوە کە خۆیان هەڵداوەتە ئاوەکەوە- هۆوەتان. دەیان بینن؟ ئەوە دوو بە لەمی پڕ لە خەڵکن.

ئاشپەزەکە دەمی خۆی دەگەڵ ڕێبوارانی دەرەجە سێدا ماندوو نەدەکرد، بەڵکو بە مست سەر وگوێلاکی دادەگرتنەوەو ئەوانش وەکو فەردە کا بەبێدەنگی بەر دەبوونەوە سەر ئەرزەکە.

بەرلەوەی هەراو زەناکە دابمرکێتەوە، ژنێک بە جلی خەوەوە کەوچکێکی بەدەستەوە بوو، بەرەو سموری تاوی دا، کەوچکەکەی لە سموری ڕادەوەشاند و بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواری دەکرد : - چۆن زات دەکەی بەمجۆرە قسە لەگەڵ مندا بکەی؟

پیاوێک کە سەراپای شەلاڵی ئارەقە بوو، سەری سمێڵی دەجوو، بە ڕاوێژێکی شپرزە و پەرێشانەوە هەوڵیدەدا ژنەکە

بــداتە داوەوە، دەیگــوت : - وازی لێبێــنە، واز لەم کەلــلە ڕەقە بێنە.

سموری، شانەکانی هەڵتەکاند، دەستی هێنایە خوارەوە، بە شپرزەیی چاوێکی داگرت، ئاوڕێکی لای منی دایەوە وگوتی:

- باشە، خۆ گوێت لێیە؟! ئەم ژنە چی لەمن دەوێ؟ هەر لە خۆیەوە هـاتووەتە سـەرم، خـوا بەوە ڕەحمـی کردووە، مـن بە عەمراتم نەم دیتووە!

جووتیارێکی کورتەباڵا، ئەو خوێنەی لە کەپوویەوە دەهـات تفاندەوەو گوتی :- بەمانەش دەڵێن بەشـەر، دەک داوەشێن دز و ڕێگرانە!

بە درێژایـــی ئەو هـــاوینە، دوو بـــویەری وام بینـــی. هەردووجارەکەش بە هۆی مەترسی ڕاستەقینەوە نەبوو، بەڵکو بە هـۆی تـرس لە ئەگەری مەترسـییەوە بـوو. جـاری سـێیەم ڕێبوارەکـان دوو دزیـان دەسـتگیر کـرد کە یەکێکیـان جلکـی قەشەی لەبەرکردبوو. لە چنگی دەریاوانەکانیان دەرکردبوون و بردبوویـاننە پەنـایەکەوەو یەک دانە سـەعاتی تەواو حەسـیر مەیانیان کردبوون. وەختایەک دەریاوانەکان فریایان کەوتبوون ولە چنگی خەڵکەکەیان دەرهێنابوون، خەڵکەکە، دەریاوانەکانیان بەر دەمرێژی جنێوان دابوو.

- ئـێمە دەزانــین ئێــوە دزن بــۆیە پەنــای دزان دەدەن، دەمارتان دەناسین، ئێوەش دزن بۆیە بەزەییتان پێیاندا دێتەوە!

دوو دزەکە ئەوەنــدەیان کـوتەک خورادبــوو، کــاتێ کە لە لەنگەرگـای دواتـر ڕادەسـتی پـۆلیس کـران خۆیـان بە پێـوە نەدەگرت.

زۆرجـار ئەم بـویەرانە دەقەومـان، پیـاو تیـا دەمـا لە خـۆی دەپرسی ئەرێ خەڵکی بە تەبیعەت باشن یان خراپ، گوێڕایەڵ

و ئارامن یان یاخی و ناڕەسەن. خەڵکی بۆچی هەندێجار لە هۆڤیان هۆڤی تر و دزترن، هەندێجاریش لەمەڕ مەڕترن، ئەوندە ڕام و دەستەمۆن پیاو لە خۆی تەریق دەبێتەوە. کە ئەو پرسیارەم لە سموری دەکرد، لە ژێر پەردەی دووکەڵی سیغارەکەیەوە، بە نەبەدڵی وەڵامی دەدایەوە :- ئەمانە ئاوهان ئیدی، تۆ هەقت چییە؟ خەڵکی خەڵکن، هی وایە زیرەک دەردەچێت و هی واهەیە کەر دەردەچێت. مێشکی خۆت بەوشتانەوە ماندوو مەکە، کتێبی خۆت بخوێنەوەو هەقت نەبێت. لە کتێباندا، بەتایبەتی لە کتێبی باشدا، وەڵامی هەر پرسیارێکت دەست دەکەوێ.حەزی لە کتێبێن ئاینی یان ژینامەی وەلیان نەدەکرد. دەیگوت :

- هی کەشیشانە، بۆ منداڵە کەشیشان باشە.

جارێک بڕیارم دا چاکەیەکی لە گەڵدا بکەم، لێبڕام کتێبێکی پێشکەش بکەم. لە قازان کتێبێکم بە پێنج کوپیکان کڕی " چۆن سەربازێک ژیانی پترۆسی گەورەی ڕزگارکرد ". ئاشپەزەکە لەو کاتەدا مەستی مەست بوو، بۆیە بڕیارم دا، چیرۆکەکە بخوێنمەوە ئەوسا کتێبەکە بدەم بەو.. کتێبەکەم زۆر بە دڵ بوو - کتێبێک بوو سادە، ڕوون، ڕەوان، پوخت و سەرنجڕاکێش. دڵنیابووم کتێبەکەی زۆر بەدڵ دەبێت..

بەڵام هەرکە کتێبەکەی لە دەستم وەرگرت و وەرنەگرت، لە دەستیا گزمۆڵەی کرد و بێئەوەی ورتەی لە دەم بێتەدەرێ، تا دەستی گرتی تووڕیدایە ناو ڕووبارەکە. بە تووڕەیی گوتی :

- ئەوە کتێبەکەت، کەرە!.. من دەمەوێ بتکەم بە بنزگ تۆ دەبیتەوە بە پاڵدوو.. دەمەوێ بتکەم بە تاژی ڕاوی، تۆ دەچی پەلاماری کێشکان دەدەیت.

لاقی بە عاردیدا کوتا و هاواری بەسەرما کرد :

- تۆ چ ناوێک لەم کتێبە دەنەی؟ من ئەو توورەهاتانەم هەموو خوێندوونەوە! ئەوەی تیایدا نووسراوە ڕاستە؟ کوا وەرە پێم بڵێ!

- نازانم.

- من دەیزانم. ئەگەر سەری یەکەم گەنجیان بڕیبا، بە قاڵدرمەکانا غل دەبووەوەو ئەوانی دی نەدەوێران بۆ عەماری پووشەکە سەربکەون. سەربازان کەر نین! دەکرا ئاگر لە پووشە وشکەکە بەربدەن و هەموو شتێک دەبڕایەوە، گوێت لێیە؟

- بەڵێ.

- کەواتە، ئەمە ڕوودەدات! من هەموو شتێک دەربارەی تزار پەترۆسی گەورە دەزانم- هیچ شتێک لەو ڕووداوانەی بەسەر نەهاتووە! دەی بڕۆ، لەم ناوە مەمێنە!

دڵنیابووم کە هەق بە یاڕۆی ئاشپەزە، بەڵام هێشتا هەر جادووی کتێبەکە بەری نەدابووم. "چیرۆکەکەم" کڕییەوە جارێکی دی خوێندمەوە، کەچی بۆم دەرکەوت کتێبەکە لە ڕاستیدا هیچی نەدەهێنا. زۆر بە خۆما شکامەوە، ئیدی بە ڕێزو حورمەتێکی زیاترەوە تەمەشای یاڕۆی ئاشپەزم دەکرد. بەڵام ئەو بەردەوام دەمی لە سەرم بوو و، دەیگوت :

- ئا، پێویستە بخوێنی، بچیتە قوتابخانە، ئێرە جێی تۆ نییە.

من خۆشم هەستم دەکرد کە ئەو شوێنە، بۆ من نابێت. سیرگی زۆری دەبوغزاندم. من خۆم چەند جارێک بە دزییەوە گرتم، پەرداخ و کەرەستەی چای لە سەر مێزەکەی من دەبردو بە ڕێبوارەکانی دەفرۆشت.. بەدزی بەرپرسی خزمەتگوزارەکانەوە ئەمەی دەکرد. من دەمزانی کە ئەمە جۆرە دزییەکە. بەتایبەتی کە سموری پتر لە جارێک ئاگاداری

کردبـــوومەوە :- ئاگـــادار بە! نەیەڵـــی خزمەتگوزارەکـــان، کەرەستەی چایت لێ بدزن!

بە ڕاستی زۆر بێزار بووم، زۆرجار بیرم لەوە دەکردەوە کە لە هەوەڵـــین لەنگەرگـــادا هەڵـــێم و ڕووبـــکەمە بێشـــە و لێـرەواران. ئەوەی ڕایگرتبـووم، تەنیـا سـموری بـوو، کە زۆر لەگەڵما بـاش بوو، ئەم پیاوە ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵما میهرەبـانتر دەبوو، ئەمە جگە لەسـەفەری بەردەوامـی کەشـتیەکە کە زۆرم بەلاوە خۆشـــبوو. وام لێهـــاتبوو حەزم نەدەکـــرد لە بەنـــدەرو لەنگەرگاکـــانیش دا بوەســـتێت. بەدەم ئومێـــدێکی چـــاوەنۆڕ نەکراوەوە دەژیام.. وام وێنا دەکرد خەریکم لە ڕوباری کاماوە بەرەو بیلایا، و لە فیاتکاوە بەرەو ڤولگا دەڕۆم ,خەڵک و خوا و کەنار و بەستێن و شارانی تازە دەبینم.

بەلام ئەفسـووس ئەو خەیـاڵ پلاوەم کەڕووی هەڵێنـا وئەو چاوە ڕەشەم کاڵ بووەوە! هیچ یەکێک لەو خەون و ئاواتـانەم نەهاتنەدی. ژیانم لە کەشتیەکەدا، بەجۆرێکی نەنگین شـکایەوە. شەوێک لە قازانەوە بۆ نیژنی نوڤگورود دەڕۆیشتین، بەرپرسی خزمەتگوزارەکـــان نـــاردی بە شـــوێنما، چـــوومە ژوورەکەی، دەرگاکەی داخست، بە سموری، کە لەوێ ڕۆنیشتبوو، گوت :- ئا ئەمە.

ئاشپەزەکە بە تووڕەیی لێی پرسیم :- تۆ مراک و قاپ و ئەو شتانە دەدەیە سێرگی؟

- نا بەدزی منەوە، کە لەوێ نابم دەیاندزێت.

بەرپرسـی خزمەتگوزارەکان، بە ئەسـپایی و لەبن لێوانەوە گوتی:

- تـۆ نەتـدیوە ئەوکـارانە بکـات، بەلام زانیـوتە ئەو کـارە دەکات.

سموری، مستێکی بەزرانی خۆیدا کێشا و پاشان کەوتە خوراندنی جێی جەزرەبەکە و گوتی :- پەلە مەکەن، هێشتا دەرفەتمان لەبەردەم ماوە.

ئەوجا لە فکران ڕاچوو. من چاوم بڕینە بەرپرسی خزمەتگوزارەکان وئەویش چاوی بڕییە من، بەڵام چاوی ئەو لە پشت چاویلکەکەیەوە نەدەبینرا.

ئەم پیاوە، بە بێدەنگی دەژیا، بە ئەسپایی ڕێی دەکرد، بە هێواشی قسانی دەکرد. هەندێجار ڕدێنە کاڵەوە بووەکەی وچاوە گێژو وێژەکانی لە گۆشەیەکەوە بەدیار دەکەوتن و هەرزوو ئاوا دەبوون، بە بێئەوەی کەس پێی بحەسێت. شەوان بەرلەوەی بخەوێت، لە بەردەم ئیکۆنەکەی مەسیحدا دەکەوتە سەرچۆک ونوێژ ونزایەکی دووروودرێژی دەکرد. قەت نەمدەتوانی ببینم کە چۆن نوێژ دەکات.. هەر ئەوەندەم دەبینی لەبەردەم ئیکۆنە پیرۆزەکەی تەنیشت چراکەوە چۆکی دادەداو هەندێجار قامکی وەکو شانە بە ڕدێنەکەیدا دێنا و ئاهی هەڵدەکێشا.

سموری، دوای کەمێک بێدەنگی پرسی:- باشە سێرگی هیچ پارەیەکی بە تۆ داوە؟

- نەخێر.

- قەت؟

- قەت.

سموری، بە بەرپرسی خزمەتگوزارەکانی گوت :- ئەم کوڕە درۆ ناکات.

یارۆی بەرپرس، لەبن لێوانەوە گوتی:

- ببورە.. ئەمە گرینگ نییە. مەسەلەکە زۆر فەرق ناکات.

سموری، هات بەلامەوە، زللەیەکی دۆستانەی بەپشت سەرما کێشا و گوتی:

- دەی بابڕۆین کەرە! ئاخر من پیاوێکی کەرم. دەبوایە چاوت لێ خافڵ نەکەم. بەشەر دایمە لە سەر یەک بیر نییە.

کە گەیمە نیژی نوڤگورود، بەرپرسی خزمەتگوزارەکان هەق و حیسابەکەی دامێ و جوابی کردم. نزیکەی هەشت ڕۆبڵ. هەرگیز ئەوەندە پارەم بەخۆوە نەبینی بوو. ئەمە یەکەم جاربوو ئەو هەموو پارەیە بە خۆوە ببینم..

وەختایەک دوعاخوازیم لە سموری کرد، بە خەمینی گوتی:

- تازە ئەمە چوو، بەڵام بۆ لەمەودوا چاوت بکەوە، گوێت لێمە؟ نەکەی لە گۆشەیەکدا دانشیت بەدەم باوێشکدانەوە مێشان بخەسێنیت!

ئەوسا کیسەیەکی توتنی گوڵدۆزیکراوی دامێ وگوتی:

- ها ئەمەش بۆ خۆت، کارێکی جوانە. من بۆ زڕکیژەکەمم دروستکردبوو،بەڵام با بۆ تۆ بێت. دەی باشە خودا حافیز. هەمیشە کتێب بخوێنەوە، ئەمە باشترین بۆ تۆ!

هەردوو قۆڵی لە بن باخەڵمەوە گرت وبەرزی کردمەوەو ماچی کردم، ئەوجا لەسەر شۆستەی لەنگەرگاکە داینام. زۆر دڵم بە حاڵی ئەو سووتا، بەزەیم بە خۆشما هاتەوە. کە گەڕایەوەو لە دواوە تەماشای ئەو زەلامە کەتەیەم دەکرد کە دڕی بە کۆڵبەرو حەماڵەکان دەدا بۆ سەر کەشتییەکە دەگەڕایەوە زۆر بە زەحمەت جڵەوی گریانی خۆم پێدەگیرا.

ئیدی لە ساڵانی دواتردا، تووشی زۆر خەڵکی سادە، پاک، گۆشەگیر، لەوانەی کە ژیان پەراوێزی خستبوون، بووم.

## (٩)

ئەنک وبابام بۆ شار گەڕانەوە. من لە بارێکی دەروونی خەمناک وتووڕە و ناڕازییەوە بۆ لایان گەڕامەوە، دڵم زۆر تەنگ بوو. چما وەکو دزێک مامەڵەیان دەگەڵ مندا کردبوو؟

ئەنکم بەوپەڕی میرەبانی پێشوازی کردم. یەکسەر چوو سەماوەرەکەی پێکرد. بابام وەکو هەمیشە بە تەوس و توانجەوە پرسی :- ها، پارەیەکی زۆرت کۆ کردووەتەوە؟

من کە لە بەر پەنجەرەکەدا ڕۆنیشتبووم، بەرسڤم دایەوە:- هەرچەندم کۆکردبێتەوە، هی خۆمە.

بە کاوەخۆ پاکەتە جگەرەیەکم دەرهێنا وجگەرەیەکم داگیرساند. بابام کە چاوی لێ نەدەگواستمەوە گوتی:

- هەو! هەر لەمەمان کەم بوو! نەمردی فێری گەڵای شەیتانیش بووی؟ باشە هێشتا زۆر زوو نییە؟

بۆ خۆڕانانەوە گوتم:- کیسەیەکی تووتنشیان بە یادگاری داومەتێ.

بابام هاوارێکی توندی کرد:

- کیسەی تووتن! نۆبەتی ئەو قەوانەیە، باشە کیسەی تووتنت بۆچییە؟ پێم ڕادەبوێری؟!

هەردوو باسکە بەهێزەکانی بڵاوکردنەوەو بە پرتاو بۆم هات، چاوە کەسکەکانی گریان لێدەبووەوە، منیش لە جێی خۆم هەستام، سەرم دانەواند و سەرم بەر سکی پیرەمێرد کەوت. بەپشتا کەوت. چەند ساتێک کە بەلای منەوە زۆری خایاند، بەچاوی ئەبڵەقەوە لەو گۆڕە مایەوە، حەیرەت و حەپەسان بە سیمایەوە هاواری دەکرد. دەمە ڕەشەکەی داچەقی بوو. بە ڕاوێژێکی ئارام پرسی:- تۆ لە من دەدەیت؟ لە بابات؟ لە باوکی دایکت؟

یەکسەر هەستم کرد کە کارێکی زۆر خراپم کرد، بۆیە بە دەمەلاڵکێیەوە گوتم:- ئاخر تۆ زیاد لە پێویست لێم دەدەی، بەسە تاکەی!

بابام، بە ئەسپایی لە جێی خۆی هەڵسا، لەلامەوە ڕۆنیشت، بلەز سیغارەکەی لەدەستم ڕاپسکاند و لە پەنجەرەکەوە تووڕی دایە دەرێ و بە دەنگێکی ترسناک گوتی:

- هەی کەر! نازانی خوای گەورە هەرگیز لەم کارەت خۆشنابێ؟

ئەوسا ڕووی کردە نەنکم و گوتی:

- ئافرەت تێدەگەی چ دەڵێم؟ ئا ئەمە، ئەو نەگبەتی شوومە، لێی دام، ئەگەر باوەڕ بە من ناکەی لە خۆی بپرسە.

نەنکم هیچی لێ نەپرسیم، بەڵام لێم نزیک بووەوە، چنگی نایە قژەکەم و سەری ڕاوەشاندنم و گوتی:- ئەمەش سزای تۆ،بیگرە دەی!

لێدانەکەی نەنکم هیچ ئازارێکی جەستەیی نەگەیاندمێ. بەڵام لە ناخا بریندار بووم، خەریک بوو لە شەرمەزاریا دەتوامەوە، بەتایبەتی تانە و تەشەرەکانی بابام زۆریان ئەزیەت دەدام. ئەو پیاوە توێتکەی نەدەگرت، لە سەر کورسیەکەی هەڵدەستا و دادەنیشتەوە، بە هەر دوو دەستان دەیکێشا بە ئەژنۆی خۆیدا ودەیگوت:- ئە ئاوا، لێدە، تا دەتوانی لێیبدە.

خۆم لە دەستی نەنکم دەربازکرد و پەنام بردەبەر دالانەکە، لەوێ لە سووچێکا خۆم دا بە عاردیدا، هیلاک، کەنەفت، مێشکم دنگەی دەهات، گیزەگیزی سەماوەرەکە لە گوێمدا دەنگی دەدایەوە.

نەنکم هات بەلامەوە، بە سەرما دانەوییەوەو لەبن لێوانەوە گوتی:- بمبورە. خۆ ئازارت نەگەیشتێ، نا؟ هیچ چارێکی دیکەم نەبوو، دەبوایە دڵی بابات بدەمەوە، ئاخر ئەویش پیر بووە،

دەبێ حورمەتی بگیرێت. ئەویش دەردی سەری دنیای بەسەر هاتووە، خەمی دنیای لە دڵدایە، نابێ دڵی بیەشێنیت، ئەلیوشا گیان، تۆ ئیدی منداڵ نیت، گەورە بوویت، دەبێ ئەو شتانە بزانیت، خۆ باباشت هیچی لە منداڵ نەگەڕاوەتەوە. منداڵێکی گەورەیە و تەواو.

ئەم قسانە وەکو ئاوێکی فێنک بە دڵمدا کران. چپە و قسە پڕ میهرەکانی، سوکنایی بە ڕۆحم دەبەخشی و ئازاری کەم دەکردمەوەو لە هەمان کاتدا لەخۆ تەریق دەبوومەوە. بەتووندی باوەشم پێدا کرد، دەستمان لە ملی یەکدی وەرێنا و کەوتینە ماچکردنی یەکدی، ئەوجا گوتی:

- هەستە بڕۆ بۆلای بابات! ئیدی ئاشت دەبێتەوەو دڵی دێتەوە جێ، بەڵام وریابە لە بەرچاوی ئەو جگەرە مەکێشە.. پەلە مەکە تا وردەوردە ڕادێت.

بۆ ژوورەکە گەڕامەوە، تەمەشایەکی بابامم کرد، چیوای نەمابوو لە قاقای پێکەنین بدەم. وەکو منداڵ خۆشحاڵ بوو. ڕوخساری دەدرەوشایەوە هەردوولاقیبە عاردیدا دەدا و ئازای بەدەنی هاتبووە سەما، بە قامکان دەیکێشا بەسەر مێزەکەدا، کە پەردەیەکی سووری پێدا درابوو، گوتی:

- فەرموو سابرێنە چکۆل! دەتەوێ دیسان بەر شاخەکانتم بدەی؟ هەی دوومۆر، دەقاودەق باوکتی، بە موو لەو لات نەداوە! بەبێ نیشانەی خاچ دێتە ژوورەوە. یەکسەر دەست بە جگەرەکێشان دەکەی. تفو لە چارەت هەی پوناپارتی چکۆلە، دوو کوپیکی قەڵب ناهێنیت!

بێدەنگ بووم. هیچی پێ نەبوو کە بیڵێت، هیلاک و ماندوو بێدەنگ بوو. بەڵام بەدەم چا خواردنەوە کەوتە ئامۆژگاری کردنم:

- وەکو چۆن هەوسار بۆ ئەسپ پێویستە، بەو ئاوایەش ترسان لە خوا بۆ بەشەران پێویستە. تاقە پشت و پەنای بەشەر هەر خوایە. مرۆڤ، دژمنی سەرسەختی مرۆڤە!

دروستی ئەو قسەیە شۆکی کردم، بەشەر دژمنی یەکن. بەڵام ئەو دوای قسەکانی بە هیچ جۆرێ کاریان تێنەکردم.

- دەبێ بگەڕێیتەوە بۆسەر کارەکەت، لە ماڵی پوورە ماتریونا،دەتوانی بەهار بچیتەوە سەر کەشتییەکە، زستانەکە لە نک وان ڕابوێرە، پێیان مەڵێ هەرکە بەهار هات جێیان دەهێڵیت.

نەنکم، کە تۆزێ لەوەپێش، بابامی بەوە خاپاند، کە بە درۆوە لێی دام، هەڵیدایێ و گوتی:

- بۆچی هەڵیان بخەڵەتێنی؟

بابام بە ڕژدی گوتی:

- بەبێ خەڵەتاندنی خەڵکی ناتوانی بژی. کەس نییە کە بەبێ حیلە و حەواڵە و خاپاندن بتوانێ بژی.

هیچ هەواڵێکم نەدایێ، شەوێ کاتێ بابام کەوتە نوێژ و نزا و خوێندنەوەی مەزمووران، لەگەڵ نەنکما لە ماڵ وەدەرکەوتین و ڕوومان کردە دەشت ودەر، ئەو کەوێڵە بچووکەی کە تەنیا دوو دەلاقەی هەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان ماوا وسوکنەی بابام و نەنکم بوو، لەوپەڕی شار بوو، کەوتبووە کۆتایی شەقامی کاناتنایاوە، یانی کەوتبووە ئەو شوێنەی کە کاتی خۆی بابام لەوێ خانوویەکی هەبوو. نەنکم پێکەنی و گوتی:

- بزانە ڕۆژمان بە چ ڕۆژێ گەییوە! بابات لە هیچ شوێنێک ناحەوێتەوە، هەر خەریکی شوێنە گۆڕکێیە. بەڵام من حەزم لەم شوێنەیە.

ڕوو بە ڕووی مە ، بە درێژایی پتر لە سێ کیلۆمەتران،دەشتێکی پان وبەرین و سەوزەلانە، پڕە لە کەند و

شـــیوەڵە و ســـپێداران کە بەرەو قـــازان دەڕوات. قەراخـــی شیوەڵەکان، گزجارە، لقی گزەکان، بە ڕووتـی بەرز بـوونەتەوە، کە ســـەیریان دەکەی، لە ژێـر زەردەپەڕی تەزی هەتـاوی ڕۆژ ئـاوادا، وەکـو قـامچیەکی لە خوێنا هەڵکشـاو دەنـوێنن. شـیبای ئێـوارەی درەنـگ، کەروێشــکەی بە گــژ و گیاکـان دەکـرد، لەوبەری کەنـد و شـیوەڵە نـزیکەکەوە، سـێبەر و تارمـایی، بە جموجـوولی کـوڕان وکیژانـی ئاشـقی گونـدەکانی ئەو نزیکـانە دەبینـرا. بە دەسـتە ڕاسـتا و لە دوورەوە، دیـوارە سـوورەکانی گۆڕستانی ناسراو بە " پەرستگەی بـوکروف " بەرز بووەتەوە. بەڵام بە دەســتە چەپـدا، بێشــەیەک وەکـو پەڵە هەورێـک بە بەرۆکی ئاسمانەوە دیارە. ئەمە گۆڕستانی جوولەکەکانە. ئیدی بێنەوایـی و هەژاری بە هەمـوو شـتێکەوە دیـارە. لەم ســەر و ئەوسەری شار،کۆلیت کەوپلانی دارین لە تۆ وایە لە دەلاقە و لە پەنجەرەکــانی خۆیــانەوە بە داخ و کەســەرەوە دەڕوانــنە ڕێگاوبـــانە تەپ وتۆزاویەکـــان. ئیـــدی مریشـــکی لاواز و جـــووجەڵەێن مردەلـــۆخ وبـــێ خـــواردن بەم ڕێگایـــانەدا دەسووڕانەوە. دەنگی بۆڕەی چێلان کە بەلای دێری ڕیڤیچی دا تێدەپەڕینـدەهاتە گوێ. دەنگی جـوق و کەڕنـایەکی سـوپایی لە سەربازگەیەکی نزیک دەگەیيە ئێرە. دەنگی شـەیپوور وسـازێن هەوایی دەهات.

کابرایەکی مەست بەلامانا ڕەت بـوو، ئۆکۆردیـۆنێکی پێبـوو، بە تووندی لێیدەدا و لەبن لێوانەوە، دەی پرتاند ودەی بۆڵانـد:- بۆ کوێ دەچی، هەر دەتگرم.

نەنکــم کە بە نیگـــای تووڕەوچـــاوانی لە داخـــا ســـوور هەڵگەڕاوەوە تەمەشای تیشکی سووورباوی هەتاوەکەی دەکـرد، گوتی:

- کێ دەگری، کەودەن؟ هاکا کەوتیتە سەر ئەرزەکە و خەوت لێکەوت، بە خەوتوویی ڕووتت دەکەنەوە، تەنانەت ئەو ئۆکۆردیۆنەشت، کە داخی دڵی خۆتی پێ دەردەبڕی، لێدەدزن.

لە کاتێکدا خەریک بووم سەربهوردی ژیانی خۆمم لە سەر کەشتیەکەدا بۆ نەنکم دەگێڕایەوە، چاوم بە دەورووبەری خۆما دەگێڕا. ژیانی ئێستام لە چاو ئەو ژیانەدا کە جێم هێشتبوو، زۆر ناخۆش بوو. هەستم بە کلۆڵی دەکرد. لە مشکێک دەچووم کە کەوتبێتە تەڵەوە. نەنکم زۆر بە وردی گوێ لێدەگرتم. وەکو چۆن من هەمیشە بە وردی گوێم لەودەگرت. کە باسی ° سموری ° م بۆکرد، بە گەرمی نیشانەیەکی خاچی کێشا و، گوتی:

- چەند پیاوێکی باشە، حەزرەتی مریەم ئاگاداری بێ! پیاوێکی میرەبان بووە، هەوڵبدە لە بیری نەکەی. هەمیشە چاک و چاکیت لە بیربێت و نەفرەت لە خراپ و خراپی، لە شەڕ بکە و لێی دوور بکەوە. زۆر بە زەحمەت هۆی دەرکردنەکەمم لە کەشتیەکە بۆی ڕوونکردەوە، چۆن و بۆ دەریان کردم.. بەڵام پاش ئەوەی زاتم وەبەرخۆم نا، توانیم هەندێ شتی بۆ ڕوون بکەمەوە. زۆر گوێی بەسەربهوردەکە نەدا، بەڵام بە جۆرە خەمساردییەکەوەو بە کورتی گوتی:

- تۆ هێشتا زۆر منداڵیت، هێشتا نازانیت کە دەبێ چۆن بژیت..

- هەموو خەڵکی هەر ئەو قسەیە بە یەکدی دەڵێن، پیاوان، کرێکارانی کەشتیەکە، پوورە ماتریونا، بەردەوام ئەو قسەیە بە کورەکەی دەڵێت. پێم ناڵێی ڕازی ئەو زانستە چییە؟

نەنکم لێوی گەست، سەری لەقاند و، بەرسڤی دایەوە: - بەخوا منیش نازانم!

- ئەدی بۆ ئەو قسەیە دەکەی!؟

نەنکم بە ئارامی بەرسڤی دایەوە:

- بۆ نەیکەم؟ زۆر بەخۆت مەنازە، تۆ هێشتا منداڵیت، ناکرێ هەموو شتێک بزانی. کێ دەزانێ چۆن بژی؟ مەگەر تەنیا دزان! بۆ نموونە سەیری بابات بکە کەسێکی وریا و فامایە، بەڵام قەت نەیزانیوە چ کارێک بکات. چۆن بژیت..

- باشە تۆ ژیان دەناسیت، ژیانێکی جوانت بەڕێکردووە؟

- من؟ ئۆف، بەڵێ. هەم باش و هەم جوان ژیاوم، هەم خراپ، هەموو جۆرەکانی ژیانم، بە هەوراز و نشێویەوە بینیوە.

خەڵکانێک هێدی هێدی بەلامانا تێدەپەڕین، پەلەیان نەبوو، سەر وسێبەری درێژیان لە دووی خۆ ڕادەکێشا. ئیدی بەدەم ڕێوە تەپ وتوز لە بن پێیانەوە بەرز دەبووەوەو سێبەرەکانیان دادەپۆشی و دەشێواند. خەمینی دەمەو ئێواری باڵی بەسەر هەموو شتێکدا دەکێشا. دەنگی ئاڵۆز و گونگی بابام لە پەنجەرەکەوە دەگەییە گوێمان:

- ئەی پەروەردگاری بەخشندە، لە غەزەبی خۆت بە دوورم کە! غەزەبم لێ لادە، بە گوێرەی توانای خۆم سزام بدە..

نەنکم پێکەنی وگوتی:

- بێگومان، خوای بێزار کردووە! هەموو ئێوارەیەک ئەم لاڤە و پاڕانەوەیەی کردووە بە پیشە. ئاخر بۆچی، ئەم گریان و کوڕوزانەوەیە بەچی دەچێ، فایدەی چییە؟ بەشەر لە پیریدا، لە تەمەن و ژی ئەودا پێویستی بە هیچ نییە، کەچی هەمیشە هەر دەگری و دەناڵێ و هاوار دەکات! خوا کە هەموو شەوێک لە نێو ئاپۆڕای دەنگەکاندا گوێی لە دەنگی وی دەبێ و دەیناسێتەوە پێدەکەنێ و دەڵێت: " دیسان ڤاسیلی کاشیرینە، هاواریەتی! قورگی خۆی دەدڕێت " دەی گیانەکەم هەستە با بڕۆین بخەوین..

***

بڕیارم دا بکەومە ڕاوی بولبولان و پەرندەێن ئاوازخوێن، بە خەیاڵی خۆم لەم ڕێگایەوە نانێکی باش پەیدا دەکەم. من دەیانگرم و نەنکم دەتوانێ بیانفرۆشێت. ئیدی تۆڕێک، داوێک و چەند فاقێکم کڕی و چەند قەفەزێکم دروست کرد. بەوجۆرە سـپێدەیەکی زوو لە نێـو پەرێـز و دەوەن جاڕێکـا، لە شێوەڵەیەکدا خۆم لە بۆسە نا، نەنکیشم بە خۆ و زەمیلە و کیسەیەکەوە بە ناو دارستانەکەی ئەو نزیکانەدا دەسووڕایەوە، لە کارگ و ترێ کێوی و گوێز و ئەو شتانە دەگەڕا.

هەتاوی خاوی هەیڤی ئەیلوول، کە هێشتا ماندوو وچاو بەخەو بوو، تازە لە ئاسۆوە گزنگی دابوو، تیشکە زەردە کاڵەکەی جارێ لە پەڵە هەورەکاندا ون دەبوو و جارێ لە سەراپای منی دەدا، کەند و لەندەکان هێشتا پڕ سێبەر بوو، مژ و دوومانێکی سپیواژ لەوێوە بەرز دەبووەوە، بەرێکی کەند و دۆڵەکە ڕووتەنێکی زۆر ڕک و ڕژد بوو. بەرەکەی تر کەمتر لێژە، یەکپارچە گیا زەرد و ڕووەکی چرمسی وگەڵا سوور و زەرد باو بوو، بایەکە ڕەدووی دەخستن و لە دۆڵەکەدا بڵاوی دەکردنەوە.

لە قووڵایی دۆڵەکەدا، لە نێو دەوەنە چڕکانەوە پەڕەسێلکان دەخوێنن و، لە دەوروبەرما کلک تەقێنە، گەروو سپی خۆ پڕ با دەکەن و ئیدی وەکو کچانی کونافینو، کە لەڕۆژانی جەژنا، سەری قسان دادەمەزرێنن، بە جریوەجریو دەیکەن بەڕۆژی خۆیان.. ئەمانە زۆر زیتەڵن، فزوڵن و دەیانەوێ هەموو شتێک بزانن و هەموو شتێک لە بنج وبناوان بکەن، بۆیە یەک یەک دەکەونە داوەکەمەوە. ئیدی هەرچەندە دیمەنی پەشۆکان و دەسەپاچە بوونەکەیان خەمناکە، بەڵام ئەوەی بۆمن گرینگە کارە، کار دەکەم. ئیدی تەیر وتووەکان لە قەفەسەکە دەنەم،

قەفەسەکە لە گونیەک دەنەم تا کەمێک تاریک ببێت و باڵندەکان ئارام بگرن.

پۆلێک لەسەر قوپەنە دەوەنێک دەنیشنەوە، مەستی تیشک و تیرۆژی هەتاوەکەن. زۆر بەجۆش دەخوێنن. لە کۆمەڵێک منداڵە مەکتەبلی لاسار دەچن. کەمێک لە سەرووترەوە، قوشێک لەسەر دەوەنێک نیشتووەتەوە، لە جێی خۆی ناجووڵێ. بەدەنووک ژێر باڵەکانی دەخورێنێ و دەدۆزێ، بە چاوەڕەشەکانی دەڕوانێتە دەوروبەری. لە ناکاوا ' مێشەسی ' یەک هەڵدەفڕێ، یەکڕاست بەرز دەبێتەوەو مێش هەنگێک لە ئاسمان دەقۆزێتەوە و دەیهێنێتە خوارەوە و لەسەر پنجە دروویەک دەنیشێتەوە و هەرلەوێ دەمێنێتەوە و دووبارە سەر بەم لاو بەولاودا وەردەگێڕێت. لە ناکاوا پەرندەی دەنووک خوار، کە نیشانەی خۆش یومنییە و من زۆری حەزلێدەکەم، لە ڕەوی خۆی دابڕاوەو بە بێدەنگی دێت و لەسەر چڵی نەمامێکی سپیدار دەنیشێتەوەو وەکو جەنەڕاڵێکی سەرکەوتوو دەکەوێتە پۆزلێدان و خۆڕانان، ناو بە ناو هاوارێکی تووڕە دەکات و دەنووکە ڕەشەکەی بەرز ونزم دەکاتەوە.

تا هەتاوەکە زیاتر بەرز دەبێتەوە، ژمارەی پەرندەکان زۆرتر دەبن و ئاوازی جۆراوجۆرتر دەخوێنن. دۆڵەکە پڕبووە لە ئاوازی موزیکاڵی و ئاوێتەی سەدای وشکی ئەو درووە جارە دەبێت کە بایەکە بێ پەروا دەیهێنێ و دەیبات و خستویەتیە هەلەکە سەما.

دەنگی وێڵی پەرندەکان ناتوانێ، ئەو هەراوزەنا خەمناکە کپ بکاتەوە.. لە دەنگی مالاوایی و دوعاخوازی دەچوو. زیاتر لە گۆرانی بەرێکردنی هاوین دەچوو. تێکرای ئەم ئاوازانە، ڕیتم و ئاهەنگی چامەیەکی ئاهەنگداری لە هەست و سۆزما پێکدەهێنا، لەژێر گوشاری ئەم واقیعەدا، بەبێ ئەوەی لە

دەستی خۆما بێ، هەندێ دیمەن و وێنەی ژیانی ڕابردووی خۆمی لەلا زندوو کردمەوە. لە سووچێکی نادیارەوە، لە جێیەکی بەرزەوە، نەنکم هاواری کرد:- لەکوێی؟

لە ترووپکی هەڵدێرەکەدا، لەسەر سەوزە گیایەکە ڕۆنیشتبوو، پریاسکەیەکی ڕاخستبوو، نان و خەیار و توور و هەندێ سێوی لە سەر دانابوو. لە نێو ئەم هەموو نیعمەتەدا، شووشەیەکی بچووکی زۆر جوان کە قەپاخەکەی لە کریستاڵ دروستکرابوو و وێنەی سەری ناپلیۆنی پێوەبوو، شووشەکە تۆزێ ڤۆدکای بۆنداری تایبەتی تیابوو.

نەنکم بە ڕەزامەندییەوە گوتی:- خوای گەورە چەند ئاسوودەین! ئەم دیمەنانە چەند جوانن!

- شیعرێکم لە سەری داناوە.

- بەڕاست. ئادەی بۆمی بخوێنەوە؟

ئیدی ئەو وشانەی، کە ڕیزم کردبوون و لە قاڵبی شیعرا دامرشتبوون، بۆ دەخوێنمەوە:

*زستان بەر دەرکەی لێ گرتووین*
*کولان، ترسی مەرگیان لێنیشتووە*
*ئەی هەتاوی جوانی هاوین،*
*ڤیان ڕاز وئەفسوونی خۆی هەیە!*

چاوەڕوانی نەکرد تا لێ ببمەوە، قسەکەی بڕیم و گوتی:

- ئەم قسانە هەر هەمووی وتراون، جوانتر لەمەش وتراون، ئەوسا دەستی پێکرد:

**ئەفسووس خۆری هاوین دوور کەوتەوە**
**بولبولانی ئەو دیار و دەڤەرە کۆچیان کرد**
**بەتەنیا مامەوە.. کیژێکی تاق و تەنیا**
**دلم کەڵکەڵەی هاوین دەکا**
**بەیانییەک لە هەموو ڕێیەکەوە**

بۆی هاتن
ڤیانی خۆم بیر دەکەویتەوە
بەدەم ڕێوە، میهر لە چاوانمەوە
سەری کرد.
لە ژێر ئاسمانی شینا، سەدای
ڤیفان و نالین دێ..
سەرما سەرەتاتکێیەتی
گوڵ کەوتووەتە ئاویلکە
ئازیزانی دڵەکەم،
کە سەرما هەڵیکرد
یەکەم بەفر دایکرد
دنیای داپۆشی
وەرن دڵم دەربێنن
بۆ مێرگێکی بەرن
بەبەفر دایپۆشن.

هەڵبەتە بەهیچ جۆرێ بەخۆما نەشکامەوە، کەرامەتی شیعریم نەڕووشا، بەپێچەوانەوە زۆریش شیعرەکەم بەدڵ بوو. زۆرم بەزەیی بەکچی ناو شیعرەکەدا هاتەوە. نەنکم گوتی:

- دەبینی؟ خەم وپەژارە، ئاوا دەشیعرێنرێت. ئەم شیعرە کیژێک داینـاوە. کیژێک کە لە هاوینـا، لەگەڵ دەنکەکەیدا. سووڕاوەتەوە، چووەتە گەشت، بەڵام هەرکە زستان هاتووە، دەنکەکەی بەجێی هێشتووە، لێی دوورکەوتووەتەوە، ڕەنگە دووی کیژێکی دی کەوتبێت. ئیدی کیژێ ڕەنجاوە، خەفەتی خواردووە، گریاوە، شتێک کە مرۆڤ خۆی تیایا نەژیابێ، بەڕۆح هەستی پێنەکردبێت، مەحاڵە بتوانێ بە دروستی گوزارشتی لێبکات. تەمەشا بزانە ئەم کیژە چەند جوان،

توانیویەتی کول وکۆڤانی خۆی بشعرێنێت،لە قاڵب و ڕیتمێکی بێ وێنەدا دای بڕێژێت!

کە نەنکم، بۆ یەکەمجار پەرندەکانی فرۆشت و چل کوپیکیان دایێ هەر سەری سوڕما، باوەڕی نەدەکرد:

- سەیرە! من وامدەزانی ئەم کارە تەنیا حەزەو هیچی دی، تەنیا بۆکار بەسەر بردنە. تەنیاگاڵتەبازاڕیە. هەوەسێکی ڕەوتەنیە. کەچی دەرکەوت، ئەمە ئیشە، دەستکەوتی هەیە.

- هەرزان فرۆشتووتن..

- ئێ من چوزانم!

ڕۆژانی بازاڕ، یەک ڕوبڵ و هەندێجار شتێ زیاتری دەست دەکەوت. پێی سەیر بوو، باوەڕی نەدەکرد، مرۆڤ بتوانێ بە کاری ناچیز پارەیەکی باش بەدەست بێنێت.

پێی دەگوتم:

- تۆ سەر لەم کارە دەردەکەی؟ من ژنێکی جلشۆر دەناسم کە لە بەیانیەوە تا ئێوارێ جل دەشوات، ژووری مالان پاک وخاوێن دەکاتەوە، کە ئێوارێ دەست لە کار هەڵدەگرێت تەنیا چارەکە ڕۆبلێکی دەدەنێ. کەچی ئێمە هەم دەچینە گەشت وهەم یەک ڕۆبڵمان دەست دەکەوێ، ئەمە کارێکی ڕەوا نییە، هەڵەیە، گوناحە فرندان لە قەفەزان توونر بکرێن. دەبێ واز لەم کارە بێنی ئەلیوشا گیان.

بەڵام من ڕمووردەی ڕاوە فڕاندن بوو بووم، لەزەتم لەم کارە دەبینی، خۆم کوێخای خۆم بووم، ئازادی ئازاد، زەڕم بۆ کەس نەبوو جگە لە فڕندەێن بەستەزمان. کەرەستەی زۆرباشی ڕاوە کێشکانم پەیدا کرد، قسەم لەگەڵ ڕاوچیانی بە ئەزموون و شارەزادا کرد، زۆر شتیان لێوە فێربووم. لەوە بە دواوە، مەیدانی کارەکەم فراوان کرد، بەتەنیا دەچوومە ڕاوێ، دوور دەڕۆیشتم، هەندێجار نزیکەی چل کیلۆمەترێک دوور

دەکەوتمەوە، دەگەییمە لێرەوارەکانی کستوفوی کەناری ڤولگا، ئیدی لەوێ بەکەیفی خۆم کێشکەی ' قەرزەبیل 'م ڕاو دەکرد، تەیرێکی سپی کلک درێژی زۆرجوان لەو ناوە هەبوو، کە ' قرقەفیان ' پێدەگوت، تەیربازان زۆر حەزیان لەم فڕندەیە دەکرد، جارجار ئەوەشم ڕاو دەکرد.

هەندێجار، دوای خۆرئاوا لە ماڵ وەدەر دەکەوتم و بە درێژایی شەو، ڕێگای قازانم دەدایە ژێر پێوە. بەتایبەتی پاییزان کە باران دەباری و دنیا دەبوو بە قوڕ وحەڕی... ئەوزار وکەرەستەی ڕاوەکەم، لە فاق و قەفەز وکێشکەی مومیاکراو تا فڕندە زندووەکانی پێ بخەڵەتێنم، لە توورەکەی مشەما دەنا و دەمدا بە کۆڵما و، داردەستێکی دار گوێزم بەدەستەوە دەگرت و بڕۆ. دنیا تەزی بوو، تاریکەشەوی پاییز ترس وسامی دەخستە دڵمەوە. سپیداری زەلام، لەم بەرو لەو بەری ڕێگاکەدا، کە هەورە تریشقە لێی دابوون و نیوەسووت بووبوون، باران بە لقەکانیانا دەچۆڕایەوە و بە سەروگوێلاکما دەڕژا. بە دەستەچەپا و لە بناری شاخەکانی دیار ڕوباری ڤولگا کە ئاوەکەی ڕەش دەچووەوە، لە دوورەوە تروسکەی بورجی کەشتیان وبەلەمانی باری، دێرکەوتوو، دەدرەوشایەوە، لە تۆوایە بەرەو هەڵدێرێکی بێ بن ملدەنەن.

من گوێم لە دەنگی شووت و شڵپ وهۆڕی پانکەکانیان دەبوو کە دەیانکێشا بە ئاوەکەدا.

کەوێڵ و کوختەی ئەو گوندانەی کە بەلایاندا تێدەپەڕیم، لە قووڵایی زەویە مسینەکەوە، سەریان قوت دەکردەوە. سەگی دڕ هێرشم بۆ دێنن، حەسحەسەکان، شاوران لێدەدەن و بەترسەوە تێم دەخوڕن: - زەلام کێی؟ بەم شەوە لەچی دەگەڕێی؟

دەترسام حەسحەسەکان، دەست بەسەر فاق و تەڵەکانما بگرن، بۆیە هەمیشە چەند سکەیەکم لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرت و دەمیانم چەور دەکرد. بەو جۆرە لە گوندی فوکینودا دۆستایەتیم لەگەڵ پاسدارەکەی ئەوێندەردا پەیدا کرد، هەرجارێ دەیبینیم دەیگوت:

- دیسان تۆیت؟ کە تەبیعەتێکی سەیرت هەیە، شەو ورۆژ بەڕێوەی، ماندوو نەبووی، بێزار نەبووی؟

ئەم پیاوە ' نیفونت'ی ناو بوو، پیاوێکی کورتە باڵای سەر بۆز بوو، لە ڕەبەن و قەشان دەچوو. زۆربەی جار، تووریێک یان سێوێک یان لۆچێ نۆکی برژاوی لە ژێر کراسەکەیەوە دەردێنا و دەیخستە دەستمەوە و دەیگوت : - وەرە بچکۆل، وەرە ئەمەم بۆتۆ هەڵگرتووە!

تا قەراخی گوند لە گەڵما دەهات ودەیگوت : - دەبڕۆ بچکۆل، خوات لەگەڵ.

لە گەڵ گەردی بەیانیدا دەگەیمە لێرەکە. فاقەکانم دەنایەوەو قەفەسەکانم کە فرندەی مۆمیاکراویان تیابوو، بە لقی درەختانەوە هەڵدەواسی، ئەوجا لە قەراخ لێرەکە پاڵدەکەوتم و چاوەڕوانی هەڵاتنی ڕۆژم دەکرد. بێدەنگی باڵی بە سەر هەموو شتێکی دەوروبەرما کێشابوو، لە تۆ وایە خەوێکی پاییزەی قووڵ بردوونیەتیەوە. لەبناری بەرزاییە بە مژ ودوومانەکەوە، ئەو دەشت ومێرگ و سەوزەزارە پان و بەرینەم دەبینی کە ڤولگا بە ناویا تێدەپەڕێ. لەوێ، لەو دارستانانەی قەراخ مێرگەکانەوە، هەتاو بە هێواشی گزنگ دەدا، لە ترۆپکی درەختەکانی جەنگەڵەکەی دەدا و ڕەنگێکی ئاگرینی پێدەبەخشی. هەنگێ دیمەنەکان لە قاوغی خۆ دەهاتنەدەرێ و ئۆخژنێکی گۆنگیان بە دڵ و دەروون دەبەخشی. تەمەکە زۆر بەخێرایی و بگرە بە پەلە پڕوزێ

لەسەر سەوزەزارەکە بەرز دەبووەوەو لە ژێر تیرۆژ وتیشکی هەتاوەکەدا وەکو زیو دەدرەوشایەوە و، لە ژێرەوەش، لەسەر ئەرزەکە، گیا و دەوەن و دار ودرەخت بە دیار دەکەوتن و لە تۆ وایە چەمەنزار ومێرگوزارەکان لە ژێر گەرمای هەتاوەکەدا دەتوێنەوە و لە شێوەی جۆگەلەێن زێرِیندا بەهەموو لایەکدا دەرِۆن. هەتــــاو لە ئــــاوی خەواڵــــووی کەنــــارەکە دەدات و ڕووبارەکە بە بۆنی خۆشی پاییز موعەتەر دەکات.

دنیــا ئەوەنــدە ســـاف وڕونــاکە، دەشـــت ودەر بـــووە بە فەزایەکی ئەوەندە بەربڵاو نە پانی دیارە نە درێژی.. هەموو ئەم دیمەنــانە ڕوویــان کــردووەتە دوورییەکــی ئەوتــۆ کە پیــاو حەز دەکات هەتا بڕدەکات، ئەو دنیایە تەی بکات. من زۆرجار لەم شــوێنەوە هەڵاتنــی خــۆرم دیتــووە، بەڵام هەمووجــاریَ دنیــایەکی تــازەم دیتــووە، جــوانی بەیانیــان چــاوانمی مەســتی مەست کردووە.

هەتــاوم زۆر خۆشدەویســـت، خۆشەویســـتیەکی تـــایبەت، نـــــاوەکەیم کە ڕیـــــتم و ئـــــاهەنگێکی ئەفســــــووناوی هەیە خۆشدەوێت. حەزدەکەم چاو بنوقێنم و ڕوخسارم وەربگێڕم و بیدەمە بەر تیشکە گەرمەکەییــان کە وەکــو شمشــێر لە درزی پەرژینێکەوە یــان لە میــانی گەڵای درەختــێکەوە، دەردەکەوێت توند بە هەر دوو دەست بیگرم.

بابــام ڕێزێکی زۆری بــۆ ٭ میــر میخائیــل چیرینگوفسکی و فیــودوری خــانەدان هەبــوو کە ڕەفزیــان کردبــوو کڕنــۆش بــۆ هەتاو بەرن ٭، بەڵام من ئەو دووانەم بە تاوانبار، بە شووم، بە نەحـــس، بە ڕەش وەکــو قەرەج دەزانـــی، وەکــو جووتیـــارە موردوفینە هەژارەکان، بەچاو پرووش و ڕیپوقاویم دەهاتنە خەیــــاڵ. کە هەتـــــاو هەڵـــــدەهات ولە مێرگـــــوزار و لە

سەوزەزارەكانی دەدا، خۆرسك، بێ ئەوەی لە دەستی خۆمابێت، بە شادمانیەوە بۆی دەگرژامەوە.

كاژستانەكە بە سەر سەرمەوە زەمزەمە دەكات، ئاونگی سەر گەڵا هەمیشە كەسكەكانی دەتەكێنێت. لە سێبەری درەختەكاندا، پاشماوەی سەهۆڵی بەیانیان بەسەر گەڵای ددانەداری ڕووەكی سەرخسەوە وەكو زیو دەدرەوشێتەوە. بەڵام ئەو گژوگیا و ڕووەكە زەردانەی كە باران لێی داون و بە بێ جووڵە لە ئەرزەكەدا ڕاكشاون و مت بوون، هەركە تیشكی هەتاوەكە بە ئاستەم لێیان دەدات، تەكان دەخۆن و زندوو دەبنەوە و گیانیان وەبەر دەكەوێتەوە. پێدەچێ ئەم جووڵەیە دوا هەوڵی ژیانەوەیان بێت.

فڕندان، بێدار دەبنەوە، چۆلەكەی قورقوف، تووكن و بۆرەقنە چلاوچل دەكەن. بولبولێك لە سەر چڵێك خۆنوێنی دەكات، تەیرێكی دەنووك خواری ئاگرین ڕەنگ، لە سەر تروپكی دار كاژەكان چینە لە بەری كاژەكان دەكات. تەیرێكی قورقوفی سپی ڕەنگی كلك وباڵدرێژ، بەسەر چڵێكەوە، باڵەكانی لێكدی دەدات، چاوە ڕەشە سركەكانی بریوەتە داوەكەی من. لە ناكاوا جەنگەڵە كروكپ، بێدەنگ و خەواڵووەكە، پردەبێت لە دەنگ و ئاوازی سەدان تەیر و پەڕندە و فڕندە، پردەبێت لە جوانترین خەلقەنەی زندووی دنیا. ئەگەر تەیران نەبا، توانای داهێنانی بەشەر چۆن دەیتوانی جوانیانی وەكو فریشتە بە هەموو شێوەكانیەوە بخولقێنێ و خەم وپەژارەو كول وكۆڤانەكانی خۆی لەو ڕێگەیەوە برەوێنێتەوە.

بەزەییم بەو تەیرانەدا دەهاتەوە كە ڕاوم دەكردن، هەستم بەجۆرە شەرمەزارییەك دەكرد كە لە قەفەزم توونـد دەكردن. حەزدەكەم بەردەوام، تەمەشای جم وجوڵیان بكەم. بەڵام مەیلی ڕاوكردن و ئارەزووی كاسبی و پارە پەیداكردن، میهر

وبەزەیی منیان زندەبەچاڵ دەکرد. زۆر لەزەت لە سلۆکی وسرکی وفیل و دەهۆیەکانیان دەبینم.

ئەوە تەیریکی شینە، سەرەتا زۆر بەوردی لە داوەکە ورد دەبیتەوە، کە هەست بەخەتەر و مەترسیان دەکات خۆی لە قەرەی داوەکە نادات، دەکەویتە چینە لەو دانەویلانەی کە لە دەوروبەری داوەکە ڕۆکراون. ئەم پەڕندە و کیشکە کێویانە زۆر سرک وزیرەکن، بەلام لە کونجکاوی ولاپرەسەنی خۆیانا تووش دەبن ودەکەونە تالوکەوە. بەلام هەندیک تەیری لە خۆبایی و گێلی وەکو "سیهرە" پۆل پۆل خۆ بە تۆڕەکەما دەدەن و گرفتار دەبن، ڕێک وەکو ئەو بورژوا دەوڵەمەندانەی بەکۆمەڵ ڕوودەکەنە کلێسایان. کە گرفتار وگیرۆدە دەبیت، تەواو دەپەشۆکیت، دەحەپەسیت، چاو دەگێڕیت وبە دەنووکە تیژەکەی دەندووک لە قامکم دەدات. بەلام تەیری "دەنووک خوار" زۆر بە ئارامی و ویقارەوە، دیت و دەکەویتە داوەوە. بەلام کیشکەی سەرڕەش، ماوەیەکی زۆر بە دیار داوەکەوە دەوەستێ، دەنووکە دریژەکەی بەملاو بەولادا بادەدات، خۆی بەسەر کلکە دریژەکەیا دەدات، ئیدی ئەم تەیرە وەکو دارکونکەرە بەقەدی درەختاندا هەڵدەزنێ و دادەگەڕێ و قورقوفان ڕاودەنێت. ئەم تەیرە بۆرەقنەیە، شتیکی سەیرە، وابزانم بە تەنیا دەژی، گۆشەگیرە نەکەسی خۆشدەوێ و نەکەس خۆشی دەوێ. وەکو قەلەڕەشان، حەزی لە دزین و شاردنەوەی شتی بریقەدارە.

دەورو بەری نیوەڕۆیان لە ڕاو دەبوومەوەو بە ناو دارستان و مەزراو دەشت و دەراندا بۆ ماڵ دەگەڕامەوە. بۆیە بە ڕاستە ڕیگاکان و بە ئاوەدانیا نەدەگەڕامەوە، چونکە دەمزانی کوڕانی گەورە وبچووکی ئەو گوندانەی کەوتبوونە

سەر ڕێگاکە ڕێیان پێدەگرتم و هەم قەفەس و فاقەکان و هەم ئەو تەیرانەیان لێدەسەندم کە ڕاوم کردبوون.

ئێوارەیەکی درەنگ کەنەفت و برسی دەگەیمەوە ماڵێ. بەڵام هەستم دەکرد کە ئەو ڕۆژە گەورەتر بووم و زۆرشتی تازە فێر بووم و هێز و توانام زیاتر بووە. متمانەم بەخۆ پتر بووە.. ئیدی ئەم متمانە بە خۆبوونە، وایکرد کە گوێ بە تەوس و توانجەکانی بابام نەدەم، کە بینی تەوس وتوانجەکان بەهەند وەرناگرم و سوورم لە سەر کاری خۆم، ڕاوێژی خۆی لەگەڵما گۆڕی و زۆر بەجدی گوتی:

- ئەم کارە تورەهاتانە دادت نادات، بە قسەی من دەکەی وازی لێ بێنە. کەس بە تەیر فرۆشی هیچی بە هیچ نەکردووە. ئیش و کارێک هەڵبژێرە، کە مێشکت بکاتەوە. مرۆڤ بۆ ئەوە دروست نەبووە، کە هەموو تەمەنی بەکارێن منداڵانە بباتە سەر. بەشەر تۆوێکە خودا وەشاندوویەتی، دەبێ گوڵ بکات، بێتەبەر، بەربدات! بەشەر وەکو پارەیە کە لە شوێنی گونجاوا بخرێتەکار و وەبەرهێنانی پێبکرێ، دەبێت بەسێ هێندە. پێت وایە ژیان کارێکی ئاسانە؟ نەخێر. ژیان زۆر سەختە! جیهان وەکو شەوە زەنگە، دەبێ هەر کەسێک، بە خۆی چرای خۆی داگیرسێنێت. هەموومان بە دە قامکانەوە لەدایک بووین، دەمانەوێ دەستمان بگاتە دوورترین ئاقار و هەموو شتێک هەڵبگرین. دەبێ بەهێز بی، کە هێز دادی نەدایت، دەبێ زرنگ و فێڵباز بی.. پەنابەریتە بەر مانۆڕان. هەرکەسێک هەم بچووک و هەم بێهێز بێ، لە هەموو دینێ دەبێت، نەبە کەڵکی بەهەشت دێت و نەبە کەڵکی دۆزەخ. لە کۆمەڵگە ولە ناو بەشەراندا بژی، بەڵام هەمیشە ئەوەت لەیاد بێ کە تەنیای. گوێ لە هەموو خەڵکی بگرە، بەڵام باوەڕ بەکەس مەکە.. ئەگەر باوەڕبکەی زەرەر دەکەیت. فێری بێدەنگی بە، قسە هەزاە و دووانی

بەکارە. ماڵ و شاران بە قسە دروست ناکرێن، بەڵکو بە پارە و ئامێران دروست دەکرێن. خۆتۆ بشکیری یان کالمیکیان نیت کە جگە لە پەز و پێستان هیچی تریان نییە..

ئەو دەیتوانی شەوان تا بەیانی ئەوجۆرە قسانە بکات. هەموو گوتە و گوتارەکانیم ئەزبەر بوو، دڵبەندی قسەکانی بووم. بەڵام متمانەی تەواوم بەمانای قسەکانی نەدەکرد. لە قسەکانیا گەیمە ئەو ئەنجامگیریەی کە دوو هێز ژیانیان سەخت کردووە:- خودا وخەڵکی.

ئەنکم لەبەر پەنجەرەکە دانیشتبوو، خەریکی تەشی ڕستن بوو، تەشییەکە، بە گف وهوڕ، لە نێو قامکە زراڤەکانیا دەخولایەوە. ماوەیەکی زۆر بە بێئەوەی ورتەبکات، گوێی لە قسەکانی بابام گرت، پاشان لە ناکاوا هاتەقسان:

- هەموو شتێک بە ئیرادە و ویستی دایکی خوایە، بە ویستی پاکیزەی پیرۆزە.

بابام هاواری دەکرد:

- ئەوە چ دەڵێی ژنەکە؟ خوا؟ وادەزانی من خوا ناناسم، خوام لە بیر کردووە؟ من خوا دەناسم زۆر باشیشی دەناسم. پێم بڵێ خودا ئەم هەموو کەر و گایەی بە دنیادا بڵاوکردووەتەوە هەی کەودەن؟

***

وام وێنا دەکرد، لە دنیادا، لە ژیانی سەربازان و قوزاقان خۆشتر و ئاسانتر نییە. ژیانیان سادە و ئاسوودەیە. بەیانیان ئەگەر هەوا خۆشبا، لەوبەری دۆڵ و شیوەکەی بەردەم ماڵی ئێمەدا کۆدەبوونەوە. بە دەشت و دەرەکەدا بڵاودەبوونەوە، مەشق و ڕاهێنانی گۆنگ و ئاڵۆزیان دەکرد، بە قەمسەڵەی سپییەوە، تفەنگ بەدەست، بە مەیدانەکەدا غار دەدەن، بەسەر

کەند ولەندە بچووکەکاندا بازدەدەن، لە دۆڵەکەدا ون دەبن. هەنگێ لە ناکاوا دەنگی شەیپورێک بەرز دەبێتەوە، سەربازەکان دووبارە، بە دەم هوراکێشانەوە، لە مەیدانەکەدا دەردەکەونەوە. بە دەم گرم وهۆڕی تەپڵەوە، بە خۆ ونێزەکانیانەوە بەرەو جادەکەی بەرماڵی ئێمە هێرش دێنن. وام خەیاڵ دەکرد هەر ئێستا کولبەکەی ئێمە وەکو خەرمانە پووشێک هەڵدەگرن و وێرانی دەکەن و دەیدەنە دەم باوە. منیش بە لاسایی کردنەوەی ئەوانەوە، بە دەم هوراکێشانەوە، بەغاردان دوایان دەکەوتم. دەنگی توندی تەپڵ ودەهۆڵان، ئارەزوویەکی توندی خراپکاری لە ناخما جۆش دەدا، بۆ نموونە وێران کردنی پەرژینێک یان لێدانی کەسێکی لە ناخما دەهاروژاند.

سەربازەکان، لە کاتی پشوو باشداتووتنی خۆماڵیان دەدامێ، تفەنگە قورسەکانی خۆیان بەمن دەسپارد. هەندێجار یەکێکیان ڕووی سەرەنێزەکەی دەکردە من و بە شۆخییەوە و بە دەنگێکی گڕ دەیگوت : - با ورگی ئەم سیسرکە بدڕین!

سەرەنێزەکە لە بەر تیرۆژی خۆرەکەدا دەدرەوشایەوە، دەتگوت گیانی لەبەرە. وەکو مارێک خۆی بۆ پێوەدان ئامادە بکات، خۆی لوول دەکرد. دیمەنەکە هەندێک ترسناک بوو، بەڵام من لەزەتم لێدەبینی!

سەربازە موردوفییە دەهۆڵ ژەنەکە فێری دەکردم کە چۆن دوو دارەکەی دەهۆڵ کوتانەکە بەکار بێنم. یەکەمجار هەر دوو دەستی لە نێو دەستی خۆی دەنام و بەهەموو هێزی خۆیەوە بەڕادەیەک دەیگوشین کە ژانی دەبردە دڵمەوە، ئەوجا دارەکانی دەخستە بەینی قامکە سڕبووەکانم.

هەنگێ چاوەکانی، کە لە چاوانی فرندە دەچوون، تێدەبڕیم و بە دەنگێکی گڕ دەیگوت:

- لێدە: یەک، دەی جارێکی دی – یەک, دەی جارێکی دی!
ت. ت. ت! لێدە، بە دەستی چەپ هێواش، بە دەستی ڕاست توووند – تا، تا، تا..!

من گوێ بە گوێی سەربازەکان، بە مەیدان و دەشتەکەدا تا کۆتایی مانۆڕ و مەشقەکان غارم دەدا. ئەوجا بە ناو شارا تابەر سەربازخانەکە لەگەڵیاندا دەڕۆیشتم. گوێم لە سروودە خۆشەکانیان دەگرت، دەمڕوانیە ڕوخساری ناسکیان کە وەکو دراوی پێنج کوپیکی تازە لە سکە دەرهاتوو دەدرەوشانەوە.

ئەم کۆمەڵە خەڵکە گەنجە، ساغ و سەلامەت، یەککگرتوو، وەکو ئاوی ڕەوان، بە خوشحاڵی وشادییەوە بە شەقام وجادەکانی شارا دەڕۆیشتن، ئیدی پیاو حەزی دەکرد پەیوەندییان پێوەبکات و بچێتە ڕیزیانەوە وەکو چۆن جۆگەلان دەڕژێنە ڕوبارەوە. ئەو گەنجانە لە هیچ کەس و هیچ شتێک نەدەترسان، بە جورئەتەوە، بێباک سەیری هەموو شتێکیان دەکرد. توانای سەرکەوتنیان بە سەر هەموو شتێکدا هەبوو، دەیانتوانی ویستی خۆیان بسەپێنن. وێڕای ئەوەش خەڵکێکی زۆرباش و خاکی بوون.

ڕۆژێک، لە کاتی پشوودا، نایب زابتێک، جگەرەیەکی ئەستووری دامێ:

- بیگرە، جگەرەیەکی عالە. من ئەم جگەرەیە بەکەس نادەم. بەڵام تۆ کوڕێکی باشیت!

دامگیرساند. کابرای نایب زابت، هەنگاوێک چووە دواوە. لە ناکاوا گڕێکی سوور لەبەر دەم و لووتما بەرز بووەوە. ئیدی بەرچاوم تاریک بوو، پەنجەکان و کەپوو و برۆیەکانم سووتان. بۆنی توووند و ناخۆشی گۆگرد، دەم و لووتی پڕ کردم، کەوتمە پژمین و کۆکەکۆک. ئیدی کوێر وترساو نەمدەزانی چ بکەم. سەربازەکان بە دەم پێکەنین و

گاڵتەپێکردنەوە لە دەورم خڕبوونەوە. بلەز بەرەو ماڵ نشێو بوومەوە، گوێم لێبوو لە دواوە پێم پێدەکەنین. قامکەکانم دەسووتانەوە، دەم و چاوم دەکزایەوە و ڕوندک بەچاوانما دەهاتە خوارێ. بەڵام ئەوەی کە زۆرم لاناخۆش بوو، ژان و ئازارەکەی نەبوو، بەڵکو بێ مانایی ئەو شۆخییە بوو کە لەگین بوو کارەساتی گەورەی لێبکەوێتەوە. بۆ ئەو کارەیان لە گەڵ مندا کرد؟ باشە ئەم خەڵکە باشە، بۆ ئەمە بە مایەی سەرگەرمی و پێکەنین بزانن؟!

که گەیمەوە ماڵ، سەرکەوتمە سەرێ، ماوەیەکی زۆر لەوێندەر ڕاکشام، هەرهەموو ئەو مەینەتیە زۆر و دژوارانەم وەکو قەوان بۆخۆم لێدایەوە کە لەم تەمەنە کورتەدا بەسەرم هاتبوون. ئیدی ئەم دیمەنەم لە بیر نەدەچووەوە، بەتایبەتی دیمەنی ئەو سەربازە بچووکەی کە خەڵکی سارابول بوو. ئەمە لە بەرچاوم نەدەسڕایەوە، هەمیشە بەزندوویەتی لە بەرچاوم بوو.

پرسی: - باشە، تێدەگەی؟

لێ، هەر زوو شتێکی زۆر هۆڤیانە و کارەساتبارترم بینی.

وردە وردە هاتوچۆی ئەو سەربازگانەم دەکرد کە لە نزیکی بیشیرسکایا سلوبودا بوون و پڕبوون لە قوزاقان. ئەم قوزاقانە لە سەربازەکان جیاوازبوون – نەک لەبەر ئەوەی شۆڕە سوار و پسپۆڕی ئەسپ سواری بوون و جلکی باشتریان لەبەربوو، بەڵکو زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە بە زمانێکی جیاواز داخاوتن، بەجۆرێکی جیاواز دەستەرین "سترانیان دەگوت" هەڵپەڕکێ و سەمایەکی زۆر جوانیان دەکرد، هەندێک جاران شەوان، دوای ئەوەی ئەسپەکانیان دادەکرد، لە نزیکی تەویلەکانا ئەڵقەیان دەبەست. ئیدی قۆزاقیەکی چکۆلەی سەرسوور کە قژە لوولەکەی بۆ پشتەوە

هەڵدەدایەوە، دەچوو، بەدەنگیکی بەرزی وەکو دەنگی کلارنێت هەڵـــی دەکـــردە گـــۆرانی، لەوێنـــدەر ڕاســـت دەوەســـتا وبەخەمبارییەوە گۆرانیەکی نەرمی خەمناکی بە دۆنی ئاراما، یـان بە دانـوبی شـیندا هەڵـدەگوت. ئیـدی وەکـو مەلـی سـپێدە (جـۆرە تەیـرێکە) چـاوانی دەنووقانـد، ئەم تەیـرە زۆرجـار کە دەخـوێنێ، چـاو دەنـووقێنێ و دەسـتبەرداری خوێنـدن نـابێ تـا دەکەوێتەسـەر عـاردی و مـردار دەبێتەوە. یەخەی کراسـەکەی کرابـووەوە، کەڵەمە ڕەق و تەقەکەی بەدەرەوە بـوو، بـیچم و قەد وقەلافەتی دەتگوتلە برۆنز داتاشراوە. لەوێندەر بەبێ چاو ڕادەوەســـتا، باســـکی دەجولانـــدن، لە ســـەر هەردوو لاقە لاوازەکەی خۆی بەجۆرێ دەهاژاند، وەکو ئەوەی ئەرزەکە لە ژێریاندا هەرەس بێنێ و دابڕوخێت، لەوە دەچوو، لە بەشـەری کەوتبـێ و بووبێـت بە شـەیپووری شـەیپوورژەنێک یـان نـای شـوانێک. هەنـدێجار وام وێنـا دەکـرد، لە ناکاوێکـا بەپشـتا دەکەوێ وەکو مەلی سپێدە گیانی دەردەچێت، چونکە، هەموو توانا بەدەنی و روحیەکەی بەو گۆرانیە بەخشیبوو کە دەیگوت.

هاوڕێکـانی، دەسـت لە گیرفـان، یـان دەسـت لە پشـت لە دەوری دەوەســـتن، چـــاو دەبـــڕنە ڕوخســـاری برۆنـــزی ودەستەکانی، بەئارامی و دەنگی دڵگیر، وەکو کۆرسێکی کڵێسـا گۆرانی دەڵێن. لەو سـاتانەدا هەر هەموویـان، بە ڕیشـدار وبێ ڕیشەوە لە پەیکەر و ئیکۆنان دەچن. گۆرانیەکە، بڵاو دەبێتەوە، دەنگدەداتەوە. من بە دەم گوێگرتنەوە، خۆ لە بیر دەکەم، نازانم وەخـت کەیە، شـەوە یـان ڕۆژە، خـۆم منـداڵم یـان پیرەمێـرد. هەموو شتێک لە هەزار تۆیی بیرچوونەوەدا، ون دەبێت! دەنگی گۆرانیبێژەکان بەجۆرێ کپ دەبێت و دادەمرکێتەوە کە گوێمان لە سووکترین تەڤگەری شەوی پاییزی دەبێت کە بەسەر مەزرا وکێڵگەکانا دادەکشێت، گوێمـان لە پرمەو هەناسـەی ئەسـپەکان

دەبێت کە خەون بە ئـازادی و دەشـت و دەرەوە دەبیـنن. ئەم هەسـتە غەریـبە بە جۆرێ لە دڵمـا دەپەنگێتەوە خەریـکە دڵـم بتەقـێ، خۆشەویسـتیەکی لاڵ، خۆشەویسـتی خەڵـک و خـاک بەجۆرێ لە دڵما پەنگاوەتەوە، ئۆقرەی لێ بڕیوم.

وا خەیاڵـدەکەم، یـارۆی قـوزاقە برۆنـزییە بچـووکەکە، لە پیاوێـک زیـاترە – شـتێکی تـایبەت و جیـاوازە – ئافەریـدەیەکی ئەفسانەییە، لە بەشـەری فـانی زۆر بـاڵاتر وگەورەترە. شـەرمم دەکـرد قسـەی لە گەڵـدا بـکەم. ئەگەر پرسـیارێکی لێکردبـام، لە خۆشـیا پێدەکەنیم، خەنـی دەبووم، بەڵام زۆر شـەرمم دەکـرد. ئامادەبووم وەکو سەگێکی دەستەمۆ، لێرەو لەوێ دوای بکەوم، هەر بـۆ ئەوەی تۆزێـک زیـاتر بیـدینم و گـوێ لە گـۆرانی و ئاوازەکانی بگرم.

ڕۆژێـک، دیـتم لە سـووچێکی تەویـلەکەوە وەسـتابوو و موسـتیلەیەکی زیـوی ئاسـایی لە ئەنگوسـت بـوو و بە دیـقەت تەمەشـای دەکـرد. لێـوە جوانەکـانی دەبـزوان، سـمێڵە سـوورە بچووکەکەی گڤ بـوو بـووەوە، ڕوخسـاری خەمێکی بەکـول و کۆڤانی پێوە دیاربوو.

ئێوارەیەکی درەنـگ وتـاریکی دیـکە، قەفەزەکـانم هەڵگـرت و چـووم بـۆ بـاڕێکی مەیـانی سـتارایا سـینایا. خـاوەنی بـاڕەکە، زۆری حەز لە بولبـول و کێشـکانی ئـاوازخوێن بـوو، زۆربەی کات ئەو تەیرانەی لێدەکڕیم.

یارۆی قوزاقی لە گۆشەیەکی باڕەکەدا، لە نێوان وەجاخەکە و دیـوارەکەدا دانیشـتبوو. ژنێکـی قەڵەو، کە بەکەلەش دوو هێندەی ئەو دەبوو، لە لایەوە ڕۆنیشـتبوو. ڕوخسـارە خڕەکەی دەبریقـایەوە، بە نیگـایەکی پـڕ خۆشەویسـتییەوە تەمەشـای دەکرد، بەڵام نیگایەکی بارگاوی بە نیگەرانی، کە زیاتر لە نیگا و نـۆڕینی دایکـان دەچوو. قـوزاقەکە مەسـت بـوو، لێکدا لێکدا

لاقـی دەجولاند، دیـاربوو لاقـی بەر ژنەکە کەوت، ژنەی تـاین ڕاجفری (ڕاچڵەکی) ڕووی گرژ کرد و بەمیهرەبانیەوە گوتی: - واز لەم بەڕەڵلایی و چەنەبازیە بێنە!

یـارۆی قـوزاقی، بە ئەسـتەم برۆکـانی هەڵبـڕین. دووبـارە داهـاتنەوە. زۆر گەرمـای بـوو، یەخەی پـاڵتۆکەی و کراسـەکەی کردبووەوە، ملی دەرخستبوو. ژنەکە، سەرپۆشەکەی لە سەری لابرد و دای بەشانیا، هەردوو باسکە سپی و گۆشتنەکانی نـایە سـەر مێزەکە، قامکەکانی بە توونـدی تێک ئالاندن، جمگەکـانی هێنـدەی دی سـپی هەڵـگەڕان. تـا زیـاتر لێیـان ورد دەبـوومەوە وام هەست دەکرد یارۆی قوزاقی کوڕێکە و خەتایەکیلە هەنبەر دایکێکی مێریڤان کردووە. ژنەکە بە میهرەبانیەوە سەرزەنشتی دەکـرد وئەویـش کڕوکـپ، هـیچ وەڵامێکـی نەدەدایەوە. هـیچ بیانوویەکی پێنەبوو کە خۆی پێ بپەڕێنێتەوە.

لە ناکاوا، وەکو یەکێک کولاشدم (دووپشک) پێوەی دابێ، هەسـتایە سـەرپێیان، شـەپقەکەی تـا سـەر هەنـیەی هێنـایە خـوارەوە، ئەوجـا نـاولەپێکی پێـدا کێشـا و بێـئەوەی دوگـمەی پـاڵتۆکەی دابخـات بەرەو دەرگـاکە چـوو. ژنەکەش هەسـتا. بە بارمەنەکەی گوت: - کوزمیچ، ئێستا دەگەڕێینەوە.

لەگەڵ ڕۆشـــتنی وانـــدا، دەنگـــی پێکەنـــین و نـــوکتەی مشتەرییەکان بەرزبووەوە.

یەکێکیـان بە سـەنگینییەوە گـوتی: - کە کـاپتن بگەڕێـتەوە، تەمبێی دەکات!

بە هەڵەداوان دوویـان کەوتـم. لە تـاریکیەکەدا چەنـد گاڤێـک (هەنگـاو) لەپێشـمەوە دەڕۆیشـتن، مەیـدانە پڕ قوڕ ولیتەکەیـان بـڕی، بەرەو کەنـاری ڤولگـا هەوراز بـوونەوە. ژنەکە، بەلادا دەهـات و هەوڵـی دەدا، یـارۆی قـوزاقی بگرێـت. گـوێم لە

فلچەفلچـی قـوڕەکە بـوو لە ژێـر پێیانـدا. ژنەکە، بە نەرمـی دەیپرسی: - بۆکوێ دەڕۆیت؟ ئاخر کێوە دەچیت؟!

هەرچەندە ڕێی من لە ڕێگەی وان جیاواز بوو، بەڵام بە ناو قوڕەکەدا خۆم گەیاندنێ. کە گەییـنە کەنارەکە یارۆی قوزاقی وەسـتا، هەنگاوێـک هـاتە دواوە، لە ناکـاوا شـەپلاخێکی بە دەم وچاویـا کێشـا. ژنە هـاوارێکی ترسـامێزی کـرد: - ئـاه، بۆ وات کــرد؟منیش ترســـام، بە هەڵەداوان بەرەو وان چـــووم. بەڵام یـــارۆی قـــوزاقی نـــاو قەدی ژنەکەی گـــرت، خســـتیە ســـەر هەڵدێرەکە، خۆیشی بە دوایا، ئیدی وەکو تارماییەکی ڕەش بە سەر گیای کەنارەکەدا خل بوونەوە. واقـم وڕمـا، وەکو بەرد لە جێی خـۆم چەقـیم، گـوێم لە دەنگـی شـەڕەکەیان و دڕانـی جـل وبەرگەکانیان و هانکەهانکی توندی یارۆی قوزاقی بوو کە لە خواری خوارەوە بەرز دەبووەوە.

ژنەکە، بە دەنگێکی نەوی و لەبن لێوانەوە دەیگوت: - هاوار دەکەم.. هاواردەکەم ها..

پاشان، ژاوەژاوێکی بەژانی لێ بەرز بووەوە و ئیدی هەموو شـــتێک کڕوکـــپ و خـــامۆش بـــوو. بەردێکـــم هەڵگـــرت وبە هەڵـدێرەکەدا غلـم کـردەوە. جـگە لە خشەخشـی گژوگیـا هیـچی تـرم گـوێ لێنەبوو. دەرگـا شووشـەکەی بـاڕەکە، بەجیڕ وهۆڕ کـرایەوە، یەکێـک کەوتە سـەر ئەرزەکە و هـاوارێکی لـێ بەرز بووەوە، بێدەنگی دووبارە باڵی بەسەر دنیادا کێشـا، بێدەنگیەکی بارگاوی بە ترسێکی پەنهان. لەو دیوی هەڵدێری کەنـارەکەوە، شـتێکی گەورەی سـپی بەدیـار کەوت. بەهەنگـاوی لەرزۆکەوە، بە هەڵدێرەکەداهەڵـــدەگەڕا، بە دەم هەنســـک هەڵـــدان و ورتەورتەوە هەڵــدەگەڕا، ئەو شـــتە گەورەیە ژنەکە بـــوو. کە وەکـو مەڕ بە چـوار چنگـۆڵە سـەردەکەوت، دەمبینـی کە تـا نـاوقەدی ڕووت بـوو. مەمکەخـڕ وگەورەکـانی لە سـپیەتیدا

دەدرەوشانەوە. لەوە دەچوو سێ سەری هەبێت. ئەنجام گەییە لای محەجەرەکان، لە لامەوە دانیشت، وەکو ئەسپێکی ماندوو پەیتاپەیتا دەی پرماند و هەوڵیدەدا قژە شێواو و تێک ئاڵاوەکەی ڕێک بخاتەوە. پەڵەی ڕەشی قوڕ و حەڕی بەجەستە سپیەکەیەوە دیاربوو. گریا، ڕوندکەکانی سڕی، ڕەفتاری لە پشیکەک دەچوو کە دەم وچاوی بشوات. کەچاوی بەمن کەوت، بە ئەسپایی هاواری کرد:

– خودایا! تۆ کێی؟ لاکەوە، هەی لاساری بێعار!

نەمتوانی دووربکەوە. حایر وحەپەساو و، خەمین و خەمبار وەستام. قسەکانی خوشکەکەی نەنکم بیرکەوتنەوە: ˚ ژن هێزە، دەبێ حیسابی بۆ بکرێ. باشە هەر حەوا نەبوو کە خودی خوای هەڵخەڵەتاند؟ ˚

ژنە هەستا، بە پاشماوەی کراسەکەی مەمکەکانی داپۆشی، لە سۆنگەی ئەوەوە لاقەکانی دەرکەوتن. بە هەشتاو لەو ناوە دوور کەوتەوە. یارۆی قوزاق، بە هەڵدێرەکەدا سەرکەوتەوە، هەندێک کەلپەلی سپی بەدەستەوە بوو، فیکەیەکی سووکی کێشا. ئەوجا بەڕاوێژێکی شاد گوتی:

ح داریا! پێم نەگوتی، قوزاقی هەرگیز پەکی ناکەوێ و هەرچییەکی بوێ، دەستی دەکەوێ؟ وات زانی من سەرخۆشم، نا؟ نا، نەخێر، سەرخۆش نەبووم، ئەوەم تەنیا بۆ هەڵخەڵەتاندنی تۆ بوو داریا!لەجێی خۆی ڕەق ڕاوەستا، دەنگی هەڵبڕی. دانەوییەوە، بە جلەکانی ژنەکە، قوڕی سەر پێڵاوەکانی سڕی و درێژەی دایێ: – داریا، وەرە، جلەکانت ببە، زویر مەبە!

ئەوجا بە دەنگی بەرز جنێوێکی پیسی دایە.

ئیدی لەوێ، لەسەر کۆمایەک هەژگ و بژاڵ دانیشتم و گوێم لەو تاقە دەنگە دەگرت کە لە ناو جەرگەی شەوە بێدەنگەکەوە، زۆر بە غرووورەوە دەهاتەگوێ.

ڕوناکی و تیشکی گڵۆپەکانی مەیدانەکە لەبەرچاوم سەمایان دەکرد، لە میانی پەڵە دارێکی ڕەشەوە، بە دەستە ڕاستا قوتابخانە سپیەکەی (کچە دەوڵەمەندان) بەدیارکەوت. کابرای قوزاقی بە دەم جنێوی پیسەوە هێدی هێدی و بەدەم ڕاوەشاندنی جڵە سپیەکانەوە بە مەیدانەکەدا بوری، ئەوجا وەکو خەونێکی ناخۆش ڕۆیی و بڕایەوە.

لەژێر بورجی ئاوەکەوە هەڵمێک بە فسەفس لە بۆریەکی ئاسنەوە بەرزدەبووەوە. عەرەبانەیەک بە تەقەتەق بە سەرەولێژگەکەدا، بۆلای ڕوبارەکە نشێو دەبووەوە. بەنی بەشەرێک لەو دەوروبەرە نەبوو. بەخەمینی بە قەراخ کەنارەکەدا کەوتمەڕێ، بەردێکی ساردم بەدەستەوە گرتبوو، بە نیازبووم بیکێشم بە یارۆی قوزاقیدا. حەسحەسێکی (جەزایرچی) لەنزیکی کڵێساکەی قەشە جۆرجی پیرۆز، ڕایگرتم و بە تووڕەیی لە ناسنامەکەی پرسیم و پرسی کە کۆڵە پشتیەکەم چی تیایە.

کە حاڵ و حیکایەتی کابرای قوزاقیم بۆ گێڕایەوە، بەپێکەنینەوە، گوتی:

- ئەمە بکە بەپەند و دەرس! قوزاقیان گوێ نادەنە ئەو شتانە، دنیایان بەو قورسیە نەگرتووە برا، ئەوانە وەکو ئێمە نین. ژن و دێڵە سەگیان لەلا وەکو یەکە!

دووبارە، قژقژ دەستی بە پێکەنین کردەوە، من ملی ڕێگەی خۆم گرت، لە دڵی خۆدا دەمپرسی، بۆچی بەوجۆرە بە کوڵ پێدەکەنی.

بەترسەوە بیرم دەکردەوە: باشە ئەگەر ئەو ژنە دایکی من یان نەنکم بوایە، چ دەقەوما؟

## (١٠)

که یەکەم بەفر باری، بابام بۆماڵی ژن خوشکەکەی بردمەوەو پێی گوتم:- مانەوەت لێرە خراپ نییە، هیچ زەرەرێک ناکەی!

هەستم دەکرد کە لە هاوینا زۆر ژیاوم، زۆر بەلام تێپەڕاندووە و لە ڕووی تەمەن و ئاوەزەوە گەورە بووم، بەلام ژی ان لەماڵی وەستا و ئەربابەکانما، زۆر لەجاران ناخۆشتر بووبوو. ئەمانە و خەڵکانی وەکو ئەمانە، ئەوەندەیان دەخوارد، هێندەیان تێ دەتراند، خۆیان ژەهراوی دەکرد، بەردەوام و بەدوور ودرێژی باسی نەخۆشییە درێژخایەنەکانی خۆیان دەکرد.

خوشکەکەی نەنکم بە هەمان دەستەواژە و ڕستەکانی جاران، دەگەڵ خودای گەورەدا دەدوا و لە ژێر پەردەی ئایندا مەبەستە گلاوەکانی خۆی دەشاردەوە. بەلام ژنە گەنجەکە، وەستاژن، چونکە منداڵی دووەمی بووبوو، تەواو باریک و بنێس بووبوو. لە هەڵس و کەوت ورەفتاریا، هەمان نازونوزی دەورانی سکپڕی دەکرد. کە جلکی بۆ جووتە کوڕەکەی دەدروو بەدەم تەقەڵ و دروومانەوە هەمیشە ولەبن لێوانەوە، هەمان گۆرانی دەگوتەوە کە قەتاوقەت گۆڕانی بەسەردا نەدەهات.

*ڤانیا، ڤانیا، ڤانیوشکا*
*برام ڤانیا، برای بچووکم*
*من لە سەر خزاکەکە دادەنیشم*
*تۆش لە دوامەوەو.. هەنگێ دەفڕین*

هەرکە دەچـوومە ئەو ژوورەی کە ئەوی تیـابوو، یەکسـەر گـۆرانیەکەی دەبـڕی و بە تـووڕەیی هـاواری دەکـرد:- بـۆچی هاتووی، چیت دەوێ؟

ئیـدی گەیـیمە ئەو قەنـاعەتەی کە جـگە لەو گـۆرانیە، هـیچ گۆرانیەکی دی نازانێ.

شـەوان، هەر دوو خـانم بـۆ ژووری نانخواردنیـان بانـگ دەکردم و دەیانگوت:

- کوا باسی ژیانی خۆتمان لە کەشتیەکەدا بۆ بگێڕەوە.

مـن لە سـەر کورسـییەکی نزیکـی دەرگـای تەوالێـتەکە دادەنیشتم و هەموو شتێکم لە سیری تا پیازی بۆ دەگێڕایەوە. مـن بە گێـڕانەوەی ئەو بیرەوەریـانەزۆر خۆشـحاڵ دەبـووم، چـونکە بەلای کەمەوەبـۆ مـاوەیەک ئەو ژیـانە تـاڵەی لە بیـر دەبـردمەوە کە بە ناچـاری لای ئەوان دەمبـردە سـەر. کە دەکەوتـمە گێـڕانەوەی سـەربهوردەکەی خـۆم، بـۆ مـاوەیەکی کـورت گوێگرەکـانی خـۆم فەرامـۆش دەکـرد، ژنەکـان کە بە عەمراتیـان سـواری کەشـتی نەبووبـوون، پرسـیاری بێسەروبەریان دەکرد:

- باشە نەدەترسایت؟

- نا، ترسی چی!

- باشـە ئەگەر کەشـتیەکە وەربگەڕێـت و بکەوێـتە گێـژاو وگێژەنگێکەوە و نقوم ببێت؟

وەستام، پێدەکەنی. لە کاتێکا کە دەمزانی کەشتی هەڵمی نە وەردەگەڕێ و نە نقوم دەبێت، بەلام هەرچیم دەکرد و دەکۆشا نەمـدەتوانی قەنـاعەت بەو دوو ژنە بـکەم. پیـرەژن، قەنـاعەتی وابـوو کە کەشـتی مەلە ناکـات، بەڵکـو چەرخ و پـێچکەی هەن، دەگـاتە بنـی دەریـا و بەهـۆی ئەو چەرخـانەوە دەڕوات، وەکـو چۆن عەرەبانە بەسەر عاردیدا دەڕوات.

- ئاخر کەشتیەک کە لە ئاسن دروستکرابێ چۆن سەر ئاو دەکەوێ؟ بۆ نموونە چەکوش، پاچ سەر ئاو ناکەوێ، وانییە؟

- بەڵام بوتڵ، ژێر ئاو ناکەوێ.

- ئەمە کەی قسەیە، بوتڵ لە کوێ و کەشتی لە کوێ؟ بوتڵ هەم بچووکە و هەم ناوەکەی بۆشە!

کە باسی سموری و کتێبەکانم دەکرد، بە گومان و ناباوەڕییەوە، تەمەشایان دەکردم. پیرەژن، قەناعەتی وابوو کە تەنیا خەڵکانی گەوج و خوانەناس کتێبان دەنووسن.

- ئەدی کتێبی مەزموورران؟ کتێبی شا داوود؟ بۆ ئەوانە چی دەڵێیت!

-مەزموورران، کتێبی ئاینییە. شا داوود بەخۆی کە لە دانانی بووەوە، ژێوان بووەوە، داوای بوردنی لە خوا کرد..

- ئەم شتە لە کوێ نووسراوە؟

- لە ناو لەپم، کە زللەیەکم بە سەروچاوتا کێشا هەنگێ دەیبینی!

ئەم ژنە هەموو شتێک دەزانێت، باسی هەموو شتێک دەکات، بێ هیچ شەرم ولە ڕوودامانێک، بە متمانەی تەواوە باسی هەموو شتێک دەکات. دەڵێت:

- لە شەقامی بیچورکادا، کابرایەکی تاتار مرد، روحی لە دەمیەوە دەرهات، ئەوەندە ڕەش بوو دەتگوت قەترانە.

گوتم: - روح نابینرێ، ڕوح هەناسەیە..

بە ڕقەوە هاواریکرد: - من باسی کابرایەکی تاتار دەکەم، هەی بێ ئەقڵ!

خانمی چکۆلەش، لە کتێبان دەترسێت. گوتی:

- خوێندن شتێکی خراپە، بەتایبەتی بۆ جەوانان. کچێک لە شەقامەکەی ئێمەدا هەبوو - شەقامی گریبچوک - لە ماڵباتێکی باش بوو، ئەمە خووی دایە کتێب خوێندنەوە، ئەوەندەی

خوێندنەوە تا کەوتە داوی ئەڤینی قەشەوە! مەگەر خوابزانی ژنەکەی قەشە، بە ڕۆژی نیوەڕۆ بە بەرچاوی خەڵکەوە چی پێکرد! بە ڕاستی حەیاچوون بوو!

هەندێجار، بڕێک وشە و زاراوەی ناو کتێبەکانی "سموری"م لە قسەکردنا بەکار دەبرد، بە تایبەتی قسەی ناو ئەو کتێبەی کە لاپەڕەکانی سەرەتا وکۆتایی پێوە نەمابوو، یەکێک لەو ڕستانە ئەمە بوو : " ئەگەر ڕاستت دەوێ، چ کەسێک بارووتی دانەهێناوە. بارووت لە ئەنجامی مالیجەی دوورودرێژ و تێبینی و دۆزینەوە و ئیکتیشافاتی لاوەکیەوە دۆزراوەتەوە. "

ئەم ڕستەیە نازانم بۆچی لە خوت و خۆڕایی لە زەینما نەخش بوو بوو. زۆر دڵبەندی ڕستەی: " ئەگەر ڕاستت دەوێ..

" بووم، بەکارهێنانی ئەو دەستەواژەیە زۆرم لە سەرکەوت.

شەوێک، کە خانەوادەکە داوایان لێکردم سەربهوردی ئەزموونەکانی خۆمیان لە ناو کەشتیە هەڵمیەکە بۆ بگێڕمەوە، هەر هات بە دەمما وگوتم:

– ئەگەر ڕاستت دەوێ، شتێک نیە کە شایستەی گێڕانەوە بێت.

هەموو بەجارێ حەپەسان و کەوتنە تەشەر لێدانم: – ئەمە چییە؟ چیت گوت؟

هەرچواریان لە قاقای پێکەنینیان دا. بە تەوس وتوانجەوە کەوتنە وتنەوەو دووبارە کردنەوەی دەستەواژەکەی من: " – ئەگەر ڕاستت دەوێ! " خۆشە!

وەستا بە خۆی ڕووی تێکردم وگوتی:

– ئەمە دەستەواژەیەکی هیچە، ئەوەندە دووبارەی مەکەوە!

ئیدی لەوەوە نازناوی " ئەگەر ڕاستت دەوێ " یان لێنام.

– ئەهای تۆ، " ئەگەر ڕاستت دەوێ " ! وەرە پیسایی منداڵەکە لە ئەرزەکە پاک بکەوە.

دیاره ئەم داخوازیە بێ مانایانە زیاتر دەبوونە مایەی سەرسامیم نەک مایەی توورە بوونم.

ئیدی لەو پەڕی کلۆڵیدا دەژیام، جا بۆ ئەوەی لەو بارە نالەبارەی خۆم دەربازبم، بە هەموو توانایەکمەوە ملم بەکارەوە دەنا، دەمویست خۆم لە بیر بکەم. کاریش کەم نەبوو. ماڵەکە دوو منداڵی بچووکیان هەبوو. خاوەن ماڵەکە، لە دایەنەکان ڕازی نەبوون، لێیان بەبیانوو بوون، زوو زوو دەیانگۆڕین. بۆیە دەبوایە ئاگام لە منداڵەکانیش بوایە، ئەرکی ئەوانیش بەملی مندا دەهات. هەموو ڕۆژێ پەڕۆکانیانم دەشت، هەفتەی جارێک دەچووم بۆ " کانی پۆلیسان " تا ڕایەخەکانی ژێریان بشۆم. هەڵبەتە ژنانی جلشۆر، لەوێ گاڵتەیان پێدەکردم. لێیان دەپرسیم:

- باشە تۆ بۆ ئەم کارە ژنانەیە دەکەی؟ ئەمە کاری ژنانە نەک کاری پیاوان.

هەندێجار، بە ڕادەیەک سەریان دەکردە سەرم، بە خۆم نەدەوەستام و جلە تەڕەکانم بە سەروچاویاندا دەدا، ئەوانیش بەگژما دەهاتنەوە ولێمان دەبوو بە شەڕە پەڕۆ. ئەلهەقی ئەم بەزمەی ناو ژنەکانم پێخۆش بوو.

کانی و سەرسەراوی پۆلیسان لە قووڵایی دۆڵێکی قووڵەوە هەڵدەقولا و بەرەو ڕوباری ئوکا دەڕۆیی و دەڕژایە ڕوباری ناڤبرییەوە، ئەم دۆڵە شاری لە بیابانێک هاوێر دەکرد کە پێیان دەگوت " یاریلو ". یاریلو ناوی کۆنی خواوەندی خۆر بوو. خەڵکی شار، لە جەژنی بەهارەدا، بۆ پیاسە و سەیران و، بەسەرکردنەوەی ڕۆحی مردووان، ڕوویان دەکردە ئەم بیابان و دەشت و دەرە. نەنکم بۆی گێڕابوومەوە، کە لە ڕۆژانی منداڵی ئەودا، خەڵکی هێشتا باوەڕیان بە خواوەند یاریلو هەبوو

و قوربانیـان بـۆ دەکـرد. ئیـدی چەرخـی گالیسـکەیەکیان لە لۆکەوە، لۆکەی لە قەترانا هەڵکشـاو، دەپێچـا و ، ئاگریـان پێوە دەنـا و لە بەرزایـی گـردەکەوە غلیـان دەکـردەوە، ئەگەر ئەم چەرخە بگەیبـایە ئاوەکـانی ئوکـا، مانـای وابـوو کە " یـاریلو " قوربانیەکەیـانی قبـووڵ کـردووە و هـاوینی ئەوسـاڵە هـاوینێکی هەتاو و بەفەڕ وبەرەکەت دەبێت و دڵی هەموو کەسێک خۆش دەبێت.

ژمارەیەکی زۆر لە خانمانی جلشۆر لە مەزراو کێڵگەکانی یــاریلو دەژیــان و هــاتوچۆی ئەوێنــدەریان دەکــرد. هەرهەمووشیان سوێرە قسە و بەدەم وزمان بوون، ئاگایان لە هەمـوو واریقـات وبویەرەکـانی شـار بـوو، قسەوباسـەکانیان مایەی سەرنجی من بوون کە باسی ئەو بازرگان و فەرمانبەر و ئەفسـەرانەیان دەکرد کەکاریـان لەلا دەکردن. جلشۆردن، لە زستانا، لە ئاوی تەزی و بەستوودا کارێکی بەڕاستی زەحمەت بوو، دەستی ژنـانی جلشۆر دەچایی، دەقەڵەشـان. بەسـەر ئەو ئەسـتێڵە دارینـەوە لە ئـاوەکەی لـێ هەڵـدەقولا، دادەنەوینـەوە، تەنیا کەپرێکی دارینی کۆنی شەقاڕ شەقاڕ، لە باسریشک و باو بەفـری دەپاراسـتن. دەم وچاویـان لە سـەرمادا هەڵدەماسـا و سـوور دەبـووەوە، قامکەکانیـان لە ئـازاردا نەدەنوشـتایەوە، ڕوندک (ئەشک، فرمێسک، هێستر) بەچاویانا دەهاتە خوارەوە، بەوحاڵەشەوە هەر سووربوون لە سەر دەمەتەقێ و گفتوگۆی خۆیان، دوا هەواڵ ودەنگ وباسیان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە. بە جورئەتەوە ڕوو بە ڕووی ژیان وخەڵکی دەبوونەوە.

ناتالیـا کوزلوفسـکایا لە هەر هەموویـان دەمـاوەرتر بـوو، ژنێـک بـوو لە سـەرووی سـی ساڵەوە، ڕوخسـاری ناسـک و ئـاودار، بە داروبـار، بەنیگـای تەوسـامێز وزمـانی تیـژی خۆی

حورمەت و ڕێزی خۆی بە سەر هەموو ژنەکانی دیکەدا سەپاندبوو. هەر هەموویان شیرەتیان پێدەکرد و بەگوێیان دەکرد نەک هەر لە بەر ئەوەی لە کارەکەیا چالاک و چەلەنگ و کارامە بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە خۆشپۆش بوو و کیژەکەش دەناردە قوتابخانە. کاتێ بە دوو زەمیلە جلەوە، لە گردەکەوە بە کووڕە کووڕ دادەگەڕا، هاوکارەکانی بە گەرمی و ڕووخۆشی پێشوازیان دەکرد. لە حاڵ و ئەحواڵیان دەپرسی، لە حاڵی کیژەکەیان دەپرسی:- کچەکەت چۆنە؟

- زۆر باشە، لە خوا بەزیاد بێ باشە. دەخوێنێت.

- کاتێ بە خۆدەزانێ بووە بە خانمێکی گەورەو بەڕێز.

- ئاخر هەر لەبەر ئەوە ناومەتە بەرخوێندن و بۆ قوتابخانەم ناردووە. چما ئەم هەموو خانمە بەڕێز وحورمەتە لە کوێوە هاتوون؟ خۆ لە ئاسمانەوە نەهاتوون! لە ئێمەن و لە چینەکەی ئێمەوە، لە ناو جەرگەی ئێمەی نەگبەت و بەش مەینەتەوە پەیدابوون، لە کوێوە هاتوون؟ مرۆڤ تا زیاتر بزانێ، بۆخۆی باشترە وخۆشتر دەژی. کە خوا دەمانهێنێتە دنیاوە چین؟ منداڵی نەفام و بێ هەستین، خواوەند دەیەوێ کە پیر دەبین، بە زانایی و دانایی بۆلای بچینەوە، بۆیە دەبێ بخوێنین و فێربین!

کاتێ ئەو قسەی بکردبا ئەوانی دی کڕوکپ، بە وریاییەوە گوێیان بۆ قسەکانی شل دەکرد. هەم لە ڕوو و هەم لە پاشملە ستایشیان دەکرد، دڵبەندی ئازایەتی و زیرەکی و کۆڵنەدانی ئەو بوون. بەڵام کەسیان تیا نەبوو کە چاو لەو بکات، بە چەرمی ملی پووتان، دوو دەست پێچی بۆخۆی دروستکردبوو تا هەر دوو ئانیشکی دادەپۆشی، بۆ ئەوەی جلەکانی تەڕ نەبن. ئەم داهێنانە هەموویانی سەرسام کردبوو، بەڵام هیچ یەکێک

لەم ژنە بەرێزانە بیری لەوە نەکردەوە، کە چاو لەو بکات. کاتێ کە من چاوم لەوکرد، هەمووان گاڵتەیان پێکردم. کەوتنە تانە و تەشەران:

- تەمەشا، تەمەشا! لاسایی ژن دەکاتەوە!

دەربارەی کیژەکەی ئەو دەیانگوت:

- ئەم کچە دەبێت بە خاتوونێکی بەرێز! باشە وا خاتوونێکی دیکەش زیادی کرد، بەچی دەچێت؟ خۆ لەوەشە خوێندن تەواو نەکات، لەوەیە پێش ئەوەی مەکتەب تەواو بکات، بمرێت!

- ژیان بۆ ژنانی ڕۆشنبیریش ئاسان نییە. بۆنموونە کیژەکەی باخیلوف، چەندین ساڵ خوێندی، خۆ بیرتانە ئەنجام چی بەسەرهات؟ بوو بە مامۆستا. وەختایەک کچ دەبێ بە مامۆستا، ئیدی دەبێ بە قەیرەو دەمێنێتەوە.

- بێگومان. لە ناکاوا پیاوێک بێتەوەی حیساب بۆ ئەوبکات چیت خوێندووە، دەت ڕفێنێ..

- مێشکی ئافرەت لە سەریا نییە!

زۆر ناخۆش بوو کە گوێت لێیان دەبوو، بەوشێوە نەنگینە باسی خۆیان دەکرد. من دەمزانی سەربازان، دەریاوانان وسەنگەر لێدەران چۆن باسی ژنان دەکەن. لە پیاوانم بیستبوو کە بەچ شانازییەکەوە باسی نێراتی و مێبازی خۆیان دەکرد و چەند ژنیان خاپاندووە و سواریان بوون. دەمزانی چەند ڕقیان لە " ژنانی تەنوورە لەبەرە ". هەرکە گوێم لە پیاوێک دەبوو، بەوپەڕی خۆڕانانەوە باسی ڕیسکە مێبازیەکانی خۆی دەکرد، هەستم دەکرد، زۆری پێوەدەنێ، زیاتر بوختانە تا ڕاستی بێت.

جلشۆرەکان باسی ئاشقێنی خۆیان بۆ یەکدی نەدەکرد، بەڵام کە باسی پیاوانیان دەکرد، بەتەوس وتوانجێکی ئەوتۆوە

باسیان دەکردن کە ڕێک ئەو گوتەیەی دەسەلماند کە: ژنان هێزێکن دەبێ هەزار ویەک حیسابیان بۆ بکرێ.

ناتالیا ڕۆژێک گوتی:- پیاو چەندیش خۆ لە ژن دوور بگرن، هەر ڕۆژێک دێ ژیوان ببنەوەو مەجبووری ژن ببنەوە.

پیرەژنێکی پۆڕسپی، بە دەنگێکی گڕ گوتی:

- زۆر ڕاستە، خیلافی نییە. ئەدی زۆر ڕەبەن و تەرکە دنیایان خودایان بەجێ نەهیشت و مەجبووری ئێمە نەبوونەوە؟

ئەم گفتوگۆیانەی کە لە سایەی شلپ وهۆڕی ئاوەکە و هەڵشیلانی جلان دا دەکرا، لەم چاڵە قووڵەدا، لەم دۆڵە بەرینەدا کە بەفریش بە تەواوەتی پێی دانەدەپۆشرا، دەکران و گوزارشتیان لە ڕازە پەنهانەکانی نەوە یەک لە دووی یەکەکان دەکرد، بەجۆرێ قێزم دەبووەوەو دڵم تێک هەڵدەهات کە پڕ بە دڵ سڵم لە " مەسەلە ئاشقینیەکان " دەکردەوە. ئیدی بە ڕادەیەک ئەو مەسەلە ئاشقینیانەم لە بەرچاو کەوتبوون، کە بە شتی زۆر ناچیز و تووڕەهاتم دەزانین.

وێڕای ئەوەش ژیانم لەو دۆڵەدا، لە نێو ئەو هەموو ژنە جلشۆرانەدا یان لە مووبەقی خزمەتکارانی ئەفسەراندا، یان لە ژێرزەمینی کریکارانی مەعدەنچیدا، زۆر لەلا خۆشتر بوو تا لە ماڵی ئەربابەکانی خۆما، کە بەردەوام، لەیەک بازنەی نەگۆڕدا، دەخولانەوە، هەمان بیروبۆچوونی سواو وپواویان دووبارە کاوێژ دەکردەوە، بە ڕاستی لە تەرح و دیداریان بێزار بووم.. سەری زمانیان و بنی زمانیان خواردن، نەخۆشی و خەو بوو. بەردەوام باسی گوناح و مردنیان دەکرد، ترسی مەرگ و مردن، هەراسانی کردبوون، ڕێک لەو دانە وێڵەیەی دەوری دەستاڕ دەچوون کە بە ترسەوە چاوەڕوانی ئەوە بوو کە نۆرە هاڕینی بێت.

لە کاتی دەستبەتاڵیدا دەچووم بۆ عەمارەکە تا دار بشکێنم، لە ڕاستیا بۆ ئەوەی دەگەڵ خۆما بژیم. بەڵام زۆرجار ئەو ئاواتەم نەدەهاتە دی. خولامانی ئەفسەرەکان دەهاتن بەسەراو دەیانگێڕامەوە بۆ ژیانی باوی مەیدانەکە.

یرموخین و سیدوروف، لە هەموو ئەوانی دی زیاتر بە سۆراخمەوە دەهاتن، یرموخین پیاوێکی خەڵکی کالوگا بوو، درێژ داهۆڵێکی قەمووری، سەر بچکۆلەی نیگا وێڵ بوو. کابرایەک بوو تەمەڵ و تەوەزەل، خاو وخلیچک، تا بڵێی گەمژە و بودەڵە. کە چاوی بە ژنێک دەکەوت، بە جۆرێ خۆی دادەنەواندەوە، لە تۆ وایە دەیەوێ خۆی باوێتە سەر لاقی و بکەوێتە خاک و پای. زۆر بە خێرایی و بە ئاسانی، پەیوەندی دەگەڵ ئاشپەز و کارەکەرەکاندا پەیدا دەکرد و تێکەڵاویان دەبوو و ڕامی دەکردن، ئیدی خەڵکەکە هەم بەغیلیان پێدەبرد و هەم لە زەلامیەکەی دەترسان. سیدوروف، خەڵکی تولا بوو، ڕێوەڵەیەکی لاواز بوو، فووت لێکردبا با دەیبرد. هەمیشە خەمین بوو، بە هێواشی دەدوا، بە پارێزەوە دەکۆکی، ترسێکی گونگ لە چاوەکانیا پرشنگی دەدا، هەمیشە دەیڕاونیە گۆشە تاریکەکان.. خەڵکەکە ئەمەیان بەجۆرە شێتییەک لێکدەدایەوە و زۆرجار لێیان دەپرسی:- تەمەشای چی دەکەیت؟

بەکاوەخۆ بەرسڤی دەدایەوە:

- بەڵکو مشکێک پەیدا ببێت. من مشکم خۆشدەوێن.. کاتێ بەخۆ دەزانی لەناکاوا، دەردەفرتێ و سەرو کەللەی بچووکی پەیدا دەبێت.

من نامەم بۆ خولام و موراسیلەکاندەنووسی – بۆ دایک و باوک و کەس وکارەکانیان یان بۆ ئەڤینداەرەکانیانم دەنووسی. ئەم کارەم زۆر پێخۆش بوو، بە تایبتی بۆ سیدوروف، هەموو

شـەممەیەک نـامەیەکی بـۆ خوشـکەکەی کە لە تـولا دەژیـا، فڕێدەکرد.

دەیبـردمە مـووبەقەکەی خـۆی، لەبەر مێـزەکە ولەلامەوە دادەنیشـت، سـەرە تاشـراوەکەی دەخوراند ئەممـا خوراندن! دەستەکانی لێکدی هەڵدەسوون و ئەوجا بە گوێیدا دەچپاندم:

- دەی، با دەست پێبکەین! یەکەم وەکو باوە، دەبێ بە سڵاو ومجامەلە دەست پێبکرێ: " خوشکی زێدە ئازیز و بەڕێزم، لە یەزدانی مەزنـم داوایە، تەمەن درێـژ و سـاغ وسـەلامەت بـی ". نووسیت، تەواو؟ دەی باشـە ئێستا بنووسـە: " ئەو ڕۆبڵەم بە دەست گەیی کە ناردبووت. زۆر مەمنوونتم، نەدەبوو ئەوکارە بکەیت. مـن پێویسـتم بەهـیچ نییە، ژیانمـان لێرە زۆرباشـە لە هیچمان کەم نییە. "

- ئێمە ژیانمـان لێـرە هـیچ بـاش نییە، مـامەڵەی سـەگمان لەگەڵـدا دەکەن. بەڵام ئەو قسـانەی بـۆ مەنووسـە. بنووسـە: " ژیانمـان باشـە. " چـونکە ئەو هێشـتا منـداڵە، هەر چواردەسـاڵ دەبێـت. پێویسـت ناکـات باسـی هەمـوو شـتێکی بۆبکرێـت و خەفەت بخـوات. دەی ئێستا بەردەوام بە لە سـەر نووسـین، بە گوێرەی زانیاری خۆت تەواوی بکە.

بەسەرشـانی چەپمـا دادەنەوییەوە، هەناسـە گەرمەکەی بەر سەروچاوم دەکەوت، بە چپەوە دەیگوت:

- " پێی بڵێ نەیەڵێ کوڕان لەباوەشـی بکەن یـان مەمکی و هەر شوێنێکی دیکەی بگرن. بۆی بنووسە ئەگەر هەر کەسێک باسی ئەڤینی بۆ کردیت، باوەڕی پێ مەکە، دەیەوێ لە خشتەت بەرێ و هەڵت بخەڵەتێنێت. "

هەوڵـی دەدا، کـۆکەکەی بخـواتەوە. ڕوخسـاری سـوور دەبـووەوە، گۆناکـانی دەئاوسـان، ڕونـدک (هێسـتر، فرمێسـک،

ئەشک, عەسر) لەچاویا قەتیس دەما. ئیدی لەسەر تەختەکە دەجوولا، خۆی بەسەرشانما دەدا، پێم دەگوت:- تۆ رێگەم لێدەگری، ئاخر ئاوا دەستم ناچێتە نووسینەکە!

- قەیدی نییە. بنووسە: " بەهیچ جۆرێ باوەڕ بە ئەربابان مەکە، ئەوانە فێرن چۆن کڵاو بکەنە سەر خەڵکی و لە خشتەی بەرن. ئەوانە دەزانن چۆن قسە دەکەن، هەرکە دەمیان هەڵێنا یەکسەر تەفرەیان داوی، لە خشتەیان بردوویت، کە متمانەت پێکردن، ئیدی هیچ چارێکت نامێنێ تەنیا ئەوە نەبێ بچیتە کاباریە و جندەخانە. هەر ڕۆبلێکت دەستکەوت، بیدە بە قەشە، ئەگەر پیاوێکی ئیماندار و بەڕێز بێ بە ئەمانەتەوە بۆتی هەڵدەگرێت - دەنا باشتر وایە لە شوێنێکی ئەمین و چەپەکدا، بیخەیتە چاڵێکەوە - وریابە کەس نەتبینێ، شوێنەکەیت لە بیر نەچێت ".

هیچ شتێک بە ئەندازەی ئەم چپەچپە، کە ناو بە ناو لەقە لەقی ئەو پانکەیەی لەهەنبەر پەنجەرەکەدا هەڵواسرابوو، دەیبڕی، خەمناکتر نەبوو. من دەمڕوانیە زارکی ڕەشی وەجاخ و ئاگردانەکە و ئەو تەختە قیمەیەی کە گۆشتیان لەسەر دەجنی، دەمڕوانیە دۆلابی قاپ و ئامانەکان کە لە مێشا ڕەش دەچووەوە. مووبەقەکە زۆر پیس و پۆخڵ بوو. پڕبوو لە مێشوولە، بۆنی دووکەڵ و بەنزین و ڕۆنی قرچاو، هێری دەکردیت. سیسرک هەر مەپرسە، بەسەر وەجاخەکە و بە ناو دارەکاندا تەراتێنیانە.. ئیدی نائومێدی باڵ بەسەر دل ودەروونما دەکێشێت، بە ڕادەیەک بەزەییم بەم سەربازە بێنەواو خوشکە بەدبەختەکەیا دێتەوە، کە گریان ئەوکم دەگرێ، هەربینا ڕوندک بەچاوما هاتەخوارێ. باشە کەی ڕەوایە خەڵکی ئاوا بژین، بەمەش دەگوترێ ژیان؟!

بێئەوەی گوێ بە چپەدووەکەی سیدوروف بدەم، لە سەر نووسین بەردەوام دەبم. دەنووسم ژیان زۆر زەحمەتە. ئەو ئاهێکی قووڵ هەڵدەکێشێت و هانم دەدات:

- زۆرت نووسی.ماڵت ئاوابێ. سوپاس. ئیدی خوشکەکەم تێدەگات دەبێ لە چی بترسێت، سڵ لە چی بکاتەوە.

من بە ڕاوێژێکی توند، لە کاتێکدا خۆم لە زۆرشت دەترسام، دەمگوت:

- مرۆڤ نابێ لە هیچ شتێک بترسێت.

سەربازەکە تەوسخەنێک دەکات، هەوڵدەدا کۆکەکەی بخواتەوە و دەڵێت:- قسە ئاسانە! ئەدی لە ئاغا و ئەربابان، لە خوا، لەم هەمووشتانە، نابێ بترسیت؟! لابە بابە! ئەوە کەی قسەیە؟!

کە نامەی خوشکەکەی بۆ دەهات، دەسەپاچە دەبوو، ترسی لێدەنیشت، بە هەڵەداوان بۆلای من دەهات، دەپاڕایەوە: - تکایە، بۆمی بخوێنەوە، لەزێکە بۆمی وەخوێنە.

ئیدی واداری دەکردم سێ چوار چەلان، نامەکەی، کە بە خەتیکی ناڕوون نووسرابوو، بۆ بخوێنمەوە، جا نامەی چی! نامەیەکی کورت و بێتام.

سیدوروف، کوڕێکی باش ودڵپاک وخۆشخوو بوو، بەڵام هەڵوێستی دەرهەق بە ئافرەتان، وەکو هەرکەسێکی دی – توند و سەرەتایی بوو. ئیدی بەڕێکەوت، بێئەوەی بمەوێ، بە چاوی خۆم پەیوەندییەکم بینی کە زۆر بەخێرایی پەرەی سەند، سیدوروف، ختووکەی سۆز و هەستی ئافرەتەکەی دەدا وگلەیی ئەوەی بۆ دەکرد کە ژیانی سەربازی زۆر سەختە، وئیدی بە درۆ ودەلەسە لە خشتەی دەبرد، کەچی پاشان کە باسی سەرکەوتنەکانی خۆی بۆ یەرموخین دەگێڕایەوە، قێزی خۆی دەهێنایەوە و ڕووی خۆی گرژ دەکرد و تفی ڕۆدەکرد،

وەکو ئەوەی دەرمانێکی ناخۆشی خواردبێت. ئەو هەڵوێستەم زۆر لەبەر گران بوو. ئیدی لەو سەربازەم پرسی، بۆچی هەموویان درۆ دەکەن و ژنان دەخاپێنن و پێیان ڕادەبوێرن و، دەستاودەستیان پێدەکەن و تەنانەت زۆرجار لێشیان دەدەن.

نەرمە پێکەنینێک دەکات ودەڵێت:

- گوێ بەم شتانە مەدە. ئەو ژنە خۆی سووکە، هەرزەیە، دەیخورێ. تۆ هێشتا زۆر منداڵی، زۆرت ماوە تا لەو شتانە تێبگەی.

بەڵام ڕۆژێک وەڵامێکی ڕوونترم چنگ کەوت، وەڵامێک کە قەت بیرم ناچێتەوە، بەدەم کۆکەکۆکەوە چاوێکی لێداگرتم و گوتی:

- باشە تۆ پێت وایە ئەو ژنە نازانێ من هەڵیدەخەڵەتێنم؟ دەیزانێ و زۆرچاک دەیزانێ! بە خۆی دەیەوێ هەڵی بخەڵەتێنم. هەمووان لەم مەسەلانەدا درۆ دەکەن. هەست بە شەرمەزاری دەکەن، چونکە شتاقیان بە ڕاستی یەکیان خۆشناوێت – ئەو کارەیان تەنیا بۆ سەرگەرمی و ڕابواردنە. بەڕاستی ئەمە مایەی شەرمەزارییە. چاوەڕوان بکە، سەبرۆکەیەک بکە بەخۆت ئەو شتە فێر دەبیت. دەبێ ئەو کارە بەشەو بکەیت، ئەگەر بە ڕۆژی ڕوناک بیکەیت، دەبێ لە سووچ و پەنایەکی تاریکی وەکو عەماری دارەکان دا بیکەیت. هەر لەبەر ئەمە، خودا ئادەم و حەوای لەبەهەشتی بەرین وەدەرنا، لەبەر ئەمەیە هەموو تیرەی بەشەر، هەست بە کڵۆڵی و کوێرەوەری دەکەن.

ئەوەی زۆر بە ناسکی و ڕوونی گوت، خەمێکی زۆری پێوە دیار بوو، بۆنی جۆرە ژیوان بوونەوەیەکی لێدەهات، تا ڕادەیەک قەرەبووی ˚ خەمەکانی دیکەی خۆی ˚ بۆ دەکردەوە.

هەستم دەکرد جۆرە خۆشەویستیەک بەرەو ئەوم ڕادەکێشێت، ڕێک بەپێچەوانەی " یەرموخین " ەوە کە ڕقم لێی بوو و هەموو ڕۆژێ هەوڵمدەدا سەر بکەمە سەری، پێی ڕابوێرم و گاڵتەی پێبکەم. هەوڵەکانم جێی خۆیان دەگرت، زۆرجار بەنیازی خراپ، بە مەیدانەکەدا ڕاوی دەنام، بەڵام بە چەکەکەیەوە پێما نەدەگەیی.

سیدوروف گوتی:- ئەوە قەدەغەیە.

دەمزانی ئەوە قەدەغەیە، بەڵام باوەڕم نەدەکرد کە ئەوە سەرچاوەی کڵۆڵی بەشەر بێ، چونکە زۆرجار گوزارشتێکی غەریبم لەچاوانی ئەوانەدا دەخوێندەوە کە ئەڤین وێڵ و ئەسیری دەکردن، هەستم بەو کەڵکەڵە و مەیلە پۆزەتیفە دەکرد کە لە دڵی ئەڤیندارانەدا دەپەنگایەوە. کەیفم بەوە دەهات کە لە دایکبوونی ڤیانێکی دڵنەوازم دەبینی.

ئەوەندەی لە بیرم مابێ، لەوسەر و بەندەدا، وام هەستدەکرد کە ژیان ڕۆژ بە ڕۆژ سەخت و خەمناکتر دەبێت و لە چوارچێوە و قاڵبێکی تەسکی پەیوەندیاندا قەتیس دەبێت. هەستم دەکرد، هیچ دەرفەت و ئەگەرێک نییە، لەوەی کە هەیە، چاکتر بکرێ، لەو واقیعەی کە هەموو ڕۆژێک وەکو خۆی بە بێئەوەی هیچ گۆڕانێکی بە سەربێت، ڕوو بە ڕووم دەبێتەوە.

جارێک، سەربازەکان چیرۆکێکیان بۆ گێڕامەوە کە زۆر پەست و خەمباری کردم، کە گوایە بەرگدروویەکی بیانی بێدەنگ و بێوەی، لە شوقەیەکدا دەژیا، ئەم پیاوە خاوەنی گەورەترین دووکانی جلدرووی شاربوو. کابرایەکی بیانی نەرمخوو، خاکی بوو. منداڵی نەبوو، ژنەکەی ڕمووودەی خوێندنەوە بوو، سەری کردبووە کتێبان و شەو وڕۆژ سەرقاڵی خوێندنەوە بوو. لەو حەوشە جەنجاڵەی مەدا، لە نێو ئەو هەموو سەرخۆش و مەیگوسارانەدا، ئەم ژن ومێردە بەو

پەڕی ئارامی و بێدەنگی دەژیان، ئەوەندە بێدەنگ و گۆشەگیر بوون، کەس هەستی بەبوونیان نەدەکرد، پەیوەندیان لە گەڵ کەسدا نەبوو وکەس هاتوچۆی نەدەکردن، بۆ هیچ شوێنێک نەدەچوون تەنیا ڕۆژانی یەک شەمموان نەبێ کە بۆ شانۆ دەچوون.

مێردە لە بەیانی زووەوە، تا درەنگانی شەو لە سەر کاری خۆی بوو. ژنەش کە لە کچی عازەب دەچوو، هەفتەی دووجاران، دوای نیوەڕوان دەچووە کتێبخانە. زۆرجار دەمبینی لارەلار وەکو ئەوەی بە ئاستەم بلەنگێت، بە هەنگاوی ورد ڕێی دەکرد، دەستەوانەی لە دەستە چکۆلەکانی دەکرد، کتێبەکانی، وەکو هەر کیژە مەکتەبلییەک بە لاستیکێک پێکەوە دەبەست. دەم وچاوی، بە چاوە بچووکەکانیەوە لە دەم وچاوی چۆلەکە دەچوو. جوان وناسک لەو بووکە شووشانە دەچوو، کە بە زۆری لە سەر مێزی توالێت و بۆ جوانی دادەنرێن. سەربازەکان دەیانگوت گوایە پەراسوویەکی لای ڕاستی شکاوە، بۆیە کە ڕێدەکات بە ئاستەم دەلەنگێت. بەڵام من ئەم لەنگینەیم پێ جوان بوو. ئەمە کردبوویە کارێک کە لە هەموو ژنە ئەفسەرەکانی حەوشەکە جیاواز بێ. ئەو ژنە ئەفسەرانە، هەرچەندە سەروسەدایان نەدەبڕایەوە، مکیاج و ئاڕایشتی زۆر تۆخ و زەقیان دەکرد، تەنوورەی فش و فۆڵیان لەبەر دەکرد، زۆر پیر دەهاتنە بەرچاو، لە کۆمەڵێک وێنەی سواو وپواو دەچوون، کە لە تاریکی عەمارانەدا، لە گەڵ کۆمەڵێک شتی بێ فایدەدا، فەرامۆش کرابن.

لە حەوشەکەدا و، دەر ودراوسێکان، ئەم ژنە وردیلەیەیان بە شێت دەزانی، دەیانگوت هێندەی کتێبان خوێندووەتەوە، ئەقڵی لە دەست داوە، بەکاروباری ماڵەوەیدا ڕاناگات. مێردەکەی بازاڕ دەکات، کەرەستەی خواردن دێنێتەوەو

ئاشپەزەکە ڕادەسپێریٚ کە خواردنیان بۆ لێبنێت. ئاشپەزەکە، ژنێکی زەلامی خەمین بوو، بە ئەسڵ ڕووس نەبوو. چاوێکی کۆرە بوو، لە جیاتی چاو درزێکی تەنگ و پەمەیی بوو. چاوەکەی دیکەی، سوور، هەمیشە تەڕی ڕوندک بوو. کەیبانووی ماڵ، وەکو هەمووان دەیانگوت گا و گوێرەکەی لێکدی جیا نەدەکردەوە، جارێک لە بازاڕا خۆی کردبوو بە گەپجاڕ، چونکە لەجیاتی توور، بیبەری تیژی کڕی بوو. تەسەور بکەن ئەوە چ حەیا چوونێکە!

هەرسێکیان لەو ماڵەدا غەریب بوون، بەڕێکەوت کەوتبوونە ئەو کولانەیەوە. وەکو تەیرانێک وەپشومەی زستان تەنگیان پێ هەڵچنیٚ و بەدەم فڕینەوە، لە پەنجەرە و دەلاقەیەکەوە خۆی بەماوایەکی بەشەری پیسدا بکات.

خولام و موراسیلەکان بۆیان گێڕامەوە کە ئەفسەرەکان، زۆر نامەردانە ڕەفتاریان دەگەڵ ژنە وردیلەکەی کابرای بەرگدرووودا دەکرد. هەموو ڕۆژیٚ، بە نۆرە، هەر ڕۆژەی یەکێکیان نامەیەکی ئاشقانەی پڕ سۆزوگودازی بۆ دەنارد و دڵبەندی خۆی بۆ دەردەبڕی و بە جوانیەکەی ئەویا هەڵدەدا. ژنەی گەنجیش وەڵامی نامەکانی دەدانەوەو تکای لێدەکردن، وازی لێبێنن با بە ئاسوودەیی بژی.. داوای بووردنی لێدەکردن کە بووە بەمایەی پەژارە و نیگەرانی وان، لە خوا دەپاڕایەوە کە لە دوای ئەشق و ڤیانی ئەم ڕزگاریان بکات. ئەفسەرەکان لە کۆڕ و بەزمی بادەنۆشیدا، پێکەوەو بە کۆمەڵ نامەکانی ئەویان دەخوێندەوەو تێر پێدەکەنین و ئەوسا نامەیەکی دلداری دیکەیان دەنووسی و ناوی یەکێک لە خۆیانیان پێوە دەنا.

خولام و موڕاسیلەکان، بە دەم گێڕانەوەی ئەم حیکایەتەوە پێدەکەنین و بەجنێو بەردەبوونە ژنەکە.

یرموخین، بە دەنگە منگنەکەی دەیگوت:

- ئەمەش بەزمی ئەو ژنە لەنگە گەوجە، هەموو هەریەک قوماشن!
سیدوروف، بە کاوەخۆ بۆی دەسەلماند ودەیگوت:
- ژنان هەموویان، حەزدەکەن پیاو هەڵیان بخەڵەتێنن.. خۆیان ئەمە چاک دەزانن.
قەت باوەڕم نەدەکرد، ژنەکەی کابرای بەرگدروو، پەی بەوە بردبێ کە پێی ڕادەبوێرن، بۆیە بیرم لەوە کردەوە کە پێی بڵێم. ئیدی چاوەڕوانی ئەوەبووم هەلێکم بۆ هەڵبکەوێت، ڕۆژێک دیتم ئاشپەزەکەیان، چوو بۆ ژێرزەمینەکە، بە هەشتاو بە پەیژەکەی پشتەوەدا بۆماڵی ژنەی ناقبری چووم، خۆم بە مووبەقەکەدا کرد، کەسی لێنەبوو، خۆم بەژوورەی خەوتندا کرد، لە بەردەم مێزێکدا دانیشتبوو، کوپێکی زێڕینی قاوەی بەدەستەوە بوو، کتێبێکیش بە دەستەکەی تریەوە بوو، کە چاوی بە من کەوت ترسا، کتێبەکەی توونددووند بە سینگیەوە قرساند، بە دەنگێکی تاساو هاواریکرد: - چیە؟ ئوگوستا! چیت.
من هەوڵمدا، بە پەلە وزۆر بەکورتی قسەکانی خۆم بکەم، چونکە دەترسام کە کتێبەکە یان کوپەکەم تێ بسرەوێنێت. لە سەر قەنەفەیەکی نەرم ونۆڵی وەنەوشەیی ڕۆنیشتبوو، ڕۆبێکی شینی یەخە بە ئۆیە و، داوێن سوورمەچنی لەبەر بوو. قژە سووره چین چینەکەی لالا بەسەر شان وملیا کەوتبوو. لەو فریشتانە دەچوو، کە لە سەر دەرگای چوونە ژوورەوەی کڵێسایاندا دەیان نەخشاندن. پشتی دابوو بە قەنەفەکەوە، هەوەڵجار بە چاوانی ئەبڵەق و نیگای تووڕەوە تەمەشای دەکردم، پاشان کەمێک هێور بووەوەو ترسی ڕەوییەوەو ڕووی گەشایەوە و بزەیەکی پرسیارئامێز نیشتە سەرلێوی. کە دەستم بە قسەکانم کرد، دەمم تێک ئالا، تەواو پەشۆکام، بۆیە

ڕووم وەرگێڕا و بەرەو دەرگای مووبەقەکە ڕۆیشتم. لە دواوە هاواری لێکردم:- ڕاوەستە، مەڕۆ!

کوپەکەی لە سەر سینیەک دانا، کتێبەکەی خستەسەر مێزەکە، دەستەکانی لە سەر سینگی تێک ئالاند، ئەوجا بە دەنگێکی گڕ، کە لە دەنگی پیاوێکی گەورە دەچوو گوتی:

- کە کوڕێکی قەشمەری. کوا وەرە پێشەوە بزانم.

بە دوو دڵییەوە لێی چوومە پێشەوە. دەستی گرتم و بە پەنجە باریک و ساردەکانی نەوازشتی کرد وپرسی:

- کەس نەیناردوویت تا ئەو قسانەم پێ بڵێیت، ڕاستم پێ دەڵێی؟ هەر لە خۆتەوە هاتوویت و ئەمەت بە خەیاڵدا هاتووە؟

دەستی بەردام، چاوەکانی نوقاندن، بە ڕاوێژێکی نەوی و بە سوێ گوتی:

- ئەو سوپاییە سەخیفانە بەو جۆرە باسم دەکەن!

ئیدی زاتم وەبەر هاتەوەو پێمگوت: - واچاکە باربکەی لێرە.

- بۆچی؟

- ئەمانە شەرت پێدەفرۆشن، لەوەیە بەزمێکت بۆ بنەنەوە..

پێکەنینێکی شادی بۆکردو پرسی:- تۆ چوویتە مەکتەب؟ حەزت لە خوێندنەوە هەیە؟

- کاتم نییە، فریای خوێندنەوە ناکەوم.

- کەسێک حەزی لە خوێندنەوە بێت، هەرچۆنێ بێ کاتی بۆ دەدۆزێتەوە. بە هەرحاڵ، من سوپاست دەکەم.

سکەیەکی زیوی بۆ ڕاگرتم، هەرچەندە شەرمم دەکرد ئەم بەخشیشە وەربگرم، بەلام نەدەوێرام وەری نەگرم، دەترسام بەبێ تەربێت و فزوڵم لە قەڵەم بدات. کە ڕۆیشتم لە سەر محەجەرەی پلیکانەکە بەجێم هێشت.

ئەم دیدارە کارێکی قووڵ و تازەی لە دەروونم کرد. هەستم کرد هەتاوێکی تازە لە ژیانما هەڵهات. تا چەند ڕۆژێک لەوە

دواش کە بیرم لە ژوورە گەورەکە و ژنە وردیلەکەی کابرای بەرگدروو، دەکردەوە و، بە جلە شینەکەیەوە، کە لە فریشتە دەچوو دەهاتەوە بەرچاوم زۆر شاد ودڵخۆش دەبووم. هەموو شتێکی دەوروبەری جوانیەکی ئەفسووناوی هەبوو، ئەو مافوورە زێرپینە ئەستوورەی کە لەبەر پێیدا ڕاخرابوو، ئەو هەتاوەی کە لە پەنجەرە کراوەکەوە دەیدا لە ژوورەوە، دەتگوت بۆ ئەوە هاتووەتە ژووریٚ تا لە حوزووری ئەودا گەرم ببێتەوە.

خولیاو کەڵکەڵەی دووبارە دیتنی ژنەی تاینم کەوتە سەر چ دەبیٚ ئەگەر داوای کتێبێکی لێبکەم؟

ئیدی زاتم وەبەر خۆنا وچوومەوە بۆماڵیان، لە هەمان شوێنا ڕۆنیشتبوو وکتێبێکی بەدەستەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە دەستەسرێکی ڕەش دەموچاوی هەڵپێچرابوو و چاوێکی ئاوسا بوو. کتێبێکی بەرگ ڕەشی دامیٚ، لە بن لێوانەوە ورتەورتێکی گونگ و فام نەکری کرد. بە خەمینی کتێبەکەم وەرگرت. بۆنی ڕازیانە و دەرمانی لێدەهات. کە گەیشتمە ماڵەوە، کتێبەکەم لە کراسێکی خاوێنەوە پێچا و لە ترسی ئەوەی نەبا ئاغاکانم بیدینن و بیدزن، لە هەورەبانەکەدا تاقەتم کرد.

ئەمانە گۆڤاری "نیڤا" یان بە بەردەوامی بۆ دەهات، ئابوونەیان هەبوو، چونکە گۆڤاری ناڤبری نموونە و کەتەلۆکی چۆنیەتی بڕین و دروونی جلکانی تیابوو و دیاریی لەگەڵدا دابەش دەکرا. قەت گۆڤارەکەیان نەدەخوێندەوە، بەڵکو تەنیا تەمەشای وێنەکەیان دەکرد، ئەوجا لە ژووری نووستنا، لە سەر کەنتۆری جلەکانیان دادەنا. لە کۆتایی ساڵدا هەر هەموویان لە سەر یەک سەفتە دەکرد ودەیانبەست و لەژێر کەتەکەدا (سیسەم، تەختەخەو) ولەگەڵ سیٚ جەڵدی (گۆڤاری

ویـــنەدار) دا دەیانشـــاردەوە. کە نـــاو ژوورەکەم دەشـــت گۆڤارەکـان بە ئـاوی پـیس تەڕ دەبـوون. وەسـتام ڕۆژنـامەی ' پەیکـی ڕووسـی 'ی دەکـڕی و ئـابوونەی هەبـوو. کە شـەوان گۆڤاری ناڤبری دەخوێندەوە، توورە دەبوو، دەیگوت : - نازانم بۆچی ئەم شتە توورەهاتانە دەنووسن!

شـەممەی دواتـر، لە کاتیکـا جلـکە شـۆراوەکانم لە سـەربان هەڵدەخسـت کتێـبەکەم بیـر کەوتەوە، دەرم هێنـا، یەکەم دێـڕم خوێندەوە:

' مالیش وەکو بەشەرن، هەر یەکەیان سیمای تایبەتی خۆی هەیە '.

بەڕاسـتی وایە، لە بەر دەلاقەی هەورەبـانەکە وهەر بە پێوە لە سـەر خوێندنەوەی کتێبەکە بەردەوام بووم، سـەرما خەریک بـوو دەیبەسـتم، بەلام مـن گـوێم نەدایە. ئەو ئێـوارەیە کە مـاڵە ئاغـام بـۆ نـوێژی ئێـواریێ چـوون، کتێبەکەم بـرد و چـووم بـۆ مووبەقەکە، لەویێ بەتاسەوە کەوتمە خوێندنەوە و هەڵدانەوەی لاپەڕە چـرچ و لـۆچ و زەرد هەڵگەڕاوەکـانی کتێـبەکە، کە لە گەلای خەزان دەچـوون. بە ڕاسـتی بـردمیە دنیـایەکی دیکەوە. تووشی نـاو و پەیوەندیانی جیاواز بووم، تووشـی قارەمانـانی دڵپـاک و نەفـس بەرز بـووم، تووشـی خەڵکـانی شـــەڕانی و شـەڕتۆخێن ئەوتـۆ بـووم کە زۆر جیـاواز بوون لەو کەسـانەی دەمناسـین ودیتبـوومن. یەکێـک بـوو لە ڕۆمـانە درێژەکـانی مونتیپان، پڕبوو لە کاراکتەر و بویەر وڕیسکان، ژیانێکی سەیر وغەریبی لیێ هەڵدەقولا. ڕۆمـانەکە تیشکێکی ئەوتۆی دەخستە سـەر خـۆی، واقـی وڕ دەکـردی، وەکـو ئەوەبـوو ڕونـاکییەکی پەنهـان لەبەینـی دێڕەکـانەوە هەڵبقوڵێـت و چـاک و خراپەکـان لێکـدی هـاوێر بکـات. خـوێنەری وادار دەکـرد کە بـایەخ بە

چارەنووسی ئەو هەموو کاراکتەرانە بدات کە لە ڕۆمانەکەدا جمەیان دەهات، خۆشی بووێن یان ڕقی لێیان ببێت. ئیدی خۆ بە خۆ خولیای ئەوەم کەوتە سەر کە هەواداری ئەم کاراکتەر و دژایەتی ئەو کاراکتەر بکەم. بیرم چووبووەوە کە ئەم دنیا و ژیانەی تێی کەوتم و خۆ بە خۆ لەبەر دەممدا دەکرێتەوە، دەسکردە، تەنیا لەسەر کاغەزا بوونی هەیە. ئیدی لە گەرمەی ئەم کێشماکێشانەدا، جارێ شادی دایدەگرتم و دەمێ خەم.

بەجۆرێ لە خوێندنەوەدا غەرق بووبووم کە زەنگی دەرگا لێدرا هەوەڵجار نەمدەزانی کێیە و بۆ لە دەرگا دەدات.

مۆمەکەی بەردەستم تەقریبەن هەمووی توا بووەوە و مۆمدانەکە (شەمان) پڕبوو لە تواوەی مۆم. چرای دیار ئیکۆنەکان، کە دەبوا ئاگاداری بم و زەیتی تێبکەم، پڵیتەکەی خوار بووبووەوەو کوژابووەوە. ئیدی بە هەشتاو هەستام، کەوتمە کارکردن، کتێبەکەم لەژێر موغەیریەکەدا تاقەت کرد، زەیتم کردە چراکەوە.

دایەنی منداڵەکان، بە هەڵەداوان لە ژووری نووستنەکە هاتەدەرێ وهاواری کرد:- ئەوە تۆ کەڕی، گوێت لە زەنگی دەرگا نییە؟

بە هەشتاو بەرەو دەرگا چووم. وەستام بە ڕاوێژێکی توند گوتی: - خەوتبوویت؟

ژنەکەی بە سەنگینی بە پلیکانەکاندا سەردەکەوت و گلەیی لە بێ موبالاتی و خەمساردی من دەکرد کە گوایە بەهۆی منەوە سەرمای بووە. دایکی کەوتە خوتەو بۆڵە و سەرزەنشتی من. پیرەژن هەرکە خۆی بە ژوورەکەدا کرد و چاوی بە مۆمە سووتاوەکە کەوت، پرسیارپێچی کردم کە چیم دەکرد. من هیچ وەلامێکم نەدایەوە، حایر وحەپەساو لە

کەسێک دەچووم لەسەربانی خانوویەکی سێ قاتەوە کەوتبێتە خوارەوە. لەوە دەترسا، کتێبەکە بدۆزێتەوە وهەنگێ سەگ حاڵی بەحاڵم نەبێت.

ئیدی سەگ بگرە و پیرەژن بەڕەڵلا بکە! هاواری دەکرد، ئەگەر ئاگایان لێم نەبێت، ڕۆژێک ماڵەکە دەسووتێنم. وەختایەک وەستا و وەستاژن هاتن بۆ شێوخواردن، هەمان قەوانی لێدایەوە:

- تەمەشاکەن.. مۆمەکەی تەواو سووتاندوە، ئەم بایە لەم کونەوە بێ، ڕۆژێ ماڵەکەش دەسووتێنێت..

هەرچواریان بە دەم شێوخواردنەوە کەوتنە سەرکۆنە کردنم، هەرچی کەمتەرخەمی کۆن و نوێم هەبوو، دەیاندایەوە بەچاوما، سوێندیان دەخوارد کە من بە خوت و خۆڕایی خۆم دەفەوتێنم، نانی خۆم بە بڕین دەدەم، ئاقیبەت لە برسا دەمرم. من دەمزانی گلەیی و ئیرادەکانیان زۆر جدی نییە، هیچیان پێنەبوو، باسی بکەن، ئیدی بەمنەوە گرتبوویان و وەختیان بەو گلەیی و ئیرادانەوە دەکوشت، بێتاقەتی خۆیان بەو قسە قۆڕانە دەردەکرد. بە ڕاستی کە لەگەڵ کاراکتەرانی ناو کتێبەکەدا بەراوردم دەکردن، زۆر بچووک و کۆمیدی و بێ نموود و بودەڵە دەهاتنە بەرچاو.

وەختایەک لە شێوخواردن بوونەوە، تێروپڕ، تەمەڵ و قورس، بەرەو جێگاکانی خۆیان ڕۆیشتن. پیرەژن، دوای ئەوەی وێرد و سەڵاواتی خۆی خوێند و لە خوا پاڕایەوە، بە موغەیریەکەدا سەرکەوت و مت بوو. هەنگێ هەستام. کتێبەکەم دەرهێنا. چوومە بەر پەنجەرەکە. هەیڤەشەو بوو، مانگ بە حەوێقی ئاسمانەوە دەدرەوشایەوە. بەڵام پیتی کتێبەکە زۆر ورد بوو، بۆم نەدەخوێنرایەوە. بەڵام ئارەزووی خوێندنەوە

تەواو هەڵپێچابووم، هەستام تاوەیەکی سیقاڵ دراوم لە سەر ڕەفەکە داگرت، ڕوو بە ڕووی مانگەکە دامنا، تا ڕوناکی و تریفەکەی لە سەر کتێبەکە عەکس بکاتەوە و بتوانم دەست بە خوێندنەوەی بکەم، بەڵام نەخشەکەم سەری نەگرت. تاریکیەکە خەستتر بووەوە. هەنگێ چوومە سەر تەختێک کە لە سووچەکەدا دانرابوو، هەر لەوێوەو بە پێوە لەبەر ڕۆشنایی چرای دیار ئیکۆنەکان دەستم بە خوێندنەوە کرد. کە ماندوویەتی تەواو زەیفی لێسەندم، هەر لەسەر تەختەکە خەوم پێداکەوت، ئیدی لە خوتە وبۆڵەبۆڵی پیرەژن بێدار بوومەوە. بەپێی پەتی و بە توێی مەکسیەکی خەوەوە بە دیارمەوە وەستابوو، سەرە سوورەکەی دەلەقاند و غەزەب لە ڕوخساری دەباری، کتێبەکەمی بەدەستەوە گرتبوو و لێکدا لێکدا دەیکێشا بە سەر وگوێلاکمدا. فیکتور، کە لە دەنگەدەنگی دایکی خەبەری بووبووەوە، هەر لە ناو جێگاکەیەوە هاواری دەکرد:

- دایکە بەسە، ئەو هات وهاوارەت لە چییە؟! بەڕاستی ئیسراحەتت لێ هەڵگرتووین.

لە دڵی خۆدا گوتم: " تەواو کتێبەکە تیاچوو. دەیدڕێنێت. ڕوو زەردی لای ئەو ژنە دەبم، حەیاچوو خۆم!

بەیانیلە کاتی نان وچای بەیانیدا، بۆ لێ پێچینەوە بانگیان کردم، وەستا بە ڕاوێژێکی جدی پرسی: - ئەم کتێبەت لە کوێ هێناوە؟

جووتە ژن، کێچ کەوتبووە کەوڵیان، هاواریان بەسەرما دەکرد، قسەیان بەیەکدی دەبڕی، ئەوەی دەیانوت نەیاندەوتەوە.

ڤیکتور، سەری بە سەر کتێبەکەدا داژەندبوو ودەیگوت:

- بۆنی عەتری لێدێت.. بەشەرەفم..

نەمدەتوانی حەقیقەتەکەیان پێ بڵێم، گوتم لە سەرباز * سیدوروف *ی موراسیلی قەشەی فەوجم وەرگرتووە. وەستام گوتی: - بۆی بەرەوە، جارێکی دی شتی وانەکەی ها!

کە پێم گوتن، کتێبەکە هی یارۆی قەشەیە، هەموو حەپەسان، زۆر پەست بوون، چۆن بابایەکی قەشە ڕۆمان دەخوێنێتەوە. بەڵام وێڕای ئەوەش کەمێک هێور بوونەوە. وەستا چەند جارێک بە گوێیدا دامەوە کە خوێندنەوە زۆر خراپە و زەرەری زۆرە:

- ئەدی هەر ئەو کتێب خوێنانە نەبوون، سکەی قیتارەکەیان تەقاندەوەو ویستیان دەست بە کوشت وبڕ بکەن.. (مەبەست لەو هەوڵەیە کە لە ک[1] ساڵی ١٨٧٩ دا بۆ تیرۆرکردنی تزاری ڕووسیا، ئەلکساندری دووەم، درا).

ژنەکەی، کە ترسی لێنیشت، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- ئەوە تۆ شێت بووی؟ ئەم قسانە چییە دەیخەیتە مێشکییەوە.

کتێبەکەم دایە دەست سیدوروف و حیکایەتەکەم لە سیری تا پیازی بۆ گێڕایەوە. سیدوروف، بێئەوەی چ قسەیەک بکات، کتێبەکەی لێوەرگرتم، سەندووقێکی بچکۆلەی کردەوە، خاولیەکی خاوێنی لێدەرهێنا، کتێبەکەی تێوەپێچا و لە سەندووقەکەدا تاقەتی کرد وگوتی:

- گوێیان مەدەیێ، با بۆخۆیان بڵێن. هەرکاتێ ئارەزووی خوێندنەوەت کرد، وەرە ئێرە بخوێنەوە، خەمت نەبێ بەکەس ناڵێم! ئەگەر هاتیت و من لێرە نەبووم، کلیلەکە لە پشت ئیکۆنەکەوە دادەنەم دەری بێنە وسەندووقەکەی پێبکەوە وتا حەزدەکەی بخوێنەوە.

هەڵویستی ئاغایەکانم سەبارەت بە کتێبەکە، هێندەی دی کتێبەکەی لەلا شیرین کردم و زیاتر ڕمووودەی بووم. لە ڕاستیا هەندێک " خوێنەر " سکەی قیتاریان تەقاندبووەوە تا کەسێک، کە من نەمدەناسی، تیرۆربکەن.. یەکسەر پرسیارەکەی ئەو قەشەیەم بیرکەوتەوە کە بۆ ئیعتراف چووبوومە لای، وەڵامەکەی خۆمم دەربارەی ئەو قوتابیانەی لە ژێر زەمینەکەدا کتێبیان دەخوێندەوە بیرکەوتەوە، ئامۆژگارییەکانی " سموری : م بیرکەوتەوە " دەربارەی ئەو کتێبانەی دەبێ بخوێنرێنەوە "، هەروەها قسەکانی بابامم دەربارەی ئەو ماسونیانەی کە کتێبی ڕەشیان دەخوێندەوەو مومارەسەی سیحری ڕەشیان دەکرد، بیر کەوتەوە: " لە ماوەی حوکمڕانی پیرۆزی تزار ئەلکسندر پاڤلوفیچ دا، خانەدانان و خودان کتێبانی ڕەش و ماسونییان هەموو دەستیان تێکەڵ کرد و پیلانی ئەوەیان دەگێڕا کە تێکڕای گەلی رووس ڕادەستی پاپای ڕۆما بکەن، کە نامەرد بوون. ئیدی جەنەڕاڵ ئەراکشییف، فریاکەوت و هەموویانی دەستبەسەر کرد و، بێئەوەی حیساب بۆ پایە وپۆستی شتاقیان بکات، ڕەهەنەی سیبریای کردن. لەوێندەر، وەکو هەموو زندانیانی دیکە خرانە ژێر کارەوەو وەکو هەر شتێکی بۆگەن کەڕوو تێی دان.. "

هەروەها " ئومبراکولی ئەستێرەنیشان " م، " گیرفاسی " م بیرکەوتەوە، لە گەڵ ئەم وشە و پەیڤە تەوسامێز و مەندانەدا: " ئاه، ئەی ئەو بوونەوەرە گەوجانەی دەتانەوێ سەر لە کارەکانمان دەربێنن، ئەقڵی بچووکی ئێوە هەرگیز پەی بە کارەکانی ئێمە نابات! "

هەستم دەکرد کەوتوومەتە سەر دووڕێیانێکی گونگ و ئاڵۆز، تیا مابووم چی بکەم. حەزم دەکرد ئەو کتێبە تەواو

بکەم، دەترسام ون ببێت یان لە سەندووقەکەی کابرای سەربازدا بدرێت. ئەوسا چی بە ژنی بەرگدرووەکە بڵێم؟

پیرەژن، بەردەوام، چاودێری دەکردم کە نەچم بۆلای کابرای سەرباز وهەمیشە دەمی لەسەرم بوو، پێی دەگوتم:

- ئەهای کرمی کتێبان! پێت وایە کتێبان سوودت پێدەگەیەنن؟ خەیاڵت خاوە. بۆ نموونە تەمەشای ئەو ژنۆکەیە بکە، لە بەیانییەوە تا ئێواریێ سەری لە ناو کتێباندایە، کەچی نازانێ تا بازاڕ بڕوات و پێویستیەکانی خۆی بکڕێت. بە ڕۆژی روناک ئەفسەرەکان بۆ ژوورەکەی خۆی دەبات و ئەشقبازیان لە گەڵدا دەکات.

ویستم هاواری بەسەردا بکەم:

- درۆیە! شتی وانییە، بوختانی بۆ دەکەن، هیچ پەیوەندییەکی ئەشقبازی لەگەڵیاندا نییە!

بەڵام دەترسام ئەگەر داکۆکی لە ژنی کابرای بەرگدروو بکەم، پیرەژن، بۆنی ئەوە بکات کە کتێبەکە هی ئەو ژنەیە.

چەند ڕۆژێک بەو داخ و کەسەرەوە تلامەوە، دڵم گیرا، ئیشتیای خواردنم نەما، خەوم دەزڕا، کە بیرم لە چارەنووسی مونتیپان دەکردەوە، دەست دەستت ئارەقەم دەکردەوە. بەیانییەک ئاشپەزی ژنە خەیاتەکە لە حەوشەدا گرتمی وگوتی:

- کوا کتێبەکە بێنەوە!

دوای فراڤین، کە ئاغاکانم لە گەرمەی سەرخەو شکاندندا بوون دەرفەتم هێنا و، تەریق و شەرمەزار بۆ ماڵی ژنەی تاین سەرکەوتم. کوت ومت وەکو جارەکەی دی وابوو، تەنیا جلەکانی گۆڕابوون. تەنوورەیەکی قاوەیی و کراسێکی مەخمەڵی ڕەشی لەبەر بوو، خاچێکی پیرۆزەی شینی لە ملدا بوو، لە کێشکە دەچوو.

که پێمگـوت، وەختـی تەواو کردنـی کتێـبەکەم نەبـووەو ئاغاکـانم قەبـووڵ نـاکەن کتێبـان بخـوێنمەوە، ئیـدی هەم لە تەریقی و زەلیلی خۆما و هەم لەخۆشی دیداری تازەی ژنەی تایندا چاوانم تەژی ڕوندک بوون.

ژنەی ناقبری برۆکانی ویکهێنانەوەوگوتی:

- عەمریـان نەمێنێ بۆ خۆیـان و ئەقڵیان، کە کەرن! کەچی وەسـتات بە ڕوخسـارا کەر دیـارنییە. نیگەران مەبە. بیرێـک لە مەسەلەکە دەکەمەوە. نامەیەکی بۆ دەنووسم!

لەم بیـرۆکەیە ترسـام. پێمگـوت کە بە درۆوە گوتـوومە کتێبەکەم لە کابرای کەشیش وەرگرتووە. ئیدی تکام لێکرد:

- نا، نا، تکایە نامەی بۆ مەنووسە، چونکە گاڵتەت پێدەکەن و جنێوت دەدەنێ، لەو ماڵەی مەدا کەسێک نییە حەز بەچارەی تۆ بکات، هەرهەموویان گاڵتەت پێدەکەن و بە گەوجت دەزانن و دەڵێن پەراسوویەکت شکاوەو ژنێکی لەنگیت..

وشە، وەکو بەڕووی برژاو لە دەمما دەتەقییەوە، هێشـتا بە تەواوەتـی لە قسـەکانم نەبووبـوومەوە کە لە گوتنیـان ژێـوان بوومەوە، هەستم دەکرد زۆرم گوت، قسـەکانم باش نەبوون. لێوی گەست و وەکو یەکێک سواری ئەسپ ببێت، یەکێکی بە کەفەڵی خۆیدا کێشـا. بە شـەرمەزارییەوە سـەرم لە بەر خۆنـا، حەزم دەکـرد ئەرزەکە شـەق بەرێ و قـووتم بـدات. لـێ ئەو پشتی بە کورسیەکەوە داو بە دەم پێکەنینێکی شادەوە گوتی:

- کە بـێ ئەقڵـن! ئەمـانە بـێ ئەقڵیـان کـردووە بە گـاڵتەی منـداڵان! ئیـدی چ بـکەم، خـۆ زاری خەڵکـی کـۆنە دیـوار نیـیە، چەپکێ قوڕی پێدا بدەم وبیگرم؟

ئەو قسـانەی لە بەر خـۆیەوە کـرد ونیگـایەکی منـی کـرد و ئەوجا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- تۆ کوڕێکی عەجیبی – زۆر عەجیبی..

نیگـــام لە ســـەر ئەو ئـــاوێنەیەی کە لە تەنیشـــتیەوە هەڵواسرابوو گیرسایەوە، بە ڕاستی قەڵافەتێکی عەجیبم هەبوو، لـووتێکی فـس، گۆنـا زەق، هەنـیەم جـێ برینێکـی کـۆنی پێـوە دیـاربوو، قـژم بـژ و شـێواو، لە مێـز بـوو مقەسـتی دەلاکـی پێنەکەوتبـوو، وەکـو سـوژن گـف بووبـووەوەو هەر یەکەی ڕووی کردبووە لایەک. ئایا بەمە دەگوترێ ' کوڕێکی عەجیب؟ ' هەڵـبەتە هـیچ لێچوونێـک لە نێـوان ئەم کـوڕە عەجیـب و ئەو بووکە شووشە جوانەدا نەبوو.

لە سەر قسەکەی ڕۆیی: – باشە بۆ ئەو پارەیەت نەبردبوو کە جاری پێشوو دامیتێ؟

- پێویستم پێی نەبوو.

ئاهێکی هەڵکێشا وگوتی:

- دەی باشە، دەسەلاتم چییە؟ ئەگەر ڕێگەیان دایت کتێبان بخوێنیتەوە وەرە بۆلام، کتێبت دەدەمێ..

سێ کتێب، لە سـەر مێزی تەوالێتەکە بوو، ئەو کتێبەی کە بـۆم گەڕانـدبووەوە لە دووانەکەی دی ئەسـتوورتر بـوو. بە مەلـوولیەوە تەمەشـام کـرد. ژنەی تـاین دەسـتە بچـووک و پەمەییەکانی بۆ درێژ کردم و گوتی:– دەی جارێ خودا حافیز!

بە پـــارێزێکی زۆرەوە دەســـتیم گوشـــی و، بە هەشـــتاو وەدەرکەوتم. دوورنییە ئەو قسانەی کە لە پاشملەی دەگوتران ڕاسـت بـن: گەوجە، هـیچ نازانێـت. ئەدی ئێسـتا بەو بیسـت کۆپیکەی نەگوت پارە؟

بەڵام من ئەو خەسڵەتەیم پێخۆش بوو.

## (١١)

که ئێستا بیر لەو هەموو زیللەت و نەگبەتی و کڵۆلی و سەرزەنشتانە دەکەمەوە کە لە سۆنگەی کتێب خوێندنەوەوە بەسەرم هات، هەم خەمبار دەبم هەم شادمان. بەخەیاڵ و مەزندەی خۆم کتێبەکانی ژنی کابرای بەگدروو زۆر گرانبەها بوون، بۆیە لە ترسی ئەوەی نەبا پیرەژن بیاندات بەدەم ئاگرەوە، هەوڵمدا فەرامۆشیان بکەم و لەبیری خۆمیان بەرمەوە. ئیدی لەو دووکانەی کە نانی بەیانیانم لێدەکڕی، وردە کتێب و نامیلکەێن ڕەنگاوڕەنگم بەکرێ دێنا.

کابرای دووکاندار، پیاوێک بوو قێزت لێی دەهاتەوە، لێوەکانی ئەستوور، هەمیشە ئارەقەی لێدەچۆڕایەوە، دەم وچاو گرتک، ڕەنگ زەرد، چاوەکانی سپی، دەستەکانی گۆشتن و قامکەکانی کورت.

دووکانەکەی، ئێواران دەبوو بە مەکۆی کوڕانی گەنج و کیژانی هەرزە وبەڕەڵلا. براکەی وەستام، هەموو عەسرێ بە مەبەستی بیرە خواردنەوە وقومارکردن بۆ ئەوێ دەچوو. کە وەختی شێوان دەهات، زۆرجار منیان لە دووی دەنارد، زیاتر لە جارێ ژنی کابرای دووکاندارم، لە گەنجینەکەی پشتەوە بە باوەشی ڤیکتۆر یان گەنجێکی دیکەوە بینی بوو. مێردەکەی، ئەم مەسەلەیەی زۆر ئاسایی وەردەگرت و خوشکەکەی لە کاروباری دووکانەکەدا یارمەتی دەدا، هیچ پەرچەکردارێکی نەدەنواند کە ئەفسەران و سەربازان و سروودخوانانی کڵێساکان و هەرکەسێکی دی، بە بەرچاوی ئەوەوە خوشکەکەیان ماچ دەکرد و لە ئامێزیان دەگرت.

دووکانەکە کەلوپەلێکی ئەوتۆی تیا نەبوو، تەقریبەن چۆڵ بوو، کابرای دووکاندار، زۆرجار بەوە وەڵامی گلەیی

مشتەرییەکانی دەدایەوە کە هێشتا نەی پەرژاوە، بە ڕێکخستنی دووکـانەکەی ڕابگـات و دووکـانەکەی تـازە کـردووەتەوە. لە کاتێکا لە پاییزەوە کرابووەوە. ئیدی وێنەی سێکسـی و دزێوی بە مشتەرییەکانی نیشان دەدا، و ڕێگەی بە مشتەرییەکانی دەدا کە لە گەنجینەکەی پشتەوە، گۆرانی و شیعری بێ پەردە بڵێن.

من کتێبە بێتامەکانی " میشاییفستگنییف "م دەخوێندەوە، لە هەنبەر خوێندنەوەی هەر کتێبێکدا کوپیکێکم دەدا، گران بـوو. ئەمە جگە لەوەی هـیچ لەزەتێکیشـم لێ نەدەبینی. (کـواک، یا ڕاسـتگۆ تـا مـردن، فرانسـیل ڤینیسـی، شـەڕی نێوان ڕووس و کاباردینەکـان، یـان ئەو ژنە ئیمانـدارەی بەسـەر تـابووت و جەنـازەی مێـردەکەیەوە مـرد.) ئەم جـۆرە کتێبـانە نەیـان دەبزواندم، بگرە زۆرجار بێزاریان دەکردم! ئیدی پێدەچوو ئەم جۆرە کتێبانە و بەو زمانە شێواوەو دوور لە واقیعە، زیانم پێ بگەیەنن نەک سوود.

کتێبێن وەکو " پیاوانی پیادە، یوری میلوسلافسکی، ڕەبەنی گۆنگ، یابانشای سوارچاکی تاتاری " زۆر کاریان تێدەکردم و لەزەتیـان پێدەبەخشـیم، بەلای کەمەوە شـتێکی لەلا دروسـت دەکردم. بەڵام مـن زیـاتر حەزم لە خوێندنەوەی سـەربهورد و ژینـامەی وەلیـان و پیاوچاکـان بـوو کە هەنـدێ شـتی جدی و قەناعەتبەخشیان تیـابوو، تەنانەت هەندێجار کۆمەڵێک هەسـتی قووڵیان لە لا دەهاڕوژاندم. پیاوە شـەهیدەکان، هەرهەموویـان، خۆیشم نازانم بۆ، کابرای " ئەمە جوانە " یـان وەبیـر دێنـامەوە. ژنە شەهیدەکانیش نەنکمیـان وەبیـر دێنامەوە. هەنـدێک لە پیـاو چاکەکان، بابامیان، لە حاڵی سەفای خۆیدا وەبیر دێنامەوە.

من ئەم کتێبانەم لە هەورەبانەکە، یان لە ژێر کەپرەکەدا، کە دەچووم بۆ دارشکاندن، دەخوێندنەوە. ئەم دوو شـوێنە یەک لە یەک سـاردتر و ناخۆشـتر بـوون. هەنـدێجار کە کتێبێـک زۆر

خۆشـبایه یـان بمویسـتبا زوو تەواوی بـکەم، شـەوان لە خەو ڕادەبــووم و لە بەر شـــەماڵکان (مــۆم) دەمخوێنـــدەوە. بەڵام پیرەژن هەستی کرد کە مۆمەکان بەشەوان کەم دەبنەوە، ئیدی بە چـوکڵە دارێـک مۆمەکـانی ئەنـدازە دەگـرت و دەیشـاردنەوە. زۆرجـار چـوکڵە دارەکەیـم دەدۆزیـیەوەو بە ئەنـدازەی مـومە ســـووتاوەکە دەمبـــڕی. بەڵام ئەگەر چـــوکڵە دارەکەی ئەوم نەدۆزیبـاوەو پیـرەژن بەیـانی کە لەخەو ڕادەبـوو، چـــوکڵە دارەکەی بە مـۆمەکە دەگـرت، ئەگەر مـۆمەکە یەک دوو سـانتیم لە چـوکڵەکە کەمتـر بـوایە، ئەوا هەراوزەنـایەکی دەنـایەوە کە ئەوسەری دیارنەبێت. ڤیکتۆر لە هەرا وهەنگامەی دایکی بێدار دەبـووەوەو هەر لە نـاو جێگـاکەیەوە هاواریـدەکرد: - دایـکە بەسە، نەبڕایەوە! بۆ کوێ بڕۆم لە دەسـت تۆ. دیـارە مۆمەکـان بۆ دەستووتێن. یـارۆ کتێبی لە بەر دەخـوێنێتەوە. کتێب لە لای یـارۆی دووکانـدار دێنـێ. بە چـاوی خـۆم دیتـوومە کە کتێـب لەوێندەر دێنێت. ئەگەر بـاوەڕ بە مـن نـاکەی بڕۆ هەورەبـانەکە بگەڕێ..

پیرەژن، بە هەشـتاو بـۆ هەورەبـانەکە سـەرکەوت، کتێبێکی بچووکی لەوێندەر دۆزییەوەو پارچە پارچەی کرد.

دیارە ئەمە بۆ من جەزرەبەیەکی کـاری بـوو، بەڵام هێنـدەی دی خوێنـدنەوەی لەلا شـیرین کـردم. زۆر دڵنیـابووم کە ئەگەر وەلی و پیاوچاکێکیش ڕێی بکەوێتە ئەم ماڵە، جووتە کەیبانوو، خێـرا دەوری دەدەن و فێـری دەکەن کە چـۆن هەڵـس وکەوت بکات، یانی بەو شێوەیەی لە قاڵب دەدەن کە خۆیان دەیـانەوێ. ئەوەشـیان تەنیـا لەبەر بێ ئیشـی دەکـرد، چ شـتێکی دی نەبـوو خۆیانی پێوە مژوول بکەن. خۆ ئەگەر دەستبەرداری هەراوزەنا بــبن و بوختـان بـۆ خەڵکـی نەکەن و گەڵـتە بەم وبەو نەکەن، ئیدی هیچیان پێ نـامێنێ، دەمیـان بۆگەن دەکـات و قسـەیان لە

بیر دەچێتەوەو لاڵ دەبن. خۆیان بە تەواوەتی لە بیردەچێتەوە. بەشەر بۆ ئەوەی خۆی لەبیر نەچێتەوە، دەبێ پەیوەندییەکی هۆشیارانە دەگەڵ خەڵکی دیدا چێبکات.. تاقە پەیوەندییەک کە ئەمانە دەیانزانی و هەیان بوو، ئەوە بوو کە ئەمرت پێبکەن، لە قاڵبی خۆیانت بدەن، ئەگەر یەکێک ملیان بۆ بدات، ئیدی دەیکەنە کونەوە. ئیدی تەبیعەت و عادەتیان لە ژیاندا واهی بوو.

ئیدی هەموو جۆرە ڕێگەیەکم گرتەبەر هەر بۆ ئەوەی لە خوێندنەوە دانەبڕێم. پیرەژن چەند جارێک کتێبەکانی سووتاندم، ئەنجام کار گەییە ئەوەی چل و حەوت کوپیکی کابرای دووکاندارم هاتەسەر. کابرای دووکاندار داوای قەرزی خۆی دەکرد و هەرپەشەی ئەوەی لێدەکردم، کە ڕۆژێک قەرزەکەی خۆی لەو پارەیە هەڵدەگرێ کە بۆ کڕینی نان بۆ ماڵەوە دەم هێنا. ئەوسا بە تەشەرەوە دەیگوت:- دەزانی هەنگێ چ دەقەومێ؟

من زۆر ڕقم لەو کابرایە بوو، دیارە ئەویش، وەک دەڵێن دڵ ئاوێنەی دڵە، زۆری ڕق لە من بوو. بۆیە بە جۆرەها هەڕوگیف، ئەزیەتی ڕۆحی دەدام. هەرکە پێم دەنایە نێو دووکانەکەی ڕوخسارە پەڵەپەڵاویەکەی دەگەشایەوەو بە درۆوە بزەیەکی شیرینی لە خۆ دێنا و دەیگوت:

- بەخێربێ، قەرزەکەت بۆ هێناومەتەوە؟

- نەخێر.

ڕووی گرژ دەبوو، برۆکانی وێک دێنایەوە:

- نەخێر؟ چیت لەگەڵدا بکەم، شکاتت لێبکەم و لە زندانی نەوجەوانانت توند بکەم؟

کە زانیم مەسەلەکە لە گاڵتە دەرچووە، سەری دنیام لێ هاتەوە یەک، ئەی خودا چی بکەم! پارە لە کوێ بێنم،

کرێکەمیان دەدایە بابام... کە تکام لە دووکانداره‌کە کرد ماوەیەک سەبرم لێبکات، دەستە گۆشتن و لووسەکانی کە دەتگوت هەویری هەڵاتەیە لێ هێنامە پێشێ و گوتی:- ماچی بکە، سەبرت لێدەکەم.

دەستم دایە کیلۆیەک و تێم سرەواند، شەیتانە سەری دانەواند و هاواری کرد: - ئای لەوە! گاڵتەم لە گەڵ دەکردی!

زانیم درۆ دەکات و بە گاڵتەی نییە. ئیدی لێبڕام دزی بکەم و شەڕی ئەو کابرایە لە کۆڵ خۆم بکەمەوە. زۆرجار کە بە فلچە جلەکانی وەستام خاوێن دەکردەوە، چەند سکەیەکی زیوم لە گیرفانی پانتۆڵەکەی دەبینی کە هەندێجار دەکەوتە سەر ئەرزەکە. ڕۆژێ یەکێک لەو پارچە دراوانە خل بووەوە و کەوتە ژێر کۆمایەک ئێزنگ و دارەوە، لە ژێر قاڵدرمەکەدا. من، بیرم چوو بە وەستا بڵێم.. هەر بیرم نەما، تا ڕۆژێک لە نێو دارەکاندا سکەیەکی بیست کوپیکیم دۆزییەوەو دامەوە بە وەستا. ژنەکەی یەکسەر پێی گوت:

- دەبینی؟ پێویستە لەمەودوا، پارەکانت بژمێری و حیسابەکەی لای خۆت ڕابگریت.

وەستا بە دەم وەڵامدانەوەوە، بزەیەکی بە ڕووی مندا دا و گوتی:

- نا، دەزانم کوڕێکی دەستپاکە و دزی ناکات!

ئێستا کە قسەکان و زەردەخەنەکەی وەستام بیردەکەونەوە لە تەریقیا ڕۆحم پڕ دەبێت لە شەرمەزاری. چەند جارێک چەند سکەیەکم لە گیرفانی دەرهێنا و ژماردمن، بەڵام نەمتوانی بیاندزم، خستمنەوە گیرفانی! سێ دانە ڕۆژ بە داخەوە تلامەوە، بەگژ خۆما دەچووم. پاشان هەموو شتێک بە ئاسانی چارەسەر بوو. وەستا ڕۆژێک لێی پرسیم:- پشکوف چیتە،

چەنـد ڕۆژێـکە لە بەرچـاوم تەواو نیـت؟ نـیگەران دیاریـت. نەخۆشیت؟

گرێی دڵی خۆم بۆکردەوە، بە پەستییەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:

- دەبینی، ئەوەش خێروبەرەکەتی کتێب!

پەنجا کوپیکی دامێ و بە توندی گوتی:

- نەخەڵەتابی، ئەمە بە ژنەکەم یان دایکم بڵێی، دەنـا دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەن! دەیکەن بە فەرتەنەیەک ئەوسـەری دیار نەبێت!

بزەیەکی دۆستانەی کرد و لە سەری ڕۆیی:

- بەڕاستی تۆ زۆر سەرسـەختی، هیچ شتێک فایدەی نییە لە گەڵ تۆدا، بەڵام گوێ مەدەیە. ئەمە خەسڵەتێکی خراپ نییە. واز لە کتێبـان بێـنە، لە سـەری سـاڵ بە دواوە، لە گۆڤـارێکی باشدا بەشداری دەکەم، هەنگێ شتێک لەبەردەست دەبێت کە بیخوێنیتەوە.

بەڵێـــنەکەی خـــۆی بردەســـەر. ئیـــدی ئێـــواران دوای شێوخواردن و چاخواردنەوە، بەدەنگی بەرز گۆڤاری " پەیامی موسکۆ "م بۆ ئاغاکـانم دەخوێندەوە، کە ڕۆمـانی نووسـەرانی وەکو فاشـکوف و ڕوکشـانین و ڕودینکۆفسکی و نووسـەرانی دیـکەی بە زنجیـرە بـڵاو دەکـردەوە، بەتـایبەتی ڕۆمانانێـک بـۆ سەرگەرمی.

حەزم لە خوێنـــدنەوە بەدەنگـــی بەرز نەبـــوو، چـــونکە ناوەڕۆکی بابەتەکەم لێدەشێوا. ئاغاکانمان سەراپایان دەبوو بە گـــوێچکە و زۆر بەجۆشـــەوە گوێیـــان دەگـــرت، قێزیـــان لە کـاراکتەرە بەدخـــو و بەدکردەوەکـــان دەبـــووەوە و بە کەش وفشـەوە بە یەکیـان دەگوت: - سـوپاس بۆخـوا کە ئێمە لەوانە

نــاچین. ئــێمه خەڵکــانێکی ســـادە و بێــوەین. ئەمە بۆخــۆی نیعمەتێکی گەورەیە.

ئیدی ئاغاکانم هەموو شتێکیان تێکەڵ دەکرد، ئەو کارانەیان کە ڕێگـــری نـــاودار چـــورکین کردبـــوونی، دەدایە پـــاڵ فوماکروچینای عەرەبانچی، بەردەوام ناوەکانیان تێکەڵ دەکرد، وەختـایەک بۆم ڕاست دەکردنەوە،بە سەرسامی دەیـانگوت: - پەنا بەخوا ئەم کوڕە زەینی ڕۆشنە!

گۆڤـاری " پەیـامی موسـکۆ " نـاو بە نـاو شـیعرێکی لیونیـد گـــرافەی بڵاودەکـــردەوە. زۆرم بەدڵ بـــوو، لە دەفتەرێکـــی بچووکـــدا دەمنووســـییەوە. بەڵام جـــووتە خـــانم باســـی شـاعیرەکەیان دەکرد و دەیـانگوت: - کچە تۆ تەمەشـا - پیرە پیاوێک شیعر دەنووسێت!

- بۆ ئەو ئاساییە، هەم سەرخۆشە هەم کەودەنە!

من شـیعری" سـتروجکین وکۆنت میمینتـو - مـوری "مزۆر پێ جوان و خۆش بوون. بەڵام جووتە خانم، هەم پیرەژنەکە و هەم گەنــجەکە، ســووربوون لە ســەر ئەوەی کە ئەو شــیعرە، تەنیا وڕینەیە و هیچی دی، تەنیا ئەکتەران لە شانۆی منداڵان و لە شانۆی گەوراندا، شیعر دەخوێننەوە و دەڵێن.

ئەو شـــەوە درێــژانەی زســـتان، کە ناچـــاربووم لە ژوورە بچـــووکەکە ولە بەردەم ئاغاکانمـــا بیگـــوزەرێنم، بـــۆمن زۆر ناخۆش بوون. ناخۆشم لێدەگوزەران. دەرەوەی ماڵەکە شـەوە زەنگێکـی کروکـپ وبەسـام بـوو، سـام وبێـدەنگی گۆڕسـتانی وەبیر دێنایەوە، ناو بە ناو دەنگی شکانی سـەهۆڵبەندان دەهـاتە گوێ. خـانەوادەکە لە ژوورەوە، لە دەوری مێزەکە، خـامۆش و بێدەنگ وەکو ماسـی سـەرمابردوو دانیشـتبوون، زریـان وبەفـر بە گــف وهــۆڕ خــۆی بە دیــوار و پەنجەرەکانــدا دەکێشـــا ودووکەڵکێشـــی ســۆپاکانی دەهێنـــایە لورانـــدن و فرفـــڕۆکە

باپێوەکانی شێتانە دەخولاندەوە. دەنگی گریەو زاری منداڵەکان لە ژوورەکەی خۆیــانەوە دەهــاتەگوێ.. ئەمــانە کردبوویــانە کارێک پڕ بە دڵ حەزم دەکرد، لە گۆشـەیەکدا هەڵتروشـکێم و لە خۆدا غەرق بم و وەکو گورگ بلورێنم.

هەردوو ژنەکە لە سـەرێکی مێـزەکە دانیشـتبوون، خەریکـی دروومان و گۆرەوێ چنین بـوون. ڤیکتـور لە سـەرەکەی تـری مێـزەکەدا دانیشـتبوو، سـەرقاڵی نەخشەکێشـانی خـۆی بـوو، هەرسـا نـا سـاتێ هـاوارێکی دەکـرد: - مێـزەکە مەجـوڵێنن! بەڕاستی ناخۆشتان کردووە! کوڕم دەوێ لەگەڵ ئێوەدا هەڵبکا.

وەسـتا لە گۆشـەیەکی تەریکـدا لە بەردەم چوارچێـوەیەکی گەورەدا وەسـتاوەو پەردەیەکـی قوماشـی سـەرمێز گوڵـدۆزی دەکـات. قامکەکـانی گیـان بە جۆرەهـا قرژاڵـی سـوور، ماسـیانی شـینباو و پەپـوولەێن زەرد و گەڵای زەرد هەڵـگەڕاوی پـاییزی دەبەخشـن. بەخـۆی ئەم ڕەسـمەی داهێنـاوە، ئەمە زسـتانی سـێیەمە کە کـار لەسـەر ئەم ئیشـە دەکـات. بەڵام بە ئاشـکرا مانــدووبوونی پێــوە دیــارە. زۆرجــار کە لە کــاری ڕۆژانە دەبمەوە، بە من دەڵێت:

- دەی پشکۆف، کار لە سەر پەردەی مێزەکە بکە.

دەرزییەکی ئەستوور هەڵدەگرم و دەست بەکار دەکەم. دڵـم بە وەسـتا دەسـووتێ، هەمیشــە حەزم کـردووە بە گـوێرەی تواناکانی خۆم یارمەتی بدەم و بەدڵی ئەو بکەم. هەر لە خـۆوە وام وێنـا دەکـرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەسـتبەرداری ڕەسـم و گوڵدۆزی و ئەم جۆرە کارانە دەبێت و دەسـت دەداتە کـارێکی خـۆش و بە سـوود. هەنـدێکجار لە نەکـاوا دەسـت لە کـارەکەی هەڵدەگرێت، بەجۆرێ لێی ورد دەبێتەوە و تەمەشای دەکات، لە تـۆ وایە بـۆ یەکەمجـار دەیبینـێ. قـژەکەی بەسـەر هەنـیە

وگۆناکانیا بەر دەبووەوە و، ڕواڵەتی ڕەبەنی دێرانی پەیدا دەکرد.

ژنەکەی لێی دەپرسێت:- بیر لەچی دەکەیتەوە؟

دەگەڕێتەوە سەر ئیشەکەی ودەڵێت:- بیر لە شتێکی تایبەتی ناکەمەوە.

من سەرم دەسووڕمێ، بەڵام ورتە ناکەم : پرسیارێکی سەیرە! ئایا دەکرێ پرسیار لە کەسێک بکرێت کە بیر لەچی دەکاتەوە؟! ئاخر چۆن دەتوانێت وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە بداتەوە؟ چونکە مرۆڤ لە هەمان کاتدا بیر لە زۆر شتان دەکاتەوە – لە هەر شتێک کە ئێستا لەبەر چاویەتی، لەو شتانەی کە دوێنێ دیتوونی یان پار دیتوونی ئیدی هەموو ئەو شتانە لە هزر وخەیاڵیا دێن و دەچن و تێکەڵاو دەبن.

بابەتەکانی " پەیامی موسکۆ " کورت بوون و بەشی پڕکردنەوەی شەوی درێژی زستانی نەدەکرد، ئیدی من پێشنیازی ئەوەم کرد ئەو گۆڤارە جۆراوجۆرانەیان کە لە ژێر تەختە خەوەکەی ژووری نووستندا لە سەریەک کەڵەکە کرابوون و چرچ ولۆچ بووبوون بۆ بخوێنمەوە. بەڵام خانمی چکۆلە بەرسڤی دایەوە: – هیچیان تیانییە بۆ خوێندنەوە، تەنیا وێنەیان تیایە..

بەڵام هەر " گۆڤاری وێنەدار " لە ژێر تەختەکەدا نەبوو. گۆڤاری " مەشخەڵ " شم تیایاندا دۆزییەوە. یەکسەر دەستم بە خوێندنەوەی ڕۆمانی " کۆنت تیاتین بالنیسکی " نووسینی سالیاس کرد.

کاراکتەر و قارەمانی ڕۆمانەکە هەرچەندە گێلۆکە دەهاتە بەرچاو بەڵام زۆر بەدڵی وەستام بوو، بەجۆرێ بە ڕیسک و سەرکێشیە خەمناکەکانی ئەو گەنجە پێدەکەنی کە ڕوندک دەزاییە چاوانی.

هاواری دەکرد: - ئەمەیە چیرۆک، بە ڕاستی کۆمیدییە!
ژنەکەی، بۆ ئەوەی خۆیبوونی ڕای خۆی بنوێنێ، هەڵیدایە:
- ئەم قسانە هەرهەمووی درۆیە..

ئەم گۆڤارانەی ژێر تەختەخەوەکە خزمەتێکی گەورەیان بە من کرد. لەو سۆنگەیەوە هەلم بۆ ڕەخسا کە گۆڤارەکان لەگەڵ خۆما بۆ مووبەقەکە ببەم و شەوان بۆخۆم بیان خوێنمەوە.

پیرەژن، لە خۆش شانسی مندا، کە دایەنەکە مەست دەبوو، دەچوو لە ژووری منداڵەکان دەنووست. ڤیکتۆر، کێشە نەبوو، هەرکە خەڵکی ماڵەکە دەخەوتن، بە بێدەنگی خۆی دەگۆڕی، لە ماڵ وەدەردەکەوت و تاکو بەیانی کەس نەیدەبینییەوە. پیرەژن، مۆمەکەی بۆ ژوورەکەی دی دەبرد و ئیدی بێ ڕۆشنایی دەمامەوە، پارەشم نەبوو مۆم بکڕم، بۆیە بە دزییەوە بنەمۆمەکانم کۆ دەکردنەوە و لە ناو قوتووییەکی بەتاڵی ساردینم دەنان و قوتووەکەم پڕ دەکرد لەو زەیتەی بۆ ئەوە دانرابوو کە لەبەردەم ئیکۆنەکاندا بسووتێ. ئیدی بەپەتی بادراو پلیتەیەکم دروست دەکرد ولە تواوەی مۆمەکانم هەڵدەکێشا و قوتیلە چرایەکی بە دووکەڵم دروست دەکرد و لە سەر موغەیرییەکە دام دەنا و دەستم بە خوێندنەوە دەکرد.

کە لاپەڕەی مجەلەدێکی ئەستوورم هەڵدەدایەوە، گڕە سوور و کزەکە دەکەوتە لەرزین و چی وای نەدەما بکوژێتەوە. هەر سا نا ساتێ، پلیتەکە لە مۆمە تواوەکەی ناو قوتووەکەدا غەرق دەبوو، بۆنێکی زۆر بۆگەن و ناخۆشی هەبوو، دووکەڵ چاوی ئەزیەت دەدام، بەڵام من کە بەدەم تەمەشاکردنی وێنەکان و خوێندنەوەی شرۆڤەکانی ژێریانەوە مژوول دەبووم و ئاگام لە خۆم نەدەما گوێم بەو هەوا دووکەڵاوی و بۆگەنە نەدەدا کە چواردەوری گرتبووم. ئەم وێنانە دنیایەکی زۆر بەرین، پڕ لەشار و ئاوەدانی

جۆراوجۆری نیشان دەدام، لووتکە و زناری کێوان و کەنارێن جوان و دڵگیری دەریایانی نیشاندەدام. ژیان بەجۆرێکی سەیر دەهاتەبەرچاو، زەوی زۆر جوان دەینواند. لەوە بە دوا کە دەمڕوانیە دەشتە بێ سنوورەکانی ئەوبەری ڤۆلگا، هەستم دەکرد، تەنیا بۆشاییەکی گەورە نییە. جاران کە تەمەشای ئەو دیمەنەم دەکرد دڵم دەگوشرا، بێزار دەبووم. دەشت و مێرگەکە زۆر یەکدەست و یەکنەوا بوو، ئەوەی تۆزە ڕەونەقێکی پێدەدا چەند قۆپەنە دەوەنێک بوو، لێرە ولەوێ ڕەش دەچووەوە، لەو بەری مێرگ و دەشتەکەوە ڕیزێک دار و درەخت هەبوو کە لە دیوارێک دەچوو بەری ئاسۆی گرتبێت، ئاسمانێکی هەورین باڵی بەسەردا کێشابوو. بەڵام ئەرزەکە چۆڵ وهۆڵ و تەنیا، لەدڵی من چۆڵتر و تەنیاتر بوو. دڵم زۆر تەنگ دەبوو، پڕبەدڵ حەزم دەکرد چاو بنوقێنم. بۆشایەکی خەمین لە دڵ و دەروونم ئاڵابوو، دەرفەتی بۆ هیچ ئومێد وئاواتێک نەدەهێشتەوە، لە تۆوایە شیلەی دڵم هەڵدەمژێت.

ئەو شەرح وشرۆڤانەی لە ژێر ڕەسم و وێنەکانەوە نووسرابوون، بەزمانێکی زۆر ئاسان و ڕوون و ڕەوان باسی وڵات و گەلانی دی دەکرد. کۆمەڵێک ڕووداو و بویەری ڕابردوو و ئێستای دەگێڕایەوە کە هەرم لە بری نەدەکردەوە. هەڵبەتە ئەمەم زۆر لەدڵ گران بوو. هەندێجار زەینم لە زاراوە و پەیڤێن سەیر وعەجیبی وەکو (میتافیزیا، باوەڕی ئەلفیە و شارتیە) ئیدی ئەو وشانە زۆریان پەست دەکردم، لە زەینمدا بڵاو دەبوونەوە، هەستم دەکرد ئەگەر مانا وچەمکی ئەو وشانە نەدۆزمەوە، لە هیچ شتێک تێناگەم. تەنیا ئەو وشانە و مانای ئەو وشانە کلیلی کردنەوەی دەرگای هەموو مەتەڵەکانمە. زۆرجار، ڕستەی تەواو، بەرۆکی زەینی دەگرتم و چەند سەرم دێنا ودەبرد، لێیان حاڵی نەدەبووم و ئۆقرەیان لێهەڵدەگرتم.

له بیرمه، چه‌ند دێڕێکی سه‌یرم خوێنده‌وه:

*ئوتیلا، سواری ده‌شت وسارا ده‌بێ*
*فه‌رمانده‌ی (الهون) سه‌راپا*
*له پۆلادا،*
*ڕه‌ش، بێده‌نگ وه‌کو قه‌بر*
*کاروانی شه‌رڤانان، له*
*دوایه‌وه هاوار ده‌که‌ن:*
*ڕۆما له کوێیه، ڕۆمای سته‌مکار؟*

ده‌مزانی ڕۆما شاره، به‌لام ˚ الهون ˚ کێن؟ ده‌بێ ئه‌وه بدۆزمه‌وه.

که هه‌لم بۆ هه‌ڵکه‌وت، له وه‌ستاکه‌مم پرسی به جۆره سه‌رسامیه‌که‌وه گوتی:- الهون؟ مه‌گه‌ر هه‌ر شه‌یتان بزانێ.

ئه‌وسا به ته‌شه‌ره‌وه سه‌ری له‌قاند وگوتی:

- پشکوف، شتی توڕه‌هاتت له مێشکایه ها! باش نییه!

ده‌بێ شته‌که له بنج وبناوان بکه‌م، ئیدی چاک بێت یان خراپ. وام وێنا ده‌کرد سولوفیوف، قه‌شه‌ی قیپه‌که، ده‌بێ بزانێ ˚ هون ˚ کێن، که له حه‌وشه‌دا دیتم هه‌مان پرسیارم له‌ویش کرد.

سولوفیوف، ڕه‌نگ وڕوو سیسه‌ڵه و چرچه‌ڵه بوو، هه‌میشه شپرزه بوو، دوو چاوی سوور، برۆی هه‌ر نه‌بوو، ڕدێنێکی زه‌ردی چکۆله‌ی دانابوو. له کاتێکا نووکی دار عاساکه‌ی له زڕ و زبڵه‌که ده‌چه‌قاند، پرسی:- تۆ ئه‌و وشه‌یه‌ت بۆ چییه؟

پاشان که هه‌مان پرسیارم له لیوتنان نیستیروف کرد، به‌توندی گوتی:- چی...ی؟

ئیدی بڕیارم دا بچم بۆ ده‌رمانخانه‌که و له ˚ گولدبرگ ˚ ی ده‌رمان فرۆش بپرسم. کابرایه‌کی زیره‌ک بوو، له گه‌ڵ منا به لوتف و میهره‌بان بوو، قامووسێک بوو له‌و گۆڕه، مانای

زاراوە قورسەکانی بۆ شرۆڤە دەکردم، عەینەکێکی چوارچێوە زەردی لەچاو دەکرد. " باڤل گولدبرک " ی دەرمانفرۆش گوتی:

- هون، گەلێکی ساراگەڕی وەکو قەرغیزەکان بوو. ئێستا نەماون – هەموویان لە ناوچوون.

زۆر پەست و بێزار بووم، نەک لەبەر ئەوەی گەلی هون فەوتابوون و نەمابوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم وشەیەی کە ئەوەندە ئەزیەتی دام، زۆر ئاسان بوو. بەڵام خۆم بە منەتباری هونەکان دەزانی . لە دڵی خۆدا سوپاسی ئوتیلام کرد کە کردیەکارێک " گوڵدبرگ " ی دەرمانفرۆش بناسم.

چونکە ئەو پیاوە، مانای هەموو وشە و زاراوە زانستیەکانی دەزانی، کلیلی هەموو ڕازەکانی پێبوو. بە دوو قامکان عەینەکەکەی ڕێکدەخست، لە چاوە ئەستوورەکانی چاویلکەکەیەوە، چاوی لە دوڕ چاوانم دەبڕی، وەکو یەکێک وردە بزماران لە هەنیەم دابکوتێ، بەو ئاوایە دەیدواندم:

- وشە وپەیڤان ,برادەری چکۆلەم، وەکو گەڵان بە دار ودرەختانەوە. جا بۆ ئەوەی گەڵا بناسیت و شێوە و ئەرکیان بزانیت، دەبێ هەوەڵجار بزانی کە درەخت چۆن دەڕوێت. لەبەر ئەوە پێویستە کتێبان بخوێنیتەوە، کتیب دۆستی چکۆلەم، وەکو بێستانێکی گەورەیە، هەموو شتێکی تیایە، شتی بێهودە و شتی زۆرچاک و بەسوودیش.

من زۆرجار بۆ کڕینی کاربونات و مەنگەنیز بۆ ئاغاکان یان هەتوان و حەبی ڕەوانی بۆ منداڵەکان، دەچووم بۆ دەرمانخانەکە. ماڵی ئاغام بە زۆری بەدەم بەد هەرسیەوە دەیان ناڵاند.. ئامۆژگاریە نەخت و پوختەکانی یارۆی دەرمانفرۆش، هێندەی دی کتێبی لەلا شیرین و ئازیز دەکردم، ئیدی بەرەبەرە، بەبێ ئەوەی بەخۆ بحەسم، ئالوودەی کتێبان

بووم، وەكو چۆن مەی بۆ كەسێكی ئالوودە زەروری یە، كتێبیش بۆ من بەو ئاوایەی لێهاتبوو.

كتێب ژیانێكی بۆ كەشف كردم، زۆر جیاواز بوو لەو ژیانەی تیایدا بووم. بە ژیانێكی ئاشنا كردم، پڕ بوو لە كاراكتەران، لە هەستێن بەجۆش و ئارەزوێن سەركێش، كە ئینسانی بەرەو مەزنایەتی ڕۆحی یان تاوانی گەورەو خۆكوژی بكێش دەكرد. هەستم دەكرد ئەوانەی دەوروبەرم نە ئەهلی خێر وچاكە بوون، نە ئەهلی شەڕ وخراپە. زۆر دوور بوون لە دنیای كتێبانەوە. كەمترین شتی خۆشم لە ژیانیاندا بەدی نەدەكرد. من نەمدەویست و نەمدەتوانی وەكو ئەوان بژیم.

لە ڕێگەی ڕەسم و وێنەكانەوە، بۆم بەدیار كەوت كە لە ناوەندی شەقامەكانی پاریس، پراگ و لەندەندا، نە گوڵاو ومرداو هەیە، نە گوڤەک و سەرانگوێلكان. جادە و شەقامەكانی ئەوێندەر پان و ڕاست وخاوێن، ماڵ و كڵێساكان وەكو ئەمانەی ئێرە نین. زستانی ئەوێندەر، قەت شەش هەیڤان خەڵكی بێنەوا ناخاتە كونی ژوورەوە. لەوێ ڕۆژووی گەورە نییە كە خەڵكی ناچاربن تەنیا كەلەرمی ترش و كارگی سوێركراو و ئاردی شۆڤان و پەتاتەی سوورەوەكراو، كە دڵم لێی تێكهەڵدێ، بخۆن. لە مانگی ڕۆژووی گەورەدا، خوێندنەوەی كتێبانم لێ قەدەغەیە. ˚ گۆڤاری وێنەدار ˚م لێ دەسندرێتەوە، ناچار دەكرام ببمە بەشێك لەم ژیانە بۆش و بەتاڵە. من ئێستا لە بارودۆخێكدام، دەكارم بەراوردێک لە نێوان ژیانی ناو كتێبان و ئەم ژیانەدا بكەم كە تیایدا دەژیم. ئەمە ژیان نەبوو، كولەمەرگی بوو. كە كتێبم دەخوێندەوە، ورەم بەرز دەبووەوە، هێزێكی مەعنەوی گەورەم لە لا پەیدا دەبوو، كە كتێبەكەشم دادەنا، باشتر و لەزتر كارم دەكرد، ئامانجێک هەبوو بۆی دەژیام، تا زووتر لە كارەكانم ببوامەوە،

کاتی زیاترم بۆ خوێندنەوە دەبوو. بەڵام کە خوێندنەوەیان لێ قەدەغە کردم، تەمەڵی گرتمی، دەستم نەدەچووە هیچ کارێک، گوێم بە هیچ نەدەدا. مەیلی خراپەکاریەکی نەخۆشانەم، لەلا دروست بووبوو. کە پێشتر ئەوجۆرە مەیلەم لە لا نەبوو.

لە بیرمە، لە ماوەی ئەم ڕۆژە ناخۆشانەدا، بویەرێکی کوت وپڕ و سەیر قەوما. شەوێک کە هەمووان خۆیان بۆ خەوتن ئامادە دەکرد، لە ناکاوا دەنگی زەنگی کڵێساکە بەرز بووەوە. ئەم دەنگە خەڵکی ماڵەکەی پەشۆکاند، هەرهەمووان، بەنیمچە ڕووتی، بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە بەر پەنجەرەکان و یەکتریان بە پرسیاران داگرتەوە:

- ئەمە ئاژیری خەتەرە؟ تۆ بڵێی ئاگر و شەوات کەوتبێتەوە؟

لە هەموو شوقەکانی دیکەوە، هەمان هەرا وزەنا بوو، دەرگاکان بە تەق وهۆڕ دەکرانەوە و دادەخرانەوە. پیاوێک بە هەشتاو خۆی گەیاندە ناو حەوشەکە. هەوساری ئەسپێکی بەدەستەوە گرتبوو. خانمی گەورە یەک بە خۆی هاواری دەکرد کە دز داویانە بەسەر کڵێساکەدا. بەڵام وەستام هەوڵیدەدا هێوری بکاتەوە، گوتی:

- دایکە هێواش هێواش. هەموو کەسێک دەزانێ ئەمە ئاژیری خەتەر نییە!

- کەواتە قەشەباشی مردووە..

ڤیکتور، لە قەرەوێڵەکەی هاتەخوارەوە، بەدەم لەبەرکردنی جلەکانیەوە، لەبن لێوانەوە گوتی:- من دەزانم مەسەلە چییە!

وەستام بۆ سەربانی ناردم تا لەوێوە تەمەشا بکەم وبزانم ئاخۆ ئاسمان سوور هەڵگەڕاوە یان نا؟ هەتا هەورەبانەکە نەوەستامەوە، لەوێندەرەوە چوومە سەربان، تەمەشام کرد، هیچ شتێکی غەریب و نائاساییم نەبینی. بەڵام دەنگی زلی

زەنــگەکە لە ئاســمانی ســارد و خامۆشــدا بە ئــارامی دەنگیدەدایەوە. شــار دەتگــوت لە ســەر ئەرزەکە ڕاکشــاوەو خەوی لێکەوتووە. بەفر و بەستەڵەک لە ژێر پێی ڕێبوارانێکی نەناســراودا، کە بە هەڵەداوان غاریــان دەدا قــرچەرچ دەشــکا. دەنگی جیرەجیڕی خزاکان کە ئەسپان بەســەر ســەهۆڵەکەدا ڕایاندەکێشــان دەهــاتەگوێ. دەنگــی زەنــگەکە ســات بەســات خەمناک تر دەبوو. گەڕامەوە بۆ ژوورەکە و گوتم:

- هیچ شوێنەوارێکی شەوات و ئاگر کەوتنەوە دیارنییە.

وەستام کە لەم ماوەیەدا خۆی گۆڕی بوو، پاڵتۆکەی لەبەر کردبــوو، کــڵاوەکەی لە ســەرنا و گــوتی: - خــودایە بەخێــری بگێڕی!

یەخەکەی هەڵــدابووەوە، خەریــک بــوو گالۆشــەکانی لەپــێ دەکرد، کە ژنەکەی پێی گوت: - مەچۆ دەرەوە! مەڕۆ!

- قسەی بەلاش!

ڤیکتــور، کە پاڵتۆکەی لەبەر و کڵاوەکەی لە ســەر کردبــوو، ســەری دەکردە سەری هەمــووان و دەیگــوت:- من دەزانــم چــی ڕوویداوە!

وەختــایەک جــووتە بــرا چــوونەدەرێ، جــووتە ژن ئەمریــان پێکــردم کە ســەماوەرەکە داگیرســێنم، بەخۆشــیان چــوونەبەر پەنــجەرەکە، بەڵام لەم کــاتەدا زەنگــی دەرگــا بەرز بــووەوە و وەســـتا هـــاتەوە، بە بێــدەنگی و بە هەشـــتاو بە قاڵــدرمەکەدا ســەرکەوت، بــلەز دەرگــای ژوورەکەی کــردەوە، بە دەنگێکــی پچڕپچڕ گوتی:- تزار کوژراوە!

پیرەژن گوتی: - ئاخری زەفەریان پێبرد!

- بەڵێ، کوشتوویانە. ئەفســەرێک ئەو خەبەرەی دامێ. خــوا دەزانێ چ دەبێت؟

دووبـاره دەنگـی زەنگـی دەرگـا بەرز بـووەوە، ڤیکتـۆر بە بۆڵەبـۆڵ و پرتەپـرت گەڕایەوە، بە دەم داکەنـدنی جلەکـانیەوە گوتی: - وامزانی شەڕ هەڵگیرساوە!

هەر چواریـان دانیشـتنە سـەر چـا خـواردنەوە. ئیـدی بە پارێزەوەو بە دەنگی نەوی کەوتنە گفتوگۆ، بێدەنگی و ئـارامی باڵی بەسەر شەقامەکەشا کێشا، دەنگی لێدانی زەنگەکەش بڕا. بە درێژایـی دوو دانە ڕۆژ هەر چپەچـپ و فسکەفسـکیان بـوو. چوون بۆ ماڵان. میوانیان هات، شتیان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە. هەوڵـم دەدا، سـەر لە بـویەرەکە دەربـکەم، بەڵام مـاڵە ئاغـام، ڕۆژنـامە و گۆڤارەکانیـان لێشـاردمەوە. وەختـایەک سـەدەمی (هـۆ) کوشـتنەکەی تـزارم لە سـیدوروف پرسـی، بە دەنگێکـی نەوی بەرســـڤی دایەوە: - وس! قســـەکردن لەمبـــارەیەوە قەدەغەیە..

زۆر زوو، ئاشـوبەکە دامرکـایەوە، هەرکەسـە چـوو بەلای کــاری خـــۆیەوە، دوای ئەوە بە مـــاوەیەکی کەم بـــویەرێکی ترسناکی دیکە ڕوویدا.

ڕۆژێکی یەک شەممە، کە مـاڵی ئاغـام بە کۆمەڵ چووبوون بــۆ نــوێژ، ســـەماوەرەکەم داگیرســـاند و لە مـــووبەقەکە وەدەرکەوتم تا دەستێک بە ژوورەکـانی دیدا بێنم و خاوێنیـان بکەمەوە. کوڕە گەورەکەی ئاغام، بە گاگۆڵکی خۆی گەیاندبووە مـــووبەقەکە، بەلـــۆعەی ســـەماوەرەکەی کردبـــووەوە و لە سـووچێکا بە دیـاریەوە دانیشـتبوو. ئـاوی سـەماورەکە چکـی کردبـوو، ئـاگردانی سـەماوەرەکە گەرمـی گەرم بووبـوو، جـا ســەماوەرەکە لەبەر ئەوەی ئـاوی تیـا نەمـابوو، دەســتی بە توانەوە کردبوو. کە لە ژوورەکەی تەنیشتەوە گوێم لە گیزەگیز بـوو، بـلەز خـۆم گەیانـدە مـووبەقەکە. سـەماوەرەکە لەسـەر پایەکـانی خـۆی هەڵـدەپەڕی، لە تـۆ وایە دەیەوێ بفڕێـت.

بەلـوعەکەی بە تەواوەتـی توابـووەوە و شـێوەیەکی ترسـناکی وەرگرتبـوو، سـەرەکەی خـوار بووبـوو، دەسـکەکانی داغـی داغ بووبوو، مسەکەی، دڵۆپ دڵۆپ، وەکو ڕوندک بە قەدیا دەهـاتە خـوارەوە، سـەماوەرە شـینە وەنەوشـەییەکە وەکو یەکێـک زۆر مەست بێ لارەلاری پێکەوتبوو. خێرا ئاوم پێداکرد، چزەچزی لــێ بەرز بــووەوە و بە شــێوەیەکی خەمنــاک کەوتە ســەر ئەرزەکە.

لەو کاتەدا، لە زەنگی دەرگا درا. کە دەرگام کردەوە پیرەژن پـێش هەمـوو شـتێک پرسـی سـەماوەرەکە پێیـە یـان نـا. زۆر بەکورتی گوتم: - پێیە.

ئەو وەڵامەی مــن کە زادەی تــرس و شــەرمەزاری بــوو، بەلای ئەوانەوە بە جۆرە گوساخی و لاسارییەکی بە ئانقەست لێکدرایەوە. یەکسەر سزایان بۆ بڕیمەوە و تێم بەربوون، بگرە کوێت دیێشێت. پیرەژن گورزەیەک شوولکی سنۆبەری هێنا و، بگرە کوێت دیێشێت. لێدانەکە زۆر بە ئـازار نەبوو بەڵام، ئـازای بەدەنـم دەتگـوت سـوزناژن کـراوە. شـەوێ پشـتم ئاوسـا، بـۆ سبەی نیوەڕۆ ئاغام ناچار بوو بۆ خەستەخانەم ببات.

دکتـۆرەکە، کە پیـاوێکی درێـژی باریـک و بنـێس بـوو، دوای ئەوەی معایەنەی کردم بەڕاوێژێکی ئارام وقووڵ گوتی:

- بـۆ واتـان لەم منـداڵە کـردووە، ئەمە چ ڕەفتـارێکە، دەبـێ دەعواتان لە سەر قەید بکەم.

وەستام سوور بووەوە، لاقی جولاند، دەمـی لە پەنـا گوێی دکتۆرەکە نا و ، شتێکی بەگوێیدا چپاند کە نەمزانـی چـی گـوت. دکتۆرەکە هەر تەمەشاشی نەکرد و بەکورتی گوتی:

- ناتوانم شتی وابکەم، مافی ئەوەم نییە.

ئەوجـا ڕوویکـردە مـن و گـوتی: - دەتەوێ سـکاڵا قەیـد بکەیت؟

پشتم زۆر دەیەشا، گوتم:- نەخێر، دەمەوێ زوو چاک ببمەوە..

بۆ ژوورێکی دیکەیان بردم، لە سەر مێزێک پاڵیان خستم. دکتۆرەکە بە مووکێشێک کەوتە دەرهێنانی دڕکێن شوولەکە لە لەشم، بەدەم شۆخی و سوعبەتەوە دەیگوت:

- پێستەکەتیان چاک نەخشاندووە بچکۆل گیان، ڕێک لە سوزگی دەچێت..

پاش ئەوەی لە کارەکەی بووەوە، کە پشتی زۆر ئازار دەدام، گوتی:

- چل و دوو دڕکم لە پشتت دەرهێنا بچکۆل! دەتوانی لە نێوهاوڕێکانتا شانازی بەمەوە بکەیت، سبەینێ ئەم کاتانە وەرەوە با سارغییەکان بگۆڕم و دەرمانت بکەمەوە. باشە زۆرت لێدەدەن؟

کەمێک دەبیرەوە چووم وگوتم:- جاران زۆرتریان لێدەدام.

دکتۆرەکە پێکەنی وگوتی:- کەواتە گرینگ نییە، مانای وایە ڕەوشت بەرەو باشی دەچێت!

کە دامیەوە دەست ئاغام، پێی گوت:- فەرموو بیبەرەوە، بۆم نۆژەنکردوویتەوە، وەکو ئەوەیە تازە دروستکرابێ، سبەینێ بۆمی بنێرەوە با سارغییەکانی بگۆڕم. خۆت و بەختت شتەکەی بە فشە وەرگرتووە و نایەوێ دەعوات لە سەر قەید بکات..

کە بە گالیسکە بۆ ماڵ دەگەڕاینەوە، ئاغام گوتی:

- پشکوف، منیش بە منداڵی کوتەکم خواردووە، هیچ دەسەلاتێکیشم نەبوو، کەسیش بەهانامەوە نەدەهات، تۆ باشیت، بەس نییە یەکێکی وەکو من بەزەیی پێتا دێتەوە و بەهاناتەوە دێم. بەلام من، هیچ کەسێک نەبوو بەزەییەکی پێمدا

بێتەوە. ئەو خەڵکەی دەرووبەرم زۆر دڵرەق و بێ بەزەیی بوون... دەتگوت مریشکی کڕ کەوتوون!

بە درێژایی ڕێگا هەر نەیبڕییەوە، ئەوەندەی گازن کرد، بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، ئەو ڕاشکاوییەیم لە گیان خۆشبوو.

کە گەییـنەوە مـاڵ، پێشـوازییەکی گەرمیـان لێکـردم، وەکـو قارەمانێکی سەرکەوتوو پێشوازیم لێکرا، جووتە ژن، ناچاریان کردم باسی عەمەلیاتەکەی خۆم و قسەکانی دکتۆریان بۆ بگێڕمەوە. ئیدی بەسەرسامی و مەندەهۆشی گوێیان لە قسەکانم دەگرت، وڕوویان گرژ دەکرد و هاوسۆزی و هاوخەمی خۆیان دەردەبڕی. ئەم ڕەفتارەیانم زۆر پێ سەیر بوو.

هەستم کرد، چونکە دەعوام لەسەر قەید نەکردبوون، زۆر لێم ڕازی بوون. منیش ئەم کارەساتەم قۆستەوە و داوام کرد کە ڕێگەم بدەن کتێبان لە ژنی کابرای بەرگدروو بخوازم. ئەو کاتە زاتیان نەکرد داواکەم ڕەت بکەنەوە. بەڵام پیرەژن هاواریکرد:

- هەر عارت نەنا ! دەبڕۆ چی دەکەی بیکە!

سبەی بەیانی چووم بۆلای ژنی خەیاتەکە. بەڕاوێژێکی ناسک گوتی:

- وتیان نەخۆش کەوتوویت و لە خەستەخانە کەوتوویت! کە ئەو خەڵکە چەند درۆزنن!

من هیچم نەگوت، شەرمم دەکرد ڕاستی مەسەلەکەی بۆ بگێڕمەوە – بۆچی بە گێڕانەوەی ئەو بویەرە ناخۆشە، پەستی بکەم؟ کە دەمبینی لە خەڵکانی دی ناچێت، زۆرم کەیف دەهات. لە خۆشیا لە پێستی خۆم نەدەهێوریم.

دووبارە دەستم بە خوێندنەوەی کتێبانی قەبە و ئەستوور کردەوە. کتێبێن دومای باوک، بونسون دی تیرایل، مونتیپان،

زاکوف، کابورپو، وایمار، و بواگوبه... بەپەلە، کتێب لە دوای کتێبم دەخوێندەوە، هەستم دەکرد لە ژیانا بەشدارم، جۆش و خرۆشێکی پڕ هیوا لە دڵ و دەروونم دەگەڕێت. بام دایەوە سەر قوتیلەچرا دەستکردەکەی خۆم، لەبەر ترووسکەی بە دووکەڵ، شەو تا بەرەبەیان دەمخوێندەوە. جۆرە ئازارێک دایە چاوەکانم، پیرەژن بە شادکامیەوە پێی دەگوتم:

- راوەستە، هێشتا لەکوێتە کرمی کتێبان، کاتێ بەخۆ دەزانی چاوانت دەتەقن وکوێرە دەبیت!

زۆر زوو بۆم دەرکەوت کە بابەتی سەرەکی هەر هەموو ئەم کتێبانە بە جیاوازی شێوە و ناوەڕۆکیانەوە، بەجیاوازی شـــــــوێن و وڵاتەکانیـــــــــانەوە، بە دەوری یەک تەوەردا دەسووڕێتەوە، ئەویش ململانێی نێوان خەڵکی باش و خەڵکی خراپە. خەڵکانی خراپ و بەدخوو، هەمیشە لە خەڵکە باشەکە بەختەوەرتر و وریاترن. بەڵام لە کۆتایی چیرۆکەکاندا، هەر خەڵکە باشەکە سەردەکەون.

وشەی " ڤیان " کە هەموو کاراکتەرە پیاو و ژنەکان بەیەک شێوە بەکاریان دەبرد، نەک هەر بێزاری دەکردم، بەڵکو ماندووی دەکردم، گومانی لە لا دروست دەکردم.

زۆرجار، کە دەستم بە خوێندنەوەی کتێبێک دەکرد، لە هەوەڵـــین لاپەڕەکـــانەوە پێشـــبینی ئەوەم دەکـــرد، کە دوا سەرکەوتن بۆ کێ دەبێ. بۆیە کە گرێیەک لە چیرۆکەکەدا چێدەبوو، هەوڵـــم دەدا بە مەزەنـــدەو وێنـــای خـــۆم گرێـــی ڕووداوەکان بکەمەوە. کتێبەکەم لە لایەکەوە دادەنا، پرسیارم لە خۆ دەکرد، خۆم تاقی دەکردەوە، زۆرجار مەزەندەو پێشبینییەکانم سەبارەت بەوەی کێهە کاراکتەر لە بەهەشتا دەگیرسێتەوە و کێهەیان لە دۆزەخ دا، دروست دەردەچوو.

زۆرجار لەپشت ئەم چیرۆکانەوە، هەندێک حەقیقەتی زندوو و گرینگ، جیاوازم لە حەقیقەت و پەیوەندییەکانی لای خۆمان دەبینی. لە لام ڕوون بوو کە عەرەبانچیان، کرێکاران، سەربازان و خەڵکانی بێنەوا ڕەمەکی مەردم لە پاریسدا، وەکو خەڵکی نیژنی نوڤگورود و پرم و قازان، لە هەنبەر ئاغاکانیاندا لارەمل و ملکەچ و دەستەوەستان نین. ئەوان ئازادانە ئاغاکانیان دەدوێنن و شانبەشانی ئەوان ڕێ دەکەن. بەگوێرەی ئەو کتێبانە، تەنانەت کەشیشانیش، لەمانەی ئێرە، لەمانەی کە من دەمبینین، جیاواز بوون. یان سەربازان، لە هیچ یەکێک لەو سەربازانەی ئاشنای من ناچن، لە سیدوروف، یان لە سەربازەکەی سەر کەشتیە هەڵمەکە، تەنانەت لە ' یرموخین ' ش کە لە هەموویان مرۆڤدۆستترە ناچن. بۆ نموونە، سەربازێک لە یەکێک لەم کتێبانەدا هەیە، لە هەندێ ڕووەوە لە سموری دەچێت، بەڵام لە سموری نەرم و نیانتر و میهرەبانترە. یان دووکانداری ناو ئەم چیرۆک و کتێبانە، لە هیچ دووکاندارێکی ئاشنای من ناچن. تەنانەت کەشیشانی ناو ئەم کتێبانە، لەو کەشیشانە ناچن کە من دەیانناسم، ئەوان لەگەڵ خەڵکیدا میرەبانتر و بەسۆزترن. بە گوێرەی ئەو چیرۆک وکتێبانەی من دەم خوێندنەوە، ژیان لە هەندەران ئاسانتر و جوانترە لەو ژیانەی ئێرە. لە هەندەران خەڵکی بەم درندەییە لە یەکدی نادەن، یان گاڵتە بە یەکدی ناکەن وەکو ئەوەی ڕێبوارەکان بە سەربازەکەی سەر کەشتیە هەڵمینەکەیان کرد، بەستەزمانە هەر حەیایان برد. یان بەو شێوە عەنتیکەیەی پیرەژنەکەی داکی وەستام، نوێژ و خوداپەرستی ناکەن.

ئەوەی مـایەی سـەرنجی مـن بـوو، ئەم کتێبـانە کە باسـی خەڵکانی بـودەڵە و خـوێڕی و بەڕەڵـڵا و تەماعکاریـان دەکـرد، نەیانـــــــــدەکردن بەو مەتەڵ و لەگەزانەی کە بەکەس نەیەتە هەڵهێنـان. بـودەڵە و بەرەڵایـان لەو کتێبـانەدا، بە شـێوازی کردەیی هۆڤی بوون، هۆڤیەتی وان هۆی ئاشکرای هەبوو، بە ئاسـانی دەهـاتە شـرۆڤە و لێکـدانەوە.. بەڵام ئەوەی لە لای مە باو بوو، هۆڤیاتی هەروا، لە خۆڕا و بۆ ڕابواردن مومارەسـە دەکرا.

هەر کتێبێکـی تـازەم دەخوێنـدنەوە، بەشـیوەیەکی خویـاتر جیـاوازی ژیـانی ڕووسـیم لەگەڵ ژیـانی وڵاتـانی دیـکەدا بـۆ بەدیـار دەکەوت. ئەم شـتە زۆری پەسـت دەکـردم، نەفرەتێکـی ئـاڵۆزی لە نـاخم دروسـت دەکـرد ولە هەمـان کاتـدا گومـانم لە دروستی قسـەی ئەم لاپەڕە زەردباوە، چـرچ و لـۆچ و پەراوێز پیسانە زیاد دەبوو.

لە ناکـاوا ڕۆمـانێکی گونکـورم، بە ناونیشـانی " برایـانی زمگـــانوف " کەوتە دەســـت، ئەو ڕۆمـــانەم یەک نەفەس وبە شەوێک خوێندەوە. شتێک سەرسـامی کـردم کە پێشـتر هەسـتم پێنەکردبـوو. بۆجـاری دووەم ئەم ڕۆمـانە سـادە وخەمنـاکەم خوێندەوە. هیچ ئاڵۆزی یان هاروژانێکی تـایبەتی تیانەبوو. هەر لە یەکەم لاپەڕەکـانیەوە وشـک و جدی بـوو، وەکـو ژینـامەی " پیاو چاکان " وشک و جدی دەهاتە بەرچاو.

زمـانە ڕوون و ڕەوان و سـادە و بەدەر لە هەر مینیـاتۆر و ڕازانـدنەوەیەک سـەرەتا بۆچـوونێکی خراپـی لە لا دروسـت کردم. بەڵام دەستەواژە کورت و هەڵبژاردەکانی زۆر بەئاسانی لە مێشـکمدا نەخـش بـوو. بە فەسـاحەتێکی ئەوتـۆ کارەسـات و بەســـەرهاتی دوو بـــرای ئاکرۆبـــاتی دەگێـــڕایەوە کە بەدەم

خوێندنەوەوە، دەستەکانم بە کتێبەکەوە دەلەرزین. لە کاتێکا گریان ئەوکی گرتبووم و هەنسکم هەڵدەدا، دووبارە ئەو بەشەی چیرۆکەکەم خوێندەوە کە ئاکرۆباتە گەنجەکە بە لاقە شکاوەکانیەوە، بەسکە خشکێ بۆ هەورەبانەکە دەچوو کە براکەی لەوێندەر بەدزییەوە، مومارەسەی هونەرە دڵخوازەکەیانی دەکرد.

کاتێ ئەم ڕۆمانە جوانەم بۆ ژنی کابرای خەیات بردەوە، تکام لێکرد کە کتێبێکی دیکەی لەم جۆرەم بداتێ. بەدەم پێکەنینەوە پرسی:- مەبەستت چییە؟!

پێکەنینەکەی پەشۆکاندمی. نەمزانی چۆن مەبەستی خۆمی تێبگەیەنم. ئیدی ئەو هەڵیدایە: - ئەمە کتێبێکی خۆش نییە. سەبرکە، کتێبێکت دەدەمێ هەم باشتر بێ هەم خۆشتر..

دوای چەند ڕۆژێک چیرۆکێکی " گرینوود "ی دامێ بە ناونیشانی " سەربهوردی ڕاستەقینەی ئاوارەیەکی بچووک ". ناونیشانەکەیم نەچووە دڵەوە. بەڵام لە یەکەم لاپەڕەوە ڕایکێشام و بزەی ڕەزامەندی خستەسەر لێوم. ئیدی بەو هەستەوە کتێبەکەم تا دوادێڕ نەک هەر خوێندمەوە، بەڵکو بە قووتدان قووتم دا. تەنانەت هەندێ بەشیم بۆ جاری دووەم و سێیەمیش خوێندەوە.

بۆم دەرکەوت منداڵانیش لە وڵاتانی بیانیدا، ژیانیان قورسە! ئەوەی ڕاستی بێ ژیانی من لەچاو ژیانی ئەواندا، ئاسان بوو. یانی شتێک لە ئارادا نەبوو کە مایەی نائومیدیم بێت.

گرینوود، ورە و جورئەتێکی تازەی پێبەخشیم. دوای ماوەیەکی کەم کتێبێکی گەورەم بەدەست کەوت بە ناونیشانی " ئوجینی گراندا " گراندەی پیر بابامی بە بیر هێنامەوە، هەرچەندە چیرۆکەکەی کورت بوو وئەمەم پێناخۆش بوو،

بەلام ڕاستگۆیی و حەقیقەت و واقعیەتی تەواوی چیرۆکەکە، ئەفسوونی کردم و قەرەبووی کورتیەکەی بۆ کردمەوە. ڕاستە ژیان ئەم حەقیقەتەی بۆ ساق کردبوومەوە، بەلام کتێب بە جۆرێکی تازە بۆی کەشف کردم. هەموو ئەو نووسەرانەی کتێبەکانیانم خوێندبووەوە، جگە لە کونگور، بەهەمان شێوازی وەستاکەم، حوکمی توندیان دەربارەی خەڵکی دەدا، زۆرجار وایان دەکرد خوێنەر هاوسۆزی دەگەڵ خەڵکی خوێڕی و بەڕەڵلایاندا بکات ودژی خەڵکانی چاک وپاک بوەستێتەوە.. هەمیشە قەناعەتم وابوو حەقیقەتی ڕاستەقینە و گرینگ لە پشت ئەو خەڵکە پاک و بێگەردانەوە پەنهانە..

لە نووسینەکانی کونگور و گرینوود و بالزاک دا پیاو تووشی خەڵکانی، نە سەدی سەد خوێڕی وبەڕەڵلا، نە سەدا سەد قارەمان دەبوو. بەڵکو تووشی خەڵکان و کاراکتەرانێک دەبوو کە زۆر ئاسایی و واقیعی دەژیان، گوتار و ڕەفتاریان واقیعی بوو، قەناعەتبەخش بوو، وەکو ژیانی ڕاستەقینە وابوو، جێگەی هیچ گومانێک نەبوو.

ئیدی بەوجۆرە، لە کتێبی باشەوە، پەیم بە لەزەتی، خوێندنەوە برد. بەلام کتێبی باش لەکوێ و چۆن پەیدا بکەم؟ ژنی خەیاتەکە یارمەتی نەدەدام.

- ئەمانە لە کتێبە باشەکانن.

بەدەم ئەو قسەیەوە، کتێبێکی ئەرسین هوسای، بە ناونیشانی " دوو دەستی پڕ لە گوڵ و زێڕ و خوێن " ی دامێ، لە گەڵ چەند ڕۆمانێکی بالو، بول دی کۆک و، پۆل فیفال دا. ماوەیەکە خووم داوەتە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە.

ئەو زۆر لەزەتی لە خوێندنەوەی ڕۆمانەکانی ماریێت و فرنر دەبینی، کەچی بەلای منەوە زۆر ناخۆش بوون، هەروەها

" شــبیلهاگن " شــم پــێ خــۆش نەبــوو. لەزەتێكــی زۆرم لە چیرۆكەكــانی ئویربــاخ دەبینــی. ڕۆمانەكــانی " والترســكوت "م لەوانەی سو و هۆگۆ پێ باشتر بوو. حەزم لەو كتێبانە نەبوو كە سـۆزیان دەبزوانـدم وشـادیان پێدەبەخشـیم. كتێبـی وەكـو كتێـبە جوانەكـانی بـاڵزاک. ژنە خەیـاتەكە لەبەرچـاوم بـوو بە بووكەشووشــە،ئەو دڵبەنـدییەی جـارانم، بەرانـبەری نەمـا. كە دەچـووم بـۆلای ژنە خەیـاتەكە ، جلـی پـاک و خـاوێنم لەبەر دەكرد، سەرم شانە دەكرد، هەوڵمدەدا ڕواڵەتێكی جوان و ڕێک و پێكم هەبێت. بەلام بە زەحمەت ئەو ئاواتەم دەهـاتەدی. بەلام حەزم دەكرد ئەو، ئەو هەوڵی خۆ نواندنەی من ببینێت و بەلای كەمەوە بە ڕاوێژێكی سادە وجدیتر قسـەم لەگەڵدا بكات و بەو بزە دەسـتكردەی سـەر لێوەكـانیەوە نەمـدوێنێت. بەلام فایـدەی نەبــوو، بە هەمــان شــێوەو بە تــۆنێكی شــیرین و مانــدوو، پێشـنیازی ئەم كتێـب و ئەو كتێبـی بـۆ دەكـردم و دەیگـوت: - ئەمەت خوێندووەتەوە؟ بەدڵت بوو؟

- نەخێر.

بە ئاســتەم بــرۆ باریكەكــانی بەرز دەكــردنەوەو چــاوانی دەبـڕینە مـن و هەناسـەیەكی قـووڵی هەڵدەكێشـا و دەیگـوت: - چما؟

- كتێبی زۆرم سەبارەت بەم بابەتە خوێندووەتەوە.

- سەبارەت بە كام بابەتە؟

- سەبارەت بە ئەڤینداری.

نەرمە پێكەنینێكی بۆ دەكات و دەڵێت:

- خۆ هەموو كتێبەكان باسی ئەڤین و ئەڤینداری دەكەن!

لە سەر كورسییەكی نەرم وپان دانیشتبوو، جووتێ نەعلی فەرووی لەپێـدا بـوو، پێــیە بچووكەكــانی دەهەژانــد. بەدەم

باوێشکدانەوە، ڕۆبە شینباوەکەی لە شانەکانیەوە دەپێچا و، بەسەری قامکە پەمەییەکانی، دەیکێشا بە بەرگی ئەو کتێبەدا کە لە باوەشیا بوو.

پڕ بەدڵ حەزم دەکرد لێی بپرسم:

- بۆچی لێرە بارناکەیت؟ ئەفسەرەکان تا ئێستاش نامەی دڵداریت بۆ دەنووسن و پێت ڕادەبوێرن...

بەلاّم زات ناکەم ئەو پرسیارەی لێبکەم. بە کتێبێکی گەورەوە دەربارەی " ڤیان " دەگەڕێمەوە و خەمی دنیام لە دڵدایە.

لەخوارەوە، لە حەوشەدا، هێشتا بە تەوس و توانجەوە، غەیبەتی ژنە خەیاتەکەیان دەکرد. من ئەو قسەو قسەلۆکە کرێت و دزێوانەم کە زیاتر بوختانوهەڵبەستراو بوون، زۆر پێناخۆش بوو، کە لەو دووربم، دڵم بەحالی دەسووتێ و لە ئایندەی دەترسم. بەلاّم کە دەچمە حوزووری و چاوە بچکۆلە و تیژەکانی،بەدەنە بچکۆلە ونەرم وشلەکەی، ڕوخساری هەمیشە خەنۆڵی دەبینم، ئیدی هەرچی ترس و بەزەییم هەیە، وەکو مژ ودوومان دەڕەوێتەوە. هەرکە بەهار هات ژنەی تاین لە ناکاوا دیار نەما، ڕۆیی.پاش چەند ڕۆژێکی کەم مێردەکەشی ماڵی پێچایەوەو ڕۆیی.هێشتا شوقەکەیان چۆڵ بوو و چاوەڕوانی کرێچی تازەی دەکرد، بە قالّدرمەکاندا سەر کەوتمە سەرەوە، ڕوانیمە دیوارەکان، یەکپارچە جێگای بزماری خواروخێچ بوو. شوێنی ئەو وێنە وتابلۆیانەی کە بەدیوارەکانەوە هەڵیانواسی بوو، لە دوورەوە بۆر دەچوونەوە. زەمینەی ژوورەکە دەبریقایەوە، یەکپارچە شڕە کاغەز و بەکرەی دروومان و سەرە مەقەستان و شووشەی عەتری بەتاڵ بوو، سنجاقێکی

گەورەی مس لە ئەرزەکەدا کەوتبوو و لە ناو ئەوشتانەدا دەبریقایەوە.

زۆر خەمگین بووم، پڕبەدڵ حەزم دەکرد، گەر بۆ تاقە جاریکیش بووە، ژنە وردیلەکەی کابرای خەیات بدینمەوەو سوپاسگوزاری و منەتباری خۆمی بۆ دەرببڕم..

## (١٢)

بەر لە ڕۆیشتنی خەیاتەکە و ژنەکەی، شوقەکەی ژێر ئێمە لە لایەن ژنێکی گەنجی چاوڕەشەوە بەکرێ گیرابوو، ئەم ژنە کچێکی منداڵی هەبوو، دایکیشی کە پیرەژنێکی پۆڕ سپی بوو لەگەڵ ئەواندا دەژیا. بەردەوام دارجگەرە کارەباکەی بەدەمەوە بوو و پەیتاپەیتا مژی لێدەدا. ژنە گەنجەکە زۆر جوان و خشیک بوو، قۆڕە دەماخ و لووت بەرز بوو، دەنگی ناسک و قووڵ بوو. کە بیویستایە سەیری کەسێک بکات، بە نازەوە سەری بە پشتا دەبرد، چاوەکانی بچووک دەکرد، وەکو ئەوەی ئەو کەسە زۆر دوور بێت و بەتەواوی نەی بینێت. ' تیوفایت 'ی سەرباز، بەخۆ و ئەسپێکی لاق باریکەوە دەهاتەبەر ماڵەکەیان. خانمە گەنجەکە بە جلێکی سوارکاری مەخمەڵی قاوەیی درێژەوە، بەجووتێ پووتی زەردەوە، بەجووتێ دەستکێشی درێژی سپییەوە دەهاتە دەرێ. داوێنی کراسە شۆڕەکەی هەڵدەکرد، قامچیەکی دەسک سەدەفی وەنەوشەیی بە دەستێکیەوە دەگرت وبە دەستەکەی تری سەری ئەسپەکەی نەوازش دەکرد وئەسپەکەش بەخۆشییەوە دەمی دەکردەوە، چاوی بۆ دەگێڕا و، سمەکانی بە ئەرزە ڕەقەکەدا دەکێشا و ئازای بەدەنی دەکەوتە جووڵە.

ژنەی گەنج، لە بن لێوانەوە و بەدەم نەوازشتی گەردنی ئەسپەکەوە، دەیگوت:- روبر، روبر!

ئەوسا پێی دەخستە سەر هەر دوودەستی سەربازەکە، کە تێکی پەڕاندبوونو بە هەشتاو خۆی هەڵدەدایە سەر زینەکە. هەنگێ ئەسپەکە، بە غروور و کەش وفشەوە، خەرامان خەرامان بە ڕێگاکەدا دەکەوتەڕێ. ژنەی تاین، هێندە لێهاتووانە لە سەر زینەکە دادەنیشت، لە تۆ وایە بە سوارچاکی گۆشکراوە.

ژنەی تاین زۆر جوان بوو، لەو جوانە دەگمەنانە بوو، کە جوانیان لە تازەبوونەوەی بەردەوامدایە و شادییەکی مەستانە بە دڵ و دەروونی مرۆڤ دەبەخشن. کە تەمەشام دەکرد، ئەو وێنایەم لە لا دروست دەبوو کە دیانا بواتییە، شاژن مارگو، مادموزایل لاڤالیر وهەموو کاراکتەرانی ئەو ڕۆمانانەی کە خوێندبوومنەوە، هەرهەموویان لە جوانیا لەو دەچوون.

خەڵکانێکی زۆر دەهاتنە دیدەنی خانم. هەمیشە دەستەیەک ئەفسەر، لە ئەفسەرانی ئەو سەربازخانەیەی کە لە شارەکەماندا ئۆردوبەزیان کردبوو، لە دەوری بوون. هەموو شەوێک بەسەرماڵەکەیدا دادەڕژان، و هەموو بەدەم ژەنین و لێدانی پیانۆ، کەمانچە و گیتارەوە ئاهەنگ و شەوبێریان بەرپا دەکرد. سترانیان دەگوت، دەرەقسین. مێجەر ئولیسوف، لە هەموو میوانەکانی دی پتر ڕموودەی ئەو ئاهەنگ وشەوبێریانە بوو، بەلاقە کورتەکانیەوە وەکو فرفرۆکە بە دەوری خانمدا دەسووڕایەوە. ئولیسوف، کابرایەکی قەڵەوی بە خۆوە بوو، قژ بۆزێکی دەم وچاو سورفل بوو، وەکو شاگرد کەشتیان جلەکانی بێسەروبەر بوو. گیتاری جوان دەژەند، بەردەوام ئامادەی هەر خزمەتێکی خانم بوو.

بەڵام کـچەکەی خـانم، کە کیژێکـی قژلـوولی بەخـۆوە بـوو وتەمەنی هەر پێنجساڵێک دەبوو، لە جوانیا چووبووەوە سەر دایکی و هیچی لەو کەمتر نەبوو. چاوە درشتە شینە پرشنگدار و قەڵافەتە مەندەکەی لە تەمەنی منداڵی نەدەهات.

نەنکی لە بەیانییەوە تـا شـەوێ مژوولـی کاروبـاری مـاڵەوە بوو، توفیـاییفی سـەربازی گرژ ومـۆن و کـارەکەرێکی قەڵەوی چاو پرۆشی چـاو کز یارمەتیـان دەدا. منداڵەکە دایەنـی نەبـوو، زۆربەی کـات بەبـێ سەرپەرشـتیار لە بـانیژەکەدا، یـان لە نـاو خـۆڵ و خاشـاکی حەوشـەکەدا یـاری دەکـرد. زۆرجـار دەمەو ئێـواران دەچـووم گەمەم لەگەڵیـا دەکـرد. ئەنجـام ڕمـوودەی بـووم. ئەویـش زۆر خێـرا هـۆگری مـن بـوو. زۆرجـار کە حیکایەتێکم بۆ دەگێڕایەوە بە باوەشمەوە خەوی لێدەکەوت. کە خەوی لێـدەکەوت دەمبـرد بـۆ سـەر جێگـاکەی. ئیـدی خـووی بەوەوە گرت هەرکاتێ بچوایەتە جێگاوە تا بخەوێ، داوای منـی دەکرد تـا بچـم بۆلای و شەوباشـی لێبکەم و هیـوای شـەوێکی ئارامی بۆ بخوازم. کە دەگەیمە ژووری نووستنەکەی ئەو، زۆر بە ویقار وهێمنی دەستە چکۆلە و خرپنەکانی دێنایە پێشـەوەو دەیگـوت: - خواحـافیز تـا سـبەی بەیـانی. دایە گەورە دەبـێ وا بڵێم. نا؟

دایە گەورە، لە کاتێکـا تۆپەڵێـک دووکەڵـی لە دەم و لـووتە باریکەکەیەوە دەردەدا، دەیگوت: - بڵێ لە ئەمانی خوادا بی.

کیـژەکە، خـۆی لە لـێفە ڕەنگاوڕەنـگ و گوڵـدۆزییەکەیەوە دەپێچـا و دەیگـوت:- تـا سبەی بەیـانی لە ئەمـانی خـوادا بیـت. ئیدی دەخەوم.

دایەگەورە بۆی ڕاسـت دەکـردەوە : - نەک تەنیـا تـا سـبەی بەیانی، بەڵکو بۆ هەمیشە.

- چما سبەی بەیانی لە گەڵ هەمیشەدا فەرقی هەیە؟

کیژەکە، وشەی " سبەی " زۆر لەلا خۆشبوو. بە چەمک و مانای ئایندە بەکاری دەبرد. کە لاسکە گیایەک، یان چڵەدارێکی لە گڵەکە دەچەقاند دەیگوت : - ئەمە سبەی دەبێت بە باخ..

یان دەیگوت:

- سبەی ئەسپێک بۆخۆ دەکڕم و وەکو دایکە سواری دەبم و دەچمە گەشت وگەڕان..

کیژێکی زۆر زیرەک بوو، بەڵام زۆر ئاسوودە و خۆشحاڵ نەبوو. هەندێجار لە گەرمەی گەمە و یاریدا، لە ناکاوا دەوەستا، لە فکران ڕادەچوو و بێهیچ پێشەکییەک دەیپرسی:

- باشە بۆچی کەشیشان قژیان وەکو قژی ژنان درێژ دەکەنەوە؟

ڕۆژێک دروویەک چوو بە دەستیا، قامکی لە درووەکە ڕاوەشاند وگوتی: - ئاگادار بە دەنا لە لای خوا شکاتت لێدەکەم و خوا سزات دەدات. خودا دەتوانێ سزای هەموو کەسێک بدات، تەنانەت دەتوانێ سزای دایکەش بدات.. هەندێجار خەمێکی کەم دایدەگرت، خۆی بەمنەوە دەقرساند و چاوە درشتە شینەکانی کە دەتگوت هەمیشە چاوەڕوانی شتێکن دەبڕینە ئاسمان.

- دایە گەورە هەندێجار لێم توورە دەبێت، بەڵام دایکم قەت لێم توورە نابێت. دایکە هەمیشە پێدەکەنێ، هەمووان خۆشیان دەوێ، هەمیشە بە پەلەیە. هەمیشە میوانی هەیە. چونکە زۆر جوانە، لە تەمەشاکردنی تێر نابن. دایکم زۆر قەشنگە. " ئولیسوف " ش دەڵێت جوانە!

حەزم دەکرد گوێ لە قسەکانی ئەم کیژە بگرم، بە قسەکانی دەیبردمە دنیایەکی نائاشناوە، هەرچییەکی دەربارەی دایکی بزانیبا، دەیگوت.

ورده ورده ژیانێکی تازەم بۆ کەشف دەبوو، دووبارە، شاژن مارگو و شاژنانی ناو کتێبەکانم وەبیر هاتنەوە، ئەمە هێندەی دی متمانەی بە کتێبان و ئەو بوویەرانەی لە دەوروبەرم ڕوویان دەدا، زیاد دەکرد.

شەوێک، کە ئاغایانم بۆ گەشت وگەڕان چووبوونە کەناراوەکانی ڤولگا و هێشتا نەهاتبوونەوە، من لە سەر پلیکانەکان دانیشتبووم و منداڵەکەم بەباوەشەوە بوو، دایکی بە سواری ئەسپەکەی هاتەوە، سووکێ خۆی هەڵدایە خوارەوە، سەری بردبووە دواوە، لێی پرسیم: - چیەتی؟ خەوتووە؟

- بەڵێ.

- بەڕاست؟

توفیاییفی سەرباز بە هەشتاو هات و ئەسپەکەی برد. خانم قامچیەکەی کرد بەبەر پشتێنەکەیدا. باوەشی گرتەوەو هاواری بەسەر مندا کرد: - کوا بمدەیە.

- قەیدی ناکا من هەڵیدەگرم.

خانم بە جۆرێ هاواری بەسەرما دەکرد وەکو ئەوەی من ئەسپەکەی بم، بە دەم هاوارەوە لاقی بە عاردیدا دەکوتان.

منداڵەکە لە خەو ڕاپەڕی، چاوانی هەڵێنان. دایکی ناسییەوەو باوەشی بۆ گرتەوە. ئەوان ڕۆیشتن. هەڵبەتە من زۆرم پێناخۆش بوو کە خانم هاواری بەسەرما کرد، هەرچەندە هەمووان لە خزمەتیا بوون و هەر ئەمرێکی بکردایە بۆیان جێبەجێ دەکرد.

دوای چەند خولەکێک کارەکەرە چاو پروشەکە هات بۆلام و گوتی:

- کچێ، پەڵپی گرتووە و نایەوێ بنووێت تا شەوباش لە تۆ نەکات.

بەوپەڕی قۆرەدەمـاخی خـۆم بە ژووری دانیشـتندا کـرد. خـانم دانیشـتبوو و منداڵەکەی بە باوەشـەوە بـوو و جلەکـانی لەبەر دادەکەند. هەرکە چاوی بەمن کەوت بە کچەکەی گوت:

- دەی فەرموو، ئەوە دێوەکەت تەشریفی هێناوە!

- ئەوە دێو نییە، هاوڕێمە، گەمەم لەگەڵ دەکات.

- بەڕاسـت؟ حەزدەکەی دیـارییەکی بچـکـۆلە پێشـکەش بە هاو وازیەکەت بکەین؟

- بەلێ، بەڵێ. با پێشکەشی بکەین!

- دەی زۆر چاکە، تۆ بڕۆ بنوو، من دیارییەکەی دەدەمێ.

کچە چکۆلەکە، دەستی بۆ درێژکردم و گوتی: - تا سـبەی خوداحافیز، تا سبەی لە ئامانی خوادا بیت..

خانم، بە مەندەهۆشی هـاواریکرد : - کێ ئەو قسـەیەی فێر کردوویت؟ نەنکت؟

- بەڵێ.

وەختـایەک کـارەکەرەکە کـچەکەی بـرد، خـانم بە قامکـان ئاماژەی کردمێ:

- چیت دەوێ بتدەمێ؟

بەرسڤم دایەوە کە هیچم ناوێ، بەڵام ئەگەر دەکرێ کتێبێکم بە ئەمانەت بدەیتێ تا بیخوێنمەوە.

بە قامکە فێنک وبۆنخۆشەکانی چەناگەی هەڵبڕیم و بە دەم بزەیەکـی ئەفسـووناویەوە لێـی پرسـیم: - ئـا، حەزت لە خوێندنەوەیە؟ چ کتێبێکت خوێندوونەوە؟

کە پێـدەکەنی هێنـدەی دی لەبەر چـاوم جـوانتر دەبـوو، بەشەرمەوە ناوی چەند کتێبێکم بۆ ژمارد.

لە کاتێکا قامکەکانی بەسەر مێزەکەدا دەکێشا، پرسی:

- چ لەزەت و خۆشییەکت لەم ڕۆمانانە دیتووە؟

بۆنێکی خۆش وتووند لە سەراپای دەهات، ئەم بۆنە تێکەڵ بە بۆنی ئارەقەی ئەسپە ڕەهوانەکە دەبوو. بەبێدەنگی لەپشت برژانگە درێژەکانییەوە تێی دەڕوانیم. تا ئەو کاتە هیچ کەسێک بەوجۆرە تەمەشای نەکردبووم.

ژوورەکە هێندەی موبیلە و کەلوپەلی جوانی تیابوو، تەواو بچـــووک دەینوانـــد و هێنـــدەی هـــێلانە چـــۆلەکەیەکی لـــێ مـــــابووبووەوە. گەڵای درەختـــــانی بـــــاخەکە دەورووبەری پەنجەرەکانی گرتبـوو، شووشـەی سپی سـۆپاکە لە تاریـک و ڕوونـــی ژوورەکەدا دەبریســـکاتەوە و پیـــانۆیەکی ڕەش لە تەنیشـت سـۆپاکەوە بـوو. کۆمەڵێـک چوارچێـوەی زێـڕ بە دیـــوارەکەوە هەڵواســـرابوون. لە نـــاو هەر یەکێکیانـــدا شـادەتنامەیەک هەبـوو کە بە پیتـی درشـتی سـلاڤی کـۆن پڕکرابوونەوە، لە ژێر هەریەکێک لەم شادەتنامانە تەمغەیەکی گەورەی ڕەش هەبوو، کە بە پەتێکەوە هەڵواسرابوو. هەمو ئەم شتانە وەکو من بە شـەرمەوە و ژێراوژێر غەرقی تەمەشـای جوانی ئەم خانمە بوون. هەرچۆنێ بوو بۆم ڕوونکردەوە کە ژیانم زۆر ناخۆشە و تەنیا خوێندنەوە ئەو ناخۆشیانەم لە بیر دەباتەوە.

لەجێگای خۆی هەستا وگوتی:

– بەڕاسـت؟ کەواتە نەهەقـت نیـیە.. بەڵام وابـزانم هـیچ دەسەڵاتێکمان نییە.. حەز دەکەم کتێبێکت بدەمێ، بەڵام جارێ لەبەردەستمدا نییە.. با، دەتوانی جارێ ئەمە بەریت..

کتێبێکی زەردباوی چرچ ولۆچی لەسەر قەنەفەکە هەڵگرت وگوتی:– کە تەواوت کرد، بەشـەکانی دیکەشت دەدەمێ، خۆی چوار بەرگە.

کتێبی " نهێنییەکانی سان پترسبووگ " ی " میرمیچرسکی " م نـایە بـن بـاخەڵم و لەوێنـدەر هـاتمە دەرێ. زۆر بەگەرمـی

دەستم بە خوێندنەوە کرد. هەر زوو، لەیەکەم لاپەڕەکانی کتێبی ناڤبرییەوە بۆم بە دیارکەوت کە نهێنییەکانی سان پترسبۆرگ، زۆر لە نهێنی شارانی وەکو پاریس، مەدریدو لەندەن، بێ ڕەونەقترە. تاقە شتێک کە لەو کتێبەدا سەرنجی ڕاکێشام حیکایەتی ئازادی و کوتەک بوو.

ئازادی گوتی: - من لە تۆ بالاترم چونکە لە تۆ ئاقڵترم.

کوتەک وەلامی دایەوە: - شتی وانییە، من لە تۆ بالاترم چونکە لە تۆ بەهێزترم.

ماوەیەک بەو گەنگەشەیەوە بە سەر دەبەن، ئەنجام بوو بە شەڕیان. کوتەک بەربووە وێزەی ئازادی، شل کوتی عەمری کرد، ئەوەندەی لە بیرم مابێ، ئازادی لە خەستەخانە کەوت و لەوێندەر گیانی سپارد.

یەکێک لە کاراکتەرانی کتێبەکە بابایەکی نەهلیستی بوو، ئەوەی لەبیرم مابێ، خەڵکی نەهلیست لە گۆشەنیگای میچرسکییەوە، زۆرخراپە، ژەهری لێدەبارێ، ئەوەندە ژەهرداره، تاقە نیگایەکی بەشی ئەوە دەکات مریشکێک بکوژێت. ئیدی وشەی نەهلیست مانا و چەمکێکی نەنگینی لەلا پەیدا کردم، جگە لەوە هیچی دیکە لەو زاراوەیە حاڵی نەبووم، دووچاری نائومیدی بووم. وادیار بوو من لە کتێبانی باش حاڵی نەدەبووم، چونکە هیچ لەم کتێبە حاڵی نەدەبووم، ئیدی هەستم کرد، دەبێ کتێبێکی باش بێت. بێگومان خانمێکی وا جوان و فامیدە کتێبی خراپی نەدەخوێندەوە. کە ڕۆمانەکەی میچرسکی م بۆ بردەوە، لێی پرسیم: - بەدڵت بوو؟

بە ئەستەم وەلامم دایەوە کە نە، چونکە دەترسام تووڕە ببێت. بزەیەکی کرد و خۆی کرد بەپشت پەردەی ئەو دەرگایەدا کە دەچووە سەر ژووری نووستنەکەی، دوای ماوەیەک بە کتێبێکی چکۆلەی بەرگ شینەوە زڤڕییەوە:

- من دڵنیام ئەمەت بەدڵ دەبێت. بەڵام ئاگات لێی بێت!

کتێبەکە کۆمەڵە قەسیدەیەکی پوشکین بوو: هەر هەموویانم لە یەک دانیشتندا خوێندەوە. ئەوەندەم بەدڵ بوون، دەتگوت خۆم لە جێیەکی یەجگار جواندا بینیوەتەوە و حەزم دەکرد بە کەرەتێک هەر هەموو پەنا وپاسار و گۆشەو کەنارەکانی کەشف بکەم. رێک وەکو کەسێک بووم، کە ماوەیەکی زۆر بە ناو جەنگەڵ و قۆپی و زەلکاودا ڕێ بکات و برستی لێ ببڕێت و لە ناکاوا خۆی لە وشکانیەکی پڕ هەتاوی بەگوڵ و وگوڵزاردا ببینێتەوە و حایر وحەپەساو بۆ ماوەیەک سەیری دەوروبەری خۆی بکات و پاشان لە خۆشیان بە غاردان بە ناو ئەو دەشت ودەرە بکەوێ.

پوشکین، بە سادەیی ویەکنەوایی و ڕیتمی قەسیدەکانی بە ڕادەیەک ئەفسوونی کردم کە تا ماوەیەکی زۆر پەخشانم لە بەرچاو کەوت، بەشتێکی ناسروشتیم دەزانی. بە ناڕەحەتی بەرهەمێکی پەخشانیم دەخوێندەوە. پێشەکییەکەی چامەی " روسلان و لودمیلا " ئەوەندە جوان بوو، لە تۆ وایە کورتە و پوختەی هەموو حیکایەتە جوانەکانی نەنکمی لە خۆ گرتووە.

بە تایبەتی چەند دێڕێکی ئەوەندە پاراو وناسک و وردو دروستبوون کە بەجارێ ئەفسوونی کردم و لە زەینمدا نەخش بوو:

*لەوێ، لە سەر ڕێگا نادیارەکان*

*جێ پێی حەیواناتی بێ ناو دەبینرێ..*

من لەبەر خۆمەوە، ئەوبەیتە ئەفسووناویانەم دەخوێندەوە و ڕێگا نادیارەکانم دەبینی کە جێ سمی حەیواناتی بێ ناونیشانیان بە سەرەوەبوو، ئەو جێ پایانەم بە سەر گیایە پێ شێل کراوەکانەوە دەبینی کە ئاونگ وەکو مرواری بەسەریانەوەو لە ژێر تیشکی هەتاوەکەدا دەدرەوشایەوە. ئیدی

هەرکاتێ کە ئەو شیعرانە و ڕیتم وڕەوانی ئەو شیعرانەم بیر دەکەوتەوە جەزمەیەکی تایبەتی دەیگرتم، حاڵم لێدەهات. بەمە دەبووژامەوە، زۆر خۆشحاڵ دەبووم، ژیانم لە لا ئاسان دەبوو، ئیدی ئەم حاڵە بۆ من وەکو دەستپێکی ژیانێکی نوێ بوو. خۆشی لەوانەی کە خوێندنەوە بەڵەدن!

من چیرۆکەکانی پوشکینم زۆر بە دڵ بوون، لە هەموو نووسینەکانی تری وی، باشتر لێیان حاڵی دەبووم. ئەوەندەم خوێندبوونەوە ئەزبەرم کردبوون. کە دەچوومە ناو جێگاوە، تا خەو دەیبردمەوە، قەسیدەکانیم لەبەرخۆوە دەگوتەوە. زۆرجار چیرۆکەکانیم بۆ خولامانی ئەفسەرەکان دەگێڕایەوە، ئیدی قاقا پێدەکەنین یان جنێویان دەدا، سیدوروف دەستی بەسەرما دێنا و دەیگوت: - پەح کە جوانن!

ئاغاکانم هەستیان بەو گۆڕانانە دەکرد کە بە سەرم دەهاتن، پیرەژن بایدایەوە سەر خوتەخوت و بۆڵەبۆڵەکانی خۆی:

- ئەم هەتیوە بەڕەڵلایە پیس خووی داوەتە خوێندنەوە. چواردانە ڕۆژە سەماوەرەکەی خاوێن نەکردووەتەوە! ئەگەر دەست دەدەمە دا رو...

من باکم بە دار نەبوو، بەم دێڕە شیعرانە بەرگریم لە خۆم دەکرد:

*ئەی پیرەژنی جادووباز*

*ڕوحی ڕەشی تۆ*

*ئاوێتەی شەڕ بووە شەڕ..*

خانمە گەنجەکە ڕۆژ بە ڕۆژ لەبەرچاوم جوانتر وبەقەدرتر دەبوو! کتێبی زۆر باشی دەخوێندەوە! کتێبەکانی ئەم وەکو هینەکانی ژنە وردیلەکەی کابرای بەرگدروو نەبوون!

ئەو ڕۆژەی کتێبەکەم بۆ بردەوە، زۆر خەمین و پەست بووم، حەزم نەدەکرد کتێبەکەی بدەمەوە. بە ڕاوێژێکی پڕ متمانە گوتی: - بەدڵت بوو، نا؟ هیچت دەربارەی پوشکین بیستووە؟

ئەوەی ڕاستی بێ وتارێکم دەربارەی پوشکین، لە گۆڤارێکا خوێندبووەوە. بەڵام حەزمندەکرد شتێک لەوەوە، لە زاری ئەوەوە سەبارەت بە پوشکین ببیستم. بۆیە گوتم: نە..

ئیدی بە کورتی باسی ژیان و مردنی پوشکینی بۆ گێڕامەوە. ئیدی بە بزەیەکی پاراو، تەڕ، نمناک وەکو بزەی ڕۆژێک لە ڕۆژانی بەهار کۆتایی بە قسەکانی هێنا:

- خۆ بینیت، خۆشویستینی ژنان چەند مەترسیدارە!

گوتم:

- لەوانەیە مەترسیدار بێت، بەڵام هەمووان دەکەونە داوی ئەشق و ڤیانەوە، ژنانیش لەلای خۆیانەوە گیرۆدەی دەبن و پێوەی دەتلێنەوە.

لە بەینی برژانگە درێژەکانییەوە، وەکو چۆن تەمەشای هەر شتێکی دەکرد، بەو ئاوایە تەمەشای کردم و بە دەنگێکی سەنگین گوتی:

- بەڕاست؟ مانای ئەو قسەیە دەزانی؟ ئەگەر دەیزانیت هیوادارم لە بیری نەکەیت!

ئەوجا پرسیاری ئەوەی لێکردم کە چ قەسیدەیەکم لاپەسندە. نازانم چ وەڵامێکم دایەوە، بەڵام هەر شیعرێکم لەبەر بوو، بە دەنگی بەرز و جووڵاندنی دەستەکانمەوە، هەموویم بۆ خوێندەوە، ئەو زۆر بە جدی و بە خامۆشی گوێی بۆ گرتم. هەنگێ لە جێگەی خۆی هەستا و بە ژوورەکەدا کەوتە ڕاوێچکە و هاتوچۆ. بە دەنگێکی بیرناکەوە گوتی:

- دەبوایە دەوامی قوتابخانە بکەی بچکۆل گیان! دەبێ بیرێک لەمە بکەمەوە. تۆ بە خزمەتی دەگەیە ئاغاکانت؟

بە ئەرێ وەڵامم دایەوە. وەکو یەکێک لۆمەی من بکات و خەتاکە بخاتە ئەستۆی من گوتی:- حەیفێ!

کتێبی "سروودەکانی برانجیە"ی دامێ، چاپێکی زۆر جوان بوو، بەرگێکی چەرمی سووری وێنەداری هەبوو. ئەم شیعرانە کە ئاوێتەیەکی سەیر بوون،لە ڕەنج و شادی بەجارێ شێتیان کردم. وەختایەک کە وشە تاڵەکانی "پیرەمێردی گەدا"م دەخوێندەوە، خوێنی دەمارەکانم دەمەیی:

*بۆچی نامخەنە ژێر پێیەکانتانەوە*

*وەکو مێرووییەکی دزیو پانم ناکەنەوە*

*ئەی پیاوچاکان؟*

*ئاخ، تەنیا ئەوەتان پێیە*

*فێرم بکەن، لە پێناوی مرۆڤامی دا*

*ڕەنج بدەم!*

*هەنگێ، لەترسی بامۆزو*

*زریانی زستانە پەنا بۆ پەناگەیەک دەبەی*

*وهەنگێ ئەم کرمە*

*دەبێ بە مێروولەیەکی ماندوو*

*خۆشم ویستن، وەکو خۆشەویستی*

*برا بۆ برا*

*لێ نها، بووم بە پیرەمێرێکی*

*ئاوارە*

*وەکو دژمنێکی ئێوە دەمرم.*

دوای ئەوە بە دەم خوێنـــدنەوەی (مێـــردی گریـــاو)ە وە پێکەنیم تـا ڕادەی گریـان. ئێسـتاش تێبینی یەکەی بیرانجیەم لە بیرە کە:

*نەفسی سادە وخاکی*
*بە ئاسانی*
*هونەری ژیانی*
*شاد فێردەبێت!..*

بیـرانجیە، جـۆرە جـورئەتێکی نەرێنـی خـراپ و ئـارەزووی لاسـاری وڕوو بە ڕوو بـوونەوەی خەڵکی لە دڵ و دەروونمـدا دروستکرد. بە توندی بە ڕووی خەڵکیدا دەچوومەوە. ئیدی لە ماوەیەکی زۆر کەمـا بووم بە وەسـتای ئەم هـونەرە. قەسـیدەم لەبەر دەکـــرد و لە مــــووبەقەکەدا، بە شـــادمانیەوە بـــۆ خزمەتکارەکانم دەخوێندنەوە.

بەڵام زۆری پێنەچـوو، ناچـار پەیوەنـدیم لە گەڵیانـدا بڕی و هاتوچۆی مووبەقەکەیانم نەدەکرد، چونکە ئەم بەیتە شیعرەی برانجیەیان کردبوو بە بیانوو تا پەیڤ و دەسـتەواژەی نەنگین دەربارەی کچان بهۆننەوە:

*ئایا هەموو کلاوێک*
*لە کیژۆلەیەکی*
*هەقدە سالان نایەت؟*

ڕۆژێـک گفتگـۆیەکی پـیس دەربـارەی ژنـان زۆری پەسـت کردم، دەهری کردم، ناچـار تـاوەیەکم بە سـەری یەرموخین دا کێشـا. سـیدوروف وچەنـد خـولامێکی دی فریـاکەوتن، لە ژێـر دەستیا دەریان هێنام. ئیدی لەوە بەداوە زاتم نەکرد، پێ بنەمە مووبەقی ئەفسەرەکانەوە.

(١٣)

گەڕانم لێ قەدەغە بوو، ڕاستت دەوێ کاتی گەشت و گەڕانم نەبوو. ڕۆژ بە ڕۆژ کارم زیاتر دەبوو. جگە لە کاری ئاسایی ڕۆژانەم کە بریتی بوو لە چوونە بازاڕ، شت کڕین بۆماڵەوە، گەیاندنی هەر ڕاسپاردەیەک، واتە کاری خزمەتکارێکی هەمەکارە، هەموو وەختەکەی لێدەگرتم، دەبوایە هەموو ڕۆژێک پارچەیەک لە چوارچێوەیەکی دارین بنەم و بە بزمار لە هەر چوارنکالەوە قایمی بکەم و ڕەسمەکانی وەستامی پێوە بنەم، هەندێجار ڕەسم و نەخشەکانیش کۆپی بکەم، حیسابی تێچووەکەی بکەم و لیستی موشتەرییە داواکارەکان بگرم. وەستام لە بەیانییەوە تا ئێوارێ، لە یەک وچان، کاری دەکرد.

لەم سەروبەندەدا، بیناکانی سەر بە شارەوانی نیژنی نوڤگورود خەریک بوو دەستاودەستیان پێدەکراو لە موڵکی گشتییەوە، دەگۆڕان بۆ موڵکی تایبەتی بازرگانان. ئیدی تەڤگەرێکی چڕ لە ئارادابوو بۆ دروستکردنی دووکان و فرۆشگایان. ئەم پێشهاتانە ڕەونەقێکی زیاتری بە کارەکانی وەستام بەخشی بوو، ئەویش چەند گرێبەستێکی کردبوو بۆ نۆژەن کردنەوەی دووکانانی کۆن و دروستکردنی دووکانێن تازە. هەندێ نەخشەی کێشا بۆ "گۆڕینی عاموودی دارین و دروستکردنی پەنجەرەێن بچووک" و ئەوجۆرە کارانە. من ئەو ڕەسم و نەخشانەم، لەگەڵ زەرفێکدا کە ئەسکەناسێکی بیست و پێنج ڕۆبڵی تیابوو، دەبرد بۆ ئەندازیارێکی پیری تەلارکاری، ئەویش دوای ئەوەی پارەکەی دەخستە تەنەکەی باخەڵی، ئەم وشانەی لە سەر نەخشەکان دەنووسی: "هەموو نەخشەکانی، ئەو بینایانەی ئێستا، وردبینی کراون و کارەکە هەر هەمووی

بە سەرپەرشتی خاوەنی ئەو ئیمزایەی خوارەوە ئەنجام دراوە. "هەڵبەتە نە هیچ وردبینییەک و نە هیچ سەرپەرشتیەکی ئەو بینایانە نەکرابوون. ئەمە جگە لەوەی ئەندازیاری ناڤبری نەیدەتوانی سەرپەرشتیاری هیچ پرۆسەیەکی بیناسازی بکات، چونکە نەخۆش بوو و دەبوایە بە بەردەوامی لەماڵەوە بێت.

ئیدی بەرتیلم بۆ سەرپەرشتیاری بازاڕ و زۆر فەرمانبەری دی دەبرد و لەجیاتی ئەوە، وەستام گوتەنی " مۆڵەتنامەی جۆرەها کاری نایاساییم " لێیان وەردەگرت. جا لە هەنبەر ئەم کارەدا، ئەو شەوانەی ماڵی ئاغاکانم دەچوون بۆ جێگایەک، ڕێگەم پێدەدرا شەوێ بۆخۆم لە حەوشەدا چاوەڕوانیان بکەم، کە زۆر بەکەمی دەچوونە شوێنان، کە دەشچوون دوای نیوەشەو دەگەڕانەوە. جا لەو ماوەیەدایان لە سەر پلیکانەکان یان لە سەر کۆمایەک ئێزینگ و قەلاشکەری دادەنیشتم، وچاوم دەبڕییە پەنجەرە ڕوناکەکانی ژووری ئەو خانمە جوانەی کە کتێبەکەی پوشکینی دابوومێ، بە وردی و تاسەمەندییەوە گوێم بۆ دەنگی ئەو مۆسیقا وگفتوگۆیە خۆشانە ڕادەدێرا کە لەوێندەرەوە بەرز دەبوونەوە.

پەنجەرەکان کراونەتەوە. لەبەینی پەردەکان وگەڵا وگوڵەکانەوە، تارمایی و سێبەری هاتوچۆی ئەفسەرە بەژن زراڤەکانم دەبینی. مێجەری خرپن ئولیسف بە شان هەڵتەکاندن و ورگ بادان دووی خانم دەکەوت. خانم بە ئاراپیشتێکی سادە وجوانەوە، دەتگوت بەسەر ئەوانەی دەوروبەرییەوە دەفڕێ.

من لە دڵی خۆما وبەیادی ئەو کتێبەوە کە جارێک خوێندبوومەوە، ناوم نابوو شاژنە مارگو. لە دڵی خۆما دەمگوت: " ئەمە ئەو ژیانە خۆشەیە کە کتێبە فەرەنسیەکان باسی دەکەن. " بەو خەیاڵانەوە دەمڕوانیە پەنجەرەکان. بەو

دیمەنانە پەست دەبووم، لە دڵی خۆدا بەغیلیم بەو هەموو پیاوەدا دەهات کە بە دەوری خانمە جوانەکەی لەمەڕ مندا دەخولانەوە. لە دڵی خۆما دەمگوت: " دەڵێی هەنگن بە دەوری گوڵدا دەخولێنەوە."

ئەفسەرێکی بالابەرز، ڕوخسار خەمناک، جێ زامێک بە هەنیەیەوە بوو، چاوەکانی بە قوولا چووبوون، کەلەوانی دی کەمتر هاتوچۆی مالی خانمی دەکرد، بەلام هەرکاتێ دەهات کەمانچەکەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، ئەوەندە بەسۆز وسیحراوی دەیژەند، کە ڕێبوارانی ناچار دەکرد بوەستن وگوێی بۆ ڕادێرن، خەڵکی کۆلانەکەی خۆمان لە سەر کۆما دارەکان خڕدەبوونەوەو گوێیان لێدەگرت. تەنانەت ئاغاکانی منیش، کە لە مال بوایەن پەنجەرەکانیان دەکردەوە و گوێیان لێدەگرت و ستایشی ژەنینەکەیان دەکرد. هەرچەندە ئەوەندەی لەزەتیان لە خواردنی ماسی دەبینی، نیو ئەوەندە لەزەتیان لەم موسیقایە و هیچ موسیقایەکی دی نەدەبینی.

ئەم ئەفسەرە هەندێجار بە دەنگێکی خۆش هەڵیدەکردە گۆرانی یان بەیتێکی دەخوێندەوە، لەو کاتەدا دەستی دەنایە سەر هەنیەی و هانکەهانکی پێدەکەوت. ڕۆژێک کە من دەگەڵ کچەکەی شاژنە مارگۆدا لەژێر پەنجەرەکەدا گەمەم دەکرد، شاژنە مارگۆ (خانمە جوانەکە) داوای لە ئەفسەرەکە کرد کە ستران بڵێت.. یارۆی ئەفسەر بەگوێی نەکرد، وەختایەک خانم پێداگری لێکرد، ناچار بەدەنگی بەرز ئەم بەیتەی دا بەگوێی دا:

*ئاواز و گۆرانی پێویستی بە جوانیە*

*جوان پێویستی بە ئاواز و گۆرانی نییە.*

ئەم شیعرە کاری لە ناخم کرد، خۆشم نازانم بۆچی لەوکاتەدا هەستم بە جۆرە خۆشەویستیەک بەرانبەر بە ئەفسەرەکە کرد.

خۆشترین کاتم ئەو ساتانە بوو کە خانم بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆی بە دەم پیانۆلێدانەوە دادەنیشت ومن لە پەنجەرەکەوە تەمەشام دەکرد. موسیقاکە مەستی دەکردم، جەزمە دەیگرتم، جگە لە پەنجەرەکەی بەرانبەرم و تارمایی شووش وباریکی ئەو ژنە نەجیبەی کە بە قامکە سپیەکانی پیانۆکەی دێنایە ئاواز وبە ئاستەم لەبەر تیشکی زەردی چراکەدا دەبینرا، هیچی دیکەم نە دەبینی، پەنجە سپیەکانی دەتگوت چۆلەکەن و بەسەر دوگمەکانی پیانۆکەوە باڵەفڕە دەکەن.

خەیاڵاوی تەمەشام دەکرد، گویم لەو موسیقا خۆشە دەگرت و لە دڵی خۆدا دەمگوت: ڕۆژێ لە ڕۆژان گەنجێک دەدۆزمەوەو یەکسەر پێشکەشی شاژنە مارگۆی دەکەم، تا دەوڵەمەند ببێت! ئەگەر سکوبیلیف بام، سەر لە نوێ شەڕم لە دژی تورکان ڕادەگەیاند، سەردەکەوتم، سەربەهای دیلەکانم وەردەگرت و لە کەناری ڤولگادا، لە جوانترین شوێنی شارا کۆشکێکم بۆ ساز دەکرد، تا لەم کۆلانە پیسە ڕزگاربێت، کە خەڵکە قەرە بەختەکەی تەنیا ئیش و کاریان ئەوەبوو، بوختان بۆ ئەو ژنە بکەن و ناوی بزڕێنن.

دەتگوت هەموو ئەو کارەکەرو خزمەتکار و دەر ودراوسێیانەی لەم گەڕەکەدا خڕ بووبوونەوە، بەتایبەتی خانمەکانی ماڵە ئاغای من، تەگبیریان کردبوو، کە بوختانی نادروست و نابەجێ بۆ شاژنە مارگو بکەن، وەکو چۆن ئەوەیان لە گەڵ ژنەکەی کابرای خەیاتدا کردبوو، بەڵام سەبارەت بەم خانمە جوانە دەنگوکان نزمتر بوون و کەمتر دەبیستران. هەرچەندە خەڵکەکە بەغیلیان بەجوانی و دەوڵەمەندی وسەربەستی و شەوبێرییەکانی دەبرد، بەڵام

لەبەر ئەوەی بێوەژنی پیاوێکی بە دەسەڵات بوو، لێی دەترسان و لێــی دەپرینگــانەوە. جارێکیــان ' توفیــاییف ' ی ســەرباز (پیاوێکی خوێندەوار بوو و بەبەردەوامی ئینجیلی دەخوێندەوە) بــۆی گێــڕامەوە کە هەمــوو ئەو ڕێزنامــانەی بە دیــواری ژوورەکەیەوە هەڵواسراون لەلایەن تزارانی جیاوازەوە بە ئاباد و ئەژدادی مێردەکەی بەخشراون. لەوانە: گودونوف، ئەلکسی، و پترۆســی مەزن. پێــدەچوو، هەمــوو ئەو بەدگــۆ ترســنۆکانە، لەوەش بترســن، کە خــانم بە قــامچییە دەســک ســەدەفەکەی بەربێــتە وێزەیــان. دەگێــڕنەوە کە گــوایە جارێــک ئەو کــارەی دەرهەق بە فەرمانبەرێکی گۆساخ کردبوو، تا جووڵابوو لە ژێر قامچیدا جولاندبووی.

بۆ نەگبەتی ئەو قسانەی بە چپە و بەدەنگی نەوی دەکران، زۆر لەو قســەڵۆکانە خراپتــر و کرێــت تــر بــوون کە بەدەنگی بەرز دەکران.

بەڕاستی من ئەو قسەوقســەڵۆکانەم زۆر لەبەرگران بوون، ئەم خــانمە جــوانە و ژنەکەی کــابرای خەیاتیــان بەیەک چــاو تەمەشا دەکرد. ئەوەی ڕاستی بێ من سەرم لە هۆ و ســەدەمی ئەم بەغیلـــی و دژمنـــایەتیە دەرنەدەکـــرد. بەڵام زۆرم لە لا ناخۆشــبوو. جارێکیــان ڤیکتــوری بــرای وەســتاکەم گێــڕایەوە شـــەوێکیان، کە دوای نیوەشـــەو بـــۆ مـــاڵ گەڕابـــووەوە، تەمەشایەکی پەنجەرەی ژووری نووستنەکەی شــاژنە مــارگوی کــردووەو بینیــویەتی بە ماکســی خەوەوە لەســەر قەنەفەیەک دانیشــتووە ومــێجەر ئولیســوف لە بەردەمیــا چــۆکی داداوەو نینۆکەکانی بۆ کردووەو بە ئیسفەنجێک هەردوو پای سڕییوە.

داکی ئاغام، کە گوێی لەو قسانە بوو، جوێنێکی دا و ڕووی وەرگێــڕا. خــانمی چکــۆلەش، لە شـــەرما ســـوور بـــووەوەو هاواریکرد:

- بەسە ڤیکتور! شەرم ناکەی! ئینسان دڵی تێک هەڵدێت! ئەم خانمە بەناو بەڕێزانە! هەموویان وان! نەعلەت لە پێستی سەری چاکیان!

وەستام بزەیەکی بۆ کرد وبێدەنگ بوو، ئەم خامۆشییەی ئەوم زۆر بەدڵ بوو، دەترسام ئەویش خۆی بکات بە شەریکی ئەو هەموو بوختان و ئیفترایانە. جووتە ژن، بووک و خەسوو، کە بە ڕواڵەت بێزاری ونەفرەتی خۆیان دەردەبڕی، بەرۆکی ڤیکتوریان بەرنەدەدا و بە پرسیاران دایان دەگرتەوە: - گوتت خانم چۆن دانیشتبوو؟ مێجەر چۆن کەوتبووە سەر چۆکان؟

- بە چاوی خۆت دیتت؟

ڤیکتور، کە خۆی بەو حاڵەوە بینی، هێندەی دی پێوەنا وگوتی:

- خۆزگە مێجەرتان دەبینی، سوور بووبووەوە، زمانی دەرهێنابوو و بستێ شۆڕ بووبووەوە..

من بەش بە حاڵی خۆم، هیچ نەنگیەکم لەوەدا نەدەبینی کە مێجەر نینۆکەکانی خانم بکات. بەڵام ئەوەم بە درۆ دەزانی کە زمانی دەرهێنابێ. بە درۆیەکی شاخدارم دەزانی، بۆیە خۆم پێنەگیراو بە ڤیکتورم گوت:

- باشە ئەگەر ئەم کارانە دزێو و عەیبە بێت، بۆچی لە پەنجەرەکەوە سەیرت دەکرد؟ خۆ منداڵ نیت..

هەڵبەتە، هەرهەموویان لەجیاتی ئەوەی وەڵامم بدەنەوە، بە جنێوان دایانگرتمەوە. بەڵام جنێوەکانیان بە هیچ جۆرێ کاری تێنەکردم تەنیا یەک مەیل، مەیلێکی زۆر جدی هانی دەدام کە بچمە نهۆمی خوارەوەو وەکو مێجەر، لەبەردەم خانمدا چۆک دابدەم و ئەوسا پێی بڵێم : - لێرە باربکە، تکایە لێرە باربکە!

ئیدی لە میانی خوێندنەوەی کتێبانەوە، گەیی بوومە ئەو قەناعەتەی کە ژیانیش، جۆر و شێوەی جیاوازی هەن، خەڵک،

بیـرو بـاوەڕو، هەسـت وسـۆزی جیـاواز هەن، ئیـدی ئەم ئەپارتمـانە بەهەمـوو خەڵکەکەیەوە، مـایەی بێزاری ونیگەرانیم بوو. ئەپارتمانی چی، یەکپارچە دەنگۆ و قسە وقسـەڵۆک بوو، کەس نەبوو، لە بوختان و ئیفترایان بخەلەسێت. بۆ نمـوونە بە قەشـەی لەشـکرەکەیان، کە پیـاوێکی نەخۆشـی دامـاو بـوو، دەگـوت کـابرایەکی ئـالوودەو داوێـن پـیس ومێبـازە. هەمـوو ئەفسـەرەکان و ژنەکانیـان بەگـوتەی ئاغاکـانی مـن، خەڵکـی بەڕەڵڵا و داوێن پیس وداوێن تەڕ بوون.

بێزم لەو قسە بێتام و قێزەونانە دەهاتەوە کە سـەربازەکان، دەربـارەی ژنـان دەیـانکرد. زیـاتر لە ئاغاکـانم بێـزار و وەڕەز بـووم. زۆریـان حەز لە بوختـان و ئیفتـرا بـوو، زمانیـان لە مەقەسـتی دۆمـان دەچـوو، کەسـیان نەدەبـوارد، لەزەتیـان لە بەدگۆیی دەبینی، خواخوایان بوو بکەونە زەمـی کەسێک، ئیدی ڕووتیـان دەکـردەوە، لەزەتیـان لەم پاشـملەبێژیە دەبینـی، پێدەچوو بەوە قەرەبووی ئەو ژیانە ناخۆشە بکەنەوە کە تیایدا دەژیان.

کە بە ئاشـکرا لە عەلەیـی شـاژنە مـارگۆ دەدوان و هەزار ویەک قسەی دزێویان دەدایەپاڵ، هەرچەندە بە تەمەن بچووک بـووم، بەڵام لەزگ بـوو لەداخـا شـەق بەرم، تـووڕە دەبـووم، ڕوحم گڕی دەگرت. پڕبەدڵ حەزم دەکرد ئەم بوختانچیانە بەر دەمرێـژی جنێـو بـدەم و کوتەکێـک بگـرمە دەسـت و بـکەومە وێزەیـان. کەچـی هەنـدێجاریش بەزەیـیم پێیانـدا دەهـاتەوە، بەزەییم بەخۆم و ئەو بێنەوایانەی دەوروبەرما دەهاتەوە. بەڵام ئەو سۆز و بەزەییە خامۆشە، زۆر بە ئازارتر بوو، لە عەزابی ڕق وکینە. مـن شـاژنە مـارگۆم لە هەمـوو ئەوانەی کە شـەو وڕۆژ لە عەلەیی دەدوان و زەمیان دەکرد، زیاتر دەناسی.

بەیانیانی یەکشەمموان، کە ئەربابەکانم بۆ نوێژی گەورە بۆ کڵێسادەچوون، مـن بە هەشـتاو دەچـووم بـۆلای خـانم. بـۆ ژووری نووستنەکەی خۆی دەبردم، لە سـەر قەنەفەیەکی نەرم وشـل کە پەردەیەکـی زەردی زێڕینـی بە سـەردا درابـوو، ڕۆدەنیشـتم. کـچە چکـۆلەکەی پێـما هەڵـدەگژاو لە سـەر ئەژنۆکانم دادەنیشت. باسی ئەو کتێبانەم بۆ دایکی دەکرد کە لە زەرفی هەفتەیەکدا خوێندبوومنەوە.

شـاژنە مـارگۆی لەمەڕ مـن لە سـەر تەختـەخەوە پانەکەی ڕاکشـابوو، لێفەیەکی زەردباوی، وەکو هەمـوو شـتەکانی تـری ناو ژووری نووستنەکە، دابوو بەخۆیا، ڕوومەتـی نـابووە سـەر دەسـتە ناسـک وسـپیەکەی، قـژە ڕەشـە هـۆنراوەکەی بە سـەر شـانەکانیا داخزابـوو، ئەوەنـدە درێـژ بـوو کە هەندێجار لە ژێـر لێفەکەوە دەهاتە دەرێ و دەگەیبە ئەرزەکە. بەدەم گوێگرتنەوە، تەمەشای منی دەکرد، سێبەری بزەیەکی شیرین دەنیشتە سـەر لێوی ودەنگی لە گوێما زرینگایەوە: - بەڕاست!..

هەستم دەکرد بزەکەی هەرگیز لە بزەی سـەنگینی شـاژنێک جیـاواز نییە. بە ڕاوێژێکـی میهرەبـان و مەنـد دەدوا. بەڵام مـن هەستم دەکرد هەمیشە، هەمان شت دەڵێت و دەڵێتەوە:

" دەزانـم مـن لە خەڵکـانی دی باشـتر وبـاڵاترم، هـیچ پێویستیەکم بە کەسیان نییە. "

زۆرجـار کە دەچـووم، دەمبینـی لەبەر ئـاوێنە وەسـتابوو، لە سەر تەپڵەکێکی نـزم دانیشـتبوو و قـژە عەبەنووسـیەکەی شـانە دەکرد. ئەم قـژ و بسـکە چـین لە سـەر چـین و پـڕ و درێـژە لە قژی نەنکم دەچوو. قژی تا ئەژنۆکـانی دەهـات، بەم لا وئەولای تەپڵەکەکەی ژێریا دەهـاتە خـوارێ، بە پشـتیا شـۆڕ دەبـووەوەو دەگەیـیە سـەر ئەرزەکە. لە ئـاوێنەکەدا مەمـکە قـوت و تونـد و

گەنمرەنگەکانیم دەبینی. بەبەرچاوی منەوە گۆرەویەکان و کراسەکەی لەبەر دەکرد، بەڵام ئەم رووتیە پاک و بێگەردەی هیچ ئارەزوویەکی سێکسی حەرامزادانەی لە لا ناهوڕوژاندم، بەڵکو بە ڕوح شادیم بە جوانیەکەی دەهات. بۆنی گوڵ لە بەدەنی دەهات، ئەم بۆنە هەر بیر وخەیاڵێکی بەدی، دەرهەق بەو، لە لا دەسڕیمەوە.

کوڕێکی ، ساغ و سەلامەت بووم، هەموو ڕازێکی پەیوەندییانی سێکسیم دەزانی. بەڵام خەڵکی هێندە بازاڕیانە وپیس وبە تامەزرۆییەوە باسی سێکسیان دەکرد، هەرگیز نەمدەتوانی ئەم بوونەوەرە ناسکە، لە باوەشی پیاوێکدا تەسەور و وێنا بکەم. باوەڕم نەدەکرد هیچ کەسێک بۆی هەبێ، بە گۆساخیەکی هەوەسامێزەوە دەست بۆ بەدەنی نازەنینی ببات. زۆر لەوە دڵنیا بووم کە ئەشق و ڤیانی شاژنە مارگۆ، زۆر جیاوازە لەو دەستبازی و حوب حوبێنە بازاڕیانەی کە لە مووبەق و عەماری ئێزنگ وقلاشکەری دا دەکرێ، شادی ئەو شتێکی دیە، ڤیانی ئەو بەرزو بالاترە، لەوەی دەربارەی ئەو دەگوترێ.

بەڵام دەمەو ئێوارەیەک، لە کاتێکا خۆم کرد بەژووری رووناندا (دانیشتن) لەجێی خۆم وشک بووم، گوێم لە پێکەنینە خۆشەکەی بوو، هەروەها گوێم لە دەنگی پیاوێک بوو لە پشت پەردەی دەرگای ژووری نووستنەکەوە، بەپاڕانەوەوە دەیگوت:

– پەلە مەکە.. خودایە! خەریکە باوەڕ ناکەم.

دەبوایە یەکسەر بگەڕێمەوە. گومانم لەمە نەبوو، بەڵام پێم ڕێی دانەدەگرت..

دووبارە دەنگی خانمم هاتەگوێ، بانگی کرد: – کێیە؟ ئۆ، تۆی ئەلیکسی؟ وەرە ژوورێ..

هەوای ژوورەکە خەفە بـــــوو، پەردەی ژوورەکـــــان دادرابـوونەوەو زۆر تاریـک بـوو، لە بـۆنی جۆراوجـۆر کەڕ بووبوو. شـاژنە مـارگۆ، لە سـەر تەختە خەوەکەیدا ڕاکشـابوو، لـــێفەکەی تـــاژێر چەنـــاگەی دابـــوو بە خۆیـــا. ئەفســـەرە کەمـانچەژەنەکە، بە تـۆیی کراسـێک پشـت لە دیـوارەکە و لە تەنیشــت ئەوەوە دانیشــتبوو، یەخەکەی کرابـووەوە، هەمـــوو سـینگ وبەرۆکی بەدەرەوە بوو. شـوێنەواری کۆنە برینێک بە سەرشانی ڕاستیەوە تا سـەر مەمکی هـاتبوو، ئەو جێگە برینە ئەوەندە زەق بوو، تەنانەت لە تاریکیەکەشدا دیاربوو.

قـژی کـابرای ئەفسـەر بەجـۆرێ گـڤ بووبـووەوە، مـایەی پێکەنـین بـوو. بـۆ یەکەمـین جـار، بزەیەکـی سـەیرم، بە سـەر ڕوخســارە هەمیشــە خەمـین و پەسـتەکەیەوە بینـی. بە جـۆرێ چـاوە درشــتەکانی بڕیبـوونە شــاژنە مـارگۆ، لە تـۆ وایە ئەمە یەکەمجارە ئەو هەموو جوانیە دەبینێت.

شاژنە مارگو گوتی:- ئەمە برادەری منە.

نەمزانی مەبەستی منە یان کابرای ئەفسەر. ئەوسا درێژەی بە قسـەکەی دا و، بە دەنگێکـی کـزی نـامەفهووم، وەکـو ئەوەی لەبنەبـانی ئەشـکەوتەوە بێـت گـوتی: - لەچـی دەترسـیت؟ وەرە ژووری!

مـــن چـــوومە ژوورەوە، باســـکە ڕووتە گەرمەکەی لە ملـــم وەرێنا وگوتی:- تۆش کە گەورە بوویت، تامی لەزەت دەچێژی، هەنووکە دەتوانی بڕۆیت.

ئەو کتێـــبەم، کە هێنـــابوومەوە، لە ســـەر ڕەفەکە دانـــا و کتێبێکـی دیـکەم لە ڕیـزی کتێبەکانـدا دەرهێنـا و لە ژوورەکە وەدەرکەوتم.

شتێک له دڵما هەرەسی هێنا. هەڵبەته قەت وێنای ئەوەم نەدەکرد شاژنەکەی لەمەڕ من، وەکو هەر ژنێکی دی ئاشقێنی بکات، سەبارەت به ئەفسەرەکەش، تەسەوری ئەو هەڵوێستەم لێنەدەکرد. بزەکەیم دێنایەوه بەرچاوی خۆم. زۆر سادە وساکار وەکو منداڵێک حەپەسابێ، بەو ئاوایە پێدەکەنی. سیما خەمینەکەی بە شێوەیەکی سەیر گۆڕابوو، بێگومان خانمی خۆشدەویست، چما کوڕ هەبوو بتوانێ خۆشی نەوێت؟ پیاوەکەش شایستەی خۆشەویستی ئەوبوو. مەگەر هەر خوا بزانێ بە چ ڕوحێکەوە کەمانچەی دەژەند! بە چ سۆز و گودازێکەوە قەسیدە وبەیتی بۆ دەگوت!..

بۆ نەگبەتی ئەم بیانوو و پاکانانە سوکنایی بە دڵم نەدەبەخشی، ئەمەش بەڵگەی ئەوەبوو، کە هەموو بۆچوونەکانم دەربارەی شاژنە مارگو، دروست نەبوو. دوای دیتینی ئەو هەڵوێستە هەستم کرد شتێکم لەدەست داوە. چەند ڕۆژێکم بەداخ وکەسەرێکی قووڵەوە بە سەربرد.

جارێکی دی کە بۆ کتێب چووەمەوە ژوورەکەی خانم، بەتووندی گوتی: - لەوە دەچێ تۆ منداڵێکی چەتوون بێت! قەت وێنام نەدەکرد وابی!

ئەو قسەیەم لە بەر گران بوو. ئیدی باسی ژیانی خۆم بۆکرد و چۆن کە خەڵکەکە بە خراپی باسی ئەو دەکەن پەست دەبم. لە بەرانبەرما وەستا، دەستێکی خستە سەر شانم، هەوەڵجار زۆر بە وردی گوێی لێگرتم. ئەوجا لە قاقای پێکەنینی دا وبە ئەسپایی لە خۆیی دوور خستمەوەو گوتی: - بەسە! هەموو ئەمانە دەزانم. دەمێکە ئەو شتانە دەزانم.

هەر دوو دەستی لە نێو دەستەکانی خۆی نام، بە دەنگێکی نەرم گوتی:

- تا کەمتر بیر لەو قسەو قسەلۆکە هیچانە بکەیتەوە، بۆ خۆت باشترە، ئاسوودەتر دەبیت. ئەوە چییە، گوێ بە خاوێنی دەستەکانت نادەیت..

دەیتوانی چاوپۆشی لەو قسەیە بکات، قسەیەکی نابەجێ بوو. ئەگەر ئەویش وەکو من ناچار بوایە، قاپ و ئامانێن مسین سپی بکاتەوە، ناو ژووران بسرێت، جلەکان بشوات، ئەوا بێگومان دەستەکانی لە دەستێن من جوانتر و ناسکتر نەدەبوون.

بە دەنگێکی خەیالاوی گوتی:

- کە بەشەر بە ژیانی خۆی رابگات وبزانێ چۆن بژی، هەموو خەڵکی بەغیلی پێدەبەن، کە بە خۆی رانەگات و نەزانێ چۆن بژی هەموو خەڵکی بەسووکی سەیری دەکەن و دەیبوغزێنن.

خانم بەرەولای خۆی رایکێشام و بەرزی کردمەوە و چاوی لەدور چاوانم بڕی و پرسی: - تۆ منت خۆشدەوێت؟

- بەڵێ.

- زۆر؟

- بەڵێ.

- بۆ؟

- نازانم.

- سوپاس. تۆ کوڕێکی باشیت! من حەزدەکەم خەڵکی خۆشیان بوێم...

بزەیەکی کرد. وام هەستدەکرد دەیەوێ شتێکی دی بڵێت، بەلام تەنیا ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا و، کەمێک بێدەنگ بوو، ئەوجا بە بێئەوەی بەرم بدات گوتی:

- هەمـوو جـارێ وەرە بـۆ ئێـرە. هەركـاتێ دەرفەتـت بـۆ ڕەخسا وەرە بۆلام..

منیش خواخوای ئەو دەعوەتە بووم. لەوە بە دواوە، هەركە دەرفەتم بۆ هەڵدەكەوت دەچووم بۆلای، هەڵبەتە ئەم دیدارانە سـوودێكی زۆری هزرییـان بۆمن هەبـوو. دوای فراڤین هەركە ئاغاكـانم، دەچـوونە سـەرخەو شـكاندن، بە هەشـتاو بە قاڵدرمەكانـدا دادەگەڕام. ئەگەر شـاژنە مـاركو لەمـاڵەوە بـایە، سـەعاتێ یـان زیـاتر بە دەم گفتوگـۆوە لەگەڵیـا دادەنیشـتم. بە قـامكە ناسـك و پەمەییەكـانی، تەوقەی لە قـژە بۆنـدارەكە دەدا وپێی دەگوتم: - پێویستە كتێبی ڕووسـی بخوێنیتەوە. پێویسـتە لە ورد و درشتی ژیانی ڕاستەقینەی ئێمەی ڕووس ئاگاداربیت. تێدەگەی؟

ئەوجا ناوی گەورە نووسەرانی ڕووسی بۆ ڕیز دەكردم و پاشان دەیگوت:- ئەو ناوانەت لە بیر دەمێنێت؟

زۆرجار بە ڕاوێژێكی كەسەردارەوە دەیگوت:

- تـۆ پێویسـتە بچیـتە قوتابخـانە، دەبـوایە مـن مشـورێكم بخواردبای، بەلام زوو شتم لەبیر دەچن.

كە دەچــوومە لای ئەو هەســتم بە كــات نەدەكــرد. گفتوگۆیەكان بە قـازانجی مـن بوون، زۆر زوو تەواو دەبوون. هەنگێ كتێبێكی تازەم لەبن هەنگڵم دەنا و بە دڵێكی ئـارام و پڕ ئومێدەوە، بە دڵێكی خاڵی لە هەر كینەیەک بۆ ماڵی ئەربابەكانم دەگەڕامەوە.

كتێبی " ژیـانی خـانەوادەیی " ئەكسـاكوف، چـامە ڕووسـیە جـوانەكەی " لە جەنگەڵدا " و " یاداشـتی ڕاوچـیەک " و هەنـدێ كتێبـی گریبنكـا و سـولوگوب و قەسـیدەكانی ڤینیڤیتینـوف و ئودویفسكی و تیوچیف م خوێندبوونەوە. ئەو كتێبـانە ڕوحیـان

لە هەر پوخڵەواتێک شۆردبوومەوە، ئێستا هەستم بە گرینگی و بایەخی کتێبێن چاک دەکرد، هەستم دەکرد کە کتێب بۆمن چەند پێویستن.

کتێب بەرەبەرە ئەو متمانەیەی لەلا دروستکردم کە من لەم دنیایەدا بە تەنیا نیم و منیش لەم ژیانەدا ڕێگایەک بۆخۆ دەکەمەوە.

جارێک نەنکم هاتە سەردانم، زۆر بەجۆش و خرۆشەوە باسی شاژنە مارگوم بۆکرد، نەنکم مژێکی لە سیغارەکەی دا و بە متمانەوە گوتی:- باشترا شوکر خەڵکی میهرەبان لەم دنیایەدا زۆرن، ئەگەر لێیان بگەڕێی دەیاندۆزیتەوە!

ڕۆژێک پێشنیازی کرد:

- پێویستە ڕۆژێک بچم بۆلای و سوپاسی بکەم کە ئەوەندە لەگەڵ تۆدا بە لوتف و میرەبانە!

- نا، نا، تکایە مەچۆ.

- چاکە، ناچم، ناچم. با کارەکان بە تەبیعەتی خۆیان بڕۆن! خۆزگە هەتا دەژیام!

شاژنە مارگو، هەر دەرفەتی بۆ نەڕەخسا، بە ئارەزووی خی بمنێرێتە قوتابخانە و بەر خوێندن. لە ڕۆژانی جەژنی سیانەی پیرۆزدا، بویەرێکی ناخۆش قەوما و چیوای نەما کە تیابچم.

کەمێک پێش ئەم جەژنە پێڵوەکانم بە جۆرێ ئاوسان کە هەردوو چاوم بە تەواوەتی قەپات بوون. ئاغاکانم دەسەپاچە بوون، دەترسان بە تەواوەتی بینایيم لە دەست بدەم، بە یەکجارەکی کوێرە ببم. منیش وەکو ئەوان دەترسام. پاشان بۆلای دکتۆرێکی ناسیاوی خۆیانیان بردم، ناوی دکتۆر هنریخ رودزیفیچ بوو. ئەمە دکتۆری نەخۆشی ژنان بوو. ژێر

پێڵوەکـانمی بە نەشـتەرێک هەڵـدڕی و پاشـان بە سـارغییەک پێچای و ئەمری کرد کە چەند ڕۆژێک، لە ماڵەوە، بە بێئەوەی بجـولێم لە سەرپشـت ڕابکشـێم. ئەمەم زۆر لەبەرگـران بـوو. ڕۆژێ پێش جەژن سارغیەکانی لە چاوم کردەوە، وەکو یەکێک زندە بەچاڵ کرابێ، بەو ئاوایە لە جێگە دەرهاتم. هیچ شتێک لە کوێری و نابینایی خراتر و ناخۆشتر نییە. بەلایەکی لە وەسف نەهاتگە. دابڕانی تەواوە لە دنیا.

لە ڕۆژی جەژنـی سیانەی پیـرۆزدا، لە نیوەڕۆوە بە هـۆی نەخۆشـیەکەمەوە لە هەمـوو کارێـک مەعـاف کـرام، ئیـدی لەم مـووبەقەوە بـۆ ئەو مـووبەق دەچـووم وسـەردانی خـولام و خزمەتگوزارەکانم دەکرد. هەرهەموویان سەرخۆش بوون تەنیا توفیاییف نەبێت. ئێواری یرمـوخین، کۆتەرە دارێکی بە سـەری سـیدوروف دا کێشـابوو، سـیدوروف لە دالانەکەدا کەوتبـوو و بوورابووەوە. یرموخین ترسابوو، لە ترسا بۆ دۆڵەکە هەلاتبوو و لەوێنـــدەر خـــۆی شـــاردبووەوە. لە مەیـــدانەکەدا دەنگـــۆ بڵاوبووەوە کە سیدوروف کوژراوە و مردووە. چەند کەسێکی کەم لەبەر دەرگـــای دالانەکەدا کۆبـــوونەوەو بە حەپەســـاوی تەمەشـــای ســـیدوروفیان دەکـــرد، کە بـــێ جـــووڵە لە نێـــوان مووبەقەکە و دالانەکەدا کەوتبوو. خەڵکەکە کەوتنە فسکەفسک کە پێویســـتە پـــۆلیس بانـــگ بکرێـــت، بەلام کەس ئەو کـــارەی نەکرد، کەسیش زاتی نەکرد دەست لە سەربازەکەوە بدات.

ناتالیـــا کوزلوفســـکایای قاپشـــۆر هـــات، جلێکـــی تـــازەی ئەرخەوانـی لە بەر کردبـوو، شـاڵێکی سـپی بەشـانیا دابـوو. بە تووڕەیی دڕی بە خەڵکەکە دا، خۆی بە دالانەکەدا کرد، بە دیار جەســـتەکەوە هەڵتروشـــکا، بە دەنگێکـــی بەرز هـــاواریکرد: - زندووە، گەوجینە! کوا تۆزێ ئاوم بۆ بێنن!

خەڵکەکە پێیان گوت: - خۆت لە کاروباری خەڵکی هەڵمەقورتێنە!

وەکو یەکێک بەشداری کوژاندنەوەی ئاگرێک بکات هاواریکرد: - گوتم ئاوم بۆ بێنن!

کراسە تازەکەی تا سەر ئەژنۆکانی هەڵکرد، سەری خوێناوی سەربازەکەی نایەسەر ئەژنۆکانی.

تەمەشاڤانە ترسنۆکەکان بڵاوەیان لێکرد. لەبەر ڕوناکیە کزەکەی داڵانەکەدا، چاوانی قاپ شۆرەکەم بینی کە ڕوندکیان تیا قەتیس مابوو و وردەوردە بە دەموچاوە سپیکەلانە خڕەکەیدا دەهاتە خوارەوە. سەتڵێک ئاوم بۆ برد، پێی گوتم کە بیکەم بە سەر و سینگی سیدوروف دا. ئاگاداری کردمەوە: - بەڵام مقەیەت بە تەڕم نەکەی- دەچمە زیارەت.

یارۆی سەرباز وەخۆهاتەوە، چاوە خەواڵوەکانی کردنەوەو ناڵەیەکی بۆکرد. ناتالیا، هەردوو دەستی خستە ژێربالی و بۆئەوەی کراسەکەی تەڕ نەبێت، کەمێک دوور لە خۆی ڕایگرت و گوتی: - بەرزی بکەنەوە.

هەڵمانگرت، بۆ مووبەقەکەمان برد. لە سەر تەختەخەوەکە پاڵمان خست. ناتالیا بە پارچە پەڕۆیەکی تەڕ دەموچاوی سڕی وئەوجا لە مووبەقەکە وەدەرکەوت وگوتی:

- ئەم پارچە پەڕۆیە بە بەردەوامی تەڕ بکە و بینە سەر سەری، تا دەچم ئەو قەل پیاوە دەدۆزمەوە. ئەم جووتە کەرە هەر دەخۆنەوە دەخۆنەوە، تا ڕۆژێ خۆیان لە زندانا دەبیننەوە.

تەنوورە تەڕەکەی داکەند وتووڕی دایە سووچێکەوە، کراسە درێژە تازەکەی دادایەوەو بە دەست چرچ ولۆچەکانی ساف کردەوەولە ژوورەکە وەدەرکەوت.

سـیدوروف، بە دەم ئـاخ وئـوفەوە کێشـمانی خـۆی دا. خوێنێکی ڕەش، لەسەریەوە دەڕژایە سەر پێیە ڕووتەکانی من. ئەوەم بەدڵ نەبوو، بەڵام لە ترسا نەدەوێرام پێم بجوڵێنم.

زۆر پەست و بێزار بووم، هەموو شتێک لە دەرەوە بۆنی جەژنـی لێـدەهات، بـانیژەو بەردەرگاکـان بە چـڵە دسـپیداری چکۆلە ڕازێنرابوونەوە.. ئیدی هەموو دەرگا و کۆڵان و گەڕەک وبان بە چڵە درەختێن جۆراوجۆر سـەوز کرابـوو و خۆشـی و سـەفای دەخسـتە دڵەوە. هەمـوو شـتێک جـوان وتـازە بـوو. لە بەیانی زووەوە وام هـاتە بەرخەیاڵ کە جەژنی بەهـار دەسـتی پێکـردووە و لەمـڕۆ بە دواوە ژیـان خۆشـتر و پرشـنگدارتر دەبێت.

سـەربازەکە هـات، مـووبەقەکەی پڕکـرد لە بـۆنی بـۆگەنی ڤودکای گەرم و پیاز. سەربازەکە دەموچاوی نـا بە شووشـەی پەنجەرەکەوە، کەمێک وەخۆهاتەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئەمە چیە؟ یرموخین؟ پیف لەو برادەرە!

کۆکی، بە سەرخۆشی لە هۆڕژنی گریانی دا:

– ئەی خوشکە چکۆلەکەم، خوشکە چکۆلە داماوەکەم!

گـوڕی دایەخـۆی، هەسـتایە سـەرپێیان، ئـازای تەڕ و پـیس بوو، بۆن بۆگەنی سـەعاتە ڕێیەک دەڕۆیی، لارەلاری پێکەوت، بە قورسی کەوتەوە سەر تەختەخەوەکە. لە کاتێکا بە ترسـەوە چاوی دەگێڕا گوتی:– بە تەواوەتی کوشتوومی!

گاڵتەم بەو قسەیە هات، پێکەنین گرتمی.

سەربازەکە، بە بێ موبالاتیەوە کەوتە ڕوانینی من و پرسی:

– بەچی پێدەکەنی هەی شەیتان؟ چۆن دڵـت دێ پێبکەنـی – لەکاتێکـا مـن نیـوە کـوژراوم – وەکـو ئەوەی هـیچ ڕووی نەدابێت؟!

به هەردوو دەستان کەوتە دەڵەک دانم، لەبن لێوانەوە گوتی:

- خوا دەست بە باڵتەوە نەگرێ. لاکەوە لەڕێم هەی شەیتان!

گوتم: - دە گەوجەگەوج!

بۆڵەیەکی تووڕەی کرد، هەردوو پێی جولاندن: - من کوژراوم و، تۆش..

بە دەستە سستە پیسەکانی یەکێکی کێشا بە هەردوو چاوما. هاوارێکم کرد و وەکو نابینا خۆم بە حەوشەکەدا کرد، تووشی ناتالیا بووم کە لە پیلی یرموخین نەوی بوو و ڕایدەکێشا و هاواری بەسەرا دەکرد:- وەرە لە گەڵما هەی بارگیر!

ناتالیا کە چاوی بە من کەوت گوتی:- ها چی بووە؟

- شەڕ دەکات..

ناتالیا بە سەرسامی دووبارەی کردەوە: - شەڕ دەکات؟

پاڵێکی بە یرموخینەوە نا و پێی گوت: - مەمنوونی خوا بە کە ئەمجارە بە سەلامەتی دەرچووی!

بە ئاوی سارد دەم وچاوم شت و گەڕامەوە، لەبەر دەرگاکەوە تەمەشایەکی ناو مووبەقەکەم کرد، سەیرم کرد جووتە سەرباز بەکول دەگرین و بەو پەڕی دڵسۆزییەوە دەستیان لە ملی یەکدی وەرێناوە. ئەوجا ویستیان دەست لە ملی ناتالیا بکەن، کە دەستیانی لە خۆی دوور خستەوەو هاواریکرد:

- دەستان لابەن هەی هیچ وپووچانە! بە چیم دەزانن،بۆ منیش ماشقە قڕنەکانی ئێوەم؟ پاڵکەون، بۆ خۆتان بخەون تا گەورەکانتان نەهاتوونەتەوە، بۆخۆتان ئیسراحەت بکەن، دەنا خراپتان بە سەر دێت.

وەکو دوو منداڵی چکۆلە ناچاری کردن کە پاڵکەون – یەکێکیان لە سەر قەرەوێڵەیەک و ئەویتریان لە سەر ئەرزەکە. کە دەستیان بە پرخ وهۆڕ کرد، ناتالیا چوو بۆ داڵانەکە.

– تەمەشای کراسەکەم بکەن – هەمووی چرچ ولۆچ بوو، بەخێریێ خۆم گۆڕی بوو تا بچمە زیارەت!لێی دایت؟... کە کەرە! ئەمەش خێروبێری ڤودکا! نەخۆیتەوە کوڕەکەم. نەخەڵەتابی خوو بدەیە مەیگوساری..

لە سەر سەکۆیەکی نزیک دەرگاکەوە لە لایەوە دانیشتم. لێم پرسی چۆنە لە سەرخۆشان ناترسی.

– لەوانەش ناترسم کە سەرخۆش نابن.

ئەوجا کوڵەمستە سوورەکانی نیشان دام و لە سەری ڕۆیی:

– ئا ئاوا بە گژیاندا دەچمەوە! مێردەکەم، کە ئێستا مردووە، مەیگوسار بوو، ئەوەندەی دەخواردەوە تا شین ومۆر دەبووەوە. هەردوو دەست ولاقیم دەبەستەوە، کە هەڵدەستا دەرپێیەکەیم دادەکەند و چەند شووڵێکی تەڕم پێدا دەکێشا. ' واز لە خواردنەوە بێنە، نەکەی خۆت ئالوودە بکەی! ئەگەر ژنێکت دەستکەوت بڕۆ بۆلای ئەو، خۆت بەتاڵ بکەوە، بەڵام پەنا وەبەر مەی نەبەی! ' ئیدی بەو جۆرە تا ماندوو دەبووم لێم دەدا، پاشان لە بەردەستمدا دەبوو بە قوڕە خۆشە!

حەوام وەبیرکەوتەوە کە چۆن خوای هەڵخەڵەتاند وگوتم: – تۆ زۆر بەهێزی.

ناتالیا، هەناسەیەکی هەڵکێشا وگوتی:

– ژن لە پیاو زیاتر پێویستی بەهێزە. هەم لەجیاتی خۆی و هەم لە جیاتی پیاو، کە خوا لەو ڕووەوە دەیخاپێنێ، ژن ناتوانێ پشت بە پیاو ببەستێ.

ناتالیا بەکاوە خۆ وبەبێ هیچ کینەیەک دەپەیڤێ، لەوێندەر ڕۆنیشت، دەستەکانی لە سەر سینگ و مەمکە زەلامەکانی تێک ئالاندن، پشتی دابوو بە دیوارەکەوە، چاوەکانی بە خەمینی بڕیبوونە بەربەستە قوڕاوییەکە. بەدەم گوێگرتنەوە لە تێبینیە حەکیمانەکانیەوە ئاگام لە کات نەما، لە ناکاوا چاوم بە وەستام کەوت کە ژنەکەی دەستی لە دەستی نابوو و لەلای بەربەستە دوورکەوە دەهاتن. بە ئەسپایی وبە جۆرە لە خۆبایی بوونێکەوە، وەکو مریشک و کەڵەباب (کەڵەشێر) هەنگاویان دەنا، بە دەم قسانەوە دەیانڕوانیە ئێمە.

بەغاردان چووم دەرگای پێشەوەم کردەوە. لە کاتێکا بەسەر قاڵدرمەکەدا سەردەکەوتین وەستاژنم بە تەشەرەوە گوتی:

- ئاشقێنی لەگەڵ قاپشۆرەکەدا دەکەی. وانییە؟ ئەمە لە خانمەکەی قاتی ژێرەوە فێربوویت؟

تێبینیەکەی لەوە گەوجانەتر بوو کە تووڕەم بکات. بەڵام وەستاکەم بەدەم پێکەنینێکی کورتەوە گوتی: - باشە ئیدی وەختی هاتووە، وانییە؟

زۆر زیاتر برینداری کردم.

بەڵام ڕۆژی دوایی، وەختێ بەیانی چووم بۆ عەماری ئێزنگ و قەڵاشکەریەکە تا دارو شەواتەک بێنم، جزدانێکی بەتاڵم لەلای ئەو چاڵەوە کە پشیلەکە بەدیوارەکەدا سەردەکەوت دۆزییەوە. دەیانجار ئەم جزدانەم بە دەست سیدوروفی سەربازەوە بینی بوو. یەکسەر بۆیم بردەوە.

لە کاتێکا قامکی بە ناو جزدانەکەدا دەگێڕا، لێی پرسیم:

- ئەدی پارەکەی ناوی، ڕوبڵێک و سێ کوپیکی تیابوو. کوانێ ویمدە!

خاولیەکی بەسەرییەوە پێچابوو، ڕەنگ زەرد و زەعیف، لێکدا لێکدا چاوە هەڵماساوەکانی (ئاوساو) دەتروکاندو سەیری منی دەکرد، بە هیچ جۆرێ باوەڕی نەدەکرد کە من جزدانەکەم بە بەتاڵی دۆزیوەتەوە. لەو بەینەدا یرموخین هات بەسەرا و دەیویست قەناعەت بە سیدوروف بێنێ کە گوایە من پارەکەم دزیوە. بەسەر ئاماژەیەکی بۆ من کرد وگوتی:

- بێگومان ئەو دزیویەتی، بیبە بۆ لای ئاغاکانی. تۆ خۆت دەزانی سەرباز دزی لە سەربازی برای خۆی ناکات!

ئەو ڕستەیەی دوایی یرموخین دڵنیای کردم کە ئەو پارەکەی دزیوە و بۆ ئەوەی هەر گومانێک لە خۆی دوور بخاتەوە، جزدانە بەتاڵەکەی هەڵداوەتە عاماری شەواتەکەی ئێمەوە. بۆیە چاوم لە دوڕ چاوی بڕی و بەدڵنیاییەوە هاوارم بەسەریا کرد: - درۆ دەکەی، تۆ دزیت، تۆ دزیوتە!

یەکسەر قەناعەتم هێنا کە گومانەکەم سەبارەت بە یرموخین، لە جێی خۆیەتی. یەکسەر ترس و تووڕەیی بە ڕوخساریەوە دەرکەوت، هاواری بەسەرما کرد وگوتی:

- بەڵگەت چییە! بە بەڵگەوە بیسەلمێنە!

ئەی خودا بەڵگەیەک لە کوێ بێنم؟ گوێی گرتم و بەدەم جنێودانەوە لە مەتبەخەکە بردمیە دەرەوە. سیدوروف بە لەقەلەق و بەدەم جنێودانەوە لە دوومان هات. ئیدی هەراوزەنایەکی زۆرمان نایەوە، کرێچییەکان لە پەنجەرەکانەوە سەریان دەرهێنابوو، یەکێک لەوانە دایکی شاژنە مارگو بوو، بە کاوەخۆ سیغاری دەکێشا، ئیدی هەستم کرد کە تەواو، لە بەرچاوی ئەو و کچەکەی کەوتم, بووم بە بەڵمە برنج، بۆیە تووڕە بووم،چاوم پەڕییە تۆقی سەرم. هەرشێت بووم.

من هێشتا بەرگریم دەکرد، جووتە سەرباز، سیدورۆوف و یرموخین باڵیان گرتم و بەرهەقیان کردم و بۆلای ئاغاکانیان بردم. ئێستاش ئەو دیمەنەم لەبەرچاوە، دەڵێی دوێنێ ڕوویداوە. ئاغاکانمله بەردەمماندا وەستابوون و بەدەم سەر لەقاندنەوە گوێیان لەو بوختان و ئیفترایانە دەگرت کە سەربازەکان بۆ منیان دەکرد.

خانمی بچووک بە قەناعەتی تەواوەوە گوتی:

- بێگومان کاری ئەوە! دوێنێ شەو بە چاوی خۆم دیتم کە ئاشقێنی لە گەڵ ژنە قاپشۆرەکەدا دەکرد. دیارە پارەی پێ بووە – چونکە ئەو شتانە بەبێ پارە ناکرێ، بە تایبەتی ئەو ژنە دین وئیمانی پارەیە..

یرموخین هاواریکرد: - زۆر ڕاستە!

سەرم دەسووڕا، هەموو شتێکی دەوروبەرم دەسووڕایەوە، هەستم دەکرد ئەرزەکە لە ژێر پێمداشەق دەبات، بە جارێ دەهری بووم، کەوتمە جنێودان بە خانمی بچووک، ئیدی شل کوتی عەمریان کردم. بەڵام ئەوەی لە لێدانەکە پتر ئازاری دەدام نەمدەزانی ئاخۆ شاژنە مارگو، دوای ئەم بویەرە چۆن بیر لە من دەکاتەوە. چۆن بتوابم بێتاوانی خۆمی بۆ بسەلمێنم. ئیدی لە ڕادە بەدەر پەست و خەمبار بووم.

خۆم و بەختم هەردوو سەربازەکە، سیدوروف و یرموخین، ئەم بویەرەیان بۆ هەرکەس و ناکەسێک گێڕابووەوە. لە ناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە. هەموو گەڕەک و کۆڵانەکە پێیان زانی.. بۆ شەوێ لە کاتێکا من لە هەورەبانەکە لە سەر جێگاکەم ڕاکشابووم، لە خوارەوە گوێم لە دەنگی ناتالیا کوزولوفسکایای کارەکەر و جلشۆر بوو، دەیگوت:

- بەڵێ، من قسەی خۆم دەکەم، بۆ دەمی خۆم بگرم. وەرە کوڕی باش، وەرە بۆ خۆت شاردووەتەوە؟ ئەگەر بە خوایشتی خۆت نەیەی دەچم مەسەلەکە بە نەقیبەکە ئێژم و ناچارت دەکات بێیت..

یەکسەر زانیم کە مەسەلەکە پەیوەندی بەمنەوە هەیە، لە کەیفان پێم بە عاردی نەدەکەوت، ناتالیای کارکەر وجلشۆر لە بەرماڵی مەدا وەستابوو، هاواریدەکرد، سات بە سات دەنگی زوڵاڵتر دەبوو، گوتی:

- دوێنێ چەندت پارە بە من نیشاندا؟ لەکوێت پەیدا کردبوو؟ ها؟دە پێم بڵێ دەی.

لە گەرمەی خوشحاڵیمدا، گوێم لە سیدوروف بوو کە بەخەمباری دەیگوت: - ئاە یرموخین، یرموخین..

- کەچی بوختان بەو کوڕە داماوە کراوەو شل کوتی عەمریان کردووە!

پڕ بە دڵ حەزم دەکرد، بەهەشتاو خۆم بگەیەنمە ناو حەوشەکە و لە خۆشیا برەقسم و دەستەکانی ناتالیای جلشۆر ماچ بکەم. بەڵام هەر لەوکاتەدا دەنگی وەستاژنم لە پەنجەرەکەوە هاتەگوێ:

- کورەی داماو! لەبەر لاساری و گوساخی خۆی لێدانی خواردووە.

- جگە لە تۆی بێ حەیا و ناچیز کەسی دی گومانی ئەوە نابات کە دزی کردبێ!

- تۆ بێ حەیای خانم! سەیری خۆت کردووە کە دەڵێی مانگای دابەستەی.

شەڕەکەی ئەوان لە گوێما تام ولەزەتی موزیقای هەبوو. لەخۆشیا ڕوندک زاییە چاوانم، زۆر منەتباری ئەو چاکەیەی ناتالیا بووم.

وەستام بە ئەسپایی بۆ هەورەبانەکە سەرکەوت. لەلامەوە لە سەر کۆتەرە دارێک دانیشت، دەستی بە قژیا هێنا و گوتی:
- پشکوف، وادیارە تۆ کەسێکی بێ شانسی.
بەبێ ئەوەی چ قسەیەک بکەم رووم وەرگێرا. ئەو لە سەری رۆیی:
- بەڵام کەس نکۆڵی لەوە ناکات کە تۆ کەسێکی جنێوفرۆشی و جنێو وسخێفی پیس بە خەڵکی دەدەی. ئاخر ئەمە وانابێت. بە خۆت دەبێ ئەمە تێبگەی.
بە دەنگێکی نەوی پێمگوت:
- هەرکە کەمێک وەخۆ بێمەوە وبتوانم خۆم بە پێوە بگرم بەجێتان دێڵم..
ماوەیەک ، بە بێئەوەی ورتەی لێوەبێت، بەدەم جگەرەکێشانەوە دانیشت. جگەرەکەی تەواو کرد، ئاغزەکەی فرێ دا و بە دەنگێکی نەوی گوتی:
- ئەوە کێشەی خۆتە! تۆ ئێستا منداڵ نیت. خۆت چاکە وخراپەی خۆت دەزانیت.
ئەوسا هەستا، بە قاڵدرمەکانا داگەڕا. وەکو هەمیشە هەستم بەجۆرە سۆز ومیهرێک کرد بەرانبەری.
دوای چوار رۆژ وازم لە کارەکەم هێنا، زۆرم حەزدەکرد بچم دوعاخوازی لە شاژنە مارگو بکەم، بەڵام زاتم نەکرد ئەو کارە بکەم، ئەوەی راستی بێ بە تەما بووم ئەو بانگم بکات. خواحافیزیم لە کچە بچووکەکەی کرد وپێم گوت: - بەدایکت بڵێ زۆر زۆر سوپاسی دەکەم. خۆ بیرت ناچێت؟
بەدەم بزەیەکی ناسک و شیرینەوە گوتی: - نەخێر خودا حافیز تا سبەینێ!
دوای بیست ساڵ جارێکی دی بینیمەوە، شووی بە ئەفسەرێکی دەرەک کردبوو. (دەرەک: پۆلیسی دەرەوەی شار).

## (١٤)

جارێکی دی لە کەشتیەکدا دەستبەکار بووم، کەشتیەکە ناوی پرم بوو، کەشتیەکی هەڵمی درێژ و گەورە بوو، هێندە سپی بوو دەتگوت قووە. ئەمجارەیان لە مووبەقەکەدا کاری قاپشۆریم دەکرد، ئیدی بۆ پایەی شاگرد ئاشپەز تەرفیعم کردبوو. مانگێ حەوت ڕۆبڵیان دەدامێ. دەبوا شاگردی و بەردەستی ئاشپەزەکەم بکردایە.

بەڕێوەبەری بوفیە وخوارنگەکە کابرایەکی قەڵەوی قۆرەدەماخی سەرساف بوو، سەری لە تۆپی لاستیک دەچوو. دوای تەواوبوونی ئیش وکار، دەستی دەخستە پشتی و بە حەوشەی کەشتیەکەدا دەهات و دەچوو، لە بەرازێک دەچوو لە قرچەی گەرمادا بۆ پەڵە سێبەرێک بگەڕێت. ژنەکەی سەرپەرشتی بوفیەکەی دەکرد. ژنێک بوو لە سەرووی چل ساڵییەوە، هێشتا شوێنەواری جوانی بە سیمایەوە دیاربوو. بەڵام ئەوەندەی سپیاو دەکرد، هەرکە دەجووڵایەوە، وردە سپیاوەکەی دەم وچاوی هەڵدەوەری وبە سەر جلە ڕەنگاوڕەنگەکانیەوە دەنیشتەوە و سپی هەڵدەگەڕان.

مووبەقەکە لە ژێر سەرپەرشتی ئاشپەز ئیڤان ئیڤانۆڤیچدا بوو کە بە (ورچە چکۆل) بەنێوبانگ بوو. پیاوێک بوو کورتەباڵا، خاو وخلیچک، کەپوو دەندووکە داڵاشی، چاو زیت، جلی جوانی لەبەر دەکرد و بەخۆی ڕادەگەیی، هەموو ڕۆژێ ڕدێنی دەتاشی، هێندەی گوێزان پێدا دێنا لا ڕوومەتەکانی شین دەبوونەوە. سمێڵە ڕەشەکانی بۆ سەرەوە بادەدا، هەرکاتێ دەستی بگەیشتبا بە پەنجە ئەستوورەکانی کە بەهۆی ئاو

وئاگرەوە پیرەڵۆک بووبوون، بۆ سەرەوەی با دەدان وبە کەش وفشەوە لە ئاوێنەیەکی چکۆلەی دەستیدا تەمەشای دەکردن.

لە کەشتیەکەدا، تاقە کەسێک کە زۆر دەچووە دڵمەوە تونچییەک بوو بە نێوی یاکوف شوموف، کە زەلامێکی تۆکمەی ناوشان پان، دفناک (لووت زل)، چاوەکانی کە لە چاوی کەڵەباب دەچوون، کەوتبوونە ژێر برۆ چڕ و پەیوەستەکانییەوە. ڕدێنێکی لوول کە لە جلەشینەی (قەوزە) سەر زەلکاوان دەچوو. قژی ئەوەندە لوول و پڕبوو، بە زەحمەت قامکانی تێدەچوو.

قومارچیەکی لە زەبر بوو، هەمیشە براوە بوو. زۆر نەوسن و خوارۆخ (پڕخۆر) بوو. هەمیشە وەکو سەگێکی بەڕەڵلا بۆ گرتکە گۆشتێک یان پارچە ئێسقانێک بەدەوری مووبەقەکەدا دەسووڕایەوە. کە شەو دادەهات بە دەم چاخواردنەوەوە لەگەڵ ˚ ورچە چکۆل ˚ دا دادەنیشت وبەسەرهات و سەربهوردە سەیر وسەمەرەکانی خۆی دەگێڕایەوە.

بەمندالی، لە ڕیازان پاش شوانی شار دەبێت. بەڕێکەوت قەشەیەکی ڕێبوار دەیبینێ و دەچێتە دڵییەوەو بۆ دێرەکەی خۆی دەبات و چواردانە ساڵ بە شاگردی لەوێندەر دەمێنێتەوە. بە شیوازە کومیدیەکەی خۆی دەیگێڕایەوە:

– من دەمتوانی ببم بە کەشیش، ببمە ئەستێرەیەکی ڕەش، لە ئەستێرەکانی خوا، بەلام جارێک ژنێکی خەڵکی بنزا، بە دین و پارسا هاتە دێرەکەمان، ژنێکی گەنج و جوان بوو، ئیدی تەواو مێشکی تێکدام، چبکەم بەدەستی خۆم نەبوو، حەزم چووێ، ئیدی بەشەرەو شیری خاوی خواردووە. پێی گوتم: ˚ تۆ کوڕێکی گەنج و قۆزی. منیش بێوەژنێکی تەنیا وئابڕوومەندم، من پێویستم بە پێشکارێک هەیە، خانوویەکی

بچووکم هەیە، پەڕ وپۆی مریشک وتەیر وتو دەفرۆشم، بۆ نایەی ببی بە پێشکارم وکاروبارەکانم بۆ بەڕێوە بەریت؟ "

قەبوولم کرد، لە گەڵی چووم، ئیدی کردم بە سوتلی (قەپاتمە) خۆم و سێ دانە سالم بە خۆشی و خۆشگوزەرانی بردەسەر..

ورچە چکۆل قسەکەی پێبڕی وگوتی:

- بەڕاستی درۆزنێکی ڕووداری. ئەگەر خەڵکی بەدرۆ ژیابان، تۆ زۆر دەوڵەمەند دەبوویت و پێویستت بە کارکردن نەدەبوو.

یاکوف شتێک دەجووێت، مووەکانی سەر گۆناکانی بەرز ونزم دەبنەوە، گوێچکە تووکنەکانی دەجووڵێن. گوێ لە قسەکانی کابرای ئاشپەز دەگرێت و هیچ وەڵامێک ناداتەوە، بەڵام بەهەمان ڕاوێژی هێدی و ئارام لە سەر قسەکانی پێشووی دەڕوات:

- ژنەی تاین لە من گەورەتر بوو، زۆر زوو لێی بێزار بووم. ئیدی پەیوەندیم دەگەڵ کچی براکەیدا پەیدا کرد، پوورەخان پێی زانی و بە پەڕۆیەکی پیس کلکی گرتم و تووڕی دامە دەرەوە..

یارۆی ئاشپەز، بە هەمان تۆنی یاکوف گوتی:

- ئەو دەستانەی خۆش بێت، هەقی خۆتی لە قوولی مستی نایت.

یارۆی تونچی، کلۆ شەکرێکی لە زاری نا و، درێژەی دایێ:

- ماوەیەک بەو جۆرە، وێڵ و سەرگەردان سووڕامەوە. تا تووشی کابرایەکی گەڕیدەی پیر بووم بە نێوی فلادیمیر، بە دوو قۆڵی نیوەی دنیا گەڕاین. باڵقان، تورکیا، ڕۆمانیا و یونان گەڕاین. تەنانەت چووینە نەمساش.. ئیدی خەڵکانێکی زۆر وجیاوازمان بینی.. لەممان دەکڕی و بەومان دەفرۆشت..

ئاشپەزەکە بەجدی پرسی: - ئەدی دزیتان لە کێ دەکرد؟

- لە کەس، کابرای پیرەمێرد ئەهلی دزی نەبوو و بەو کارە قاییل نەبوو، بەمنی دەگوت: " لە ولاتی غەریبیدا دەبێ ئاقڵ بی، دەست پاک بیت. لێرە قانوون لە گەڵ ئێمەدا نییە، لەگینە لە سەر بچووکترین شت سەرت ببڕن ". وێڕای ئەوەش چەند جارێک هەوڵی دزیکردنم دا، بەڵام ئاو لە دووی بێڵم نەهات. هەق بەو پیرەمێردە کەرە بوو. ڕۆژێک خۆم تاقیکردەوە، ویستم ئەسپێک لە تەویلەی کابرایەکی بازرگان بدزم. بەڵام لە نەزانی خۆما گرفتاربووم، گرتیانم، بگرە کوێت دێشێت، شل کوتی عەمریان کردم و بۆ مەخفەری پۆلیسیان بکێش کردم. لەوێ بووین بە دووان، یەکممان ئەسپ دزێکی لە زەبر و کارامە و بە ئەزموون بوو، دووەممان کە من بووم هەر وا بۆ هەوەس ئەو کارەم کرد، ئیدی کە بەخت وناوچەوان نەیکرد خۆ بە زۆر نییە، تۆمەز، چووبوومە سەر دزێکی تەواو عەیار، دزێکی بەڵەد و شارەزا لە هەموو وردەکارییەکانی هونەری دزی. بەڵام من ئەوم زۆرباش دەناسی، کاتی خۆی من توونی حەمامەکەیانم بۆ دانابوون. ڕەنگە هەر ئەمە بووبێ بە سەدەمی ڕزگاربوونی من. چونکە ئەم پیاوە یەکسەر تووشی نەخۆشی دەبێت، تای لێدێت و بە دەم تایەکەوە دەکەوێتە وڕینە کە گوایە لەم وڕینانەدا من وەکو خۆم دەبینێ و تەنانەت قسەشم لە گەڵدا دەکات. پاشان زۆر شپرزە دەبێت و دەترسێت و هەمان ڕۆژ مراجەعەی پۆلیس دەکات و داوا دەکات: " بابە ئازادی بکەن... واتە من ئازاد بکەن. ئەو پیاوە هاتووەتە خەونم و هەڕەشەی لێکردووم، ئەگەر بمەوێ ڕزگاربم دەبێ ئەو ئازاد بکرێت، چونکە ئەوپیاوە جادووگەرە. " گوایە من جادووگەرم. ئیدی چونکە کابرا، کاتی خۆی دز و

ڕێگرێکی لەزەبر دەبێ و ئێستا بازرگانێکی بە نێوبانگ دەبێت، بەگوێی دەکەن و منیان ئازاد کرد.

- نە دەبوو ئازادت بکەن، دەبوایە بەردێکیان لە ملت ببەستایە و سێ دانە ڕۆژ بخرایتایەتە ژێر ئاوەوە، تا وەهۆش هاتبایتەوە.

یاکوف، بێئەوەی خۆی شلوێ بکات، بلەز ئەو قسەیەی قۆزتەوە وگوتی:

- ڕاست دەکەی، من ئەوەندە بێهۆش و کەرم، ئەگەر کەرێتی من دابەش بکرێت، بەشی یەک گوندی تەواو دەکات، پەنا بەخوا کەرێتی من لەوەدا نییە.

ئاشپەزەکە، زۆر تووڕە دەبێت، قردێلەکەی ملی کە زۆر توونند بوو کەمێک شل دەکاتەوە، سەری بەملا وبەولادا بادەدات و بە بێزارییەوە دەڵێت:

- تفو، وەرە کابرایەکی وەکو ئەم تاوانبارە لە دنیادا بژی، بخوا وبخواتەوە و بخەوێت و وەکو بەرزەکی بابان بسوڕێتەوە، توخوا حەیف نییە؟ پێم بڵێ.. تۆ بەخۆت دەزانی بۆچی دەژیت؟

تونچییەکە، بە دەم هەڵمژینی قەندەکەی نێو دەمییەوە، بەرسڤی دایەوە: - چوزانم. منیش وەکو هەرکەسێکی دی دەژیم. ئیدی خەڵکانێ هەن دەخەون، نووسەران ڕۆژ تا ئێوارێ قوون لە سەر کورسییەکانیان نابزوێنن. ئیدی چ دەکرێ، دەبێ هەموو خەڵکی زگی خۆ تێر بکەن.

ئەوقسەیە، یارۆی ئاشپەزی هێندەی دی بێزار کرد:

- تۆ زۆر لەوە کەرتری کە تەسەور بکرێ یان بە قسە گوزارشتی لێبکرێ، تۆ شایستەی ژیان نیت، هەر بۆ ئەوە باشیت بکرێی بە خوراکی بەرازان..

یاکوف، بە سەرسامی دەپرسێت:

- نازانم بۆچی بەو جۆرە خۆت سەغڵەت دەکەیت؟ ئاخر چیت لەمە دەست دەکەوێت؟ هەموومان توخم وتۆوی یەک درەختین، بەو قسانە چاک نابم، ئیدی من ئەوەم کە هەم.

زۆر زوو دڵبەندی یاکوف بووم، بەسەرسامی تەمەشام دەکرد و بەزاری بەشەوە گوێم لێدەگرت، هەستم دەکرد لە بۆتەی ژیاندا قاڵبووەتەوەو بە شێوازی تایبەتی خۆی دەژی. بەیەک چاو سەیری هەمووانی دەکرد. بە هەمان ڕاشکاوی هەمووانی دەدواند، کاپتن، شاگرد، دەریاوان، کارمەندان، خزمەتگوزاران، ڕێبواری دەرەجە یەک، پێشخزمەتانی بوفیەکە و، ڕێبوارانی دەرەجە سێ لە لای ئەو هیچ فەرقێکیان نەبوو و وەکو یەک بوون.

هەندێجار کاپتن یان سەر ئەندازیاران بۆ لێ پێچینەوە بانگیان دەکرد، لە بەردەمیاندا دەوەستا، بازووە درێژەکانی کە لە بازووی مەیموون دەچوو، دەخستە پشتیەوەو بەبێدەنگی گوێی لە سەرزەنشتەکانیان دەگرت، ئیدی لەبەر تەمەڵی و تەوەزەلی و خەمساردی یان گزی و دزی لە وەرەقبازیدا، سەرزەنشتیان دەکرد. چەندیان سەرزەنشت بکردایە یان هەڕەشەی ئەوەیان لێکردبا کە لە بەندەری پاشتردا دەری دەکەن، بەخەیاڵیا نەدەهات، وەکو ئەوە بوو گوێزی بۆ بژمێرن.شتێکی سەیر لەم یاکوفەدا هەبوو، وەکو کابرای (ئەمە جوانە) وابوو. وادیاربوو ئەمیش قەناعەتی وابوو کە کەسێکی جیاوازە، لە قوماشێکی جیاوازەو خەڵکی تێی ناگەن.

من قەت ئەم پیاوەم بە خەمینی و بە پەستی نەبینی بوو، بیرم نایەت زمانی لە دەمیا وەستابێ. وشە دەتگوت، بە بێئەوەی بەدەستی خۆی بێت، وەکو ڕێژنەی باران لەزاری دەباری. کاتێ کە لێی توورەبان، یان جنێوێکیان پێبدابا یان

گـوێی لە قسـەیەک بگرتبـایە، لێـوی دەبزواند، لە تـۆ وایە ئەو قسانەی کە دەی بیستن، لە بەرخۆیەوە دووبارە دەکاتەوە. یان بەدەم بیرکـردنەوەوە قسـان دەکـات. کە وەختـی کـار تەواو دەبـوو، لە تـوونی کەشـتیەکە دەهـاتە دەرێ، ئـارەقە لە سەراپایەوە دەچۆڕایەوە، ئازای لە ڕۆن وگریسدا هەڵکشـابوو، پـێ پەتـی، یەخە کـراوە، دڵـۆپە چەوری و ئـارەقە بەسـەر سـینگیەوە دەبریقـایەوە، بـێ پشـتێن، تـا سـینگە تـووکنەکەی پیشـانی خەڵکـی بـدات. هەنگـێ گوێمـان لە دەنـگە قـووڵ و یەکنەواکەی دەبوو، وشە وەکو باران لە زاریەوە دادەباری.

- سڵاو دایکە. بۆ کوێ دەڕۆیت؟ بۆ چیستوپول؟ زۆرچاکە زۆرچـاکە، مـن ئەوێنـدەر بەڵەدم، لەوێ کـارم کـردووە، لە مەزرای کـابرایەکی تاتـاری دەوڵەمەنـد بە نـاوی یـوزان گوبایـدولین، کـارم کـردووە. ئەم پیـاوە، هەرچەنـدە تەمەنـی هەبوو،بەڵام کابرایەکی بەمل بوو، دەم وچاو سوور، سێ ژنـی هەبـوو، بەڵام ئەلهەقـی بـاش پێیـان ڕادەگەیـی. ژنە هەرە بچووکەکەی، ژنێکی تاتاری خشکۆک بوو، ئەمە دەستی لە گەڵ مندا تێکەل کردبوو، زۆرم لەگەڵیا ڕابوارد.

ئیـدی هەمیشـە ئەو قسـەیەی دووبـارە دەکـردەوە، خـۆی لێکردبـووین بە دون جـوان، لە هەر شـوێنێک ژنێکـی دیتبـوو، پەیوەندی لەگەڵیـا بەستبوو و لەگەڵیـا ڕاییواردبـوو، ئیدی ئەو شتانەی بەکاوەخۆ، بێ هیچ شەرمێک، بە ئاو وتاو دەگێڕایەوە. قەت کەسـێکی لـێ پەیـدا نەبووبـوو، تەریقـی کـردبێتەوە، یـان چاوێکی لـێ سـوور کـردبێتەوە. دوای یەک خـولەک لە کلکەی کەشـتیەکەوە هـاواری دەکـرد: - ئەهـای خەڵکینە کـێ دەیەوێ وەرەقبـازی لەگەڵ یـاکوف دا بکـات؟ هەر یـارییەک کە ئێـوە دەتانەوێ! بە ڕاستی قومارکارێکی باشـە. دەشـێت، بە بێ هیچ

هەوڵ ورەنجێک بەقومار دەوڵەمەند ببێت. ئاخر ئەمەش بۆخۆی کار وبازرگانییە، چ فەرقێکی هەیە.
ئەوەی مایەی سەرنجی من بوو زۆر بە دەگمەن وشەێن " باش " یان " خراپ " یان " شەڕانی " بەکار دەبرد، بەردەوام شتەکانی بە " جوان " یان " خۆش " یا " سەیر " وەسف دەکرد. ژنی جوان لەلای ئەو (شتێکی چکۆلەی جوان) بوو، ڕۆژی هەتاو وساف لەلای ئەو "ڕۆژێکی خۆش بوو" ، دەستەواژەی دڵخوازی ئەو: " لەپێی کە " بوو.
هەمووان بە تەمەڵ و تەوەزەلیان دەزانی، بەڵام بەڕای من ئەو بۆچوونە، دادپەروەرانە نەبوو. من دەمبینی زۆر بەجدی لەو توونە گەرمەی کەشتیەکەدا، کاری دەکرد و وەکو هەریەکێک لە توونچیەکانی دی کاری دەکرد. قەت گویم لێی نەبووبوو وەکو توونچییەکانی دی گلەیی بکات. خوتە وبۆڵە بکات، کارەکە قورسە، زۆر ماندووە..
شەوێک کیسەی پارەی پیرەژنێکی نەفەری کەشتیەکە دەدزێ، شەوێکی ساماڵ و ئارام بوو، هەموو خەڵکەکە ئاسوودە بوون. لەو شەوە خۆشانەشدا هەندێجار بویەرێن ناخۆش ڕوودەدەن و جەوەکە لە خەڵکی تێکدەدەن. بە هەرحاڵ کابرای کاپتن پێنج ڕۆبلی دا بە پیرەژن و خەڵکەکەش برە پارەیەکی دیکەیان بۆ خڕ کردەوە، کە پارەکەیان دا بە پیرەژن، پیرەژن نیشانەی خاچی کێشا و کڕنۆشی بۆ ڕێبوارەکان برد وگوتی:
- بەڕێزینە، ئەو پارەیەی بە منتان داوە، زۆر زۆرە، سێ ڕۆبڵ و دە کوپیکی لە پارە دزراوەکەی خۆم زیاترە.
یەکێک بە دەنگێکی خۆش هاواریکرد:
- نەنەگیان، هەڵیگرە، سێ ڕۆبڵ هیچ نییە، خەمت نەبێ خوا ناردوویەتی!

یەکێکی دی گوتی:

- پارە وەکو میوان نییە زیادە بێ، پارەی زیاد سەر ناشکێنێ، پارە هەموو کاتێ هەر خۆشەویستە.

بەڵام یاکوف، زۆر بە جدی چوو بەلای پیرەژنەوە. داوای لێکرد:

- پارە زیادەکەم بدەیە قوماری پێدەکەم.

ئامادەبووان دەستیان بە پێکەنین کرد، وایانزانی یاکوف شۆخی دەکات، کەچی زۆر بەجدی دووبارەی کردەوە: - دەی داپیرە. کوا ئەو پارەیە بدە بەمن. تۆ پارەت بۆ چییە؟ ئەمڕۆ و سبەیە دەمریت وشەڕت لە کۆڵ ئەم دنیایە دەکەیەوە..

ئامادەبووان بە ڕوویا هەڵشاخین. لەو ناوە دەریان کرد. بە سەرسامی، بەدەم سەرلەقاندنەوە بەمنی گوت:

- توخوا ئەمانە قەشمەڕ نین؟ زۆر سەیرە ها! ئاخر ئێوە هەقتان چییە بەسەرەوە، بۆ خۆتان لە کاروباری خەڵکی هەڵدەقورتێنن؟ پیرەژن بە خۆی دەڵێت سێ ڕۆبڵ زیادەی وەرگرتووە، سێ ڕۆبڵ بۆ من زۆرە، بۆ نایەڵن سوودێکی لێ ببینم..

لەوە دەچوو زۆری حەز لە پارەبێ، هەر بەدیتنی پارە خۆشحاڵ ببێت. بە دەم قسەوە، پارچە دراوێکی لە پانتۆڵەکەی هەڵدەسوو و پاشان بەرزی دەکردەوە بۆ ئاستی کەپووە پسەکەی و ورد ورد تەمەشای دەکرد تابزانێ سیقال بووەتەوە یان نا، ئەوجا برۆکانی وێک دێنایەوەو دراوەکەی لە چاوی دوور دەخستەوە ونزیک دەکردەوە. بەڵام وێڕای هەموو ئەو قسەو قسەڵۆکانەی بە دوایەوە بوو، کابرایەکی چاوچنۆک و پیسکە نەبوو. ڕۆژێک پێی گوتم با قومار بکەین، ئێ من قومارم نەدەزانی، بە سەرسامی گوتی:

- ئای لەوە، قومار نازانی! چۆن دەبێ؟ خوێنەوار و قومار نەزانی! وەرە فێرت دەکەم. هەروا، بۆ سەرگەرمی گەمە دەکەین، لە سەر کڵۆ قەند یاری دەکەین..

بەو جۆرە نزیکەی نیو هۆقە قەندی لێبردمەوە، کڵۆ قەندەکانی یەک لە دووی یەک هاوێشتە دەمییەوە و هەرهەمووی خوارد. کە زانی فێری یاریەکە بووم گوتی:

- ئێستا بەڕاستی یاری دەکەین، لەسەر پارە دەیکەین. پارەت هەیە؟

- پێنج ڕۆبلم هەن.

- زۆر چاکە، مندوو ڕۆبڵ و شتێکم هەیە.

هەڵبەتە هەرچیم پێبوو لێی بردمەوە. کە ویستم قەرەبووی دۆڕانەکەم بکەمەوە و بیمەوە مایە، پالتۆ تەنکەکەم بە پێنج ڕۆبلان خستە بارمتەوە، ئەویشم دۆڕاند، پێڵاوە تازەکانم بە سێ ڕۆبڵان خستە بارمتەوە، ئەویشم دۆڕاند. هەنگێ یاکوف بە نیمچە تووڕەبوونێکەوە گوتی:

- تۆ قومارچی نیت.. زۆر هەڵدەچیت، پالتۆ و پێڵاوەکانت هەڵگرەوە، من نامەوێن. پارەکەشت هەڵگرەوە، تەنیا چوار ڕۆبلی هەڵبگرەوە. ڕۆبلی پێنجەم بۆمنە، لەبریکرێی ئەو دەرسەی کە پێمدایت، ئەگەر بەخۆت ڕازی بی و پێت ناخۆش نەبێت.

بەدل سوپاسم کرد. ئەو گوتی: - لەپێی کە، هەر گوێشی مەدەیە. قوماریش جۆرە سەرگەرمییەکە، تەنیا کات بەسەر بردنە، پیاو دەبێ جارجارێک پێبکەنێ، بەلام تۆ زۆر بەهەندی دەگری، وادەزانی شەڕە. تەنانەت لە شەڕیشدا پێویست بە هەڵچوون ناکات. هەمیشە خوێنسارد بە، چ پێویست بە هەڵچوون دەکات؟ تۆ هێشتا منداڵی، دەبێ متمانەت بەخۆت بێ. جارێ، پێنج جار، حەوت جار بدۆڕی، هەر گوێشی مەدەیە..

لەپێی کە! کەمێک دوور بکەوە، پاشان کە وەخۆ هاتیەوە، سەر لە نوێ تێ هەڵبچۆوە. ئەمە تەکنیکی یاریە، دەبێ بەو ئاوایە یاری بکەیت!

هەر خۆشم دەویست.. هەندێجار کە قسەی دەکرد، نەنکمی وەبیر دێنامەوە. هەندێک خەسڵەتی تیابوو بە ڕاستی ڕایدەکێشام بەڵام جۆرە خەمساردی و بێ موبالاتیەکی بەرانبەر بەخەڵکی تیابوو، هیچ بەدڵم نەبوو..

ڕۆژێک، دەمەو خۆرئاوا، بازرگانێکی قەڵەوی خەڵکی شاری پرم، کە لە قاتی دووەمی کەشتیەکە بوو، کە ئەوشەوە سیامەست بوو، لە سەر کەشتیەکەوە کەوتە ئاوەکەوە. ئیدی دوا بە دوای کەشتیەکە کەوتە پەلەقاژەو پەلهاوێشتن، هەردوو باسکی بەرز دەکردنەوە، یەکسەر ئامێرەکان کوژێنرانەوە و کەشتیەکە لە جێی خۆی وەستا، پانکەکانی کەشتیەکە دەخولانەوە و پێل و شەپۆلانی بۆ ئاسمان هەڵدەداو لەبەر زەردەپەڕی خۆر لە زەردەی خۆرئاوا سوور دەچوونەوە. جەستەیەکی ڕەش، بەدەم پەلەقاژە و پەل کوتانەوە، بەجۆرێ هاواریدەکرد، مووی لەشم ڕەپ بوو. نەفەرەکانیش هاواریان دەکرد، بە پاڵەپەستۆ لە کلکەی کەشتیەکە خڕ دەبوونەوە. هاوڕێیەکی کابرای نقووم بوو، کە سورفلێکی سەرساف بوو و، ئەویش سەرخۆشبوو، بە دەم بۆلەبۆڵەوەو، بە ئانیشکان دڕی بە ئاپۆرای خەڵکەکە دەدا:

- لاکەون، لاکەون! با فریای بکەوم!

لەوکاتەدا دوو دەریاوان خۆیان هەڵدابووە ئاوەکەوە و بە باسکە مەلە بەرەو کابرای نقوم بوو دەچوون. بەلەمێکی فریاکەوتن خرایە ڕووبارەکەوە. دەنگی بەرز و هێدی یاکوف، لە سەرووی دەنگی دەریاوانەکان و قیژە وهاواری ژنانەوە دەهاتەگوێ.

- دەخنکێ، بێگومان نقوم دەبێ، چونکە پاڵتۆ و جلی درێژ و شۆڕی لە بەردایە. ئەمە گەنگەشە هەڵناگرێت، بۆ نموونە ژنان.. بۆچی هەمیشە لە پێش پیاوانوە نقوم دەبن؟ بەهۆی تەنوورە درێژەکانیانەوەیە. ژن کە دەکەوێتە ئاوەوە، یەکسەر وەکو بەردێکی قورس ژێر ئاوەکە دەکەوێت. تەمەشاکەن، یارۆ ژێر ئاوەکە کەوت و تەواو. پێم نەگوتن؟

کابرا بەڕاستی نقوم بوو. دوو دانە سەعات، بێهودە لە جەستەکەی گەڕان. برادەرەکەی کە تازە وەخۆ هاتبووەوەو مەستیەکە بەریدابوو بە نائومێدی و دۆشداماوی لە کلکەی کەشتیەکە دانیشتبوو وبە ئەسپایی و لە بەرخۆوە دەیگوت:

- تۆ بزانە تووشی چ قەدەرێک بوو، ئێستا من چ بکەم، چی بە کەسوکارەکەی بڵێم؟ خزم وخوێشی هەیە..

یاکوف، لە بەردەمیا وەستاوە، دەستەکانی خستوونەتە پشتی، بە ڕاوێژێکی هێمن دڵخۆشی دەداتەوە:

- گوێ مەدەیە جەنابی بازرگان! دژمنایەتی قەدەر ناکرێ، کەس نازانێ بە چی دەمرێت. هی وا هەیە، یەک پاروو کارگ دەخوات، ژەهراوی دەبێ و دەمرێت و لێدەبێتەوە. ئەم یەکە با دەکات و دەمرێت! لە کاتێکا هەزاران کەس کارگ دەخۆن، پێیان دەکەوێ و پێی قەڵەو دەبن، کەچی تەنیا ئەو یەکە پێی دەمرێت. ئاخر کارگ هی ئەوەیە پێی بمریت؟!

یاکوف، وەکو دیوار لە بەردەم کابرای بازرگاندا وەستابوو، هەژدە هەژدە قسەی دەکرد و ڕێی قسەکردنی بە کەس نەدەدا. کابرای بازرگان لە هەوەڵەوە، بەدەم گوێگرتنەوە لە یاکوف، بە ئەسپایی دەگریا، پاشان بە ناو لەپە پانەکەی فرمێسکەکانی سڕی و لە هۆڕژنی گریانی دا:

- ئەریَ تۆ بۆ دەستبەردارم نابی هەی شەیتانی نەحلەتی؟ هۆ خەڵکینە وەرن ئەم ملۆزمەم لە کۆڵ بکەنەوە، دەنا هەرچییەک رووبدات من بەرپرسیار نیم!

یاکوف، بەهێواشی لاکەوت وگوتی:

- بەراستی ئەو خەڵکە سەیرن، چاکەیان لەگەڵ دەکەیت، جنێوت پێدەدەن.

هەندێجار وام بە خەیاڵدا دەهات ئەم توونچیە (یاکوف) کابرایەکی ساویلکەیە، بەڵام زۆرجاریش وام هەست دەکرد بە ئانقەست خۆی لە گێلی دەدا. حەزم دەکرد باسی ئەو شوێنانەم بۆبکات کە چووبووێ، باسی ئەو شتانەم بۆبکات کە دیتبوونی، بەڵام قەت بەدڵی منی نەدەکرد. سەری بەپشتا دەبرد، چاوە رەشە زیتەکانی بە ئاستەم دەنوقاندن، دەستێکی بەسەروچاوە تووکنەکەیدا دێنا و دەکەوتە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی:

- خەڵکی لە هەموو شوێنێک هەن، براله، وەکو مێرولەن! خەڵکانێک لێرە، خەڵکانێک لەویّ.. بە مێگەل هەن. هەڵبەتە جووتیاران زۆربەی هەرە زۆریان پێکدەهێنن، ئەمانە لە هەموو شوێنێک ئەوەندە زۆرن وەکو گەلای خەزانن. بولگار؟ بە دڵنیاییەوە بولگارم دیوە، یونانیش، هەروەها سربیان و رۆمانییان و، قەرەجی جۆراوجۆرم دیتوون.. هەموو رەگەزێکم دیتوون! لەچی دەچن؟ لەچی بچن؟ لە شاراندا خەڵکی شارن، لە گوندەوارانداا گوندین. خەڵکی هەموو وەکو یەکن، بەڵکو هەندێکیان وەکو مە قسان دەکەن، نەک وەکو ئێمە بەرەوانی بەڵکو بەزمانێکی سەروگویّ شکاو، بۆ نموونە وەکو تاتارییەکان یان موردوفییەکان. یونانییەکان ناتوانن وەکو مە قسان بکەن.. ئەوانە هەرچییەکیان بە بیر وخەیاڵدا بێت دەیڵێن،

ئەو دەنگـانەی لە زاریـانەوە دەردێـت لە وشــە دەچـن، بەڵام بێـئەوەی لە مانـاکەی حـاڵی ببیـت. بـۆیە دەبێـت بە ئامـاژەی دەسـت بیانـدوێنیت. ئەو پیرەمێردەشـی کە لە گەڵما بـوو، وای دەنوانـد گـوایە یونـانی دەزانیـت و لە یونانییەکـان تێدەگات – ئیدی پەیتا پەیتا وشە و پەیڤی سـەیری بەکار دەبرد: کالامـارا، کالامـارو! بەڕاسـتی بەڵا بـوو، زۆر زیـرەک بـوو، لێهـاتووانە دەیخاپانـدن. ئەمە چییـە؟ دیسـان دەڵێـی لە چـی دەچـن؟ تـۆ منــداڵێکی ســادەی، دەبــێ لە چ بچـن؟ بێگومــان گەنمــڕەنگن، هەروەها ڕۆمانییەکانیش گەنمڕەنگن.. هەموویان یەک ئیمانیان هەیە. بولغارەکـانیش گەنمــڕەنگن، کەچــی وەکـو ئـێمە نــوێژ دەکەن. بەڵام یونان.. وەکو تورکانن..

هەستم کرد هەموو شـتێکی بۆ نەگێڕامەوە، شـتێک هەیە و لێمـی دەشـارێتەوە. لە ڕێـگەی وێـنەێن نـاو گۆڤـارانەوە زانـیم ئەسینا پایتەختی یونانە، شارێکی دێرین وجوانە. بەڵام یـاکوف، بە گومانەوە سەری لەقاند و نکۆڵی لە بوونی ئەسینا کرد.

– درۆیـان لەگەڵ کردوویـت بـرا. چ ئەسـینایەک لە گـۆڕێ نیـیە. تەنیـا ئـاتون هەیە، ئەویـش شـار نیـیە، بەڵکـو چیـایەکە دێرێکــی گەورەی بە ســەری ســەرەوەیە. هەر ئەوەیە وتەواو، چیایەکەش نێوی چیای ئاتونی پیرۆزە. وێنەشـی هەیە، کـابرای پیرەمێـرد فرۆشـتنی. شـارێکی دی هەیە بە نێـوی بلگـرود، ئەم شـارە لە سـەر ڕوبـاری دانـوبە، لە یاروسـلاڤل، یـان نیژنــی نوڤگورود دەچێ. شارەکانیان هیچ نییە، شایەنی باسکردن نین، بەڵام گونـدەوارەکانیان.. شـتێکی تەواو جیـاوازترن! هەروەهـا ژنەکانیـانیش.. زۆر لەوە شـۆخ وشــەنگترن کە وشــە بتـوانێ وەسـفیان بکـات. زۆری نەمـا بە هـۆی ژنـێکەوە لەوێنــدەر بمێنمەوە، ناوی چی بوو، خوایە؟

به هەشـــتاو به هەردوو ناولەپـــان کەوتە خورانـــدنی دەم وچاوی و ڕدێنەکەی بە ئەسپایی کەوتە قرچە قرچ، بەڵام لە قـــوڵایی ئەوکیـــیەوە، قاقـــایەک بەرز بـــووەوە کە زیـــاتر لە لەرینەوەی زەنگێکی شکاو دەچوو:

- پیاو چەند زوو شتی بیر دەچێت! ئێمە، من وئەو پێکەوە بووین.. کە ماڵاواییم لێکرد گریا، منیش گریام، ئیدی باوەڕ دەکەی یان نا کەیفی خۆتە..

ئیدی زۆر بە گۆساخی کەوتە ئامۆژگاری کردنم کە چۆن دەبێ لەگەڵ ژناندا ڕەفتار بکەم.

بە دوو قـۆڵی دەڕۆیـین بـۆ کلـکەی کەشـتیەکە، لەوێنـدەر دادەنیشین. شـەوێکی فێنـک وخۆشـە، دنیـا سـایەقە و سـامالە، مانگ بە حەوێقی ئاسمانەوەیە. لە تۆ وایە دێتە پێشوازی مە. کێڵگە ومەزراکانی دەستەچەپمان، لەودیو ئاوە زیوینەکەوە، بە زەحـمەت دەبینـرێن، گردۆلکەکـانی دەسـتە ڕاسـتمان، لە بەر ڕۆشـــناییەکی زەردبـاوی لەرزۆکـا، وەکـو سـتێرانی دیـل، سـەرەتاتکێیانە.. هەمـوو شـتێک لە جـووڵەیەکی بەردەوامـدایە، ژیـانێکی ئـارامی لـێ هەڵدەقوڵێت. یـاکوف بە ئـارەزووی خـۆی دەڕێســـێت: - هەنـــدێجار باســـکە ڕووت و قووتەکـــانی بـــۆ دەگرتمەوە..

چیرۆکەکەی یاکوف هەرچەندە بێپەردە بوو، بەڵام بێزاری نەدەکردیت، نە خۆڕانان، نە توندی و نە هیچ فانتازیایەکی تیا نەبوو. بەڵام جۆرە نوستالیژایەکی تیابوو. ڕووتی مانگەکە بە حەوێقی ئاسمانەوە، بە قەد قسەکانی یـاکوف، دڵـی دەگوشـیم. نـازانم بـۆچی حەزدەکەم یـادی شـادترین بەشـێن ژیـانی پـڕ لەخەمی خۆم بکەمەوە. شاژنە مارگۆ و ئەو شیعرە جوانەی کە ئەو ئەفسەرە بە ئاوازەوە دەیگوت، وەیاد دێنمەوە:

*گۆرانی پێویستی بە جوانییە*

*جوانی پێویستی بە گۆرانی نییە...*

خەمینی بەری دام، دووبارە کەوتمە هاندانی یاکوف کە باسی سەربهورد و سەفەرەکانی خۆیم بۆبکات! گوتی:

- تۆ کابرایەکی سەیری. چیت بۆ بگێڕمەوە، باسی چیت بۆبکەم؟ من هەموو شتێکم دیتووە. ئەگەر لێم بپرسیت دێرت دیوە؟ بەڵێ. مەیخانە؟ هەڵبەتە. من ژیانی دەوڵەمەندان، خانەدانان، جووتیاران، بێنەوایانم دیتووە. هەندێجار بەکەیفی دڵی خۆم ژیاوم، بێ دڵی خۆم نەکردووە، لە هیچم کەم نەبووە، هەندێجار لەزگ بووە لە برسا بمرم.. گەرمی و ساردی ڕۆژگارم چەشتووە. هەموو هەوراز ونشێوێکم دیتووە. هەزار قوڕ و چلپاوم پێدا هەڵپژاوە.

زۆر بە وردی، وەکو ئەوەی بەسەر پردێکی لەرزۆکی سەر ڕوخانەیەکی قووڵ و خرۆشاودا بپەڕێتەوە، بەو ئاوایە ڕابردووی خۆی وەبیر دێنایەوە:

- بۆ نموونە با ئەم بەسەرهاتەت بۆ بگێڕمەوە : لە زندانام، لە سەر ئەسپێکی مردەڵە لە زندان توونـد کراوم. لە دڵی خۆدا دەمگوت: تازە تەواو، ئەمجارە ڕەهەنەی سیبریام دەکەن! بەڵام تۆ سەیری ئەو ڕێکەوتە، ئەفسەری پۆلیسخانەکە، دادوبێدادی بوو لەوەی کە دووکەڵکێشی موغەیرییەکەیماڵەوەیان خراپە و بە باشی کار ناکات. من یەکسەر هەڵمدایە: " قوربان، من دەتوانم بۆتی چاک بکەمەوە. " بەڵام بە ڕووما هەڵشاخی و هاواریکرد: " دەمت داخە، باشترین سۆپاسازی شارەکە، نەیتوانی چاکی بکاتەوە. " بەڵام من کۆڵم نەدا، مردن مردنە لەقەفرتێی بۆچییە! من حیسابی سیبریام بۆخۆم کردبوو. بۆیە گوتم: " ببورە قوربان، هەندێجار خەلکێکی ڕووتەی وەکو من لە وەستاباشییەک زیاتر ئەقڵی بەکارێکدا دەشکێ. " یارۆی

ئەفسەر گوتی: " چاکە، بڕۆ تەمەشای بکە، ئەگەر چاکت نەکردەوە هەڵت دەواسم. "بە هەرحاڵ لە زەرفی دوو ڕۆژدا هەموو سۆپا و موغەیرییەکانم بۆ چاک کردەوە، وەکو سەعاتی میقاتکراو کاریان دەکرد، کابرای ئەفسەر لەخۆشیان لە پێستی خۆی نەدەهێوری. دووبارە پێما هەڵشاخی: " هەی کەرپیاو، کەودەن، تۆ کە ئەم سەنعەتە باشە دەزانیت و لە وەستا وەستاتری چیت داوە لە ئەسپ دزی! " گوتم قوربان قسەکەی تۆیە، لە کەرێتیمە.. تەنیا کەرێتی ئەم کارەی پێکردووم! گوتی: " ڕاست دەکەی، تەنیا کەرێتییە! سەد حەیف و مخابن، دڵم بەحاڵت دەسووتێ. " ئاوای پێگوتم، گوێت لێیە؟ ئەفسەرێکی پۆلیس کە وەزیفەکەی ڕێگەی نادات، بە هیچ جۆرێ نەرمی بنوێنێ، بەزەیی بە حاڵما دێتەوە..

قسەکەم بە یاکوف بڕی وپرسیم:- ئێ یارۆی ئەفسەر پاشان چی کرد؟

- هیچ، تەنیا دڵی بە حاڵم سووتا. دەتەوێ چی بکات؟

- تۆ چ پێویستت بە دڵسووتان هەیە؟ تۆ بەرانبەر بە هەموو کەسێک وەکو تاوێری ڕەق وایت!

یاکوف، بە ڕووخۆشییەوە پێکەنی وگوتی:- تۆش سەیری! دەڵێی تاوێری ڕەق؟ تاوێریش پێویستی بە بەزەییە. تاوێریش ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێ مشووری بخوات وئەنجامی بدات. کاتی خۆی ڕێگاوبانیان بە بەرد و تاوێران فەرش دەکرد. هەموو شتێک پێویستی بەبەزەیی هەیە. هەموو شتێک فایدەی خۆی هەیە. بۆ نموونە لم وەربگرە. ئاخر لم چییە؟ کەچی گیای لە سەر دەڕوێ..

وەختایەک یاکوف، ئەو قسانەی دەکرد، هەستم دەکرد وێنا وتەسەوری ئەو بۆ دنیا، زۆر لە سەرووی فام و ئیدراکی منەوەیە. دیسان لێم پرسی:- ڕات لە هەنبەر ئاشپەزەکە چییە؟

یاکوف، بە خەمساردییەوە گوتی:- کێ؟ ورچە چکۆل؟ دەبێ چ ڕایەکم هەبێ؟ هی ئەوە نییە هیچ ڕایەکت دەربارەی هەبێ.

هەق بە یاکوف بوو. ئیڤان ئڤانوفیچ، هێندە وشک و ڕژد و ئاڵچاخ بوو، شایستەی ئەوە نەبوو هەر بیریشی لێبکەیتەوە. تاقە یەک شتی تیابوو کە مایەی سەرنج بوو، ئەویش ئەوەبوو کە زۆر ڕقی لە یاکوفی توونچی بوو، بەردەوام پێیا هەڵدەشاخی. جنێوی دەدایێ، ئیرادی لێدەگرت، کەچی هەمیشە دەعوەتی چای دەکرد. جارێکیان گوێم لێبوو بە یاکوفی دەگوت:

– ئەگەر سەردەمی کۆیلایەتی ‌وئاغایەتی مابا من ئاغای تۆ بام، هەفتەی حەوت جار پێستم دەگرویت، هەی تەمەڵی تەوەزەل!

یاکوف، بە کاوەخۆ وەڵامی دایەوەو گوتی: – هەفتەی حەوت کەڕەت، زۆر زیادە!

وێڕای ئەوەی بە بەردەوامی ئیرادی لە یاکوف دەگرت، سەرکۆنەی دەکرد، جنێوی دەدایێ، بەڵام شتێکی دەدایێ کە بیخوات و دەیگوت: – وەرە زڵفنچی بکە خوارۆخ (زۆرخۆر)!

یاکوف، هێدی هێدی بە دەم جوونی خواردنەکەوە دەیگوت:

– من، لە سایەی تۆدا، ئەم هێز وقوەتەم هەیە ئیڤان ئیڤانوفیچ! تۆ نەبی لە برسا دەمرم.

– ئەم هێزە بەکاری چیت دێ هەی تەمەڵباشی؟

- بەکاری چی دێ؟ ئەمە چۆن پرسیارێکە! بۆ ئەوەی زیاتر بژیم، هێشتا زۆرم بەبەرەوە ماوە.

- ژیان، بە کەڵکی چیت دێت، پیرە دێو؟

- دێوانیش حەزیان بەژیانە. یان تۆ گاڵتەت بەژیان دێت؟ ژیان خۆشە ئیڤان ئیڤانوفیچ!

- کە کەودەنی!

- چیت گوت؟

- کەو.. دە.. ن.

یاکوف، بە سەرسامی دەڵێت : - وشەیەکی سەیرە! تۆخوا ئەوەش بوو بە قسە؟

ورچە چکۆل، ڕوودەکاتە من و دەڵێت:

- ئێمەمانـان، لەبەر ئەم ئـاگردانەدا، ئـارەقە دەڕێـژین و خەریکە دەتوێینەوە، کەچی ئەو (یاکوف) دانیشتووەو وەکو بەراز هەر دەلەوەڕێت!

یاکوف، بە دەم جوونی خواردنەکەوە دەڵێت:

- هەرکەسە خۆی و قیسمەتی.. هەرکەسە بە جۆرێ دەژی.

من دەمزانی، سەرپەرشتی وداگیرساندنی توون وئاگردانی کەشـتیەکە، زۆر گەرمتـرو نـارەحەتتر بـوو لە وەسـتانی بەردەمئاگردان و کوورەی مووبەقەکە. چونکە یەک دوو جار هەوڵمدا شەوان یارمەتی یاکوف بدەم وکاری لەگەڵدا بکەم، نەمـدەزانی بـۆچی لە وەلامـی ئیڤـان ئیڤـانوڤیچ دا، نەیـدەوت کارەکەی ئەو زۆر لە کاری ئاشپەزەکە قورسترە. وادیاربوو ئەوەی ئەو دەیزانـی، مـن نەمـدەزانی. وێـرای ئەوەش هەمـوو خزمەتگـوزارانی کەشـتیەکە، کـاپتنەکە، میکانیسـێنەکە، دەریاوانەکان و کەشتیرانەکان، ئەوەی کەمتر پەیوەندی لەگەڵیا هەبوو، لیی بە گلەیی وگازن بوو. لە دڵی خۆدا دەمگوت ئەوە

حاڵیانه بۆ دەری ناکەن. تەنیا توونچییەکان، بەڕێزەوە تەمەشایان دەکرد، تەنیا گلەیی ئەوەیان لێی هەبوو کە گوایە چەنەبازە و زۆر ڕەموودەی قومارە. جارێک لە هاوکارەکانیم پرسی: - یاکوف ئینسانێکی باشە؟

- یاکوف؟ زۆریش باشە. زەڕەیەک عەیبی نییە، قەت تووڕە نابێ بە قەد منداڵێک سادەیە، بڕۆ ئاگر بە پشتیەوە بنێ، لێت نارەنجێت.

یاکوف، وێڕای قورسی کارەکەی و زۆرخۆریشی زۆر کەم دەنووست. هەرکە لە کارەکەی دەبووەوە، خێرا دەهاتە سەرەوەی کەشتیەکە. ئارەقە لە سەراپای دادەچۆڕا، زۆرجار هەربە جلە گریساویەکانیەوە، بێئەوەی سەروچاوی بشوات، دەهات بە درێژایی شەوەکە لە کلکەی کەشتیەکە دادەنیشت، یان قسەی بۆ ڕێبوارەکان دەگێڕایەوە یان قوماری لە گەڵدا دەکردن.

یاکوف، بۆ من وەکو سەندووقێکی داخراو وابوو. هەستم دەکرد شتێکی گرینگی تیادا شاردراوەتەوە. بۆیە بە مکوڕی لەو کلیلە دەگەڕام کە بیکاتەوە.

لە ژێر برۆکانییەوە تەمەشایەکی کردم وگوتی:

- نازانم تۆ عەوداڵی چیت براله. دەتەوێ باسی دنیات بۆ بکەم؟ ڕاستە من زۆر شوێنان گەڕاوم. بەڵام ئەوە چییە؟ تۆ کابرایەکی سەیری ها! دەیسا گوێ بگرە با بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.

ئیدی ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێرامەوە: ' لە زەمانی کۆنا. عەیامێ بەو عەیام، لە شارۆچکەیەکدا قازییەکی گەنجی سیلدار لەگەڵ ژنە ئەڵمانیەکەیدا دەژیا، ئەم ژنە، ئافرەتێکی نەزۆکی تۆکمە بوو. ئەم ژنە کەوتە داوی ئەشقی بازرگانێکەوە کە ژنێکی جوان و سێ منداڵی هەبوو. وەختایەک یارۆی بازرگان

هەستی کرد ئەم ژنە ئەڵمانییە حەزی لێکردووە، بڕیاری دا شۆخی لە گەڵدا بکات، کابرای بازرگان داوای لێکرد شەوێ بێتە ژوانی و لە باخی شاردا یەکدی بدینن، دوو برادەری خۆشی، لەو نزیکانە دانا.

ژنەی ئەڵمانی لە کات وساتی دیاریکراوا، بەجۆش و خرۆشەوە هات، بە پیاوەی گوت هەرکاتێ ئەو بیەوێ، ئەم ئامادەیە، بەسەروبەرەوە خۆی ڕادەستی بکات. لێ پیاوە گوتی: " خانم، من ئەهلی ئەو کارە نیم، چونکە من ژنم هەیە. بەڵام دوو هاوڕێی خۆمم بۆ هێناوی – یەکێکیان سەڵتە و ئەویتریان بێوەپیاوە ".ژنەکە یەک بەخۆی هاواری کرد، تا هێز لە بازوویا بوو، زللەیەکی ئەوتۆی خێواندێ کە لە.سەر ئەو تەختەی کە لە سەری دانیشتبوو، خستیە خوارەوە، ئەوجا بە شەق بەربووە دەم وقەپۆزی. خۆش ئەوە بوو من ژنەکەم بۆ باخەکە هێنابوو، بەو حیسابەی من دەرگاوانی کابرای قازی بووم، ئیدی خۆم مەڵاس دا و لە درزێکی دیوارو پەرژینەکەوە کەوتمە تەمەشاکردن و شەڕەکەم بەچاوی خۆم بینی: جووتە برادەرەکەی، لە ناو هەژگ و ژاڵەکانەوە دەرپەڕینە دەرەوەو بە دوو قۆڵی پەلاماری ژنەیان دا و بە قژ ڕایانکێشا و دووریان خستەوە. منیش لەلای خۆمەوە بەهەشتاو بە سەر دیوارەکەدا بازم دا و تێم خوڕین: " هەقی ئەم ڕەفتارەتان نییە! خانم بە نیازێکی پاکەوە بۆلای هاتبوو کەچی ئەو بەم شێوە نەنگینە لە قاوی دا ! " ژنەکەم دوورخستەوە. دوو زەلامەکە کەڕپوچێکیان کێشا بە تەپڵی سەرما.. ئازارەکەی لە کێشا نەبوو، ژنەش هەر بە ناو حەوشەکەدا دەهات ودەچوو، نەیدەزانی چ بکات. بەمنی گوت: " دەگەڕێمەوە بۆلای کەسوکارەکەم لە ئەڵمانیا، یاکوف گیان. کەی مێردەکەم مرد

دەگەڕێمەوە. " گوتم: " زۆرچاک دەکەیت. هەڵبەتە دەبێ بۆ ئەوێندەر بگەڕێیتەوە ".

ئێ، ئیدی کابرای قازی قەزا وبەلای تۆی برد، ژنەش ڕۆیی. ژنەکە ئافرەتێکی ناسک وجوان بوو، قازیش پیاوەێکی میرەبان بوو، خوا لە گوناحی خۆش بێت! "

کە لە مانای چیرۆکەکە حاڵی نەبووم، بێدەنگ بووم. هەستم دەکرد شتێکی قورس و نامەفهوومیتیایە، بەڵام هیچم پێنەبوو بیڵێم، چم بگوتبایە؟

یاکوف پرسی:- چیرۆکەکەت بە دڵ بوو؟

بە پەستییەوە مینگەمینگێکم کرد. بەڵام یاکوف بە کاوەخۆ کەوتە ڕوونکردنەوەی چیرۆکەکە:

- خەڵکانی وەکو ئەوانە، دەوڵەمەندان و زەنگین، هەندێجار مەیلی ڕابواردن و خوشگوزەرانییان لە لا دەهاڕووژێ، بەڵام هەموو کاتێ لەو کارەدا سەرکەوتوو نابن.. چونکە نازانن چۆن ئەوکارە بکەن. ئەمەش ئاسایییە، چونکە ئەزموونیان نییە، سەرقاڵی کارن، بزنس لە هەموو دینێکیان دەکات. بزنس بیرکردنەوەی بەردەوامی دەوێت، بیرکردنەوەی زۆریش بەشەر بێزار دەکات، بۆیە دەیەوێ جارجارێ بای باڵێکی خۆی بدات و کەمێک خۆی سەرگەرم بکات.

ڕووبارەکە لە دوای کەشتیەکەوە شەقێکی تێکەوت، کەفاوی وخرۆشاو، دەمانتوانی هاڕەوهاژەی ئاوەکە بژنەوین وکەناری ڕەشی ڕووبارەکە بدینین کە بەکاوەخۆ لێمان دوور دەکەوتەوە. پرخ وهۆڕی ڕێبوارەکان لە سەر کەشتیەکە بەرز دەبووەوە، ژنێکی باریک و بنێس، ڕەش پۆش، پۆر سپی، بەکاوەخۆ بەبەینی تەختەخەو ونەفەرە نووستووەکاندا، بەرەولای مە دەهات. یاکوف ئانیشکێکی تێوە ژەندم و لەبن لێوانەوە گوتی:

- تەمەشای بکە، تازیەبارە.

وام هەستکرد لەزەتێکی تایبەتی لە دیتنی تازیەباری و خەمباری خەڵکی دەبینێت.

ئیدی زۆجار چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە و بە تاسەمەندییەوە گوێم بۆ ڕادەدێرا. هەموو بەسەرهات وچیرۆکەکانیم لە یاد ماوە بەڵام لە کۆی ئەو هەموو سەربهوردە، تاقە یەک بەسەرهاتی شادی تیا نەبوو. بە شێوازێکی کراوەتر و فامکری تر لە کتێبان قسەی دەکرد. چونکە من زۆرجار لە کتێباندا، هەست وسۆزی نووسەری کتێبەکەم بەدی دەکرد- تووڕەبوونی، شاد بوونی، خەمینی، تەوس و توانجی. بەڵام یاکوف، نە پێدەکەنی، نە ئیرادی دەگرت. وەکو شایەدێکی بێلایەن لە دادگا قسەی دەکرد، من لەم بێ موبالاتی و بێ لایەنیەی ئەو نارەحەت و پەست دەبووم ورقم لێی هەڵدەستا.

لەوە دەچوو ژیان لە بەردەمیا وەکو ئاگری ژێر کوورەی کەشتیەکە سەما بکات و ئەویش بە خۆ وکوتەکێکی دارینەوە وەستابوو و بەکاوەخۆ دەیکێشا بەو جەرەدا کە سووتەمەنی ئاگرەکەی زیاد و کەم دەکرد. بە دەم تەمەشاکردنەوە لێم پرسی:

- باشە قەت ڕێکەوتووە کەسێک بێڕێزیت پێبکات؟

بەرسڤی دایەوە:

- کێ دەتوانی بێ ڕێزیم پێبکات؟ من کابرایەکی بە هێزم و هیچ کەسێک پێم ناوێرێت!..

- لە ڕووی بەدەنیەوە نالێم. لە ڕووی دەروونییەوە دەڵێم. قەت ڕۆحیان بریندار نەکردوویت؟

گوتی: - ڕوح بریندار ناکرێت. بویەر و پێشهاتی دەرەکی کار لە ڕوح و دەروون ناکات. کەس دەستی ناگاتە ڕوح و دەروون.

ڕێبوارەکـان، دەریاوانەکـان، هەمـوو کارمەنـدانی سـەر کەشـتیەکە زۆر باسـی ڕوح و دەروون دەکەن، چـۆن باسـی زەوی، یان کارەکانی خۆیان، یان نان و ژن دەکەن، بەو ئاوایە باسـی ڕوحـش دەکەن. ئیـدی ڕوح ودەروون، وشـەیەکی زۆرباوە لە قاموسـی ڕەمەکی مەردمدا، بەقەد دراوێکی پێنج کوپیکی باوە. کە گوێم لەو خەڵکانە دەبوو، زۆر بازاڕیانە ئەو وشـەیەیان بەکـار دەبـرد، لە کانگـای دڵمەوە هەسـتم بە ئـازار دەکرد.

من زۆر چاک لە بیرمە کە نەنکم بە چ شکۆیەکەوە باسی ڕوح، ئەم مەکـۆی ڕازئـامێزەی ڤیـان، هیـواو ئومێـد، جـوانی وژیـانی، دەکـرد. قەنـاعەتی تەواوم بەوە هەبـوو کە وەختـایەک ،مـرۆڤ دەمرێـت، فریشـتەێن سـپی ڕوحـی هەڵـدەگرن، بـۆ حەوێقی ئاسمانی شین، بۆلای خواوەندە میهرەبانەکەی نەنکمی دەبەن، کە ئەویش زۆر بە میهرەبـانی پێشـوازی دەکـات. ئیدی بە قسەی نەنکم لەوێندەر، خـوا بەدەم پێشـوازی کردنیەوە پێی دەڵێت:

- ئێ! گیانەکەم، پاکیزەکەم، تۆ لەوێ، لەسەر زەوی، ئازاری زۆرت چەشت، کاتێکی پڕ سوێت بەسەربرد؟

ئیـدی خـوا، بـاڵی پێدەبەخشـیت، بـاڵی سـپی، وەکـو بـاڵی فریشـتان. یـاکوفیش، وەکـو نەنکـم زۆر بە وردی و بەپـارێز و بەڕێـز و حـورمەتەوە باسـی ڕوح دەکـات. قەت لە جنێوەکانیـا، نەعلەتـی لە ڕوح نەدەکـرد، ئەگەر گـوێی لە خەڵکـی دی بـوایە باسـی ڕوح بـکەن، سـەری لە بەرخـۆ دەنـا، مـلە ئەسـتوور و سـوورەکەی شـۆڕ دەکردەوەو هیچی نەدەگـوت. کە پرسـیاری جەوهەر و مـاهیەتی ڕوحـم لێبکردبـا دەیگـوت: - ڕوح ڕوحە، هەناسەی خوایە..

من بەو وەڵامە رازی نەدەبووم، کە زیاتر پێداگریم لێدەکرد، ئەو سەری لە بەرخۆ دەنا و دەیگوت:

- کوڕی باش تەنانەت زانایان و غەیبزانانیش شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ڕوح نازانن. ڕوح جۆرە ڕازێکە، ئەقڵی ئێمەمانان پەی پێ نابات..

بە بەردەوامی بیرم لە یاکوف دەکردەوە. بووبوو بە خولیای شەو ورۆژم، نەمدەتوانی بیری لێنەکەمەوە، حەزم دەکرد پەی بە بیر و بۆچوونەکانی بەرم . بەڵام بێهودە، پەیم پێ نەدەبرد، کەلەشە زەلامەکەی هەموو شتێکی لێدەشاردمەوە.

ژنی بەڕێوەبەری بوفیەکە، بایەخێکی تایبەتی بە من دەدا، بایەخێکی گوماناوی. بەیانیان ئاوم بۆی دەبرد تا دەموچاوی بشوات، کە ئەمە کاری لوشا بوو نەک من، لوشا کچۆڵەیەکی پاک و خاوێن و شاد و ڕوخۆش بوو، لە خزمەتگوزارانی دەرەجە دوو بوو. کاتێ کە لە ژوورە بچووک و تەنگەکەی ژنی بەڕیوەبەری خوارنگەکەدا، بە دیاریەوە دەوەستام، تا ناوقەدی رووت بوو، کە جەستە زەرد وچرچەکەیم، کە لە بەهێی باڕنی چرمسی دەچوو، دەبینی دڵم تێک هەڵدەهات. بە دەست خۆم نەبوو، بەخەیاڵ، لەگەڵ جەستە سفت و تورت و برۆنزییەکەی شاژنە مارگودا بەراوردم دەکرد. ئەم ژنە تەواو بڵ بووە، دەڵێی چیکەنەیە، بۆ یەک سات دەمی ناوەستێت. بە تەنیا، جارێ بە پاڕانەوەوە، جارێ بە تووڕەیی قسان دەکات.

لە نیاز مەبەستی حاڵی نەدەبووم، بەڵام بە مەزەندە شتێکی لێ حاڵی دەبووم، نیازی شەریف نەبوو، بەڵام من گوێم نەدەدایە. زۆر لە بیر وبیرکردنەوەی منەوە دوور بوو..

دەنگی لوشا، وەکو ئەوەی خەون ببینم، بە تەشەرەوە لە گوێما زرنگایەوە:

- ئەلكسی، ژنی کابرای بەڕێوەبەری خوارنگەکە، بەدڵ وبەگیان کەوتووەتە داوی ئەشقی تۆوە. هەلێکە وبۆت هەڵکەوتووە، لە کیسی خۆتی مەدە، برۆ ڕابوێرە..

ئەمە هەر تەشەری لوشا نەبوو، هەر ئەو بە مەسەلەکەی نەدەزانی، بەڵکو هەموو کارمەندەکانی خوارنگەکە بە مەسەلەکەیان دەزانی و پلاریان داوێشتمێ. بۆ نموونە ئاشپەزەکە، بەناوی سوعبەتەوە پێی دەگوتم:

- ئەم ژنە، تا ئێستا زۆر لات و لەوێری بەڕێکردووە، ئێستا تەماحی کردووەتە تۆ. پشکوف، ئاگاداری خۆت بە، دوایی ژێوان دەبیتەوە..

تەنانەت " یاکوف" ش ئامۆژگارییەکی باوکانەی کردم:

- هەڵبەتە، ئەگەر دوو ساڵێک گەورەتر بوایەی، بەجۆرێکی دی قسەم دەگەڵ دەکردیت. بەڵام بۆ ئەم تەمەنە.. باشترین شت ئەوەیە پەلە نەکەی، خۆت ڕادەست نەکەی. بەڵام وێرای ئەمەش ئازادی، بە کەیفی دڵی خۆت بکە..

گوتم: - واز لەو قسانە بێنە. خەمت نەبێت..

- هەڵبەتە!..

بەڵام، قامکەکانی وەکو شانە بە قژە ئاڵۆزکاوەکەیدا کرد، هەرچەندە بە تەمابوو، ئەم جۆرە قسانە نەکاتەوە، بەڵام گوتی:

- هەڵبەتە دەبێ حاڵی ئەویش لە بەرچاو بگیرێت.. ئەویش نەهەقی نییە، لە زستانی پیریدایە، حاڵی باش نییە! بۆ نموونە سەگیش، بە سەگیەتی خۆی پێویستی بە نەوازشە.. چ جای بەشەر! ژن بە نەوازش دەژی، وەکو چۆن قارچک بەباران دەژی. ڕەنگە ئەو شەرم لەو حاڵەی خۆی بکات، بەڵام چاری چییە، چ بکات؟ بە کورتیەکەی جەستە قەحپەیە وتەواو.

چاوم لە دوورِ چاوە لێڵەکانی بڕی و پرسیم:- خەفەتی بۆ دەخۆیت؟

- من؟ خۆ دایکم نییە؟ هەندێ کەس تەنانەت خەفەت بۆ دایکیانیش ناخۆن. تۆ بەڕاستی کابرایەکی سەیریت!

نەرمە پێکەنینێکی بۆ کرد، سەدای پێکەنینەکەی لە سەدای زەنگێکی شکاو دەچوو.

هەندێجار کە سەیری دەکەم، هەستدەکەم دەکەومە بۆشاییەکی خامۆشەوە، دەکەومە بیرێکی بێ بنەوە.

- هەموو خەڵکی ژن دێنن یاکوف. باشە تۆ بۆ ژن نایەنیت؟

- چ پێویست دەکات؟ چی زۆرە ژن زۆرە.. هەرکاتێ بمەوێ ژن حازرە... پیاوی ژندار دەبێ لە ماڵەوە بە بەدیار ژنەکەیەوە دانیشێت وزەوی وزار ڕەنێوبێنێ. من نە زەوی باشم هەیە نە زەوی زۆر. زەوی وزارەکەم مامم بۆخۆی داگیریکرد. ئیدی کە برایەکەم لە خزمەتی عەسکەری زفرییەوە، لە گەڵ مامما کەوتە ململانێ.. سەری شکاند، براکەمیان دەستگیر کرد، حوکمی ساڵ و نیوێکیان داو لە زندانیان توونند کرد. دوای ئەوە تاوانباری دێرین، تەنیا یەک ڕێگەی لەبەردەما بوو، ئەو ڕێگەیەش هەمیشە بۆ زندان دەچێت. ژنەکەی شتێکی چکۆلەی جوان بوو. بەلام چ بڵێم؟ کە پیاو ژن بێنێ دەبێ دەست بە کڵاوی خۆیەوە بگرێ و لە ماڵی خۆیا دانیشێت. بەلام عەسکەر هەرگیز ناتوانێ خاوەنی ژیانی تایبەتی خۆیشی بێت.

ئاراستەی قسەکان دەگۆڕم:- باشە تۆ نوێژ دەکەیت؟

- کە کوڕێکی سەیری! هەڵبەتە دەیکەم.

- چۆن؟

- هەرچۆنێ ڕێبکەوێت.

- بۆ نموونە چ نوێژ و نزایەک دەکەی؟

- من هیچ جۆرە دوعا و نزایەک بەڵەد نیم. من تەنیا ئەمە دەڵێم : ئەی عیسا مەسیح ڕەحمم پێبکە، ڕەحم بە مردوواندا بکە، لە شەڕی شەیتان و لە بەڵای ناگەهان بمانپارێزەو.. بەو جۆرە لە گەڵ هەندێک وردە وێردانی دیکەدا.

- وەکو؟

- بە گوێرەی ئەوکاتە. هەرچیەک بڵێی خودا دەی ژنەفیٚ!

زۆر بە میهرەبانی مامەڵەی لە گەڵما دەکرد، بەو چاوەوە سەیری دەکردم وەکو ئەوەی گوجیلەیەکی دەستەمۆ بم و لە ڕێگەی هەندێک گەمانەوە سەرگەرمی بکەم. هەندێجار شەوان لە لایەوە دادەنیشتم، بۆنی گریس و نەوت و ئاگر و پیازی لێدەهات. زۆر حەزی لە پیاز بوو، وەکو ناسکە سێو، بە کاڵی دەیخوارد، لە ناکاوا قسەکەی خۆی بڕی وگوتی:- ئەلکسی کوا با چەند شیعرێک بخوێنیتەوە!

ئەوەی ڕاستی بیٚ، شیعرێکی زۆرم لەبەر بوو. ئەمە جگە لەوەی کە دەفتەرێکی ئەستوورم هەبوو، دەیان شیعری پەسەند و دڵخوازی خۆم تیایدا نووسی بووەوە. ' روسلان و لودمیلا ' م بۆ دەخوێندەوە، بەبێدەنگی، بەبیٚ جووڵە، چاوەکانی دەنووقاندن و گوێی بۆ هەڵدەخستم. پاشان بە ئارامی و لەبن لێوانەوە دەیگوت:

- کە چیرۆکێکی جوانە. هی خۆتە؟ وتت هی پوشکینە؟ من کابرایەکی خانەدان دەناسم بە نێوی موخین — پوشکین. بەڵیٚ پوشکین، من بە چاوی خۆم ئەو پوشکینەم دیتووە.

- ئەمە ئەو پوشکینەی تۆ نییە، پوشکینی شاعیرە، لە مێژە کوژراوە.

- کوژراوە؟ چما؟

من به کورتی، ئەو بەسەرهاتەم بۆی گێڕایەوە کە جارێک شاژنە مارگو بۆی باس کردبووم کە لە شەرحەکەم بوومەوە، یاکوف بە ئارامی گوتی:- زۆرکەس بە هۆی ژنانەوە تیا دەچن!

زۆرجار ئەو چیرۆکانەم بۆ دەگێڕایەوە کە لە کتێباندا خوێندبوومنەوە یان دەمخوێندنەوە. هەرهەموو ئەو چیرۆکانە لە زەینمدا تێکەڵاو بووبوون و چیرۆکێکی درێژ وجوانیان پێکدەهێنا و پڕ بوو لە هەوا وهەوەس، ڕیسک و سەرکێشی، قارەمانانی ئابڕوومەند، بەختەوەری، ململانێی و مردن، وشەێن جوان وکارو کردەوەێن کرێت و دزیو. ئیدی من زۆرجار کە روکامبول، لامول، هانیبال و دیکوکوناس، لویسی یازدەیەم، و باباگوریوم دەگێڕایەوە، بە ئارەزووی خۆم و بەگوێرەی سەلیقەی خۆم دەستکاریم دەکرد و دنیایەکم بەگوێرەی مەیلی خۆم دروست دەکرد، لە خوڵقاندنی ئەو دنیایەدا ڕێک لاسایی خواوەندەکەی نەنکمم دەکردەوە. ئەو خواوەندەی کە بە کەیفی خۆی یاری بە تیرەی بەشەر دەکرد. دیارە پاشاگەردانی ئەم دنیای کتێبانە ڕێگری ئەوەی لێنەدەکردم کە واقعی ژیان نەبینم، هەستی خەڵکناسی لەلام دانەدەمرکاندەوە بەڵکو پەردەیەک بوو لە پوخڵەواتە ژەهراوی و دەردە زۆر و پەنهانەکانی ژیانی دەوروبەر دەیپاراستم.

بەوجۆرە کتێبان لە زۆر شتی خراپیان دەپاراستم. تەبع و تەبیعەتی خەڵکیان پێ ناساندنم، کردیانە کارێک پێ نەنەمە قەحپەخانان و قێزم لەو شوێنانە و لەو کەسانە ببێتەوە کە هاتوچۆی ئەو شوێنانەیان بە کارێکی ئاسایی دەزانی.

روکامبول، فێری کردم، لە هەنبەر زرووفدا خۆڕاگر بم، کۆڵنەدەر بم. قارەمانەکانی دوماس فێریان کردم کە ژیان بۆ دۆز و مەسەلەیەکی گەورە تەرخان بکەم. کاراکتەری دڵخوازی

من، شا هینری چوارەم بوو. وا تەسەوەر دەکەم بیرانجیە لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا شا ئیتو، مەبەستی ئەوە بوو کە دەیگوت:

*تێکەڵاوی خەڵکانی سادە وساکار بوو.*

*ڕاستە دەیخواردەوە.*

*بەڵام پاشایەک میللەتی خۆی شادمان بکات.*

*حەقی خۆیەتی بۆخۆیشی بژیت.*

لەو ڕۆمانە ولە ڕۆمانەکانی دیدا هینری چوارەم وەکو پیاوێکی نەجیب وخۆشەویستی جەماوەری خەڵک باس دەکرا. موراڵی بەرزی وی ئەو قەناعەتەی لە لا چێدەکردم کە فەرەنسا جوانترین ولاتی دنیایە. ولاتی سوارچاکی و جوامێرییە، لە گەدایانەوە تا پاشایان، هەموو جوامێر و خانەدان دەنوێنن. وەختایەک هینری چوارەم کوژرا، منیش لە ناخی دڵەوە وەکو دەست و پێوەندەکەی، بە کوڵ و بەدڵ گریام، نەفرەتم بۆ " رافیاک " ی بکوژ دەنارد. هینری کاراکتەری هەموو ئەو چیرۆکانە بوو کە بۆ " یاکوف "م دەگێڕانەوە. یاکوف، هێندە مەدح و ستایشی لە منەوە بیست، ئەویش خۆ بەخۆ دڵبەندی هینری وفەرەنسا بوو. هەندێجار باسی هینری چوارەمی دەکرد و دەیگوت:- ئەم شا هینریە پیاوێکی ڕەند و مەرد بووە، جێگای متمانە بووە!

شەوق و زەوقی یاکوف قەد لە سنووری ئاسایی هێوەتر نەدەڕۆیی. یاکوف کە بە تەبیعەت کەسێکی زۆربلێ بوو، قەت لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکاندا قسەی پێنەدەبڕیم، برۆکانی وێک دێنانەوەو بە بێدەنگی گوێی بۆ ڕادەدێرام، سیمای وشک و نەگۆڕ- تاوێرێکی کۆنی سەربە خەنەتیلکە بوو. بەڵام ئەگەر من بە هەر هۆیەک لە گێڕانەوە وەستابام، بلەز لێی دەپرسیم:

- تەواو، هەر ئەوەندە بوو؟

- نەخێر، ماویەتی.

- کەواتە بەردەوام بە!

جارێک کە باسی فەرەنسییەکانمان دەکرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا وگوتی:

- ئەم فەرەنسیانە شانسیانهەیە، زۆر خۆش و ئاسوودە دەژین..

- چۆن؟

- چۆن و مۆنی ناوێ، من وتۆ ئێستا ناچارین لە ناو ئاگرا کار بکەین، هەمیشە کاردەکەین، ئاو بوەستێ ئێمە ناوەستین. بەڵام ئەوان بە کەیفی خۆیان دەژین، لە جێی خۆ ناجوڵێن، دەخۆن، دەخۆنەوە، سەیران و گەڕانی خۆ دەکەن، ئەوە ژیانە!

- بەڵام ئەوانیش کار دەکەن!

سەرنجەکەی یاکوف بەجێ بوو، گوتی:

- بەڵام لە چیرۆکەکانی تۆدا هیچ هەواڵێک لە کارکردنیانەوە نییە.

ئەم سەرنجە ڕایگرتم، بیرم کردەوە، بۆم بەدیار کەوت زۆربەی ئەو کتێبانەی من خوێندوومنەوە، کەم وزۆر باسی چۆنیەتی کار وکاسبی خەڵکیان تیانەبوو، باسی ئەو سەرچاوانەیان تیا نەبوو کە قارەمانانی بە نێوبانگ پێی دەژیان.

هەرکاتێ کە لە قسە و گەنگەشە دەبووینەوە، یاکوف لەسەر گازی پشت ڕادەکشا و دەیگوت:- باشە من سەرخەوێ دەشکێنم.

ئیدی هەر لەو شوێنەدا پاڵدەکەوت و دوای یەک خولەک پرخ و هۆڕی بەرز دەبووەوە.

## (١٥)

پاییز، کە کەنارەکانی ڕووباری کاما سوور هەڵگەڕان وگەڵای درەختان زێڕئاسا زەرد هەڵگەڕان، هەتاو تین وتاوی جارانی نەما، یاکوف، لە ناکاوا کەشتیەکەی بەجێهێشت وڕۆیی. بەرلە ڕۆشتنەکەی بەمنی گوت:

– ئەلیوشا، دوو سبەی هەردووکمان، من وتۆ دەگەینە پرم، دەچین بۆ حەمام و بە ئارەزووی خۆمان خۆ دەشۆین، لەوێوە یەکسەر دەچین بۆ بارێک موزیقای تیابێت. شتێکی زۆر خۆشە. من حەز دەکەم گوێم لە لێدانی ئامێرێکی موزیقی بێت!

پیاوێکی قەڵەوی داتەپیو، ڕدێن تاشراوی سیما ژنانی لە سارابۆڵ سەرکەوتە سەر کەشتیەکە. پاڵتۆ درێژەکەی وشەپقەکەی سەری کە دەورەکەی کەوڵە ڕێوی بوو، هێندەی دی ژنانەی دەنواند. یەکسەر مێزێکی لە گۆشەیەکی گەرمی نزیک مووبەقەکەوە هەڵبژارد، داوای چایەکی کرد، بەبێ ئەوەی پاڵتۆکەی یان شەپقەکەی دابکەنێ، دەستی بە چا خواردنەوە کرد. ئیدی ئارەقە لە سەراپای دەچۆڕا.

هەوری پاییزی بە ئاستەم پروشەی دەکرد، لەوە دەچوو ئەم پروشەیە، هەرکاتێ کە کابرا بەدەستەسڕەکەی سەروچاوی دەسڕی، کەم بکات، وهەرکاتێ کابرا ئارەقەی بکردباوە، زیاد بکات.

یاکوف هەر زوو لە لای ئەو پیاوەوە دانیشت، بە دوو قۆڵی کەوتنە تەمەشاکردنی نەخشەیەکی ناو ساڵنامەیەکی کۆن، کابرای ڕێبوار بە قامکی وێنەی شتێکی کێشا، یاکوف بە ئارامی گوتی : – ئێ ئەوە چییە؟ ئەمە بۆ گەنجێکی وەکو من کارێکی ئاسانە. لە پێی کە!

ڕێبوارەکە، لە کاتێکا ساڵنامەکەی دەخستەوە نێو جانتایەکی چەرمی کراوەی بەرپێی خۆیەوە، بە دەنگێکی بەرز گوتی:- زۆرباشە.

بەدەم چا خواردنەوە، بە ئارامی لە سەر قسان بەردەوام بوون. بەر لەوەی نۆرەی کاری یاکوف دەستپێبکات ناسنامەی ئەو کابرایەم لێ پرسی. بەدەم پێکەنینێکی کورتەوە بەرسڤی دامەوە: - لە ئافرەت دەچێت وانییە؟ مانای وایە خەسیوە. لە سیبریاوە هاتووە. پیاوێکی سەیرە... لەوە دەچێ بەگوێرەی بەرنامەیەکی تایبەتی بژی..

بە تەق وهوڕ پاژنە ڕووتە ڕەشەکانی کە لە دوو سم دەچوون، دەکێشا بەسەر کەشتیەکەدا، لێم دوور کەوتەوە. بەڵام لە نیوەی ڕێدا وەستا، ئاوڕی پاشەوەی دایەوە و بەدەم هەڵکڕاندنی پەراسووەکانیەوە گوتی:

- قەرارە لای ئەو کاربکەم. هەرکە گەیینە پرم کەشتیەکە بەجێدێڵم و لەیەکدی جیا دەبینەوە ئەلیوشا گیان. بە قیتار دەڕۆین، پاشان لە ڕێگەی دەریاوە، دواتر بەسواری ئەسپ. بە پێنج هەفتە ئەوجا دەگەیینە ئەوێندەر. بەشەر تەیری بێ باڵە، دەگاتە هەموو گۆشە وکەنارێکی دوور!

سەرم لەو بڕیارە کوت و پڕەی یاکوف سوڕما. بە سەرسامی پرسیم: - باشە دەیناسیت؟

- لە کوێ بیناسم؟ قەت نەمدیوە، هەرگیز بەو شوێنەدا تێ نەپەڕیوم کە ئەو لێی دەژی..

بۆ بەیانی یاکوف پەیدا بوو، فەروەیەکی کورتی چڵکن وپڵکنی لەبەربوو، شەپقەیەکی پووشی کۆنی بێ قەراخی لە سەر بوو، کۆنەی ورچە بچکۆل بوو، جووتێ پێتاوەی شڕی لەپێدا بوو. بە قامکە ئاسنینەکانی توووند دەستی گوشیم:

- له گه‌ڵما وه‌ره ئێ؟ ئه‌و کابرایه‌، یارۆی نێره‌موک ئه‌گه‌ر ڕووی لێبنه‌یێن کار به‌تۆش ده‌دات. ده‌ڵێی چی، پێی بڵێم؟ تۆزێکی لێده‌بڕێت، ئه‌وه‌نده‌ی که‌ زه‌ره‌ری نه‌بێت و، پاره‌یه‌کی که‌مت ده‌داتێ. ئه‌مانه‌ که‌ کوڕێک سونه‌ت ده‌که‌ن، جه‌ژنیانه‌، جه‌ژنی ڕاسته‌قینه‌یانه‌، له‌ بری ئه‌وه‌ پاره‌ش ده‌ده‌ن..

کابرای نێره‌موک له‌ لای محه‌جه‌ره‌که‌ ده‌وه‌ستێ وسارغیه‌کی سپی له‌بن باخه‌ڵدایه‌. به‌ دووچاوی لێڵ ده‌ڕوانێته‌ یاکوف، ڕوخساری قورس، له‌ ڕوخساری پیاوێکی خنکاو ده‌چێت. به‌ چپه‌ به‌ نه‌عله‌تم کرد، یاکوف، جارێکی دی ده‌ستی گوشیم:

- له‌ پێی که‌! هه‌رکه‌سه‌ و به‌ له‌یلای خۆیدا هه‌ڵده‌ڵێت.. چیت داوه‌ له‌وه‌؟ ده‌ی باشه‌، به‌ دوعا. هیوادارم به‌خته‌وه‌ربیت!

یاکوف شوموف، ڕۆیی. وه‌کو ورچێکی زه‌لام بۆی ده‌رچوو، کۆمه‌ڵێک هه‌ستی هه‌ڤدژی له‌ لا به‌جێ هێشتم، هه‌م خه‌فه‌تم بۆی ده‌خوارد، هه‌م لێی بێزار بووم، له‌ دڵی خۆدا به‌ جۆره‌ به‌غیلی و ترسێکه‌وه‌ ده‌مپرسی باشه‌ بۆچی بۆ ئه‌و شوێنه‌ دوور ونادیاره‌ ده‌ڕوات. باشه‌ ئه‌م یاکوف شوموفه‌ ده‌بێ کێ بێ؟

له‌ ئاخر و ئۆخری پاییزا، که‌ که‌شتیه‌ هه‌ڵمینه‌که‌، ناچاربوو گه‌شته‌کانی ڕابگرێت له‌ به‌ر سه‌رما وسۆڵه‌ له‌ کار بوه‌ستێت، ئیدی به‌ شاگردی له‌ کارگه‌یه‌کی وێنه‌کێشانی ئیکۆنان دامه‌زرام. ئاغام پیره‌ژنێکی میره‌بانی ڕووخۆش بوو، که‌سێکی باده‌نۆش بوو، یه‌که‌م ڕۆژی دوای ده‌ستبه‌کار بوونم، به‌ تون و ڕاوێژی خه‌ڵکی شاری فلادیمیر پێی ڕاگه‌یاندم:

- ئێستا ڕۆژ کورت وشه‌و درێژه‌. ده‌مه‌وێ هه‌موو به‌یانییه‌ک بۆ دووکان بڕۆیت و له‌وێ له‌ کاروباری فرۆشتندا

یارمەتیان بدەیت و شەوان کە گەڕایتەوە، فێری نیگارکێشیت دەکەن.

منی بە شاگردێکی دیکەی سەر دووکانەکەی خۆی سپارد، کە کابرایەکی کورتەبالای چالاک و چەلەنگ و ڕەزا سووک بوو. من وئەو، بە دوو قۆلی، لە تاریک و ڕوونی بەیانیدا، شارمان دەدایە ژێر پێوە، بە کوچە وکۆلانە خوالووەکانی ئیلینکادا نشێو دەبووینەوە تا دەگەیشتینە بازاڕی ژێرین کە دووکانەکە لە قاتی دووەمی خانێکی بازرگانیدا بوو. دووکانەکە، کۆنە عەمار بوو. بچووک و تاریک بوو، یەک پەنجەرە و دەرگا یەکی ئاسنی هەبوو، دەیڕوانیە بانێژەیەک کە سەرەکەی بە چینکۆ گیرابوو. دووکانەکەمان پڕ بوو لە ئیکۆنان و چوارچێوانی گەورەو بچووک، هەندێ لە چوارچێوەکان سادە و ئەوانی دی بەنەخش و نیگار بوون. هەروەها کۆمایەکی کتێبی ئاینی و ئینجیلی بەرگ زەردی تیابوو کە بە پیتێن سلافی کۆن نووسرابوون.

دووکانێکی دی بە تەنیشتمانەوە بوو کە ئەویش هەمان کاری ئێمەی دەکرد، ئیکۆنان و کتێبێن ئۆلی و ئاینی دەفرۆشت. دووکاندارەکە بازرگانێکی ڕدێن ڕەش بوو، بە خزمایەتی دەگەییە زانایەک لە زانایانی پەیڕەوی مەزەبی کۆن، کە لە سەرانسەری ڕووباری کیرجینیتسی ئەوبەری ڤولگادا بناف ودەنگ بوو. ئەم بازرگانە کوڕێکی هاوتەمەنی منی هەبوو، لەڕ ولاواز، چالاک و گورج وگۆڵ، ڕەنگ وڕوو سیسەڵە و چرچەڵە لە پیرەمێردان دەچوو. چاوەکانی وێڵ و شەڵەقاو. ئەرکی من ئەوەبوو، هەڵبەتە دوای کردنەوەی دووکانەکە، خێرا بڕۆم لە باڕێکی ئەو ناوە ئاوی گەرم پەیدا بکەم. دوای خواردنی نان وچای، دووکانەکە گسک بدەم و

تەپوتۆزی سەر کتێب و ئیکۆنەکان بتەکێنم، دوای ئەو ئەرکانە دەبوایە بچمەبەر دووکانەکە تا ئەگەر کڕیارێکی نەناس بەوێدا ڕەت بوایە، بۆ دووکانەکەی خۆمانی ڕابکێشم وبەهەر شێوەیەک بووە نەیەڵم بۆ دووکانەکەی دراوسێمان بڕوات.

فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان، بە ئاشکرا ئامۆژگاری دەکردم و دەیگوت:

- کڕیاران گەوجن. هەرکە هاتنە بازاڕ، خۆیان بە هەموو دووکانێکدا دەکەن، گرینگ ئەوەیە شتی هەرزانیان دەست بکەوێ، بیر لە چاکی و خراپی ئەوشتانە ناکەنەوە کە دەیکڕن!

یارۆی هاوکارم، زۆر شارەزایانە قەراخی ئیکۆنەکانی بەیەکدا دەکێشا و لەبەر چاوی من خۆی دەنواند و بەوەوە دەفشی کە لە کاروباری بازرگانی و دووکانداریدا زۆر مەعلانە:

- کاری مەکینە، باش نییە، ڕەواجی کەمە.. بۆ نموونە ئەم پارچەیە جوانە.. زۆر هەرزانە، پێوانەکەی سێ بە چوارە.. نرخی خۆی هەیە. ئەم پارچەیەی دی : شەش بە حەوتە.. ئەمیش پارەی خۆی دەکات.. تۆ وەلیان دەناسیت؟ هەوڵبدە بیانناسی: فونیفاتی.. ئەمە بۆ چارەسەری مەیگوسارییە، شەهید ڤارڤارا... بۆ دان یەشە و مەرگی مفاجات، ڤاسیلی پیرۆز... بۆ تا و وڕینە. ئەدی پاکیزەکان دەناسیت؟ تەمەشاکە : پاکیزەی خەمین، پاکیزەی سێ بازوو، پاکیزەی گریاو،پاکیزەی دەردم ئاسان بکە، پاکیزەی قازان، پاکیزەی پوکروف، پاکیزەی سمیستریلنایا..

بە خێرایی نرخی ئیکۆنەکانم، هەر ئیکۆنەیەک بەگوێرەی قەوارەو ماوەی دروستکردنەکەی، ئەزبەر کرد. فێری ئەوەبووم وێنەی پاکیزەکان لێکدی جیابکەمەوەو بیانناسمەوە. بەڵام جیاکردنەوەی پسپۆڕی وتایبەتمەندی هەر یەکێک لە

وەلیەکان هەندێک قورس بوو. بەڵام فرۆشیارەکە دوور ونزیک چاودێری دەکردم، هەرکاتێ بیدیبام، شانم داوە بە لا شیپانەی دەرگـاکەوە و خەیـاڵم ڕۆییـوە، لە ناکـاوا بە دەنگێکـی گـڕ دەیپرسی:

- کام پاکیزە، شفابەخشی ئازاری منداڵبوونە؟

ئەگەر وەڵامەکەم هەڵە بوایە، ڕووی گرژ دەکرد و دەیگوت:

- بەس پێم بڵێ مێشک بۆچی باشە، فایدەی چییە؟

بەڵام ڕاکێشانی مشتەری و کڕیاران لەوەش قورستر بوو. زۆر ڕقـم لەو ڕوخسـارە دزێوانە بـوو کە لە سـەر ئیکۆنەکـان نەخشـێنرابوون، نەمـدەزانی چۆنیـان بفرۆشـم. پـاکیزەی نـاو حیکـایەت و چیرۆکەکـانی نەنکـم، جیـاواز بـوون، منـداڵکار وخشـکۆک و لە بەردڵان و میرەبـان بـوون. لە وێـنەی نـاو گۆڤارەکانیشدا هەر ناسک وجوان بوون، بەڵام لە ئیکۆنەکانی لەمەڕ ئێمەدا زۆر پیر و ڕەزا قورس، لووت درێژی دەندووکە داڵاشی و دەست کوڵ بوون.

ڕۆژانـــی چوارشـــەممە و هەینیـــان، ڕۆژانـــی بـــازاڕ، کاروکاسبیمان گەرم بوو. ئیدی گوندیان و پیرەمێردان، ژنان و پیـــاوان، تەنـــانەت هەنـــدێجار خـــانەوادەیەک بە هەمـــوو ئەندامەکانیەوە، بەتایبەتی پەیڕەوانی ئاینی کۆن، خەڵکانی گرژ ومۆن، بە گومـان و دڕودۆنگ، خەڵکی جەنگەڵەکانی ئەوبەری ڤولگا، بە قاڵدرمەکانـدا سـەر دەکەوتـن و سـەری دووکـانەکەی ئێمەیـان دەدا. هەنـدێجار پیـاوێکی کەتە و زەلام، کە فەرویەکـی کەوڵە مەڕی لە خۆیەوە ئاڵاندبوو و لە ژێرەوە دەستێک جلکی دەســتچنی زبـری گونـدیانەی لەبەر کردبـوو، بەکـاوەخۆ بە بـانێژەکەدا دەهـات، وەکـو ئەوەی بترسـێت بـانێژەکە لە ناکـاوا هەرەس بێنێت. بەڕاسـتی شـەرمم دەکـرد لێـی نزیـک ببمەوە،

بەلام ناچاربووم زۆر لە خۆم بکەم، بازووەکانم لەسەر سینگم جووت بکەم و بە دەوریا بسوڕێمەوە و مێش ئاسا بە گوێیدا بویزێنم:

– قوربان، چیت دەوێ؟ کتێبی نوێژ، مزماران بە شەرح و شرۆڤە و پەراوێزەوە، بەرهەمەکانی یەفریم سیرین و کیریل، کتێبی قانوون.. فەرموو ژوورەوە، تەمەشایەک بکە، چوونە ژوورەوە بە خۆڕاییە.. جۆرەها ئیکۆنەمان هەن.. بەنرخی جیاواز، باشترین شەمایل و ئیکۆنان دروست دەکەین، بە ڕەنگێن جۆراوجۆر. ئامادەین بە گوێرەی داوای خۆت بۆتی دروست بکەین، شەمایلی تایبەتی، خانەوادەیی، یان هەر جۆرێکت بوێ، بۆتی دروستبکەین. لە هیچ شوێنێکی دی لە مانە باشترت دەستناکەوێت. ئێرە باشترین کارگەی ڕووسیا و باشترین دووکانی سەرانسەری شارە!

کابرای مشتەری بێئەوەی کەمترین بایەخ بە قسەکانی من بدات، لە جێی خۆی دەوەستێ و بە بێدەنگی لێم مۆڕ دەبێتەوەو حیسابی سەگیشم بۆناکات. پاشان لە ناکاوا بڕیاری خۆی دەدات، ئەوجا بە دەستە بەهێزەکانی دەڵەکم دەدات و لە سەر ڕێگاکەی خۆیم کەنار دەخات و بەرەو دووکانەکەی دراوسێمان دەڕوات. فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان بەدەم خوراندنی گوێچکە زلەکانیەوە، دەکەوێتە پرتاندن و دەڵێت:

– یەکێکی دیکەشمان لەدەست چوو. عەمرت نەمێنێت! تۆ لیاقەتی بازرگانی و دووکانداریت نییە.

لەم کاتەدا، لە دووکانەکەی تەنیشتمانەوە، دەنگێکی نەرم و ڕاوێژێکی شیرین دێتەگوێ:

– برادەری ئازیز، ئێمە لێرە کەوڵی مەڕ یان پێلاوی چەرم نافرۆشین. لە دووکانی ئێمەدا، پەیڤی خوا فەرمانڕەوایە، پەیڤی

خوا لە زیو و زێڕی خالیسەش بەبەهاترە، بە هیچ نرخێکی دنیایی نایەتە خەملاندن.

فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان، لە بەغیلیدا دەڵێت:

- گوێ بگرە گوێ، بزانە چ مەرایییەک بۆ ئەو مشتەرییە دەکات، بزانە چ سابونێک لە ژێر پای دەدات! ئەلهەقی چاک دەزانێ مشتەری بخاتە داوەوە، گوێ بگرە و لەوەوە فێربە. بە ناخێرت خوێنەواری!

من باش فێری نیگارکێشی دەبووم، بەلام لەواری بازاڕ گەرمکردن و ڕاوە مشتەریدا زۆر کۆڵەوار بووم. بەڕاستی بەزەییم بەو پیاوە بێدەنگ و گرژ ومۆنانەدا، یا ئەو پیرەژنە داماوانەدا، کە دەتگوت مشکی سرک و ترساون دەهاتەوە. لەناخی خۆدا حەزم دەکرد، بەدزییەوە نرخی ڕاستەقینەی شەمایل و ئیکۆنەکانیان پێ بڵێم، تا نەخەڵەتێن و بیست کوپیکی زیادە نەدەن. هەرهەموویان لەبەرچاوی مندا زۆر هەژار و برسی دیار بوون. لە دڵی خۆدا دەمپرسی باشە ئەمانە چۆن سێ ڕۆبڵ و نیو دەدەن بە کتێبێکی مەزموران، لە کاتێکا ئەمە کتێبێکی زۆر میللی یە و لە بازاڕا وەکو خۆڵ وایە.

لەلایەکی دیکەوە، سەیرم بەوە دەهات کە زۆر بە وردی بەهای کتێب و وێنە و شەمایلەکانیان دەزانی. ڕۆژێک پیرەمێرێک کە دەمویست هەرچۆنێ بووە ئیغرای بکەم و بیهێنمە ناو دووکانەکەوە پێی گوتم:

- تۆ ڕاست ناکەی کوڕۆ، وانییە کارگەکەی ئێوە باشترین کارگەی ڕووسیا نییە. باشترین کارگە، کارگەی روگوژینە لە موسکۆ.

تەریق بوومەوەو هەنگاوێک لێی دوور کەوتمەوە، کابرای پیرەمێر بە ئەسپایی کەوتەڕێ و نەچووە دووکانەکەی تەنیشتمانیش. فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان بە توورەیی گوتی:

- ها لە قافا گرتتی؟
- تۆ قەت باسی کارگەی ڕوگوژینت بۆمن نەکردووە..
فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان، بەدەم سخێف و جنێوانەوە دەیگوت:
- ئەم خەڵکە مەندانەی کە بەردەوام دەسووڕێنەوە، خۆ لە گێلی دەدەن هەموو شتێک دەزانن و باسی هەموو شتێک دەکەن.. لە ئاوی مەند بترسە لە ئاوی خوڕ مەترسە!
ئەم پیاوە قۆرە دەماخ و لە خۆڕازییە، کە بە قۆزیەکەی خۆیەوە دەنازی، زۆری ڕق لە جووتیار و گوندیان بوو، جارێکیان کە کەمێک سەری گەرم کردبوو، پێی گوتم:
- من کابرایەکم زیرەک، حەزم لە شتی خاوێن و بۆنی خۆشە - بخورد، کولۆنیا و ئەوشتانە. جا بیهێنە بەرچاوی خۆت کەسێکی بەزەوقی وەکو من بە ڕیپاوە لەبەر جووتیارێکا دابنەوێتەوە، بۆ ئەوەی پیرەژنەکەی خاوەن فرۆشگایەکە پێنج کوبیکەکەی خۆی مسۆگەر بکات! تۆ پێت وایە چۆن ئەوە تەحەموول دەکەم؟ ئاخر جووتیار چییە؟ مشکێکە و بەسەر ئەرزا دەڕوات! ومن..
بەسەرسامی بێدەنگ بوو.

من جوتیارانم خۆشدەویست، هەستم بە شتێکی شاراوەو پەنهان لە هەموویاندا دەکرد، ڕێک وەکو ئەو حاڵەی دەگەڵ یاکوف دا هەمبوو. کابرایەکی تێکسمراوی جل وبەرگ شپوشۆڕی پاڵتۆ لەبەر بە تەمەڵی خۆ بە فرۆشگاکەماندا (دووکان، موغازە) دەکات، کڵاوەکەی لە سەری دادەگرێ، بە دوو قامکان نیشانەی خاچ دەکێشێت، نیگای لەسەر گۆشەی ئیکۆنەکاندا، کە چراکەی لێدەگرا گیرسایەوە، ئەوجا ئاوڕ دەداتەوە تا چاوی بە وێنە ناپیرۆزەکان نەکەوێت. بە چاوی

کڕیاری تەمەشایەکی ناو فرۆشگاکە دەکات ودەڵێت: - کتێبێکی مەزمووورانم بە شەرحەوە بدەیە!

ئاسینی (سەری قۆل) پاڵتۆکەی هەڵدەکات و ماوەیەکی زۆر لە پیتەکانی لاپەڕەی یەکەم ورد دەبێتەوە. بە بێدەنگی لێوە قڵیشاو و وشکەکانی دەبزوێنێت: - کتێبی لەمە کۆنترتان نییە؟

- هەڵبەتە دەزانیت کتێبی کۆنی ئاینی زۆر گرانە، بایی هەزاران ڕۆبڵە..

- دەزانم.

سەری قامکی تەڕ دەکات ولاپەڕەکە هەڵدەداتەوە، شوێنەواری پەنجەی لە پەراویزی لاپەڕەکەدا خەتم دەبێت. فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان بە تووڕەیی سەراپای کابرای کڕیار بەنیگا دادەبێژێت و دەڵێت:

- کتێب و دەقە پیرۆزەکان هەرهەموویان هی یەک سەروبەندن، کۆنن.خۆ خوای گەورە قسەکانی خۆی ناگۆڕێت..

- ئەوەمان بیستووە. خوا قسەی خۆی ناگۆڕێت، بەڵام نیکون دەیگۆڕێت و ئەولاتریش، بەکەیفی دڵی خۆی دەکات..

یارۆی مشتەری بە وشکی کتێبەکە دادەخات و بە بێدەنگی لە دووکانەکە دەڕوات.

ئەو خەڵکانەی کە عەوداڵی کتێبانی کۆن بوون، وەختایەک دەگەڵ فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمانا گەنگەشەیان دەکرد، هەستم دەکرد ئەوان، لە فرۆشیارەکەی مە، پتر شارەزای کتێبانی پیرۆز و ژینامەی وەلیان و پیاوچاکانن. فرۆشیارەکەی لەمەڕ ئێمە لەمە تووڕە دەبوو و لەبەرخۆوە پێی دەگوتن: - بێ دینانی کێوی!

خۆ ئەگەر یارۆی مشتەریش، لەبەر هەر هۆیەک کتێبە تازەکانی بەگەن نەکردبایە، زۆر بەڕێزەوە سەیری دەکرد و

ئەوەنــدە بە پــارێزەوە دەیگــرت بە دەســتەوە، وەکــو ئەوەی چۆلەکەیەک بێ و لە ناکاوا لە دەستی بفڕێت. مـن ئەو حاڵەتەم زۆر پێخۆش بوو.

چونکە من بەش بەحاڵی خۆم کتێبم بە جۆرە پەڕجوویەک دەزانـی کە ڕوحـی دانەرەکەی لە بن دێڕەکانیا بـوو. هەرکـاتێ کتێبێکم بکردباوەو دەستم بە خوێندنەوەی کردبا، ئەو ڕوحەم ئـازاد دەکـرد و بە شـیوەیەکی سـەیر تـێمە دەئـالا و مژوولـی دەکردم.

زۆرجـار ڕێکـدەکەوت کە پیـاوان وژنـانی پیـر ودان عەمـر کتێبی کۆنیان بۆ دێنـاین، کە دەگەڕانەوە بۆ پێش ' نیکون ' ی ڕیفورمیسـت، داوایان لێدەکردین کە لێیـان بکڕین. یـان لیسـتی ئەو کتێبانەیـان بـۆ دەهێنـاین، کە بە خەتێکـی جـوان وخوانـای هەنــدێک ڕەبەنیتــانی دەقەرێــن هەردوو ڕوبــاری ئەرجیــز وکیرجینیتس نووسرابوو. یان هەندێ نوسخەی ' ژیانی وەلیان ' یــان بــۆ دەهێنــاین کە لەلایەن دیمیتــری ڕوستوفســکییەوە پێداچوونەوەی بۆ نەکرابـوو. ئیکۆنـانی کـۆن و خـاچ و مراکـی زیوینیــان بــۆ دەهێنــاین کە میرانــی موســکۆیی کـاتی خـۆی بەدیـاری دابوویـان بەو بارمەنـانەی کە خزمەتیـان کردبـوون. هەرهەمــوو ئەو شــتانەیان بە دزیــیەوە بــۆ دەهێنــاین و نەیاندەویست ئەو ڕازەیان کەشف ببێت.

فرۆشیارەکەی ئێمە و ئەوەی دراوسێمان، ئەو شـتانەیان لە ئاسمان دەقۆستەوە، ڕکابەری یەکدیان دەکـرد، ئەمە بـۆ ئەوان کاســبیەکی چەور بــوو، ئەو شــتە کــۆن و توحفانەیــان بە پــارەیەکی کەم لە دەســت گونــدیانەکان دەردێنــا و پاشــان لە بازاڕا بە پارەیەکی مـۆڵ بە دەوڵەمەنـدانی توحفە دۆسـت یـان ئیمانــدارانی هەواداری کڵێســـای کۆنیـــان دەفرۆشـــتەوە.

فرۆشـــیارەکەی ئـــێمە، لەم کاتـــانەدا هەمیشـــە ئاگـــاداری دەکردمەوە:

- چاوت بکەوە، ئاگات لەم شەیتانانە، لەم سیحربازانە بێت، ئەمانە هەمیشە گیرفانیان پڕە لەپارە. بەزەییت پێیاندا نەیەتەوە.

هەرکە سـەروکەللەی یەکیک لەو فرۆشیارانە پەیدا دەبـوو، فرۆشـیارەکەمان منـی لە دووی بیـوتر فاسـیلیفیچ دەنـارد، کە شـارەزاییەکی تەواوی لە کتێب و ئیکۆنـانی کـۆن و ئەو بـابەتە شتانەدا هەبوو.

بیوتر فاسیلیفیچ، پیرەمێرێکی بەژن زراڤی، چاو زیتی، سـەر وڕوخسـار جـوانی، ڕدێـن درێـژ بـوو، کە ڕدێنـی لە ڕدێـنەکەی ڤاسـیلی پیـرۆز دەچـوو. بەردەوام دار عاسـایەکی بەدەسـتەوە بـوو، چـونکە قـامکی پێیەکـی لە دەسـت دابـوو و لە ڕۆیشـتنا کەمێک دەلەنگی. هاوین و زستان بالاپۆشێکی تەنکی لەبەر بوو کە لە جبەی قەشە دەچوو. کلاوێکی مەخمەڵی قووڵی لە سـەر دەکـرد. بە گـورجی خـۆی بە دووکـانەکەدا دەکـرد، هەرکە وەژوور دەکەوت، شانەکانی خوار دەکردنەوە و بە ملکەچیەوە هەناســەیەکی هەڵدەکێشــا و بە دوو قامکــان، بە شــێوازی پەیڕەوانــی مەزەبـی کـۆن نیشـانەی خـاچی دەکێشـا و لەبـن لێــوانەوە وێــرد ونــزای دەخوێنــد. بەو ڕواڵەتە دینــداری و خواناسییەوە، متمانەی فرۆشیارانی شتە توحفە و دەگمەنەکانی بەدەست دەهێنا.

پیرەمێری شارەزا دەیپرسی:- ئەمرێکتان بە من هەبوو؟

- ئەم پیـاوە ئیکـۆنەیەکی بـۆ هێنـاوین... دەڵێـت لەبـابەتی ئەوانەی ستروگانوفە.

- لە بابەتی ئەوانەی کێ؟

- ستروگانوف.

- ئاه ببوره گوێم کەمێک گرانە. باشتر، خوای گەورە لە بیستنی کفر گۆییەکانی نیکون و پەیڕەوەکانی بە دووری کردووم..

کڵاوەکەی دادەکەنێت، ئیکۆنەکە بە شێوەیەکی ئاسۆیی بەدەستیەوە دەگرێت، جوان جوان دیقەتی دەدات، ئەم دیو وئەودیوی دەکات، چوارچێوە دارینەکەی بەر زەین دەدات، چاوەکانی چکۆلە دەکاتەوەو لەبن لێوانەوە دەڵێت:

- پەیڕەوانی خوانەناسی نیکون، لەوەتای زانیویانە ئێمەمانان بایەخ بە هونەرێن کۆن دەدەین، لە شەیتانەوە فێڵێک فێربوون، دەچن وێنە پیرۆزەکان، زۆر بەکارامەیی کۆپی دەکەنەوە، کە هەوەڵجار سەیریان دەکەیت وادێنە بەرچاو دەسکردی ستروگانوف، یان ئوستیوک، یان سوزدالە. بەڵام چاوی باتین، هەرزوو کەشفی دەکات کە نەخێر ئەسڵ نین، بەڵکو تەخلیتن!

ئەگەر کابرای پسپۆڕ و عەنتیکەناس بیگوتبایە ئەم ئیکۆنەیە تەخلیتە، ئەوە مانای وابوو، شتێکی دەگمەن و بەنرخە، ئەوە پەرلەی بەینی فرۆشیارەکەی ئێمە و کابرای پسپۆڕ و عەنتیکەناس بوو. لە ڕاستیا ئەوان زمانێکی تایبەتی خۆیان هەبوو، هەرخۆیان لەیەکدی حاڵی دەبوون. ئەگەر یارۆی عەنتیکەناس، سەبارەت بە ئیکۆنەیەک یان کتێبێک ڕووی گرژ کردبا و داخ و کەسەری دەربڕیبا، مانای وابوو، بایی دە ڕۆبڵە، ئەگەر " نیکون " ی بەر دەمرێژی جنێوان دابا مانای وابوو، بیست و پێنج ڕۆبڵ دێنێت.

بە ڕاستی زۆر بێ شەرمانە فرۆشیارەکەیان دەخاپاند، هەرچەندە من لەو فەندەڵ فێڵانە بێزار بووم، بەڵام گەمە وچاو و ڕاوەکانی کابرای پسپۆڕم بەلاوە سەیر و سەرنجڕاکێش بوو:

- پەیڕەوانی نیکون، ئەو زوریەتە ڕوو ڕەشەی نیکون، لە شەیتانەوە فێربوون، هەموو شتێک دروست بکەن.. بۆ نموونە تەمەشای ئەم ئیکۆنەیە بکە، لە تۆ وایە ئەسڵە ئەسڵی ئەسڵە، جلەکانی یەک نیگارکێش دروستی کردووە، بەڵام تۆ تەمەشای ڕوخساری بکە... ڕوخسارەکە دەسکاری کەسێکی دیکەیە. وەستا و هونەرمەندانی کۆن، وەکو سیمون و ئوشاکوف، ئەگەر خوانەناسیش بان، وێنەکانیان بەدەستی خۆیان دەکێشا.. جلەکان، دەموچاوەکان... هەرهەموویان بەدەستی خۆ دروستدەکرد، بەڵام ئەمانەی ئێستا هیچیان لەبارا نییە، دەرەقەتی ئەو کارانە نایەن. جاران کێشانی وێنەێن مەزەبی و ئیکونان کارێکی پیرۆز بوو، بەڵام ئێستا، بەڕێزینە تەنیا پیشەیە، سنعەتە سنعەت!

ئەوجا هەڵوەستەیەکی دەکرد، ئیکۆنەکەی بە پارێزەوە لە سەر مێزەکە دادەنا و کڵاوەکەی لەسەر دەکرد و دەیگوت : - خوا بیانگرێ!

ئەو قسەیە بەومانایە بوو : ئیکۆنەیەکی باشە، خێرا بیکڕە لە دەستی خۆتی مەدە!

ئیدی کابرای فرۆشیار لە نێو ئەو هەموو پەیڤ و زاراوەو شارەزاییە زۆرەی یارۆی عەنتیکەناسدا، سەری لێ تێکدەچوو و بە نیگەرانییەوە دەیپرسی: - قوربان، بابی گەورە ڕات بەرانبەر بەم شەمایلەی من چییە؟ (شەمایل : وێنە و پەیکەری گەورەپیاوانی ئاینی و مەزەبی)

- ئەمە دەسکردی پەیڕەوانی نیکونە.

فرۆشیارەکە هاواری دەکرد:

- شتی وا چۆن دەبێت، بابای من و بابای بابام لەبەردەم ئەم شەمایلەدا (پورترێت) نوێژیان کردووە..

کابرای پیرەمێر دەیگوت: - گیانەکەم، نیکون زۆر لە پێش بابای بابای تۆدا ژیاوە.

ئەوسا دووبارە ئیکۆنەکەی لە سەر مێزەکە هەڵدەگرتەوەو نیشانی خاوەنەکەی دەدا و بە ڕاوێژێکی ئامۆژگاری ئامێزەوە دەیگوت:

- تۆ جوان تەمەشا بکە!.. بەمەش دەڵێی ئیکۆنە؟ ئەمە وێنەیەکی ڕووت وقووتە، فرِی بە ئۆل و ئاینەوە نییە، هیچ نییە، یەکێکە لە دەسکارەکانی هەوادارانی نیکون. کەم و زۆر ڕوحی تیانییە. من مەجبوور نیم درۆت لە گەڵدا بکەم. من بابایەکم پیر، پێم بە لێوار قەبرەوەیە، بەهیچ جۆرێ ئامادەنیم ڕوحی خۆم بفرۆشم و ئیمانی خۆم بلەوتێنم، هیچ قازانجێکم لەوەدا نییە!

دوای ئەو قسانە، وای دەنواند کە بە تەمای ڕۆیشتنە، ئازای ئەندامی دەکەوتە لەرزین، وەکو یەکێک گومان لە قسەکانی کرابێ خۆی تووڕە دەنواند، ئیدی لەو ماوەیەدا فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان، شەمایلەکەی بە چەند ڕۆبلێک دەکڕی وخاوەنەکەی بە دڵخۆشییەوە، بەدەم خواحافیزیەوە، دوو لۆ لەبەردەم بیوتر فاسیلڤیچدا دەنوشتایەوە و بە مەمنوونیەوە لە دووکانەکە وەدەردەکەوت. هەنگێ منیان بۆ چاخانەیەک دەنارد تا ئاوی گەرم بۆ چا لێنان بێنم. وەختایەک دەگەڕامەوە دەمبینی کابرای عەنتیکەناس، بە خۆشحاڵییەوە دەست بەسەر ئیکۆنە کڕدراوەکەدا دێنێت و بە فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان دەڵێت:

- تۆ تەمەشا چەند جوانە، چەند سادەیە، خواناسی و پارسایی لە سەرانسەری دەچۆڕێ.. لە هەر کەڵکەلە و ئارەزوویەکی بەشەری بە دوورە..

فرۆشـــیارەکەی خۆمـــان، کە لە کەیفـــان لەپێســـتی خـــۆی نەدەهێوری و بە نـاو دووکانەکەدا(فرۆشگا) دەهـات و دەچوو، بە چاوانی حەپەساوەوە دەیپرسی:- باشە دەستکردی کێیە؟

- هێشتا، ماوتە ئەوە بزانیت.

- بە ڕای تۆ خەڵکانی شارەزا بە چەندی دەکڕن؟

- نازانم، دەیبەم تا بەچەند کەسێکی نیشانبدەم..

- شتی وا چۆن دەبێ پیتور فاسیلیفیچ..

- ئەگەر فرۆشـتم، پەنجـا ڕۆبـڵ بە تـۆ دەدەم و بـاقیەکەی هەرچەندێ بوو بۆ خۆمی هەڵدەگرم!

- ئاە..

- هیچ نارەزاییەک دەرمەبڕە، فایدەی نییە.

بە دەم چـاخواردنەوە، بە بـێ هـیچ شــەرمێک گەنگەشــەی مـامەڵەکە دەکەن، بەچـاوی دز و ڕێگـرەوە تەمەشـای یەکـدی دەکەن. دیـار بـوو کە فرۆشـیارەکەی لەمەڕ ئـێمە، زۆر خـراپ کەوتبـووە داوی یـارۆی عەنتـیکە ناسـەکەوە، مـن بە ئاشـکرا هەستم بەوە دەکرد. هەرکە کابرای عەنتیکەناس، لە دووکـانەکە وەدەرکەوت، فرۆشیارەکەی خۆمان ڕوویکردە من وگوتی:

- ئەلکســـی زمـــانی خـــۆت بگـــرە! نـــابێ خـــانم، خـــاوەنی دووکانەکە بە هیچ جۆرێ بەم سەوداو مامەڵەیە بزانێت!

کە لە سـەر چـۆنیەتی مـامەڵەکە ڕێکـدەکەون، ئیـدی هەمـوو شـــتێک لە بیـــر دەبەنەوەو وەکـــو ئەوەی هـــیچ نەبـــووبێ، فرۆشیارەکەی خۆمـان دەپرسـێت : - پیـوتر فاسـیلیفیچ، دەنـگ وباسی شار، چی تازە هەیە؟

پیرەمێرد، دەستێک بە سمێڵیا دێنێ، لێوە لەرزۆکەکـانی بە دیـار دەکەون ئەوجـا دەسـت بە گێـڕانەوەی پوخڵەواتەکـانی ژیـــانی بازرگانـــانی دەوڵەمەنـــد و، ســـەودا و مـــامەڵەی

سەرکەوتوو، نەخۆشی، زەماوەند و داوەتان، بویەرێن فاحیشەگەری و خیانەتی ژن و مێردان لە یەکدی، دەکات. پیرەمێرد، هەرهەموو ئەو باس و خواسانەی، وەکو ئاشپەزێکی کارامە و بە ئەزموون، بەسەر یەکدا دەکرد و پاشان پێکەنینێکی فیکە ئاسای بەسەرا دەکرد. فرۆشیارەکەی لە مەڕ خۆمان، لە خۆشیا سوور دەبووەوە، چاوە خەواڵوەکانی پرشنگیان دەدا و ئاهێکی هەڵدەکێشا ودەیگوت : - ئەوانە دەژین. ئەوە ژیانە! منیش تا ئێوارێ ڕەنج دەدەم.

پیرەمێرد، بەدەنگێکی نەوی دەڵێت:

- هەرکەسە وقەدەر وچارەنووسێکی هەیە. یەکێک فریشتەکان، بە مقەستی زێڕین چارەنووسیان بڕیوەتەوە و یەکێک شەیتان بە تەورداس چارەنووسیان داتاشیوە.

وا دیاربوو ئەم پیرەمێردە تۆکمەیە هەموو شتێک دەزانێت و ئاگای لە ژیانی هەموو شارەکەیە، هەموو ڕازو نهێنییەکی بازرگانان، فەرمانبەران و روحانیان و پیشەوەران دەزانێت.. چاوەکانی تیژ دەتگوت چاوی هەڵۆن، خەسڵەتی گورگ و ڕێوی تیابوو. پڕ بەدڵ حەزم دەکرد، سەربکەمە سەری و توورەی بکەم، بەڵام بێهودە. بەڵام ئەو زۆر لە سەرەوە، زۆر لە دوورەوە، وەکو ئەوەی لە پشت مژ و دوومانەوە سەیری من بکات، بەو ئاوایە سەیری دەکردم. قەڵەمی دەست وپێم دەشکا. وام وێنا دەکرد لە سەر هەڵدێرێک ڕاوەستاوەو هەرکەسێک توخنی بکەوێت، هەڵدەدێرێت و لە حەوت شوێنەوە ملی دەشکێت. هەستم دەکرد شتێکی هاوبەش لە نێوان ئەو و یاکوف شوموفدا هەیە.

فرۆشیارەکەی ئێمە، مەفتوونی زیرەکی کابرای پیرەمێرد بوو، چ لە ڕووا و چ لە پاشملە ئەوەی نەدەشاردەوە. بەڵام

هەندێجار ئەمیش وەکو من حەزیدەکرد تووڕەی بکات و پێی ڕابوێرێ.

جارێک بە دەم مۆڕەیەکەوە، بە پیرەمێردەکەی گوت : - کە پیاوێکی فێڵبازی خاپینۆکیت!

یارۆی پیرەمێرد، بە دەم قاقایەکی خاوەوە گوتی:

- تەنیا خودا خاپینۆک نییە و خەڵکی فریو نەداوە! بەڵام ئێمەمانان هەر هەمووومان، بە فریودانی گەوجان دەژین. ئەگەر نەتوانی پیاوێکی گەوج بخەڵەتێنی بۆچی باشیت، گەوج بۆ خەڵەتاندن نەبێ بۆچی باشە؟

فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان زۆر تووره بوو، گوتی:

- جووتیاران هەموویان گەوج نین بازرگانان لەوانەوە دروست بوون!

- ئێمە باسی ئەوانە ناکەین کە بوون بە بازرگان. گەوجان هەرگیز نابن بە دز. گەوجان ئەولیان، مێشک لەسەریاندا نییە..

پیرەمێردەکە بە کاوەخۆ قسەی دەکرد. لە کەسێک دەچوو لە سەر گردۆلکە گڵێکی ناوەندی زەلکاوێک وەستابێت. پەستکردن و بێزار کردنی مەحاڵ بوو، ئیدی یان تووڕە بوونی لە مەزەبدا نەبوو، یان دەیتوانی زۆرچاک تووڕەبوونی خۆیم لێبشارێتەوە.

بەڵام زۆرجار هەوڵی دەدا تووڕەم بکات، دەم وچاوی لێم نزیک دەکردەوە، بە دەم پێکەنینەوە ڕدێنەکەی سەمای دەکرد ودەیگوت : - پێم بڵێ ئەو نووسەرە فەرنسیە ناوی چییە، بونتوس؟

شێوازی، شێواندنی ناوەکانیم زۆر لەلا گران بوو، زۆر تووڕە و پەستی دەکردم، بەڵام خۆم کۆنترۆڵ دەکرد و وەڵامم دەدایەوە : - بونسون دی تیرال.

- هەواداری کێیە؟

- گەوج مەبە.. خۆتۆ منداڵ نیت،
- هەق بە تۆیە، من منداڵ نیم. ئەوە چییە دەیخوێنیتەوە؟
- یەفریم سیرین.
- کێ باشتر دەنووسێت - چیرۆکنووسان یان ئەو؟
وەڵامم نەدایەوە.
دووبارە گوتی: - چیرکنووسان بە زۆری دەربارەی چی دەنووسن؟
- دەربارەی هەموو رووداو و بویەرەکانی دنیا.
- دەربارەی سەگ و ئەسپانیش؟
فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان لە قاقای پێکەنینی دا، زۆر تووڕە بووم، زۆر بەزەحمەت خۆم پێ کۆنترۆڵ کرا. خۆ ئەگەر شوێنەکەم بەجێ هێشتبا ئەوا فرۆشیارەکەی خۆمان بە گوێیدا دەچپاندنم : - بۆ کوێ دەڕۆی؟
یارۆی پیرەمێرد، بەردەوام بوو لەسەر تاقیکردنەوەی ڕادەی سەبر و هەداری من:
- تەمەشا، وەرە ئەم مەتەڵە هەڵبێنە سەر درێژ : ئەگەر هەزار بەشەری ڕووت وقووتت لەبەردەما بێ، پێنج سەد ژن و پێنج سەد پیاو، ئادەم و حەواشیان لە نێودا بێت، چون ئادەم و حەوایان تیا دەناسیتەوە؟
زمانم بەند دەبێت، دوای ماوەیەکی کەم بە ڕاوێژێکی سەرکەوتووانە دەڵێت:
- گەوجەگیان! خوا دروستی کردوون بە بێئەوەی لە دایک ببن، مانای وایە دەبێ ناوکیان نەبێت! بەوەدا دەناسرێنەوە.
پیرەمێرد ژمارەیەکی زۆری لەو مەتەڵانە ئەزبەر بوو و منی پێ تووڕە دەکرد.

لە ڕۆژانی یەکەمی دەست بەکاربوونمەوە لە فرۆشگاکەدا، بابەت و سەربهوردی هەندێک لەو چیرۆکانەم، کە

خوێندبوومنەوە بۆ یارۆی فرۆشیار گێڕایەوە، کە پاشان لەو کارەم ژیوان بوومەوە. چونکە فرۆشیارەکە، بە بەرچاومی منەوە، وەکو ئەوەی بیەوێ گاڵتەم پێبکات، بۆ پیوتر فاسیلیفیچی دەگێڕانەوەو بە ئارەزووی خۆی دەستکاری دەکردن و دەی شێواندن و شەرح و شرۆڤەی بێ پەردە و بێ ئەدەبانەی بۆ دەکردن. کابرای پیرەمێردیش بۆی دەسەندەوە و بە پرسیارێن ناشیرین و بازاڕی و بێ ئەدەبانە هێندەی دی چەشەی دەکرد. ئیدی بە دوو قۆڵی بە زمانە پیسەکانیان کاراکتەر و قارەمانە خۆشەویست و دڵخوازەکانی منیان لەکەدار و عەیبدار دەکرد، لەوانە : ئۆجینی گراندە، لودمیلا و، هینری چوارەم.

ئیدی بۆم بە دیارکەوت کە ئەمانە لە بێزاری خۆیان و بۆ کات بە سەر بردن ئەو قسانە دەکەن. بەڵام وێڕای ئەوەش ئەو ڕەفتارەی ئەوانم لە دڵ گران بوو. ئەمانە لەو بەرازانە دەچوون کە خوویان بە پوخڵەواتەوە گرتبێت و لووتیان دەژەنیە قوڕاو وزبڵدانانەوە، عەیب وعار و ڕیسوایی خەڵکیان دەردێنا و بە ئاو وتاو و بەلەزەتەوە لە قاویان دەدا و دەیانگێڕایەوە، ئیدی ئەمانە لە بە غیلی و حەسوودی خۆیاندا چاویان بەرایی نەدەدا جوانی هەندێ ژیان و کەسایەتی بدینن، بۆیە بە بوختان و ئیفترا ناویان دەزڕاندن و عەیبداریان دەکردن. بە ئەقلی نوقسانی من، هەموو خەڵکی، هەموو خەڵکی ئەم کوچە وبازاڕە بازرگانیە، لە کارمەندانیەوە بیگرە تا ئاغا و شاگردانی، ژیانێکی زۆر هیچیان بەسەر دەبرد، لەزەتیان لە فڕو فێڵان و خاپاندنی خەڵک و خوا دەبینی. بۆ نموونە ئەگەر جووتیارێک بۆ یەکەمجار ڕێی بکەوتبایە شار و پرسیاری شوێنێکی کردبا، ڕێک ئەدرەسێکی پێچەوانەیان پێدەگوت. ئیدی

ئەم چەواشەکارییە بووبوو بە بەشێک لە ژیانیان، هەموو سەر گەرمیەکیان بریتی بوو لە قسەێن بازاڕی و شەهوانی ئەوتۆ کە بنیادەم دڵی لێی تێک هەڵدەهات، ئەمە جگە لە مەردم ئازارییان.. بەڵام ئەم ڕەفتارو ئەتوارانەیان، ئەوەندە دووبارە بووبووەوە کە تەواو سوابوو و کەس بە سەرگەرمی نەدەزانی.

هەندێجار بازرگانەکان دوو مشکیان دەگرت، کلکیان بەیەکەوە دەبەستن و بەهەوڵ و تەقەلا و شەڕی ئەو حەیوانە بەستەزمانانە پێدەکەنین، هەندێجار بۆ ئەوەی سەرگەرمییەکەیان بگەیەننە لووتکە، نەوتیان بەو حەیوانە بەستەزمانانەدا دەکرد و ئاگریان تێ بەردەدان. هەندێجار تەنەکەیەکیان لە کلکی سەگێکی داماو دەبەست و سەگی بەستەزمان، بە دەم قورسکاندنەوە غاری دەدا وتەق وهۆڕی تەنەکەکە دنیای پڕدەکرد و خەڵکەکە لە پێکەنینا دەبوورانەوە.

زۆر کاری دیکەی لەم بە ناو سوعبەتانەیان دەکرد، وەکو ئەوە بوو هەموو خەڵکی – بەتایبەتی ئەو جووتیارانەی لە گوندەوە دەهاتن – بۆ گاڵتە و ڕابواردنی دووکاندارانی ئەم گوزەرە بازرگانیە دروست بووبن.

بازرگان و شاگردەکانیان هەمیشە لە دەرفەتێک دەگەڕان یەکێکیان دەست بکەوێ و ئەزیەتی بدەن و پێی ڕابوێرن و بیکەن بە گەپجاڕی خۆیان. ئەوەی بۆ من وبەلای منەوە سەیر بوو، ئەوەبوو لە هەموو ئەو کتێبانەدا کە تا ئێستا خوێندبوومنەوە، کەم وزۆر باسی ئەو داب ونەریتانە، کە بەو ڕادەیە زۆرو باو بوون، نەکرابوو و ئەمەم بە فەرامۆشکارییەکی بێ ئینسافانە دەزانی. یەکێک لەم بەناو شۆخی و سەرگەرمیانە لە گوزەرەکەدا، زۆری پەست کردم.

لە دووکانێکی خوری ولباد فرۆشیدا کە ڕێک کەوتبووە ژێر دووکـــانەکەی ئـێمەوە کرێکارێــک هەبـوو، لە سەرانســـەری بازارەکەی خوارەوە، بە زۆرخۆری و نەوسنی ناوبـانگی ڕۆیـی بوو. خـاوەنی دووکـانەکە، وەکـو چۆن خەڵکانێک خـۆ بە دڕی سـەگەکانیان یـان خۆشـبەزی ئەسـپەکانیانەوە ڕادەنەن، بەو ئاوایە خۆی بە پڕخـۆری و نەوسـنی شـاگرد و کرێکـارەکەیەوە ڕادەنا. زۆرجار لەگەڵ دراوسێکانیا گرێوی دەکرد:

- کێ گرێو لە سـەر دە ڕۆبـلان دەکـات؟ مـن ئامـادەم گرێـو دەگەڵ هەر کەسـێکا بـکەم کە میشـا دەتـوانێ لە مـاوەی دوو سەعاتدا پێنج کیلۆ گۆشتی بەراز بخوات!

هەڵـبەتە کەس گومــانی لەو توانـایەی میشـا نەبـوو. بـۆیە دەیانگوت:

- ئێمە گرێو نـاکەین. بەڵام ئامـادەین گۆشـتەکە بکڕین، بەو مەرجەی بە بەرچاوی خۆمانەوە بیخوات.

- بەڵام پێـنج کیلـۆیەکە دەبـێ نەرمەی ڕووت بـێ، ئێسـقانی تیا نەبێت!

ئیدی مـاوەیەکی زۆر هەر بـۆ بێتاقەتی باسـی گرێوەکەیـان دەکرد، تا ئەنجام لە عەمارە تـاریکەکەوە، کوڕێکی لاواز، ڕدێـن تاشراو، گۆنا زەق، بە خۆ وپاڵتۆیەکی درێژەوە کە هەر پرژاڵە خوری بوو و قایشێکی سووری لە سـەر بەستبوو، سـەرکەوتە سەرەوە، بە ڕیزەوە کڵاوەکەی لە سەری داگرت، چاوە بە قوڵا چووەکــانی بـڕیە ڕوخســارە خــڕ و داهێــزراو و ســورفل و ڕیشنەکەی وەستای.

وەستاکەی لێی پرسی:- دەتوانی ئەم گۆشتە بخۆیت؟

میشـــا، بە دەنگێکــی ناســـک و، بە نەزاکەتەوە گــوتی : - بەچەندێ؟

- بە دووسەعات.

- زەحمەتە!

- بۆتۆ زەحمەت نییە!

میشا دەڵێت:- دەتوانن دوو بیرەشی بخەنە سەر؟

وەستا دەڵێت: - دەی. دەست پێبکە!

وەستا بە فیزەوە ئاوڕ لە دراوسێکانی دەداتەوەو دەڵێت:

- وا نەزانن برسیەتی ها. نەخێر، ئەم بەیانییە یەک کیلۆ نانی خواردووە، نیوەڕۆش فراڤینێکی چەوری خواردووە..

ئیدی گۆشتەکە دێنن، کۆمەڵێک تەمەشاڤان خڕ دەبنەوە، هەر هەموویان بازرگانی کارامە و بە ئەزموونن، هەموو خۆیان لە پاڵتۆی زستانەی ئەستوورەوە پێچاوەو لە بەرمیل دەچن، خەڵکانێکن ورگن، دەم وچاو قەڵەو، چاویان لەبەر گۆشت بە ئاستەم دیارە، هەموو خەواڵوو وبێزار دیارن.

دەستیان لە ئاسینە دەڵبەکانیاندا شاردووەتەوەو دەوری کوڕە زۆرخۆرەکەیان داوە کە چەقۆیەک و نانێکی جۆی بەدەستەوەیە. کوڕەکە، دوای ئەوەی چەند جارێک بلەز نیشانەی خاچ دەکێشێت، لە سەر فەردەیەک خوری دادەنیشێت، گۆشتەکە لە سەر سەندووقێکی دارین دادەنێت و بە تامەزرۆییەوە تەمەشای دەکات. ئەوجا پارچەیەکی تەنک و بچووک لە نانەکە و پارچەیەکی ئەستوور و گەورە لە گۆشتەکە دەبڕێت. دەیکات بە بابۆڵە و بە هەردوو دەستان بۆ دەمی بەرز دەکاتەوە. بە زمانە درێژەکەی لێوە لەرزۆکەکانی دەلێسێتەوە، وەکو سەگ ددانە وردەکانی بە دیار دەخات، ئەنجام وەکو سەگ قەپ لە بابۆڵەکەی دەگرێت.

- ئەوە دەستی پێکرد!

- سەعات بگرنەوە!

هەمـــوو چـــاو دەبـــڕنە ڕوخســـاری کـــوڕەی پڕخـــۆر، شـەویلاگەکانی، جوولەی گوێچکەکـانی، هەڵکشـان و داشـکانی چەناگەی، ناو بە ناو بەگوێی یەکدا دەچپێنن.

- وەکو ورچ پارووەکەی دەجوێت!

- قەت ورچت دیوە چۆن خواردن دەخوات؟

- تۆ لە جەنگەڵان ژیاویت؟ ئەوە هەر قسەیەکی باوی سەر زارانە کە دەڵێن: وەکو ورچ پارووەکەی دەجووێت.

- قسەو پەندەکە دەڵێت: وەکو بەراز پاروو دەجووێت.

- بەراز گۆشتی بەراز ناخوات.

بە بێتامی پێدەکەنن. یەکێک لە فەلسەفەڕێسەکان دەڵێت:

- بەراز هەموو شتێک دەخوات.. تەنانەت زوڕیەتی خۆی، یان خوشکی خۆشی دەخوات..

کوڕەی پڕخۆر، بەرەبەرە ڕوخسـاری سـوور هەڵدەگەڕێت، گوێچکەکـانی شـین دەبـنەوە، چـاوە بەقـوولا چووەکـانی زەق دەبـنەوەو هەناسـەی تەنـگ دەبێت، بەڵام چەنـاگەی بەردەوام دەجوڵێـت. خەڵـکەکە هانیـدەدەن :- میشـا، لەزێـکە.. کـاتەکەت خەریکە تەواو دەبێت.

نیگایەکی نیگەرانی پاشماوەی گۆشتەکە دەکات، قرێک لە بیـرەکە دەدات و لە سـەر خـواردنی خـۆی بەردەوام دەبێـت. ئـاپۆڕاکە زیـاتر هەڵـدەچن ودێنەجـۆش، هەرتـاو نـا تـاوێ تەمەشـای سـەعاتەکەی، وەسـتاکەی میشـا دەکەن و یەکـدی ئاگادار دەکەنەوە:

- وریابە، میلی سـەعاتەکە نەباتە دواوە. هەقە سـەعاتەکەی لێوەربگرین.

- بـاش چـاودێری میشـا بکە، لەوەیە بەشـێک لە گۆشـتەکە بخاتە ئاسینی کراسەکەیەوە!

- ناتوانیٚ هەموو گۆشتەکە لە کاتە دیاریکراوەکەدا بخوات!

وەستاکەی میشا، بە متمانەوە هاوار دەکات:

- من ئامادەم لە سەر بیست و پێنج ڕۆبڵ گرێو بکەم! میشا گیان قسەم لە عاردی نەدەیت!

ئامادەبووان، هانی دەدەن، بەڵام کەسیان نەچوونە ژێر باری گرێوەکە. میشا لە سەر خواردنی خۆی بەردەوام دەبێت، دەم وچاوی وەکو ئەو گۆشتەی کە خەریک بوو دەیخوارد، سوور بووەوە، کەپووە تیژەکەی دەی فیشکاند. تەمەشاکردنەکەی زۆر ترسناک بوو، وام وێنادەکرد، لە هەر ئان و ساتێکا، لە هۆڕژنی گریان بدات و هاوار بکات : " خەڵکینە مەعز بۆخوا بەزەییەکتان پێمدا بێتەوە! "

یان لە بەرپێی ئاپۆڕای خەڵکەکەدا بکەوێت وحەیاتی لەبەر ببڕێت و دەمی پڕبێت لە گۆشتی قووت نەدراو.

ئەنجام میشا، گۆشتەکەی تەواو کرد، ئاورێکی لای خەڵکەکەی دایەوە و بە هانکەهانک گوتی :- قومیٚ ئاوم بدەنیٚ.

وەستاکەی تەمەشای سەعات دەکات و، لەبن لێوانەوە دەڵێت:

- حەرامزادەیە چوار خولەک دواکەوت..
- مخابن، گرێوەکەمان قبووڵ نەدەکرد. دەنا دەتدۆڕاند.
- بەڵام، نکوڵی لە توانای ئەم کوڕە ناکرێت!
- شوێنی ئەو سێرکە نەک ئێرە.
- خواش بەهرەی سەیر بە هەندیٚ کەسان دەدات!
- باشە، با چایەک بخۆینەوە، ئیٚ؟

ئیدی وەکو ڕیزە کەشتیەکی گەورە بەرەو بارەکە نشێو دەبنەوە.

لە دڵـی خۆمـا دەمگـوت باشــە ئەم هەمـوو خەڵـکە زەلامە بۆچی لە دەوری ئەو گەنجە کلۆڵە خڕ دەبنەوە، چ لەزەتێک لە دیمەنی ئەو هەموو خواردنە بەزیانە دەبینن؟

دالان و گـوزەری بـازاڕکە تەنـگ و درێـژ و تاریـک بـوو، یەکپارچە باڵەی خوری، کەوڵی بەرخ، پەت، پێڵاوی لباد، زینی ئەسپان بوو. بە سـەلبەند و سـەنگ فەرش، لە شـەقامەکە بەرز کرابووەوە. زۆر پیس و شێواو بوو، لە کۆنیا داڕزابوو، لە تەپ وتـۆزی شـەقامەکەیا ڕەش هەڵگەڕابـوو. ڕەنـگە هەزاران جـار خشـتەکان و درزی بەینـی خشـتەکانم ژمـاردبن و ئێسـتاش لە زەینمدا ماون.

ڕێڤینگـان، بە ئەسـپایی بەسـەر شۆسـتەکەدا دەڕۆیشـتن، عەرەبـانەی کەل وپەل وکـاڵا و عەرەبـانەی نەفەران، خـاوتر لە ڕێبوارەکان بە سەر جادەکەدا دەڕۆیشتن. لە کۆتـایی ڕێگاکەدا مەیدانێک هەبوو، هەر چوار نکاڵی دووکان بوو کە بە خشتی سوور دروستکرابوون، هەر دووکانێک، لە دووقـات پێکهـاتبوو. ئیـدی ئەم مەیـدانە پڕبـوو لە سـەندووقی بەتـاڵ، لە پـووش و پەلاش، هەژگ و بـــژاڵ، هەر هەمـــووی لە گەڵ بەفرێکـــی پێخوستی پیسدا تێکەڵ بووبوون.

هەر هەمـوو ئەم شـتانە، بە خەڵـکەکەوە، بە ئەسـپەکانەوە، وادەهاتنە بەرچاو لە جێی خۆ ناجوڵێن و بە زنجیرێن نادیار و پەنهـان بەسـتراونەتەوەو بە دەوری یەک شـوێندا دەخـولێنەوە. هەستم دەکرد، ژیان لێرەدا، گەییوەتە ئاستی لاڵ بوون، فزەی لێـوە نـایەت. چەرخـی گالیسـکەکان جیڕەجیـڕ بەسـەر بەفـردا دەخـزێن، دەرگـای دووکانـان، شــەق بەیەکـا دەدرێـن، کێـک وشیرینی فرۆشان، بانگەواز بۆ کالاکانیـان دەکەن، بەلام دەنگە بەشــەرییەکان، هێنـدە خەمنـاک و مـردوو وهاوشـیوەن، پیـاو حەزناکات گوێی لێیان بێت.

زەنگی کڵێساکان تازیەبارانە لێیان دەدا. قەتاوقەت دەنگە ترسناک و خەمناکەکانیانم لە بیر ناچنەوە. ئەم دەنگە لە بەیانییەوە تا ئێواریێ، لە ئاسمانی گوزەر و بازاڕەکەدا دەزرینگایەوەو باڵی بەسەر هەموو هەست و سۆزێکی بەشەردا دەکێشا.

بێزارییەکی سارد و سڕ و تاقەتبەر، لە هەموو شتێکەوە پرشنگی دەدا – لە زەوییەوە، لە بەفری کەڵەکەبووی سەر بانەکانەوە، لە خشتی سووری دیواری خانوو و بیناکانەوە. بێزاری لە دووکەڵی دووکەڵکێشە ڕەشەکانەوە، بە نزمی لە ئاسمانی کەوەیی و چۆڵەوە دادەخزی. بێزاری لە لمۆزی ئەسپان و کونە کەپووی خەڵکییەوە شەپۆلی دەدا. ئەم بازاڕە بۆنێکی تایبەتی هەبوو – بۆنی تووند وتیژی قورسی ئارەقە، بۆنی پیوو، دووکەڵ، بۆنی زەیت و کارگی سوورەوکراو. ئیدی پیاو گێژدەبوو، تووشی جۆرە ژەهراوی بوونێک دەبوویت، حەزت دەکرد چاوت بنووقێنیت، تا دەمت دەگریێ هاوار بکەی، بلەز خۆت بگەیەنیتە نزیکترین دیوار تا سەری خۆتی پێدا بکێشیت.

زۆرجار لە سەر وسیمای قەڵەوی بازرگانەکان ورد دەبوومەوە، دەموچاویان گۆشتن و سوور، خەواڵوو بوو. زۆرجار کە باوێشکیان دەدا، ڕێک لەو ماسیانە دەچوون کە فڕیێ دەدرانە کەناران و دەمە داچەقێیان پێدەکەوت.

لە وەرزی زستاندا کاسبی و بازرگانی کەساد بوو، چاوی بازرگانەکان ئەو پرشنگ و گەشییەی هاوینانیان نەدەما. پاڵتۆ قورسەکانیان جووڵەی لە بەر دەبڕین و لە عاردی دەچەقاندن. بە بێتاقەتیەوە قسانیان دەکرد، لەیەکدی تووڕە دەبوون و بەیەکدی دا هەڵدەشاخان – هەموو شتێکیان دەکرد بۆ ئەوەی بۆ یەکتری بسەلمێنن کە هەن، زندوون!

به ڕوونـــی دەمبینـــی هەرهەموویـــان لە ژێـــر بـــاری ئەو بێزارییەدا کە دایگرتبوون، دەتوانەوە، وای بۆ دەچووم هەمـوو ســـەرگەرمییە نـــاخۆش و بێماناکانیـــان، تەنیـــا هەوڵـــێکە بـــۆ ڕەواندنەوەی ئەو بێزارییە.

هەندێجار، ئەم بابەتەم لە گەڵ پیوتر فاسیلیفیچدا باسدەکرد. بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستی لەگەڵ مندا سارد و تەوسامێز بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش، پێی خۆشبوو کە حەزم لە کتێبانە، ناو بە ناو بەجدی تەمەشای دەکردم.

جارێک پێمگوت : - من شێوازی ژیانی بازرگانانم بە دڵ نییە.

لە کاتێکا بەشیک لە ڕدێنی لە قامکییەوە دەئاڵاند، پرسی:

- باشە تۆ چوزانی چۆن دەژین؟ هاتوچۆیان دەکەیت؟ ئێرە شەقامە گیانە، خەڵکی لە شـەقامانا نـاژین. لە شـەقاما بازرگانی دەکەن، یان بلەز پێیدا تێدەپەڕین و بۆماڵ دەڕۆنەوە. خەڵکی لە جادە وباندا بەڕواڵەت و جل و بەرگەکانیانەوە یەکدی دەبینن، لەبەر ئەوە نـــاتوانین حەقیقەتیـــان لە ژێـــر ڕواڵەت و جـــل و بەرگەکانیـانەوە بناسـین. پیـاو تەنیـا لە مـاڵی خۆیـدا بە ئاشـکرا دەژی، ئیدی ژیانی چـۆن دەبێ و چـۆنە؟ ئەمەیـان بە ئاسـانی نازانرێت.

- بەڵام بیرکردنەوەیـــان چ لە مـــاڵەوە وچ لێـــرە هەمـــان بیرکردنەوەو هزرینە.

یارۆی پیرەمێرد مۆرەیەکی لێکردم و بە ڕقەوە گوتی:

- کـێ دەزانـــی دراوســـێکەی بیـــر لەچـــی دەکـــاتەوە؟ بیـــر وهزران، بەقەولی پێشینیان وەکو ئەسپێیە، لە ژمـاردن نـایەت. لەوەیە کەسێک کە دەگاتە ماڵەوە، بکەوێتە سـەر چۆکـان، یـان بەدەم گریـانەوە نـوێژ دابەسـتێ و بکەوێتە لاقە وپـاڕانەوە : " خودایـا لـێم ببـوورە، چـونکە لە ڕۆژی پیـرۆزی تـۆدا خەتـا و

گوناحم کردووە! ' لەوەیە ماڵەکەی بۆ ئەو ببێت بە دێرێک و بەتەنیا لەگەڵ خوادا بژی. هەر جاڵجاڵۆکەیەک (جۆڵاتەنە) گۆشەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، داوی خۆت بتەنە..

کە بەجدی قسانی بکردبا، دەنگی قووڵتر دەبوو، وەکو ئەوە بوو نهێنییەکی گەورەم بۆ بدرکێنێت.

- تۆ زۆر گەنگەشان دەکەیت، تۆ هێشتا منداڵیت، ئەم کارە بۆ تۆ هێشتا زووە. پیاو لەم تەمەنەی تۆدا نابێ بە ئەقڵ بژی، بەڵکو بەچاو بژی. بە گوتەیەکی دی تەمەشا بکە. شت بخە زەینی خۆتەوە، بەڵام زمانت بگرە. ئەقڵ و ئاوەز تایبەتە بە کارکردن، وەکو چۆن ئیمان تایبەتە بە ڕوح! کە بە کەسێک دەگوترێ کتێبان بخوێنەوە، دەبێ ئەوە بزانێت کە هەموو شتێک سنووری خۆی هەیە. هەندێ کەس، بەڕادەیەک خوو دەدەنە خوێندنەوە کە ئەقڵیان لە دەست دەدەن، کە خوای خۆیان لەدەست دەدەن..

بەجۆرێ قسانی دەکرد وام وێنا دەکرد کە مەحاڵە بمرێت. تەسەورم نەدەکرد بگۆڕێت یان پیر ببێت، حەزی دەکرد بە سەرهات وحیکایەتی بازرگانان یان دزان یان ئەو قەڵبەزەنانە (قەڵبەزەن : کەسێ کە پارەی زەغەڵ دروست دەکات) بگێڕێتەوەکە ناو وناوبانگیان دەرکردبوو. گەلێک لەو حیکایەت و سەربووررانەم لە بابامەوە بیستبوو، بەڵام بابام لەم باشتری دەگێڕانەوە. بەڵام بیرۆکەی چیرۆک وحیکایەتەکان هەمیشە هەر هەمان ناوەڕۆک وبیرۆکە بوو: سەروەت و سامان هەمیشە لە ڕێگای فروفێڵ و تەڵەکەبازییەوە بەدەست دەهات، فروفێڵ لە خوا ولە خەڵکی. پیوتر فاسیلیفیچ هیچ خۆشەویستی ومەحەبەتێکی سەبارەت بە بەشەر نەبوو، بەڵام بەو پەڕی میرەبانی و خۆشەویستیەوە باسی خودای دەکرد. کە باسی خودای دەکرد، چاوانی دادەخستن و هەناسەی لە خۆ دەبڕی.

- تەمەشــا خەڵکــی چــۆن خــوای خۆیــان دەخــاپێنن، بەڵام خواوەند یەسـوع دەیانبینێ و بۆیان دەگری: " ئوف، گەلەکەم، گەلەکەم، ئەی گەلە داماوەکەم. دۆزەخ چاوەڕوانتانە! "

جارێــک زاتــم وەبەر خۆنــا وپێمگــوت : - خــۆ تــۆش جووتیاران دەخەڵەتێنی..

توورە نەبوو، بەڵکو گوتی :

- ئم. مـن لە چـاو خەڵکیـا زۆر باشـم! ئەوەی مـن دەیـکەم، شتێکی ئەوتۆ نییە، ئەوپەڕی سێ یان پێنج ڕۆبڵێکم لەوکارە دەست دەکەوێت – کە ئەمە ناکاتە هیچ.

کە بیبینــایە خەریکــی خوێنــدنەوەم، کتێــبەکەی لە دەســتم دەســەند وبە ڕژدیــیەوە پرســیاری نــاوەڕۆکەکەی لێــدەکردم. بەجۆرە حەپەسـانێکی گومانـامێزەوە ئـاوڕی لە فرۆشـیارەکەی لەمەڕ ئێمە دەدایەوە : - تەمەشاکە.. ئەم مەیمـوونە چکۆلەیە لە کتێبان تێدەگات!

ئەوجــا ئــاوڕی لای مــن دەداتەوە و هەنــدێ ئامۆژگــاریم دەکات کە نایەتە لەبیرکردن:

- گــوێ لەم قســـانەی مـــن بگـــرە – زۆر ســـوودی لێوەردەگریــت! دوو قەشــە هەبــوون، هەردووکیــان ناویــان کیریلوس بوو. یەکێکیان قەشەباشی ئەسکەندەریە و دووەمیان قەشەباشی قودس بوو. یەکەمیان دژایەتی خوانەناسی نەعلەتی " نەتوریـوس " ی دەکـرد، ئەم نەتوریوســە نەگریســە، دەنگـۆی ئەوەی بڵاودەکـردەوە کە گـوایە پـاکیزە، ئـافرەتێکی ئەم دنیـای فـانییە و هیچـی دی، ، بـۆیە هەرگیـز نـاتوانێ خـودای ببێـت. بەڵکو ئینســانێکی بــووە بەنــاوی مەســیح و مەســیح فریاڕەســی جیهـانە، ئیـدی بەم پێوەدانگە، نـاتوانین پێـی بڵێـین دایکـی خـوا، بەڵکــو دایکــی مەســیحە. تێــدەگەی؟ ئەمە کوفرگــۆییە. بەڵام کیریلوسەکەی قودس، دژایەتی خوانەناس ئەریوسی کرد..

پێم سەیر بوو کە ئەو هەموو زانیارییەی لەمەڕ مێژووی مەسیحیەت هەبوو، دەستە نەرم و ناسکەکانی بە ڕدێنیدا دێنا و ، بە خۆ هەڵکێشانەوە دەیگوت:

- من لەم مەسەلانەدا جەنەڕاڵم. لە جەژنی سیانەی پیرۆزا چووم بۆ مۆسکۆ تا زمانی ژەهر پژێنی موریدە ڕۆشنبیرەکانی، نیکون بە قەشە وزانایانیانەوە دەمکوت بکەم. گەنگەشەم دەگەڵ زاناترین زانایاندا کرد. تەنانەت یەکێکیان، بەرگەی زمانی منی نەگرت و کەپووی پژا.جا بیهێنە بەرچاوی خۆت!

گۆناکانی ئاڵ بوونەوەو چاوەکانی پرشنگیان دا.

دیاربوو ئەم لووت پژانەی بە گەورەترین سەرکەوتنی ژیانی خۆی دەزانی، یاقووتێکی پرشنگدار بوو لە تاجە زێڕینەکەی سەرفرازییەکانیا. بە ڕاویژێکی سەرکەوتووانە باسی دەکرد:

- گەنجێکی قۆز بوو، بە کەپووی خوێناویەوە لە سەر مینبەرەکە وەستابوو، بێئەوەی بەخۆی بزانێ چ شەرمەزارییەکی بەسەردا هاتووە. دەتگوت شێری تووڕەیە، دەنگی لە دەنگی زلی زەنگان دەچوو. منیش هەر سا نا ساتێ، بە خەنجەری پەیڤ و وشە دام دەدوریەوە.. ئیدی ئەو هاتبووە جۆش و هەژدە هەژدە کوفر گۆییەکانی خۆی هەڵدەڕشت.. بەجۆرێ گەرم بووبوو بە ئامان و زامان سارد نەدەبووەوە. بە ڕاستی ڕۆژانێکی مەزن بوو!

هەندێ پیاوانی ڕوحانی دیکەش. یەکێک لەوانە باخومی بوو، پیاوێک بوو قەڵەو، ورگن، یەکەڵەچاو، ڕوخسار داهێزراو، منگن، هەمیشە پاڵتۆیەکی کۆنی چەوری لەبەر دەکرد. یەکێکی دی پیرەمێرێک بوو بە نێوی لوکیان، ئەمە ڕێوەڵەیەکی لاوازی مشک ئاسا بوو، بەڵام دڵپاک و بە گوڕ بوو. هەمیشە کەسێکی

له گەڵـدا بـوو چوارشـانە، ڕووگـرژ ومـۆن، زیـاتر لە عەرەبـانچیەکی تـووڕە دەچـوو، ڕدێنـی ڕەش، سـیمای وشـک ونەگۆڕ دیاربوو.

ئەمـانە، هەمیشـە کتێبـی کـۆن، ئیکۆنـان و بوخـوردان و ئامانێن کڵێساییان پێدەفرۆشتین. ناوبەناو کەسانی دیکەیـان – چ پیرەمێرد و چ پیرەژنانی ئەوبەری ڤولگایان لەگەڵ خۆدا دێنا – ئەوانـیش شـتی فرۆتەنیـان بـۆ دێنـاین. ئەگەر مـامەڵە و سەودایەکەمان سەری بگرتایە، لە قەراخ نووسینگەکەدا وەکو کەڵەبـابێن سـەر دیـواران هەڵدەنیشـتن، چایـان بە کێـک و شیرینەمەنی و مرەبای میوەوە دەخوارد و باسی زوڵم و زۆر و غەدری کڵێسـا نیکونیەکانیـان دەکـرد. بـۆ نمـوونە ماڵێـک تەحەڕی کـراوە، هەمـوو کتێـبە پیرۆزەکـانی بـردراوە، یـان پەرسـتگەیەک لەلایەن پۆلیسـەوە داخـراوە و هەمـوو پەرستکارەکانی ناویان بە تۆمەتی بن پێ کردنی مادەی سەد وسێ ١٠٣ داوە بە دادگا.

سەری زمان و بنی زمانیان مادەی سـەد وسێ بوو. بەڵام بە نەبەدڵی ئاماژەیان بۆ دەکرد، وەکو ئەوەی شتێکی حەتمی بـێ و هـیچ چـارێکی نەبـێ، ئیـدی زسـتان یەک جـار سەختەووتەواو.

وشە و زاراوەێن پۆلیس، پشکنین، زندان، دادگا و سیبریا – لەو وشانە بوون کە دەهاتنە سەر باسی کول وکۆڤانی ئاینی خۆیـان لە دەمیـان نەدەبـڕا –کە گـوێم لەو وشـانەیان دەبـوو، خەریک بوو ئاگرم تێ بەردەبوو بۆیان. ئیدی زۆر بەزەییم بەو پیرەمێـرانەدا دەهـاتەوە. ئەو کتێبـانەی خوێنـدبوومنەوە فێـری ئەوەیان کردبووم دڵبەندی ئازایەتی مۆڕاڵی ئەو کەسانە بم کە لە پێناوی وەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیاندا کۆڵیان نەدەدا.

ئیدی گوێم بەو کێماسییە شەخسییانە نەدەدا، کە لە بانگخوازانی ئیمانی کۆندا هەبوو، دڵبەندی ئەو سەبر وتەحەمولەیان بووم کە ئیمانێکی بتەو ونەگۆڕی لە پشتەوە بوو، دڵبەندی تەحەمولی ئەو ئازار و ناخۆشیانەیان بووم کە لە پێناوی ئەم مەسەلەیەدا دەیان چەشت.

پاشان، لە ئەنجامی هەڵس وکەوت ودیدارم لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەو خەڵکانە، چ ڕۆشنبیرەکانیان و چ خەڵکە سادە و ساکارەکانیان، بۆم بە دیارکەوت، کە سەبر وهەداری ئەو خەڵکە، دیاردەیەکی نەرێنییە و زادەی سەرگەردانی و چەقبەستن و نەگۆڕی خەڵکەکەیە، و کەمترین مەیل و ئارەزووی پێشڤەچوونیان نییە، کەوتبوونە داو و تۆڕی کۆمەڵێک وشە و زاراوەی نەزۆک و چەمکی سواو و پواوەوە. ئیدی هیچ توانایەکی گەشەکردن و پەرەسەندن و ئایندەخوازیان لە لا نەمابوو. ئەگەر لە ناکاوا ئازاد ببوونایە بە شێوەیەکی میکانیکی، وەکو تاوێرێک لە لوتکە و زناری چیاوە غل ببێتەوە، بەو ئاوایە غل دەبوونەوە و هەڵدەدێران. ئەمانە ئەسیر ودیلی کۆمەڵێک هزر وبیری مردوو بوون، هەمیشە بۆ دواوەی دەبردن، تووشی نەخۆشی خۆدئازار بووبوون، لەزەتیان لە عەزاب و چەوسانەوەی خۆیان دەبینی. ئەگەر عەزابیان لە سەر نەبوایە، گومانیان لە بوونی خۆیان دەکرد، وەکو چۆن بایەکی توند لە ڕۆژێکی خۆشا، هەوران ڕادەماڵێت و بە ئاسمانەوە نامێنن، بەو ئاوایە دەڕەوینەوە و نەدەمان.

بێگومان ئەو ئیمان و باوەڕەی کە ئەوان ئامادەبوون بە کەماڵی ئارەزوو خۆیانی لە پێناودا دابنەن، باوەڕێکی بتەو و نەگۆڕ بوو، بەڵام لە جل و بەرگێکی کۆنە دەچوو کە تۆز و با لەگەڵ خۆی هێنابی وزەمان و ڕۆژگاری بەسەر چووبێت.

ئیــدی هەمــــوو هــــزرین و بیرکـــردنەوەو ســــۆزێکیان لە چوارچێـوەیەکی تەنگـی وەهــم و باوەڕانـدا قەتـیس مـابوو، و بەخۆشیان خوویان پێوەگرتبوو.

ئەم ئیمـانە کە دەبێـت بە خـوو و عـادەت، ئیـدی دەبێـت بە خراتـرین دیـاردەی ژیانمـان. هەمـوو شـتێکی تـازە لە سـایەی کـۆت وبەنـدی ئەم جـۆرە ئیمـانەدا زۆر بەخـاوی، بەخـوار وخێچـی چەکەرە دەکـات، وەکـو ئەوەی لە سـێبەری دیـوارێکی بەردیندا بێت. زۆر بەکەمـی، تیشـکی خۆشەویسـتی ئەم ئیمـانە چـڕە سـێبەرداره دەبڕێت. ئیـدی لە هەمـوو لایەکەوە بەرتیـری تۆڵە و ڕق و بەغیلی دەدرێت، تەنیا ڕق و کینە لە زەمینەی ئەم ئیمان و باوەڕەدا دەڕوێت.

بەلام چـارم ناچـار بـوو، ســالانێکی زۆری پـڕ لە ژیــانی سەخت و دژوار، بگوزەرێنم، ژمـارەیەکی زۆری بتـان بشـکێنم، ژمــارەیەکی زۆری هــزران لە ڕەگ و ڕیشــەوە هەڵکەنــم، تــا قەنـاعەت بەم ڕاسـتیە بێنم. پیـاو ڕاسـت بڵـێ، مـن وەختێـک لە گەرمەی ئەو ژیانە خەمین و ژینگە بێهودەیەی دەوری دابووم بۆ یەکەمجار ئەو ڕوحانیـانەم بینـی، وام وێنـا دەکرد، ئاسـتێکی ئەخلاقـی یەجگـار بەرزیـان هەیە و لە ڕاسـتیدا خـوێی زەویـن. تەقریبەن هەر هەموویان، لە قۆنـاغێکی ژیـانی خۆیاندا دادگا و زندانیان بینی بوو، نەفی کرابوون، شـاربەدەر کرابـوون، دەگەڵ تاوانبـارانی دیـدا ڕێگـای دوور ودرێـژ و سـەختی تاراوگەیـان بـڕی بـوو. هەر هەموویــان ژێراوژێــر ولە دڵــی خــۆدا لە دوودڵیەکی تووندا دەژیان.

بە هەرحـاڵ، وێـڕای ئەوەی لە مومارەسـەی نیکونیەکـان بە گلەیـی بـوون، بەلام خۆشـیان، بە کەمـاڵی ئـارەزوو، یەکتریـان ئازار دەدا..

باخومی یەکەڵە چاو، کە مەست دەبوو، حەزیدەکرد، هێزی یادگە بە ڕاستی زندووەکەی بنوێنێت. هەندێ کتێبی پیرۆزی لەبەر بوو، بە قامکان ئاماژەی بۆ وشەیەکی ناو کتێبەکە دەکرد و ئیدی لەو وشەیەوە، بە دەنگێکی نزم و منگن هەرهەمووی لەبەر دەخوێندەوە. هەمیشە چاوی دەبڕییە ئەرزەکە. تاقە چاوەکەی بە تاسەوە بە چواردەوری خۆیدا دەگێڕا، لە تۆ وایە بۆ شتێکی زۆر بەنرخ دەگەڕێت. هەندێجار پەنای بۆ کتێبەکەی میرمیچیتسکی ˚ هێشووی ڕووسیا ˚ دەبرد تا بەهرەمەندی خۆی نیشانبدات. لە هەموو شتێک زیاتر ئاگاداری ˚ ئازاری شەهیدانی قارەمانی نەترس ˚ بوو. بیوتر فاسیلیفیچ، هەمیشە بۆی لە کەمینا بوو تا هەڵەیەکی لێبگرێت.

- نا، تۆ هەڵەیت! ئەوە لە دەنیسی پاک ڕوویدا نەک لە کیبریانۆسی پیرۆز.

- دەنیس؟ کەس دەنیسی بیستووە؟ ناوی دیونیزیوسە.

- لە سەر ناوەکە مەڕۆ گرینگ نییە!

- تۆش من فێرمەکە!

دوای خولەکێک لێیان دەبوو بە گەنگەشەیەکی توونەد، لە تووڕەییدا سوور دەبوونەوەو خێسەیان لێکدی دەکرد و بە یەکیان دەگوت:

- هەی بەد مەست، هەی چاوچنۆک، تەمەشای ورگت بکە!

باخۆمی، وەکو ئەوەی بە قامکان شتێک بژمێرێت:

- تۆ سابرێنی، فاسق، داوێن پیس، مێباز.

فرۆشیارەکە بسکەی سمێڵی دەهات، دەستی لە بەرکی دەنان و ئەم جووتە پەیڕەوەی ئیمانی کۆنی هاندەدا وەکو ئەوەی دوو قوتابی بن : - جوابی بدەوە! زۆر چاکت کرد!

ڕۆژێـک شــەڕێکی ڕاســتەقینە لە نێـوان هەردوو پیرەمێـردا ڕووی دا، بیـوتر فاسـیلیفیچ، زۆر لێهـاتووانە شــەپەزللەیەکی بە دەم وچـاوی باخۆمیـدا کێشـا و بـاخۆمی بە ناچـاری هەڵات، بەدەم سـڕینی ئـارەقەکەی نێـو چەوانیـیەوە، لە دواوە هـاواری لێکرد:

- ڕاوەسـتە – بـزانە ئەم هەڵەیە چیـت بە سـەر دێنێت! تـۆ کارێکـــت کـــرد کە دەســـت بـــکەمەوەو ئەم هەڵەیە بـــکەم. داناوەشێیت! تەریق نابیتەوە!

زۆر لەزەتـی لەوە دەبینـی کە هاوڕێکـانی بە کەم ئیمـانی و نەرێنی تۆمەتبار بکات.

- ئەلکسندر هانت دەدات، ئەو کەڵەشێرەی دەخوێنێت.

وا دیـاربوو ئەم وشــەی نەرێنیـیە زۆری تـوورە دەکـرد و دەیترساند. خۆ ئەگەر پرسیاری مانـای ئەو زاراوەیەی لێکرابا نەیدەتوانی وەکو پێویست ڕوونی بکاتەوە.

- نەرێنــی، لە بـــابەتی کوفرگـــۆییە، چـــونکە بـــوونی خـــوا دەســـڕێتەوە و نکـــۆڵی لێـدەکات، تەنیـا بـاوەڕی بە ئەقـڵە. بـۆ نموونە قوزاقەکان وەربگرە – ئەمانە جگە لە تەورات باوەڕیـان بە هیچـی دی نییە، ئەو تەوراتەی لە ئەڵمانەکـانی سـاراتوفەوە وەرگیـــراوە – لە لوتەرەکەیـــانەوە وەرگیـــراوە، کە دەربـــارەی دەڵێن: " ناوی خۆی بە خۆیەوەیە، وشەی لوتەر لە لوسـفیرەوە وەرگیـــراوە، لـــوتەری فاســـق " ئەم شـــتانە هەر هەمـــووی لە ڕۆژئاواوە دێت، لە لادەر وبیدعەتچیەکانی ئەوێندەرەوە دێت.

لاقە شـــەلەکەی بە عاردیـــدا دەدات وبەبـــێ موبـــالاتیەوە لە سەری دەڕوات:

- دەبێ ئەوانە سزا بـدرێن، بخرێنەسـەر خـازوق و ئاگریـان تێ بەر بدرێت، نەک ئێمەمانان! ئێمە لە قالو بەلاوە هەر ڕووس

بووین و ئیمانی مه، ئیمانی ڕۆژهه‌ڵاتی ڕاسته‌قینه‌یه، ئیمانی ڕووسی تا سه‌ر مۆخ. به‌ڵام ئیمانه‌که‌ی دی هه‌رهه‌مووی له ڕۆژئاواوه هاوه‌رده کراوه – له هزرینی ئازادی خواروخێچه‌وه، له ئه‌ڵمانه‌کانه‌وه، له فه‌ره‌نسیه‌کانه‌وه. ئاخر ئه‌وانه که‌ی شتی باشیان لێوه‌شاوه‌ته‌وه؟ تۆزێک ئاوڕی دواوه بده‌نه‌وه، ئاوڕێک له ساڵی ١٨١٢ بده‌نه‌وه..

ئه‌وه‌نده گه‌رم ده‌بێت، بیری ده‌چێت که قسه بۆ کوڕێکی منداڵکار ده‌کات، ده‌سته به‌هێزه‌که‌ی ده‌خاته‌به‌ر پشتێنه‌که‌م جاریٚ بۆلای خۆی ڕامده‌کێشێت و جارێک له خۆیم دوور ده‌خاته‌وه. به‌جۆش وخرۆشێکی گه‌نجانه‌ی سه‌یره‌وه له سه‌ری ده‌ڕوات:

- حیکمه‌تی مرۆڤ له‌و جه‌نگه‌ڵه‌دا که به خۆی دروستی کردووه گومڕا ده‌بێت، وه‌کو گورگێکی دڕنده گومڕا ده‌بێت، ئیدی شه‌یتان کارێک ده‌کات خودی به‌شه‌ری تیا بچێت، که ئه‌م خوده‌گه‌وره‌ترین به‌خششی خودایه. بزانه ئه‌و شه‌یتاندۆستانه چییان داهێناوه! با ڕێنماییه‌کانی ڕوحانیه که‌چه‌ڕه‌و وبیدعه‌تچیه‌کانت بۆ باس بکه‌م، گوایه ئیبلیس کوڕی خوایه، برا گه‌وره‌ی مه‌سیح یه‌عوسه – جا ته‌سه‌وری ئه‌وه بکه! ئه‌وانه خه‌ڵکی هانده‌ده‌ن، به‌گژ ده‌سه‌ڵاتا بچنه‌وه، کاره‌کانیان فه‌رامۆش بکه‌ن، ده‌ستبه‌رداری ژن و منداڵه‌کانیان ببن، ئینسان هیچ ئه‌رکێکی له ئه‌ستۆ نییه – بیٚ نیزامی – با به ئاره‌زووی خۆی بژی، یان به ئه‌مری شه‌یتان بژی. ئاه، دیسان ئه‌لکسندر، ئه‌و مێرووه کلۆله په‌یدا بووه‌وه.

فرۆشیاره‌که‌ی له‌مه‌ڕ خۆمان، ناو به ناو بانگی ده‌کردم که فلان یان فیسار کار بکه‌م، یارۆی پیره‌مێرد، له‌و ده‌مانه‌دا که من به‌ده‌م کاره‌که‌وه ده‌چووم، به ته‌نیا له‌به‌ر ده‌رگاکه

دەمایەوە، درێژەی بە قسەکانی دەدا، قسەی بۆ بۆشاییەکەی دەوروبەری خۆی دەکرد:

- ئاە، ئەی نەفس و خودی بێ باڵ! ئاخ ئەی گوجیلە کوێرەکان، بۆ کوێ بفڕم و ماوایەک بۆ خۆ بدۆزمەوە!

ئەوسا، سەری بەرز دەکردەوە، چاوی دەبڕییە ئاسمانە کەوەییە زستانییەکە و، هەردوو ناو لەپی لە سەر هەردوو ئەژنۆی دادەنان.

بەرە بەرە، بە تێپەڕبوونی زەمان زیاتر لێم نزیک بووەوەو زیاتر بایەخی پێ دەدام. هەرکاتێ بیدیتبا کتێبێکم بەدەستەوەیە و خەریکی خوێندنەوەم، دەستی بەشانما دەدا و دەیگوت:

- ئافەرین، کوڕی باش بخوێنەوە، خێر لە خوێندنەوە دەبینیت. وادیارە ئاقڵیت، مخابن گوێ لە خەڵکی لە خۆت گەورەتر ناگریت، بەڵکو تووشی هەرکەسێک دەبیت، بەگژیا دەچیت. بەڕای خۆت ئەم ڕەفتارە خراپە بەرەو کوێت دەبات؟ بەرەو تاوانت دەبات کوڕی باش. بەڵێ. بەردەوام بەلەسەر خوێندنەوە، بەڵام ئەوەت لە بیربێت - کە کتێب، تەنیا کتێبە، دەبێ هۆش وبیرت بخەیتەگەڕ. مامۆستایەک لە نێو فیرقەی (خلیستی) یەکان دا (خلیستی: فیرقەیەکی سۆفیاتی بوو لە ئاخر وئۆخری سەدەری هەڤدە و سەرەتاکانی سەدەی هەژدەدا، لە ڕووسیا دورستبوو) هەبوو ناوی دانییل بوو، قەناعەتی وابوو، کە کتێبان بەکۆن و نوێیانەوە، بێ سوودن، بۆیە هەر کتێبێکی چەنگ کەوتبا، تووڕی دەدایە ڕوبارەوە. دیارە ئەو ڕەفتارە لە ئەقڵ بەدوور بوو. ئەلکسندریش، ئەم شەڕخوازە، بەردەوام یاری بە ئەقڵی خەڵکی دەکرد.

زۆرجار باسی ئەم ئەلکسندرەی دەکرد. جارێکیان خۆی بە دووکانەکەدا کرد، سیمای نیگەران دیاربوو، ڕوویکردە فرۆشیارەکەمان و گوتی:

- ئەلکسندر لێرەیە، لە شارە – دوێنێ هاتووە. هەموو شوێنێکی لە دوو گەڕام، بەڵام نەمدۆزییەوە. خۆی شاردووەتەوە، تاوێک لێرە دادەنیشم، ئێ بەڵکو بێرەدا تێبپەڕێت..

فرۆشیارەکەمان، بە ڕاوێژێکی دژمنانەوە گوتی: - هیچ کەس و شتێک ناناسم!

پیرەمێرد سەری لەقاند وگوتی :

- چاکە. تۆ جگە لە کڕیار و فرۆشیاران کەسی دی ناناسیت.. بەلای تۆوە جگە لەو دوو توێژە هیچ کەسێکی دی نییە. دەتوانی چایەکم بۆ بکڕی..

وەختایەک بە سەماوەرە مسەکەوە، کە تەژی ئاوی گەرم بوو گەڕامەوە، چەند میوانێکی تازەم لە دووکانەکەدا بینی. یەکێکیان کوکیانی پیر بوو، بە ڕواڵەتی کەیفی قنج بوو. لە گۆشە تاریکەکەی پشت دەرگاکەوە، کابرایەکی غەریب دانیشتبوو، کە جووتێ پووتی درێژی لبادی لە پێدا بوو، پاڵتۆیەکی گەرمی پشتێن کەسکی لەبەر بوو، شەپقەیەکی لە سەری توونــد کردبوو، کە تا سەرچاوەکانی هێنابوویە خوارەوە. هەرچەند پیاوێکی خاکی و ئارام بوو، بەڵام ڕەزا قورس و ئێسک گران بوو. لە شاگرد دووکانێک دەچوو کە تازە لە کارەکەی دەرکرابێت و ئەم بویەرە تەواو پەرێشان و پەشێوی کردبێت.

بیوتر فاسیلیفیچ، بێئەوەی ئاوڕی لای کابرا غەریبەکە بداتەوە، زۆر بە ئارامی و سەنگینی شتێکی دەگێڕایەوە، کەچی کابرا غەریبەکە لێکدا لێکدا بەدەستی ڕاستی یاری بە کڵاوەکەی دەکرد. وەکو یەکێک بیەوێ نیشانەی خاچ بکێشێت، دەستی بەرز دەکردەوە، بەڵام تەنیا کڵاوەکەی بە ئاستەم دەجوڵاند وهیچی دی، ئەو جووڵەیەی دووبارە و سێ بارە کردەوە، تا

ئەنجام بە پشتە سەریا شۆڕ دەبووەوە و لەزگ بوو بکەوێت، ئەوسا دووبارە دەیهێنایەوە سەرچاوەکانی. ئەم حەرەکەتەی ئەو بڕێک بیرەوەری کۆنی دەربارەی ئیگوشا شێت " مەرگ لە گیرفان " لەلا زندوو کردمەوە.

بیوتر فاسیلیفیچ گوتی:

- زۆرن ئەو ماسییانەی لە ئاوە لیٖلەکانی مەدا مەلە دەکەن و هێندەی دی لیخنی دەکەن.

ئەو کابرایەی کە لە شاگرد دەچوو، بە ڕاوێژێکی ئارام و نەوی پرسی: - مەبەستت منە؟

- ئەگەر مەبەستم تۆبێ چییە؟

کابرا دووبارە، بەڵام بەتووندی پرسی : - ئەدی بۆ باسی خۆت ناکەی برادەر؟

- من باسی خۆم تەنیا بۆ خودا دەکەم- ئەوە پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە.

کابرای غەریب بە راوێژێکی سەرکەوتووانە گوتی:

- نەخێر، برادەر ئەوە پەیوەندی بە منیشەوە هەیە. نە خۆت لە گێلی بدە و نە غروور کوێرت بکات، چونکە خەتا و گوناح، چ لای خوا و چ لای خەڵک هەر ناپەسند و گەورەیە!

زۆرم پێخۆش بوو کە بە (برادەر) بانگی پیوتری دەکرد، هەروەها دەنگە ئارامەکەیم بەدڵ بوو. وەکو چۆن ڕەبەنێکی دڵپاک نوێژی " ئەی خوای گەورە، ئافەرێنەری ئەم جەستەیە.. " دەخوێنێ و بە دەم نوێژەکەیەوە، خۆی بۆ پاش و پێش ڕادەژەنێ، دەست بە دەم وچاویا دێنێت، بەو ئاوایە قسەی دەکرد.

- بۆچی سەرکۆنەم دەکەیت؟ خۆ من لە تۆ گوناحبارتر نیم.. دەرزیەک بە خۆتا بکە و ئەوجا سوژنێک بە خەڵکیدا بکە..

پیوتری پیر، بۆ ئەوەی ڕەوتی قسەکە بشێوێنێت گوتی:

- سەماوەرەکە گیزەگیزیەتی خەریکە هەڵدەچێت!

کەچی یارۆی غەریب، بێئەوەی گوێ بە قسەکەی ئەو بدات، لە سەری ڕۆیی:- خودا دەزانێت، کێ لە کێ زیاتر سەرچاوەکانی ڕوحی قودس لیخن دەکات. ڕەنگە ئەوە خەتا و هەڵەکەی تۆبێ، خەتا و هەڵەی خەڵکانی خوێنەوار و ئامۆژگار، ئەوانەی لە کتێباندا غەرق بوون. من نە سەر لە کتێبان دەردەکەم و نە خوێندەواریم هەیە، مرۆڤێکی سادە وساکار وخاکیم..

- من ئاگام لەم ساکاری و خاکەڕاییەی تۆ هەیە – زۆرم لە بارەیەوە بیستووە!

- ئێوە، یاری بە ئاوەزی خەڵکی دەکەن، ئێوەی کتێب خوێن، ئێوەی فرەزان، کە بیرە سادەکان دەشێوێنن. بەڵام من.. دەتوانی پێم بڵێی چ دەزانم؟

پیوتر فاسیلیفیچ گوتی : - کەچرەوانی بیدعەتچی! (هەرتوقیەکان.)

بەڵام یارۆی غەریب، هەردوو دەستی بەرزکردنەوە و لە بەرچاوی خۆیدا ڕایگرتن، وەکو ئەوەی شتێکیان لێ نووسرابێ و بیخوێنێتەوە، بەجدی لە سەری ڕۆیی:

- باشە تۆ پێت وایە، بەوەی کە خەڵکی لە تەویلەیەکەوە بۆ تەویلەیەکی دی دەگوازیتەوە، حاڵیان باش دەکەیت؟ من دڵنیات دەکەم کە وانییە! من پێت دەڵێم- خۆت ئازاد بکە ، ئەی مرۆڤ، ئاخر ماڵەکەت، ژنەکەت، هەموو دار ونەدارت لەبەردەم خوادا دەکاتە چی؟ خۆت ئازاد بکە ئەی مرۆڤ، لە هەر هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە مایەی زەبر و زەنگ و کوشتن – لە زێڕ و، لە زیو و لە هەموو سەروەت وسامانێک، چونکە هەر هەمووی وەکو دەڵێن چلکی دەستە! ڕزگاری مرۆڤ لەم دنیایەدا نییە، بەڵکو لە دۆڵ وشێوەلانی بەهەشت دایە! من پێت دەڵێم : چاو

لە هەمووشتێک بپۆشە، هەموو پەیوەندییەکان، هەموو کۆت و بەنــدەکان، هەمــوو ئەو شــتانەی بەم دنیــاتەوە گرێــدەدات، وەلاوەی بنە، چونکە هەرهەمووی دەستکردی مەسیحی دەجال و درۆزنە. مـن بەرێگـا ڕاسـتە تەنـگەکەدا دەڕۆم، بە ورەیەکـی بەرزەوە هەنگاو دەنەم، پشت لەم دنیایە دەکەم..

کابرای پیرەمێر، بە تووڕەیی قسەکەی پێبڕی:

– باشــە پشــت لە نــان و ئــاو و پۆشــاکیش دەکەیــت؟ خـۆ ئەمانە هەمووی هی ئەم دنیایەیە!

ئەم قسانە کاریان لە ئەلکسندر نەکرد، بەڵکو زۆر بەگەرمـی لەســەر قســەکردنی خـۆی بەردەوام بـوو. بە ڕاوێژێکـی هێدی، وەکو ئەوەی فوو بە بۆقیەکی مسیندا بکات، گوتی:

– گەنــج و گەنجینەکانــت لە کــوێن ئەی مــرۆڤ؟ گەنــج و گەنجینان تەنیا هی خوایە. بە پاشەڵ پاکی لە بەردەمیا بوەستە، گۆتی ئەم دنیایە لە خـۆت دامـاڵە، تەمەشـای خـوای خـۆت بکە : تـۆ بەتەنیـا، ئەو بەتەنیـا! ئەوا دەتـوانی لە خـوای خـۆت نزیـک ببیتەوە، چونکە تەنیا یەک ڕێگا بۆلای خـوا دەڕوات! لە کۆنەوە گوتوویـانە : هەوڵبـدە بەوەی لە داک وبابـت دوور بکەویـتەوە، دەســتبەرداری هەمـوو شــتێک ببیـت، خـۆت ڕزگـار بکەیـت! لە پێنـاوی خـوادا جەسـتەی خـۆت بکـوژە و خـودی خـۆت ڕزگـار بکە، خـودی خـۆت، نەفسـی خـۆت، بـۆ هەتـا هەتـایە لە تیشـکی میهر ومەحەبەتی خوایی هەڵکێشیت و لە روناکیدا بژیت..

پیوتر بەدەم هەستانەوە گوتی:

– تفو! بە نەحلەتی خـوا بی! لە پارەوە وام وێنـا دەکـرد کە بەرەبەرە فامـاتر دەبیـت، بەڵام وادیـارە لە هەمـوو کـاتێکی دی خراتریت..

پیرەمێر، بە شەلەشەل بەرەو ڕاڕەوەکە ڕۆیی، ئەلکسندر بەوە نیگەران بوو. بەسەرسامی و بەپەلە گوتی : - دەڕۆیت؟ بەلام – چۆن؟

لوکیان، چاوێکی لێداگرت وگوتی : - قەینا، قەینا!

ئەلکسندەر، بە تاو بەرەو لایئەو چوو:

- تۆش، هەڵەوەرێکی ئەم جیهانەیت، تۆوە نەزۆکەکانت دادەچێنی. ئاخر ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ دووجار لە سەلاوات بدری یان سێ جار.. (پەیڕەوانی ئیمانی کۆن، لە کاتی نوێژدا دووجار سەلاواتیان دەدا، بەلام پەیڕەوانی نیکون، سێ جار سەلاواتیان دەدا.)

لوکیانیش بە دەم بزە پێکەنینەوە بەرەو ڕاڕەوەکە چوو، یارۆی غەریب ڕوویکردە فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان و بە قەناعەتەوە گوتی:

- کاریگەری ڕوحیم بە سەریانەوە زۆرە، ئەم دووانە، وەکو چۆن دووکەڵ، لە ئاگر هەڵدێ، بەو ئاوایە هەڵدێن..

فرۆشیارەکە، نێوچاوانی تێک نا و ژێراو ژێر تەمەشایەکی کرد و بەبێزارییەوە گوتی: - من هەقم بەسەر ئەو شتانەوە نییە.

یارۆی غەریب، سەری لەو قسانە سوڕما، کلاوەکەی هێنایە سەرچاوی و لەبن لێوانەوە گوتی:

- چۆن دەتوانی هەقت بەسەر ئەو شتانەوە نەبێت؟ ئەم شتانە... پێویستە پیاو خۆی لێیان هەڵقورتێنێت..

بۆ چەند سائێک، بە بێدەنگی لەوێ دانیشت، سەری لەبەر خۆی نابوو، پاشان جووتە پیرەمێردەکە گازیان کرد. بەسێ قۆڵی بەبێ ئەوەی سلاو بکەن ڕۆییشتن.

کابرای غەریب، وەکو پشکۆیەک لە تاریکی شەودا، هەڵ دەبوو ودەکوژایەوە، جۆرە قەناعەتێکی سەبارەت بە پشتکردنە ئەم دنیایە لەلا دروستکردبووم.

ئەو ئێوارەیە دەرفەتم هانی و ئەو شتەم بۆ ئیڤان لاریونیچ گێڕایەوە، لاریونیچ، پیاوێکی هێدی و هێمن بوو، سەرپەرشتیاری کارگەکە بوو، کە لە قسەکەم بوومەوە، گوتی:

- دیارە دەبێ لە هەڵاتووەکان بێت- هەڵاتووەکان تایفەیەکن بە هیچ جۆرێ، هیچ شتێک قەبووڵ ناکەن.

- ئەدی چۆن دەژین... وێڵ و سەرگەردان دنیا دەدەنە ژێر پێیانەوە، هەر لەبەر ئەوەشە پێیان دەڵێن هەڵاتووەکان. ئەمانە دەڵێن دەبێ پشت بکرێتە زەوی و هەموو شتێکی سەر زەوی، پۆلیس ئەمەیان لێ قەبووڵ ناکات، دەیانگرێت..

ژیانم تا بڵێی تاڵ بوو، بەڵام وێڕای ئەمەش هەرچی سەرم دێنا و دەبرد، لەوە حاڵی نەدەبووم. چۆن مرۆڤ دەتوانێت پشت لە هەموو شتێکی سەرزەوی بکات. لەو سەروبەندەدا، زۆر شتم لە ژیانی دەروروبەری خۆدا دەبینی کە ئازیز و شایستەی بایەخ پێدان بوو، ئیدی زوو وێنەی ئەلکسندر لە زەینمدا کوژایەوە. بەڵام ناو بە ناو، لە کاتی تەنگانەدا، بەدیار دەکەوت. بەناو کێڵگە و لێرەوارەکاندا تێدەپەڕی. بە دەستە سپیەکانی، کەکار نەی غاراندبوون، خێرا خێرا کڵاوەکەی بە پشتا دەبرد و لە بن لێوانەوە دەیگوت:

- من بەڕێگە دروست و تەنگەکەدا دەڕۆم و پشت دەکەمە هەموو شتێک. هەموو پەیوەندییەکان بپچڕە..

باوکی خۆم، بە هەمان شێوەی نەنکم لە خەونەکانیا دەی بینی، لە تەنیشت ئەوەوە دەبینی، کە گۆچانێکی دارزانی بەدەستەوە بوو، سەگێکی بەڵەکی بەدواوە بوو، کە زمانی بستێک دەرهێنابوو.

## (١٦)

کـارگەی ئیکۆنەسـازییەکەی مە، لە دوو ژووری بینـایەکی گەورەی بەردینـدا بـوو. یەکێک لە ژوورەکـان پێنج پەنـجەرەی تیابوو، سیانیان بەسـەر مەیدانەکە و دووانیان بەسـەر باخەکەدا دەکرانەوە. کەچی ژووری دووەم تەنیا یەک پەنـجەرەی تیـابوو بـڕوانیتە سـەر ڕێـگەکە و پەنجەرەیەکـی دیکەشـی تیـابوو کە دەیـڕوانییە بـاخەکە. پەنجەرەکـان بچکۆلەبـوون، شووشـەی پەنجەرەکـان ئەوەنـدە کـۆن و گەرد وتـۆزاوی بـوون، تیشـکی کزی زستانە بە ئەستەم لێیانەوە دەهاتە ژوورەوە.

هەردوو ژوورەکە پڕ بوون لە مێز، هەر مێزێک نیگارکێشێ دووانی بەسەرا دانەوی بوونەوە. چەند گۆیەکی شووشـەی پڕ ئـاو بە پەت بە مـیچەکەوە بەسـترابوون و شـۆڕکرابوونەوە بـۆ ئەوەی تیشــکی ســپی و ســاردی چراکــان لە ئیکــۆنە چوارگۆشەکانی سەرمێزەکان بدات .

کەش و هەوای کارگەکە زۆر گەرم بوو، پیاو خەفە دەبوو. نزیکەی بیست نیگارکێش، کە لە شـوێنانی وەک بـالیخ، خولـوی و مسـتیراوە هـاتبوون، لێرەدا یەکیـان گرتبوو، هەر هەموویـان کراسی خامەکی یەخەکراوە و پانتۆڵی کەتانیـان لەبەربوو، یـان گــۆرەوی جاویـان لەپـێ دەکــرد یــان بە پــێ خاوســی دەسـووڕانەوە. دووکەڵـی شـینباوی جـگەرەو تـووتنی خراپـی خۆماڵی، لە ژوورەکەدا پەنگابووەوە، بۆنی زەیتی وشکەوەبوو، بۆیە و هێلکەی پیس پیاوی گێژ دەکرد. گۆرانییەکی میللی باوی شـارۆچکەی فلادیمیـر، بە خـاوی لەم هامـاج وجەوەوە بەرز دەبووەوە:

*ئاە چ خەڵکانێکی بێ غیرەتن*
*هەر کوڕە وبە بەرچاوی خەڵکیەوە،*

*کیژان ڕادەمووسن.*

گۆرانی دیکەشیان دەگوت، بەڵام زۆر ناخۆش بوون، ئەو گۆرانیە گۆرانی دڵخوازیان بوو. ئیدی ئاوازە خاوەکەی نە بیرکردنەوەی پیاوی دەشێواند و نە تەڤگەری فلچەی ڕادەگرت، کە لە مووی فسۆس دروست کرابوون، ئەو فلچانەی کە هێڵە گشتیەکانی پێ دروست دەکرا یان توێی جلەکانی وەلیان و پیاوچاکانی پێ ڕەنگ دەکرا، یان سیمای ژان و ئازاری بە ڕوخسارە لاواز و ڕەقەکانەوە بەرجەستە دەکرد، دەنگی چەکوشەکەی " گوگولیف " کە پیرەمێرێکی سەرخۆشی کەپوو سووری دفناک بوو، لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە. لێدانی تووندی چەکوشەکە، بووبوو بە ڕیتم بۆ گۆرانیە خاوەکە، لە زیکەزیکی مێروویەک دەچوو لە قەدی درەختێک وڕوکابێت.

کەس گوێی بە وێنەکێشانی ئەم ئیکۆنانە نەدەدا. بلیمەتێکی بەد نیاز ئەم کارەی دابەش کردبوو بەسەر زنجیرەیەک عەمەلیاتی خاڵی لە هەر جوانیەک، ئیدی مەحاڵ بوو پیاو هەست بە کەمترین مەیل و خۆشەویستی بۆ ئەم کار و پیشەیە بکات. " بانفیل "ە خێلی دارتاش کە پیاوێکی بوغزنی بە تەوس و توانج بوو، جۆرەها تەختەی دار سەروو یان زەیزەفونی سیقال کراوی بۆ دێنایەن.

داڤیدوف کە گەنجێکی سیلاوی بوو سکێچی تابلۆکانی ئامادە دەکرد، " سوروکین " ی هاوڕێی ڕەنگی دەکردن. میلیاخین، بەقەڵەم لە سەر تابلۆ ڕەنگ کراوەکە، وێنەیەکی لەبەر وێنە ئەسڵەکە وێنە دەکێشا، ئەوسا گوگولیفی پیر دەکەوتە ڕەنگکردن و ڕوتوشکردنی. هەنگێ نیگارکێشەکان دەستیان بە ئامادەکردنی دیمەنەکان و جل وبەرگی قەدیسەکان (وەلی) دەکرد و ئەوسا وێنەکان، بەبێ دەست و ڕوخسار بە

دیوارەکانەوە هەڵدەپەسێردران، تا پۆرترێت سازەکان بێن و تەواوی بکەن.

زۆرجار دیتنی ئەم ئیکۆنانە کە دەبوا لە سەر ڕەفەی ماڵان و میحرابی کڵێسایان هەڵبواسرێن، دەبووە مایەی بێزاری، بە تایبەتی کە بە بێ سەر یان دەست یان لاق لەوێ دانرابوون – ئیدی دیاربوو کە تەواو نەکراون – زیاتر لە جل وبەرگ یان ئەو کراسە کورتانە دەچوون کە فریشتە لە بەریان دەکرد. ئەم تابلۆیانە هەستی مردنیان دەهاڕوژاند : خاڵی بوون لەو ژیانەی کە دەبوو بژی. بەڵام ژیانی ڕابردووی پێوە دیاربوو.

کە هەموو کارەکان تەواو دەبوون و، تابلۆیەکە ڕادەستی کرێکارانی تایبەتی دەکرا، بۆ ئەوەی دوا قەڵەمکاری بکات و چوارچێوە زێڕینەکانی جەلایی بکات. ئەوجا دەدرا بە کرێکارێکی پسپۆڕ، تا چەند وشەیەکی گونجاوی لە سەر بنووسێت، هەڵبەتە گونجاو لە گەڵ ناوەڕۆک و چیرۆکی ئیکۆنەکەدا. ئەنجام ئیڤان لاریونیچی بەڕێوەبەری کارگەکە بەخۆی جەلایی دەکرد. ئەمە پیاوێکی هێمنە، ڕدێنی پاک سپی بووبوو، نەرم دەتگوت ئاورێشمە، چاوە کەوەییەکانی خەمێکی نائاساییان نیشتبووە سەر. ناسکە بزەیەک بە سەر لێویەوە دیاربوو. کە تەمەشات دەکرد، ڕێک لە ئیکۆنەکەی قەدیس سیمون دەچوو، وەکو ئەو لاواز و بابردەڵە بوو. چاوەکانیشی، هەمان بێ موبالاتی چاوەکانی ئەویان پێوە دیاربوو.

تازە چەند ڕۆژێک بوو هاتبوومە کارگەکە و دەستبەکار بووبووم، نیگارکێشی بەیداخان هات، فوول سەرخۆشبوو نێوی کاپندیوخین بوو، قوزاقێکی خەڵکی دون بوو، کابرایەکی قۆزی بە خۆوە بوو. هەرکە هاتە ژوورەوەو نەهاتە ژوورەوە، بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک، بە مستە پۆلایینەکانی بەربووە کرێکارەکان، دانی بە جیڕەوە بردبوو و چاوە جوانە ژنانیەکانی

بچووک کردبوونەوە، بەبالا مامناوەندی وزراڤەکەیەوە بە ناو کارگەکەدا دەسووڕایەوە، دەتگوت پشیلەیەکە وکەوتووەتە ناو عەمارێکی پڕ لە مشکەوە. کرێکارەکان حایر وحەپەساو خۆیان لە گۆشـە وکەنـاری ژوورەکەدا توونـد کردبـوو، هاواریـان لە یەکدی دەکرد : - بیدەن بە ئەرزا!

ئیدی ' یەڤگینی سیتانوف ' ی پورترێتساز، تەپلەکێکی کێشا بەسەر کابرای بەد مەستدا و لە ئەرزەکەدا خپی کرد، یارۆی قوزاقی تەختی ئەرزەکە بوو. کرێکارەکان بەرهەقیان کرد، بە خاولی و دەستەسڕان دەست ولاقیان بەست، ئیدی کابرا بە ددان کەوتە دڕینی خاولی و دەستەسڕەکان. یەڤگینی زۆر لەم ڕەفتارە تووڕە بوو، خۆی هەڵدایە سەر مێزێک وهەردوو دەستی نانە کەلەکەی و ئامادەبوو خۆی بدات بە سەر کابرای قوزاقی دا، یەڤگینی زۆر زەلام و بە کەلەش بوو، لەوە بوو بە مستێک کاپندیوخین بکوژێت، بەڵام باش بوو لەو کاتەدا لاریونیچ هات بەسەرا، پاڵتۆکەی لەبەر و کاسکێتەکەی لەسەر بوو، هەڕەشەی لە سیتانوف کرد و ڕوویکردە ئەوانی دیکە و، بە ڕاوێژێکی ئارام و جدی گوتی : - بیبەنە ڕاڕەوەکە، وازی لێ بێنن تاوەخۆ دێتەوە..

نیگار کێشەکان، یەکسەر کابرای قوزاقیان لە کارگەکە بردە دەرەوە، مێز وکورسیەکانیان ڕێکخستەوە، دەستیان بەکاری خۆ کردەوە، کەوتنە باس و گەنگەشەی هێز و قوەتی کاپندیوخین و پێیان وابوو ئەم پیاوە ئەگەر لە سەر ئەم حاڵە بەردەوام بێ، لە یەکێک لەم شەڕە زۆر و زەبەندانەیدا دەکوژرێت.

سیتانوف، زۆر بە ئارامی، وەکو یەکێک زۆر شارەزای بابەتێک بێ و فرەبیری لێکردبێتەوە، گوتی : - کوشتنی زۆر زەحمەتە.

تەمەشـايەکی لەزگینـی ٬ لاریـونیچ ٬م کـرد، نەمـدەزانی ئەم هەموو کرێکارە تووڕە و بەهێزانە بۆچی بە گوێیان دەکرد و بەو ئاسانیە ڕادەست دەبوون.

زۆرجـار ڕێنـوێنی دەکـردن کە دەبـێ چـۆن کـار بـکەن، کـارامەترین نیگـارکێش، بە ڕێـزەوە گـوێی لە ڕێنوێنیەکـان وئیرادەکـانی دەگـرت و بە گـوێی دەکـرد. لە هەمـووان زیـاتر ڕێنوێنی کاپندیوخینی دەکرد و دەیگوت:

- تـۆ خـۆت بە هونەرمەنـد دەزانیـت. دەبـێ بە شـیوازی ئیتاڵیـایی کاربکـات، ژیـان بخـاتە بەر کارەکـانی، کارەکـانی لە ژیان بچن، وێنەی زەیتی، دەبێ لە ڕووی هێڵکاری و ڕەنگەوە، هاوسـەنگی تەواوی تیابێ، تۆ تەمەشای ئەم ڕەنگە سپیە بکە کە لێرەت داناوە: بۆیە چاوەکانی مریەمـی پاکیزە ساردوسـڕ و مـردوو گێـژ ووێـژ و شـڵەقاو دێـنە بەرچـاو. گۆناکـانی خـڕ وسـوورن، چاوەکـانی لە گەڵ گۆناکانیـا نـاگونجێن. شـوێنی چاوەکـانی تەواو نـین - یەکێکیـان لە کەپـوویەوە نـزیکە و ئەویتریـان چـووە بەلای لاجانگیـدا، ئیـدی هـیچ شـوێنەوارێکی مەزەبـی و پیـرۆزی بە ڕوخسـاریەوە بەدی ناکرێـت، زیـاتر چاوی دنیایین تا ئۆلی بن. کاپندیوخین، تۆ وەک پێویست بایەخ بە کارەکەت نادەیت.

یـارۆی قـوزاق، بەدەم گـوێگرتنەوە سـەر لەبەر خـۆ دەنێـت، ئەوجا بێ هیچ تەریق بوونەوەیەک بزەیەکی بۆ دەکات وچاوە ژنانیەکانی دەگەشێنەوەو ئەوجا بە دەنگێکی مەستانە بەرسـڤ دەداتەوە:

- ئیڤـان لاریـونیچ، گەورەم، دەزانـی هـۆیەکەی چیـیە؟ ئەم کارە کاری من نییە، من بە موزیسیونی لەدایک بووم و ئێستا دەیانەوێ جبەی قەشایەتیم لەبەر بکەن.

- بەشەر ئەگەر خۆی بیەوێ، لە عۆیەی هەموو کارێک دێت و فێری دەبێت.

- ئەوە من نیم، من ئاوارتەم. شتی وا لە من ناوەشێتەوە. دەبوایە من عەرەبانچی بوایەم، جووتێ ئەسپی باڵدارم لە بەردەست بوایە!

ملی قوت دەکاتەوەو گۆرانیەکی درێژی ناخۆش دەڵێت:

*بەپەلە عەرەبانەکەم ئامادە دەکەم*
*دوو ماین و ئەسپە کوێتی لێدەبەستم،*
*بڕۆ بە چوارناڵە*
*بۆماڵەوە،*
*کە یاری لێیە.*

ئیڤان لاریوفیچ بزەیەکی نە بەدڵی بۆ دەکات، عەینەکەکەی لە سەر لووتە شینەکەی ڕێکدەخاتەوە و ئەوجا لە یارۆی قوزاقی دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە دەرەوە، لە ناکاوا دە دەنگ هەمان گۆرانی دەڵێنەوەو دەبێ بە گەرەلاوژەیەک لە تۆ وایە کارگەکە لە سەر هەمان ڕیتم و نەزم دەکەوێتە سەما :

*ئەسپەکان ڕێگاکە دەزانن*
*دەزانن کە ماڵی دڵدارەکەم*
*لە کوێیە..*

پاڤل ئودینتسوف ی شاگرد بە دەم جیاکردنەوەی زەردێنە وسپێنەی هێلکەوە، کە هەر بەشێکی توێکڵە هێلکەکە بەدەستێکیەوەیە بە دەنگێکی ناسک بەگەڵ کۆرسەکە دەکەوێت.

ئیدی هەموو کرێکارەکان، خۆیان و کارەکانیان لەبیر دەکرد، دەچوونە یەک قاڵبەوە، دەبوون بە یەک ڕوح، یەک سۆز و گوداز کۆی دەکردنەوە، هەموو چاویان دەبڕییە یارۆی قوزاقی، ئیدی کە هەڵیدەکردە گۆرانی، دەبوو بە گەورەی بێ هەڤرکی کارگەکە، هەموو ئاوڕی لای ئەویان دەدایەوە و

نەیاندەویست بچووکترین حەرەکەتی ئەویان لەکیس بچێت، بەجۆرێ دەست و بازووەکانی دەجولاند لە تۆوایە دەیەوێت بفڕێت. خەڵکەکە وەها دەخرۆشان، دڵنیابووم ئەگەر لەو کاتەدا گۆرانییەکەی ببڕابایە و بیگوتبا: " وەرن با هەموو شتەکان بشکێنین " ئەوا هەموو کرێکارەکان، بە جدیترین وەستایانەوە، بێهیچ بیرکردنەوەیەک بەگوێیان دەکرد و لە چاو نوقانێکدا کارگەکەیان ژێر وژوور دەکرد و داریان بەسەر بەردییەوە نەدەهێشت.

زۆر بە دەگمەن گۆرانی دەگوت، بەڵام کە گۆرانی گوتبا ئیدی دەنگی بەسەر هەموو شتەکاندا زاڵ دەبوو. بەجۆرێ کاری لە خەڵکەکە دەکرد، خەمبارترین کەسی دێنایە جۆش.

من بەش بەحاڵی خۆم، لە ناخی ناخەوە دەهاتمەجۆش، بەغیلیم بە گۆرانی بێژەکە دەهات کە بەو ڕادەیە کاری لە خەڵکەکە دەکرد. بەڕادەیەک خەمبار دەبووم و دڵم پڕ دەبوو، حەزم دەکرد بگریم یان بە دەنگی بەرز هاوار بکەم و بە گۆرانیبێژەکە بڵێم: " هەربژی، خۆشم دەوێی! "

داڤیدوڤی سیلاوی، ڕەنگ زەرد، تووکن، تا دەیتوانی زاری دەکردەوە، لە فەرخە قاژوویەک دەچوو تازە لە هێلکە دەرهاتبێت.

بەڵام تەنیا یارۆی قوزاقی ئەو گۆرانیە شاد و خۆشانەی دەزانی و دەگوت. نیگارکێشەکان، کۆپلەی خەمناک و خاوی وەکو " خەڵکی دڵرەقن " یان " لەباخ و لێران " ویان ئەو گۆرانیەی بۆ مردنەکەی ئەلکسندەری یەکەم گوترابوو " چۆن تزار هات بۆ سەردان و بەسەرکردنەوەی هێز و لەشکرە ئازاکەی " یان دەگوت.

هەندێجار، لە سەر داوای چیخاروف، باشترین پورترێتسازی کارگەکەمان دەستیان بە خوێندنی سروودێن

کڵێسایی دەکرد. بەڵام مەگەر بەدەگمەن دەنا لە هیچ یەکێک لەو سروودانەدا سەرکەوتوو نەدەبوون. چیخاروف، هەمیشە حەزی لەو ئاوازانە بوو کە هەر خۆی لێیان حاڵی دەبوو، بەردەوام ئیرادی لە گۆرانی گوتنی خەڵکانی دی دەگرت.

چیخاروف، پیاوێک بوو باریکەلەی لاواز، تەمەنی چل و پێنج ساڵیک دەبوو، تەپڵی سەری ڕووتابووەوە قژێکی لوولی قەرەجیانە دەوری دابوو، برۆ چڕەکانی لە سمێڵ دەچوون. ڕدێنێکی چڕی درێژی هەبوو کە دەم وچاوی درێژتر دەنواند، ڕوو وڕوخساری بە هیچ جۆرێ لە ڕووسان نەدەچوو، کەپووە درێژە دەندووکە داڵاشیەکەی بەسەر سمێڵەکانیا قوت بووبووەوە. چاوە شینەکانی جیاواز بوون – بە ئاشکرا چاوی چەپی لە چاوی ڕاستی گەورەتر بوو.

بەدەنگە بەرز و گڕەکەی هاواری لە باشکا (پاڤل)ی شاگردی دووەم کرد: – پاڤڵ! ' ناوت هەر بەرز و پیرۆز بێ خودایە ' بخوێنە. گەلۆ ئێوەش گوێ بگرن!

باشکا، هەردوو دەستی بە بەرکۆشەکەی سڕی و دەستی بە خوێندن کرد:

– با... نا... وت... هەر..

چەند دەنگێک پێکەوە بەرز بووەوە : – ئەی دا... ی... کی... خوا..

کەچی چیخاروف بە هەڵچوونەوە هاواریکرد :

– تۆش لەوێی سیتانوف! دەنگت نەوی بکە تا لە ناخی دەروونتەوە دەربێت!

سیتانوف، دەنگی هەڵبڕی، دەنگی چی دەتگوت لەبنی بەرمیلێکی بەتاڵ دەدەیت:

– ئەی بەندەێن خ... و... ا..

- تفو، وانا ! دەبێ بەجۆرێ بخوێنی کە زەوی بلەرێتەوە، دەرگا و پەنجەران لە خۆڕا، خۆ بە خۆ بکرێنەوە!

چیخاروف، بە هەڵچوونێکی گۆنگەوە ئاوڕی دایەوە، برۆ سەیرەکانی بەرز ونزم دەبوونەوە، دەنگی دەلەرزی، قامکەکانی دەجولان. بە ڕاوێژێکی بەماناوە پرسی:

- ئەی بەندەێن خوا – نابینی؟ دەبێ تا سەر مۆخ هەستی پێ بکەیت، با ناوی خوا هەر بەرز و پیرۆز بێ، خەڵکینە! ناتوانن هەست بەوە بکەن؟

سیتانوف، بە نەزاکەتەوە گوتی:

- ئێمە هەرگیز بە دروستی ئەوەمان درک نەکردووە، بۆ زانیاری تۆ.

- دەی باشە با واز لەوە بێنین!

چیخاروف، گەڕایەوە سەر کارەکەی، تا ڕادەیەک پەست و تووڕە بوو. چیخاروف کارامەترین کرێکارو وەستامان بوو – دەیتوانی وێنەی دەم وچاوێک بەهەموو شیوازێکی بیزەنتی یان فەرەنسی یان ئیتاڵی بکێشێت. هەرجارێ لاریونیچ، داوای ئیکۆنەیەکی لێکرابا، بەبێ ڕاوێژی چیخاروف کە لە هەمووان پتر شارەزای کارێن ئەسڵ بوو، هیچ قەرارێکی نەدەدا. هەموو ئیکۆنە و شەمایلە ئالۆز و گرانبەهاکان، ئەوانەی لەبەر بەرهەمەکانی تیودوروف کازان و سمولنگ و.. هتد گیرابوونەوە، بەو دەسپێردران و هەر ئەو دەیتوانی ئەنجامیان بدات. بەلام هەرکاتێ بە دەوری مودێلەکانیا دەسووڕایەوە، بە ناڕەزاییەوە هاواری دەکرد:

- بزانە چۆن بەم مودێلانەوە گیرۆدەیان کردووین، ئەم مودێلبازیە، داهێنان دەکوژێت، ئەفراندن لە بەین دەبات.

هەرچەندە پێگەیەکی گرینگی لە کارەکەدا هەبوو، بەلام لەوانی دی خاکیتر بوو، دەگەڵ شاگرد و کرێکارەکاندا،

بەتایبەتی لەگەڵ پاڤل ومندا، بە لوتف تر و میهرەبانتر بوو. تاقەکەس بوو کە حەزیدەکرد فێری ئەو هونەر و پیشەیەمان بکات.

پیاوێکی گونگ بوو. بە شێوەیەکی گشتی پیاوێکی کراوە و ڕووخۆش نەبوو، جاری واهەبوو یەک هەفتەی تەواو، بەبێ ئەوەی ورتەیەکی لێوەبێ، وەک ئەوەی کەڕ ولاڵ بێ، کاری دەکرد. بەجۆرێ تەمەشای دەکردین، وەکو ئەوەی یەکەمجار بێ بماندینێت. لەو کاتانەدا ئیدی دەمی تێک دەنا و بە کێردیش هەڵنەدەپچڕا، هەرچەندە زۆری حەز لە گۆرانی بوو، بەڵام وادەهاتە بەرچاو گوێی لە گۆرانی خەڵکانی دی نەبێت. هەموو تەمەشایان دەکرد، بە دزییەوە چاویان دادەگرت. سەرقاڵ و مژوول بە سەر ئیکۆنەیەکەوە داهاتبووەوە، سەرێکی تابلۆکەی نابووە سەر هەردوو ئەژنۆی و سەرەکەی تری نابوو بەقەراخ مێزەکەی بەردەمیەوە، بە فڵچە ناسکەکانی سیمای پورترێتێکی دەکێشا، وەکو سیمای خۆی تاریک و غەریب بوو. لە ناکاوا، بە توورەیی دەیگوت:

- بریدتیچا – ئەم وشەیە مانای چییە؟ ' تیچ ' لە زمانی سلاڤی کۆندا مانای (ڕۆیی) دەگەیەنێ. بەڵام ' برید ' مانای (پێشتر) دەگەیەنێ. ئیدی ' بریدتیچا ' مانای ' زوو ڕۆیشتوو ' واتا هەڵاتوو، هەر ئەو مانایە دەدات و تەواو..

هەموو بە بێدەنگی زاربەش دەکەنەوە، بەنیگای خێرا دایدەبێژن، وشە سەیر و غەریبەکان، لە گوێدا دەزرینگێنەوە :

- نەدەبوو لە پێستی مەڕدا ڕەسم بکرابا، دەبوو باڵی لێنرابا..

یەکێک لە ئامادەبووان، ڤیروسیا دەکات و دەپرسێت : - ئەوە باسی چیدەکەیت؟

وەڵام ناداتەوە، ئیدی یان لەبەر ئەوەی گوێی لە پرسیارەکە نەدەبــوو، یــان دەعــیەی نەدەهــات وەڵام بــداتەوە، دووبــارە قرِوقەپی دەکرد. وشەکانی لە بێدەنگیدا نقووم دەبوون.

- پێویســتە ژیانیــان بــزانین. کــام ژیــانە؟ ئەوەی لە کتێــبە پیرۆزەکاندا تۆمـار کراوە؟ ئێمە بە تەنیا دەژین – بەبێ باڵ.. کوا نەفس – نەفس؟ من ئەوەتـان لێ دەپرسـم! ئێمە مودێل و ئەسڵەکەمان لەلایە، ئەمە ڕاستە. بەڵام بەبێ دڵ..

هەمــوو ئامــادە بــوون، بەو بیرۆکــانە بزەیــان دێتــێ تەنیــا سـیتانوف نەبێـت. یەکێکیـان بە تەوســەوە دەڵێـت : - شــەوی شەممە دەخواتەوە..

سـیتانوف، گەنجێکـی بیسـت و دووسـاڵانی دەم وچـاوخڕی بــێ ڕدێــن و تەنــانەت بــێ بــرۆش بــوو، بــاڵای بەرز بــوو، لە ئــارەقەدا هەڵکشــابوو، مەنــد وخەمــین دەیــڕوانییە ســووچێکی کارگەکە.

ئێســـتاش لە بیـــرمە، جارێـــک چیخــــارۆف کە لە تەقلیـــدی شـــــەمایلێکی مریەمـــــی، دەســــــتکردی تیـــــودورف بـــــووەوە، شەمایلەکەی (ئیکۆنە) خستە سەر مێزێک وگوتی :

- ئەی پاکیزەی پیرۆز! هەنووکە حازر و ئامادەیت. تۆ لە ئامانێکی بێ بن دەچیت، کە هەمـوو ڕونـدکی تـاڵی هەڵقوڵاوی دڵی تیرەی بەشەر لەودا دەدرەوشێتەوە..

هەنگــێ دەســتی بــرد، پــاڵتۆی یەکێــک لە نیگارکێشـــەکانی هەڵگرت، دای بەشانیا و مەیخانە خۆت بگرە واهاتم. کوڕەکان دەستیان بە پێکەنین کرد. یەکێکی بە تەمەنیان هەناسـەیەکی پڕ لە بەغیلی هەڵکێشا، بەڵام سیتانوف، چوو بۆ لای ئیکۆنەکە، بە وردی لێی ورد بووەوە، گوتی:

- بێگومان دەخواتەوە، خۆی مەست دەکات، بۆیە دەخواتەوە چونکە لە تابلۆکەی بووەتەوە، لە سووی دابڕانە، دابڕان لە تابلۆکەی. هەموو کەسێک لەم هەڵوێستە تێناگات..

نۆرە خواردنەوەی چیخارۆف هەمیشە شەمموان بوو، وەنەبێ، وەکو نیگارکێشەکانی دی، بە حوکمی ڕاهاتن و ئالوودەبوون بخواتەوە. خواردنەوەکانی ئەو بەمجۆرە دەستی پێدەکرد : بەیانی پارچە کاغەزێکی بچووکی دەنووسی و بە پاڤل دا دەینارد. ئەوجا پێش وەختی فراڤین دەچوو بۆلای لاریونیچ و دەیگوت : - ئەمڕۆ بۆ حەمام دەڕۆم.

- زۆرت پێدەچێت؟

- ئا، وابزانم..

- تکایە، تا ڕۆژی سێ شەممە زیاترت پێنەچێت!

چیخاروف، سەرە سافەکەی دەلەقاند و برۆکانی وێک دێنانەوە. کە لە حەمام دەهاتەوە، جلە جوانەکانی لەبەر دەکرد، بۆینباخی دەبەست. زنجیرێکی زیوی درێژی بە ئێلەکە ئاوریشمەکەیەوە دەبەست و بە دەم ڕۆیشتنەوە بە پاڤل ومنی دەگوت:

- ئەمشەو کارگەکە جوان بشۆن، مێزە درێژکەش جوان پاک بکەنەوە!

ئیدی خۆشییەکی کوت وپڕ باڵی بە سەر هەمووانـدا دەکێشا، نیگارکێشەکان دەبوژانەوە و جلەکانیان خاوێن دەکردەوەو دەچوون بۆ حەمام و شێوێکی بەپەلەیان دەخوارد. دوای شێو، چیخارۆف بە بیرە و مەی و مەزە و خواردنەوە پەیدا دەبوو، ژنێکی بەکەلەشی بێ ڕەزا، کە باڵای دوو مەتر دەبوو، بە تەپەتەپ دووی دەکەوت، کورسیەکانمان لەچاو ئەوا دەتگوت یاری مندالانن، بگرە سیتانوف، بە هەموو درێژییەکی خۆیەوە، لەچاو ئەوا دەتگوت مندالێکی چکۆلەیە. ئەم ژنە زۆر

زەلام بوو، مەمکەکانی لەبەر چەناگەیا کەڵەکە بووبوون. لە جم وجـولا زۆر خـاو بـوو. دەم وچـاوە خـڕەکەی، بەچـاوە گەورەکـانیەوە کە لە چاوانی ئەسـپ دەچـوون، وێڕای ئەوەی تەمەنـی چـل سـاڵان بـوو، هێشـتا هەر تەڕ وتـازە بـوو، دەمە چکۆلەکەی دەتگـوت بە قەڵەم و فلـچە دروسـتکراوە، لە دەمـی بـوکەڵەێن هەرزان بـایی دەچـوو. ئەم ژنە خەنـۆڵ و دەم بە خەندەیە، دەستە زەلام و گەرمەکانی بۆ هەمووان درێژ دەکرد و تەوقەی دەگەڵ دەکردن و بەبێ ئەوەی پێویست بکات زیاد لە پێویست مجامەلەی دەکردن :

- چـۆنن باشـن؟ ئەمـڕۆ دنیـا سـاردە. ئەم بـۆنە چیـیە لە ژوورەکەتـان دێـت – وادیـارە بـۆنی شـەمایلەکانە. ئـێ حاڵتـان چۆنە؟

دیمەنـی ئەم ژنە دەچـووە دڵەوە، لەبەر دڵان بـوو، ژنێکـی تۆکمە و تێکسمڕاو بوو، مەنگ وەکو ڕوباری ڕەوان بوو. بەڵام کە قسەی دەکرد، ئەوە نەبوو، پیاو لێی بێزار دەبوو، جگە لە قسەی تورەهـات هیچی دی نەدەزانی. پێش ئەوەی قسـەبکات، گوپە ئاماڵ سوورەکانی پڕبا دەکرد، دەم وچاوی هێندەی دی خڕ دەبوو.

گەنجەکان، لە قاقایان دەدا و لە بن لێوانەوە دەیانگوت : - چ ئەسپە ژنێکە!

- هەر بۆ ئەوە باشە بکرێ بە بورج و منارەی کلێسا!

لە پشـت سـەماوەرەکەوە، لە بەردەم مێـزەکەدا دادەنیشـت، لێوەکـانی کـۆدەکردنەوەو باسـکەکانی لە ژێـر مەمکەکـانی دا دەخسـتە سـەریەک، بەچـاوە درشـتە جوانەکـانی تەمەشـای هەمووانی دەکرد.

هەمـووان بەڕێـزەوە مامەڵەیـان لە تەکـدا دەکـرد، بگـرە گەنجەکـان کەمێکیش لێـی دەترسـان. ئەگەر گەنجێک بەچاوی

تەماحەوە سەیری جەستە قەڵەوەکەی بکردبایە، بە ڕێکەوت نیگای، لە نیگای زیتەڵی ئەو هەڵەنگوتبا، چاوی دادەخست و سەری لە بەرخۆ دەنا و لە شەرما هەموو گیانی وەسەر ئاو دەکەوت.

جیخاروفیش بە ڕێزەوە مامەڵەی لە تەکدا دەکرد، بە وشەی کۆ، واتە ئێوە یان " هاوسێ " بانگی دەکرد، هەرجارێ شتێکی بدایە پێی، لەبەری دەنوشتایەوە. ژنەکەش بە ناسکی دەیگوت:

- خۆت لەبەر من سەغڵەت مەکە. خەجاڵەتم. بەڕاستی زۆر خۆت سەغڵەت دەکەیت!

بە ڕواڵەت پەلەی هیچ ئیش وکارێکی نەبوو، بازووەکانی تەنیا لە ئانیشکەکانیەوە دەجولان، باقیەکەی بە کەلەکەیەوە نووسابوو. جەستەی بۆنی نانی گەرم و تازەی لێدەهات.

گوگولیفی پیرەمێرد، لە پەستاو بێپسانەوە ستایشی دەکرد، لەبن لێوانەوە ، هەر ورتە ورتی بوو، لە تۆوایە شەماسەیە و نزا و نوێژان دەخوێنێت، ژنەش بەدەم ناسکە بزەیەکەوە گوێی لێدەگرت.

چەند گوگولیف، ستایشی دەکرد، ئەویش (ژنەکە) دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکرد:

- کە منداڵ بووم جوان نەبووم، کە تەمەنم گەیە سێساڵان ئیدی بە تەواوەتی گۆڕام، بووم بە مایەی سەرنج، تەنانەت خانەدانەکانیش هەستیان بەوە کرد، یەکێکیان بەڵێنی ئەوەی دامێ کە عەرەبانەیەک و جووتێ ئەسپم پێشکەش بکات..

کاپندیوخین، کە لەو کاتەدا مەست دەبێت، بەقڕی بڕەوە خێسەیەکی لێدەکات وبەتووندی دەڵێت : - لە هەنبەر چییا، هەربە خۆڕایی؟

ژنەکە دەڵێت : - هەڵبەتە لە هەنبەر خۆشەویستی مندا.

کاپنـــدیوخین، دەپرتێنـــێ و بە نـــاڕەحەتی دەڵێـــت:- خۆشەویستی، مەبەستت لە خۆشەویستی چییە؟

ژنە، زۆر بە سادەیی بەرسڤ دەداتەوە :

- گەنجێکـی قـۆزی وەکـو تـۆ پێویسـتە هەمـوو شـتێک سەبارەت بە خۆشەویستی بزانێت.

کـارگەکە لەبەر قاقـای پێکەنـین دەلەرێـتەوە، سـیتانوف، بەگوێی کاپندیوخین دا دەچپێنێ :

- ئەم ژنە گەوجە.. لە گەوجـیش خراتـرە. کـوڕم دەوێ بتوانێ بکەوێتە داوی ئەشقی ئەم ژنەوە، ئیدی ئەمە گەنگەشەی ناوێ..

بەهۆی مەیەکەوە دەم وچاوی گرژ بوو، ئارەقە نیشـە سـەر لاجانگەکانی، گڕ لە چاوە زیتەکانی دەبووەوە. گوگولیفی پیر، کەپووە دزێوەکەی دەجولێنێت و بە قامکەکانی چاوە لێڵەکانی دەسڕێت و دەپرسێت : - چەند منداڵت بووە؟

- یەک کوڕ..

چرایەک بە سەر مێزەکەدا شـۆڕ بـووەتەوە، یەکێکـی دی لە گۆشـەیەکی پشـتی مـوغەیرییەکەوە دەگـرێ، ڕونـاکی کـزی چرایەکـان هەمـوو گۆشـەیەکی کارگەکەیـان پـڕ کـردووە لە سـێبەتی بـێ دەم وچـاو. پەڵەی ڕەش جێگـای دەسـت و دەم وچاویـــان گرتـــووەتەوە و وەهمـــی ســـەیر دەخەنە دڵ و دەروونەوە، لە هەرکاتێکی دی زیاتر ئەو وەحیەی دەدایـێ کە جەسـتەی ڕوحانیـان و وەلیـان هەر دوو ژوورە تاریکەکەیـان چـۆڵ کـردووە و جلە بۆیاخکراوەکانیـان لە دوای خـۆ بەجـێ هێشـتووە، تـۆپە شووشـەییەکان بە بـن مـیچەکەوە شـۆڕ بووبوونەوەو لە ناو چەڕە دووکەڵدا، شین دەچوونەوە.

چیخـاروف، بەردەوام بەدەوری مێـزەکەدا دەسـووڕایەوە، ڕۆڵی خانەخوێی دەگەڵ هەموو ئامادە بووەکاندا دەبینی، سەرە

سـافەکەی جـاریَ بەلای ئەمـا و جـاریَ بەلای ئەودا دادەنەوانـدەوە، قـامکە ڕەق و تەقەکـانی لە جـوولەی بەردەوامـدابوون. تەواو لاواز بووبـوو، لـووتە دەنـدووکە دالاشیەکەی هێندەی دی باریک بووبوو، کە لەلای ڕوناکیەکەوە دەوەستا، سێبەری کەپووە درێژەکەی لا ڕوومەتی دادەپۆشی.

بە دەنگە زولاڵەکەی دەیگوت : - گەلۆ، بە ئارەزووی دڵی خۆتان بخۆن وبخۆنەوە!

ژنەکە، وەکو ئەوەی گەورەی کوڕەکە بیَ، دەیگوت:

- بۆچی خـۆت سـەغڵەت دەکەی دراوسـیَ؟ هەریەکێک لە ئامـادەبووان بـازووی خـۆی و توانـای تـایبەتی خـۆی هەیە، هەرکەسە و بەگوێرەی توانای خۆی دەخوات!

چیخاروف، بە هەڵچوونەوە هاوار دەکات:

- گەلۆ بیَ دڵی خۆ مەکەن! هەمووومان بەندەی خوداین، با بە یەکـدەنگ ئەم سـروودە وەخـوێنین: " نـاوت هەر بەرز و پیرۆز بێت " .

خوێندنەکە، زۆرخراپ ناکامْ دەبێت، هەمووان لە خواردن و خـواردنەوەدا مـڕ بووبـوون. کاپنـد یـوخین، دەسـت دەداتە ئوکوردیونێک، ڤیکتور سالوتین کە گەنجێکی گرژ ومۆن بوو، دەفێک دەگرێت بە دەستەوە، لێی دەدات وزنجیر و پلپلەکانی دیوی ناوەوەی دەزرنگێنەوە.

چیخاروف ئەمر دەکات : - سەمایەکی ڕووسی لێبدەن!

ئـاوڕی لای ژنەکە دەداتەوە و دەڵێـت : - هاوسـیَ نافەرمووێت!

ژنە هەڵدەسـتێت و دەڵێـت : - تـۆ زۆر خـۆت سـەغڵەت دەکەیت!

بەرەو ناوەنـدی ژوورەکە دەڕوات و لەوێنـدەر دەوەسـتێت، تۆکمە وزەلام دەڵێی بـورج و منـارەی کڵێسایە. تەنوورەیەکی

قاوەیی دەڵب و ئێلەکێکی لۆکەی زەردی لەبەرە و دەسماڵێکی سووری لە سەرییەوە ئاڵاندووە.

ئوکوردیۆنەکە ئاوازێکی خۆش لێدەدات، زەنگۆڵە چکۆلەکانی دەزرینگێنەوە. دەفەکە دەنگێکی ناخۆشی قورس وخەمناکی ئەوتۆی لێ بەرز دەبێتەوە کە گوێچکە دەتۆرێنێت، وەکو ئەوەیە شتێک بگری، داخ و ئاخ هەڵکێشێت، سەری خۆی بە دیواردا بدات.

چیخاروف، سەمای باش نەدەزانی. هەردوو پێی دەبردنە پێشەوە، پاژنەی هەر دوو پووتە بریقەدارەکەی دەکوتا بە عاردیدا یان سووک وەکو بزن بەجۆرێ هەڵدەبەزییەوە کە بە هیچ جۆرێک دەگەڵ ڕیتمی موسیقاکەدا تێکی نەدەکردەوە، وا دەهاتە بەرچاو لاقەکانی هی خۆی نەبن، بەدەنی بە شێوەیەکی زۆر دزێو دەلەراندەوە، دەتگوت ماسیەکە کەوتووەتە تۆڕەوە، بە ڕاستی دیمەنێکی خەمناک بوو. بەلام هەمووان – بەسەرخۆشەکانیشەوە – بەدیقەت تەمەشای هەڵپەڕینەکەیان دەکرد وچاویان بریبووە ڕوخساری ودەستەکانی. سیمای چیخاروف، بە شێوەیەکی سەیر دەگۆڕا، جاری وا هەبوو ناسک و شەرمن بوو، جاری واهەبوو لووت بەرزو فڕناخ و قۆرە دەماخ بوو، هەندێجاریش گرژ و مۆن و خوێنتاڵ بوو. لەوە دەچوو شتێک لە ناکاوا بیترسێنێت، هاواری دەکرد و چاوی دەنوقاند، کە دووبارە چاوی دەکردنەوە، لە تۆوایە خەم باڵی بەسەریدا کێشاوە. هەردوو دەستی دەنوقاندن و لە ژنەکە نزیک دەبووەوە، پاشان لە بەردەمیا دەکەوتە سەر هەردوو چۆکان، هەردوو پێی بە عاردیدا کوتان، هەردوو باڵی کردنەوە. برۆکانی وێک هێنانەوە، بزەیەکی گەرمی بە ڕوودا دەدات. ژنەی تاین لێی ورد دەبێتەوە، ناسکە

بزەیەکی بۆ دەکات، بە هێمنی ئاگاداری دەکاتەوە : - خۆت دەفەوتێنی هاوسێ!

دەیەوێت، بەنازەوە چاوەکانی بنوقێنێت وخۆی تاقیبکاتەوە. بەلاّم چاوەکانی، کە هەر یەکێکیان بە ئەندازەی دراوێکی سێ کۆپیکی دەبوون، بەدەنگیەوە نایەن و نایەنە نوقاندن، ئیدی چرچ و لۆچەکانی دەوری چاوی هێندەی دی ناشیرینی دەکەن.

ژنەش، سەماکارێکی ناکام بوو. هەموو هونەرێکی ئەوەبوو کە جەستە زەلامەکەی بە ئەسپایی دەهەژاند و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی دەچوو. دەستەسرێکی بە دەستی چەپیەوە گرتبوو و بە خاوی بای دەدا، دەستی ڕاستی لە سەر سمتی بوو، ڕێک لە جەڕەیەکی گەورە دەچوو.

دەم وچاوی چیخاروف، کە بە بەردەوامی بەدەوری ئەم پەیکەرەدا دەسووڕایەوە، خێراخێرا دەگۆڕا. لەوە دەچوو هەر ئەو بەتەنێ لێرەدا نەڕەقسێت، بەڵکو دە زەلام لێرە بڕەقسن هەمووشیان لێکدی جیاوازبن. یەکێکیان شەرمن و خاکییە، دووەمیان گرژ ومۆن و ترسناکە، سێیەمیان لە شتێک دەترسێت و بەدەم هاوارێکی چکۆلەوە هەوڵدەدات لەم ژنە زەبەلاحە قێزەونە ڕزگاربێت. پیاوێکی دی لە ناکاوا بەدیار دەکەوێت، وەکو سەگێکی بریندار خۆی لوول دەکات، ئەم ڕەقس و سەما ناشیرینە بێتاقەتی دەکردم و کۆمەڵێک بیرەوەری خراپی لەمەڕ سەربازان و کارەکەران و جلشۆران و دەڵەبەبای وەبیر دێنامەوە.

قسە ئارامەکانی سیدوروفم وەبیر هاتنەوە:

" هەموو بەشەرێک لەم مەسەلانەدا درۆیان دەکات. شەرم دەکەن، تەریق دەبنەوە، چونکە هیچ کەسێک نییە بە ڕاستی خۆشەویستی بکات. تەنیا بۆ ڕابواردن ئەو شتە دەکەن. "

نەمدەویست باوەڕ بەمەی کە ٠ هەموو بەشەریک لەم مەسەلانەدا درۆ دەکات ٠ بکەم. ئەدی شاژنە مارگۆ؟ دڵنیام چیخاروف درۆ ناکات. دەمزانی سیتانوف کچێکی سەرجادەی خۆش ویست ولەرێگەی ئەوەوە تووشی نەخۆشیەکی نەنگین بوو، بەڵام سیتانوف بە ڕاوێژی هاورێکانی لە سەر ئەو شتە نەک لێی نەدا، بەڵکو زوورێکی بەکرێ بۆی گرت وکەوتە چارەسەرکردنی، بەردەوام بە ئەدەب و میهرەبانیەکی تایبەتیەوە باسی دەکرد.

ژنە زەلامەکە، هەر لەوێندەر خۆی بادەدا، بزە دەستکردەکەی هەموو دەم وچاوە پانەکەی گرتبووەوە، دەستەسرەکەی دەستی شەپۆلی دەدا، چیخاروف بە دەوریا دەسووڕایەوە، بەدەم تەمەشاکردنی وانەوە، بیرم دەکردەوە : تۆ بڵێی حەوا، کە خودی خوای هەڵخەڵەتاند، وەکو ئەم ئەسپە بووبێ؟ ئیدی هەر لە خۆوە ڕقم لێی بووەوە.

ئیکۆنە بێ دەم وچاوەکان لە سەر دیوارە تاریکەکەوە تەمەشایان دەکردین، شەوی تاریک باڵی بە سەر شووشەی پەنجەرەکاندا دەکێشا، هەردوو چراکە، بە ئەسپایی لە ناو کارگە خەفەکەدا دەگران. ئیدی زێدەباری دەنگی تەپەتەپی پێیان و ژاوەژاوی دەنگەکان، دەمتوانی گوێم لە دەنگ و تکەتکی ئەو ئاوە بێت کە بە خێرایی لە ئامانە مسینە گەورەکەوە، دەتکایە ناو تەنەکەی خۆڵەکە.

بەراستی ئەم ژیانە لەگەڵ ئەو ژیانەدا کە لە کتێباندا خوێندبوومەوە، ئاسمان و ڕێسمان بوو! جیاوازییان یەجگار زۆر بوو! زۆری پێنەچوو، بێزاری بەسەر هەمووواندا زاڵ بوو، کاپندیوخین ئوکوردیونەکەی لە دەستی سالوتین، دەرهێنا و هاواری کرد:

- دەی با کارێک بکەین لەوحەکان دووکەڵیان لێبەرز ببێتەوە!

وەکو فانکاتسیگانوف هەڵدەپەڕی، لە تۆ وایە بە حەوادا دەفڕێ، ئەوجا پاڤڵ ئودینتسوف و سورکین چەند هەنگاوێکی لەز وجوانیان نا، تەنانەت داڤیدوڤی سیلداریش بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، بەهۆی تەپ تۆز و دووکەڵ و بۆنی ڤودکای ترشاوەوە دەکۆکی ئەمما کۆکین!

ئیدی بەو جۆرە بە دەم هەڵپەڕکێ وگۆرانی وهاوارەوە بەردەوام دەبوون. بەڵام وام هەستدەکرد، هەر بە ڕواڵەت ئاسوودە و خۆشحاڵ بوون، بەدرۆوە خۆیان شاد و خۆشحاڵ دەنواند. سیتانوف، کە سەری گەرم بووبوو، بە نێو ئامادەبووواندا دەسووڕایەوە، بەڕاوێژێکی مەستانە دەیپرسی : - چۆن دەتوانێ ژنێکی وای خۆش بوێ. ها؟

وام دەهاتە بەرچاو، چیوای نەماوە لە هۆڕژنی گریان بدات.

لاریونیچ، شانە ڕەق وتەقەکانی با دەدات و وەڵام دەداتەوە:

- لە خەڵکی دی خراتر نییە. تۆ هەقت چییە؟

بەڵام هەر زوو ئەو جووتەی باسیان دەکردن، دیار نەمان.

سیتانوف، بە نیگا خەمینەکانی ژوورەکە دادەبێژێت و دەپرسێت : - ئەو جووتە ڕۆیشتن.

بەڕاستی ڕۆیشتن، من دەزانم کە چیخاروف، تا دوو یان سێ ڕۆژی دی بۆ کارگە نایەتەوە. کە بێتەوە، دوای چوونە حەمام، ئیدی لە سووچەکەی خۆیا، کڕوکپ، مەند و گۆشەگیر، دوو دانە هەفتە ونیو، بەسەر کارەکەی خۆیدا کڕ دەکەوێ.

سیتانوف، دەم وچاوێکی داهێزراوی هەبوو، هیچ جوانیەکی تیانەبوو، تەنیا چاوە ساف و گەشەکانی نەبێت.

لەگەڵ مندا زۆر بە لوتف بوو، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ دەفتەرە ئەستوورەکەم کە پڕ بوو لە شیعر. ئەم پیاوە باوەڕی

بەخوا نەبوو. زەحمەت بوو لەو کارگەیەدا، بزانرێ کێ باوەڕی پێی هەبوو و خۆشی دەویست جگە لە لاریونیچ. هەمووان بە تەوسەوە باسی خوایان دەکرد، ڕێک وەکو چۆن کرێکارەکان باسی وەستا و خاوەن کارەکانی خۆیان دەکرد. وێڕای ئەوەش کە لە سەر خوانی خواردن دادەنیشتن هەموویان نیشانەی خاچیان دەکێشا و کە دەچوونە ناو جێگاوە وێردیان دەخوێند و هەرهەموویان ڕۆژانی یەک شەمموان دەچوونە کڵێسا.

بەڵام سیتانوف، ئەو سرووتانەی نەدەکرد و بە خوانەناس دادەنرا. بە دڵنیاییەوە دەیگوت:- خودا نییە.

- ئەدی، ئەم هەموو شتە لە کوێوە هاتووە، سەرچاوەکەی چییە؟

- نازانم.

جارێک پێمگوت : - چۆن دەبێ خوا نەبێت؟

باسکە درێژەکەی بۆ سەر سەری هەڵبڕی و ئاماژەی بۆ ئەرزەکە کرد و وەڵامی دامەوە:

- دەبینی، خودا بەرزاییە، مرۆڤ قوڵاییە. وانییە؟ بەڵام گوتراوە: " خوا بەشەری لە سەر شێوەی خۆی دروستکردووە ". باشە گوگولیفی لە سەر شێوەی کێ دروستکردووە؟

دەمم بەسترا. گوگولیفی مەیگوسار و پیس و پۆخڵ، هەرچەندە بە تەمەن بوو، لە هیچ گوناحێک نەدەپرینگایەوە. هەروەها خوشکەکەی نەنکم بیرکەوتەوە، یرموخینی سەربازی خەڵکی فیاتکام بیرکەوتەوە، ئاخر چ شێوەو وێنەیەکی خودا لەوانەدا بەدی دەکرا؟

سیتانوف گوتی : - خەڵکی بەرازن.

بەڵام خێرا، وەکو ئەوەی داوای بووردن لە من بکات هەڵیدایێ:

- نیگەران مەبە ماکسیمیچ، خەڵکی باشیشیان تێدا هەن.

من لەگەڵیا ئاسوودە بووم، هەرشتێکی نەزانیبا بە ئاشکرا دەیگوت نایزانێت. دەیگوت : - نایزانم. بیرم لەم شتە نەکردووەتەوە!

دیارە ئەم ڕاشکاویە باو نەبوو. ئەو خەڵکەی دی کە دەمناسین وایان دەنواند هەموو شتێک دەزانن. لە هەموو بابەتێکدا ئەسکۆی بوون، خۆیان لە هەر بابەتێک هەڵدەقورتاند.

ئەوەی بەلای منەوە سەیر بوو، ئەوە بوو دەفتەرەکەی وێڕای ئەوەی کە شیعری زۆر جوانی تیابوو، هەندێک چامە و قەسیدەی ئەوتۆی تیابوو، پیاو لە شەرما سوور دەبووەوە. کە باسی پوشکینم لە گەڵیا کرد ئاماژەی بۆ قەسیدەی " گافریلیادا " کرد، کە کۆپی کردبوو..

- پوشکین؟ زۆرم بەدڵ نییە. بەڵام بینیدیکتوف — ئەمە شاعیرێکە پێویستە بایەخی تەواوی پێ بدەیت ماکسیمیچ!

چاوی دەنوقاندن و بەدەنگێکی نەرم، دەیگوت:

*بڕوانە مەمکە قوتەکانی*

*ئەم خانمە جوانە...*

نازانم بۆچی تەکەزی تایبەتی لە سەر ئەم سێ بەیتە دەکرد و بە کەش وفشەوە دەیخوێندەوە:

*چاوی تیژ و تیر ئاسای*

*باز ناتوانێ*

*ئەم دەرگا داخراوانە ببڕێ*

*تا نیگایەکی لەزگینی*

*ناخی دڵی بکات..*

- حاڵی بوویت؟

شەرمم دەکرد، دان بەوەدا بنەم کە من نازانم چ شتێک ئەو هەموو شادییەی دەخاتە دڵەوە.

## (١٧)

ئەركی شاگردیی من لە كارگەكەدا زۆر ئەستەم نەبوو. بەیانی زوو، بەر لەوەی نیگاركێشەكان لە خەو ڕابن، من سەماوەرەكەم گەرم دەكرد و چام بۆ ئامادە دەكردن. وەختایەک ئەوان لە مووبەقەكەدا خەریكی خواردنی نان و چای بەیانی دەبوون، من لەگەڵ پاڤل دا هەر دوو ژوورەكەم گسک دەدا و خاوێن دەكردەوە و سپێنە و زەردێنەی چەند هێلكەیەكم جیادەكردەوە، كە بۆ تێكەڵكردنی بۆیەكان بەكاریان دەبرد، ئەوجا دەچووم بۆ فرۆشگایەكە. ئێواریٚ، بۆیەكانم تێكەڵ دەكرد وتەمەشای وەستاكانم دەكرد كە چۆن كاردەكەن. لە سەرەتاوە بە تاسەیەكی زۆرەوە تەمەشام دەكردن، بەڵام هەر زوو بۆم بەدیاركەوت كە زۆربەی ئەو پیاوانە حەز لە كارەكانیان ناكەن و بە بێزاری و نەبەدڵی كاردەكەن و كات بەسەر دەبەن.

شەوان چونكە بە زۆری بێكار بووم، ئیدی كاتەكەم بە گێڕانەوەی ژیانی خۆم لە سەر كەشتیان و ئەو چیرۆكانەی كە لە كتێباندا خوێندبوومنەوە، بۆ نیگاركێشەكان بەسەر دەبرد. ئیدی بەرە بەرە بەبیٚ ئەوەی بەخۆ بزانم لە كارگەكەدا، بووم بە نەقاڵ و خوێنەر.

ئیدی زوو بە زوو بۆم دەركەوت كە هیچ كەسیک لەو خەڵكە بە ئەندازەی من نە ئاوێتەی ژیان بووە و نە دنیای دیتووە.

هەر لە سەرەتای مێرمنداڵی خۆیانەوە، لە چوارچێوەی زندانی تەنگی پیشەكەی خۆیاندا حەپس بووبوون و نەیانتوانی بوو لێی دەربچن. لە نێو هەموویاندا، تەنیا چیخاروف لەو

کارگەیەدا، مۆسکۆی بینی بوو و بە بەردەوامی هەرباسی دەکرد، نێوچاوانی تێکنا و گوتی:

- چاو لە بینینی مۆسکۆ تێر نابێت، دەبێ بە بەردەوامی چاوت کراوەبێت.

ئەوانی دی شتاقیان لە شویا یان فلادیمیر هێوەتر نەڕۆیی بوون. ئەگەر ناوی قازان هاتبا، لە منیان دەپرسی : - ڕووسیانی زۆری لێهەن؟ باشە کڵێساشی تێدا هەیە؟

پیرم، لە لای ئەوان دەیکردە سیبریا، باوەڕیان نەدەکرد کە سیبریا، دەکەوێتە پشت ئوراڵەوە.

- باشە، ماسیانی ئورال لەوێوە، لە دەریای قەزوێنەوە ناهێنن؟ بەم پێیە دەبێ ئورال لە سەرووی ئەو دەریایەوە بێت!

هەندێجار کە دەیانگوت ئینگلتەرا کەوتووەتە پشت ئوقیانووسەوە وام دەزانی پێم ڕادەبوێرن، یان دەیانگوت بوناپارت، لە ماڵبات و بنەماڵەیەکی خانەدانی خەڵکی کالوگایە. کە باسی هەندێ شتم بۆ دەکردن کە بە چاوی خۆم دیتبوومن، بە دەگمەن باوەڕیان پێدەکردم، کەچی بەتاسەوە گوێیان لە ڕۆمانانی زۆر خەیاڵی و چیرۆکێن گونگ و ئاڵۆز دەگرت. تەنانەت پیرەکانیش خەیاڵیان لە حەقیقەت پێ پەسندتر بوو. بە ئاشکرا دەمبینی تا چیرۆکەکە ناواقیعی تر بوایە، زیاتر گوێیان لێدەگرت، تا ڕووداوەکان زیاتر ڕەگیان لە درۆدا با، زیاتر لەزەتیان لێدەبینی، بە کورتیەکەی واقیع سەرنجی ڕانەدەکێشان، هەموو بە تاسەوە چاویان لە ئایندە بوو، حەزیان دەکرد دزێوی وکوێرەوەری ئێستا تەپس بکەن.

ئەمەم زۆر بەلاوە سەیر بوو، چونکە هەستێکی توندم سەبارەت بە هەڤدژی نێوان حەقیقەت و وەهم لە لا چێبووبوو. ئەو خەڵکە ڕاستیانە بە بەرچاومەوە بوون، بەلام لە هیچ کتێبێکدا خەڵکانێکی وەکو ئەوانم بەرچاو نەکەوتبوو، قەت

کەسێکی وەکو سموری و یاکوفی توونچی یان ئەلکسندر فاسیلیڤی هەڵاتوو، یان چیخاروف یان ژنانی جلشۆری وەکو ناتالیام نەبینی بوو..

لە سەندووقەکەی دافیدوفدا، کۆمەڵێک چیرۆکی تۆز گرتووی کۆن ودڕاوی نووسەر گولیتسینسکی و کتێبەکەی بولگارین " ئیڤان ڤیگیگین " و بەرگێک لە کتێبەکەی برامبیوز هەبوو. من بە دەنگی بەرز هەموو ئەو بەرهەمە کۆن و پەژمردانەم بۆ نەقاشەکان خوێندەوە، زۆریان پێخۆش بوو.

لاریونیچ گوتی:

- خوێندنەوە لە گەنگەشە و دەمەقاڵەت دوور دەخاتەوە. ئەمە کارێکی زۆرباشە.

من لە کتێبان دەگەڕام، هەر کتێبێکی دڵخوازی خۆم پەیدا دەکرد، هەموو شەوێک بۆ ئەوانەی دەوروبەری خۆم دەخوێندەوە، شەوانێکی خۆشبوون، بیر ناچنەوە، کارگەکە بە ڕادەیەک بێدەنگ دەبوو، لە تۆ وایە لە بیابانێکدایت، ئەو گڵۆپانەی لە بن میچەکەوە شۆڕ بووبوونەوەو لە ئەستێرانی سپی و سارد دەچوون، تیشکەکانیان دەیدا لەو سەرە ساف یان قژنانەی کە بە سەر مێزەکاندا دانەوێنرابوون. کۆمەڵێک ڕوخساری ئارامم دەبینی کە لە فکران ڕۆچووبوون، ناو بە ناو یەکێکیان ستایشی نووسەرەکە یان قارەمانی چیرۆکەکەی دەکرد. کرێکارەکان لەم کاتانەدا کە مژوولی گوێگرتن دەبوون، تەواو دەگۆڕان، دەتگوت هەمان ئەو کەسانە نین کە بە ڕۆژەوە دەمبینین. لەو ساتانەدا زۆرم خۆشدەویستن، ئەوانیش بەلای منا دایاندەکێشا، خۆم لە جێگەی شایستەی خۆمدا دەبینییەوە.

ڕۆژێک سیتاتوف گوتی:

- لەوساوە کە تۆ کتێبمان بۆ دەخوێنیتەوە، دەڵێی لە بەهاردایین و پەنجەرەکانمان کردووەتەوەو هەوای پاک هاتووەتە ناو ژوورەکانمان.

زۆر بە زەحمەت کتێبم پەیدا دەکرد. ئەوەم بەبیرا نەهاتبوو، لە کتێبخانەیەکی گشتی کتێبان بە ئەمانەت وەربگرم. بۆیە وەکو سواڵکەر، تووشی هەرکەسێک بوایەم سواڵی کتێبم لێی دەکرد.

ڕۆژێک نەقیبێکی بەڕێوەبەری دایەرەی ئاگر کوژاندنەوە کتێبێکی لیرمانتۆفی دامێ، کە خوێندمەوە هەنگێ تێگەیشتم کە شیعر چییە و چ کاریگەری و باندۆرێکی بەسەر دڵ و دەروونی بەشەرانەوە هەیە.

لە بیرمە کە دەستم بە خوێندنەوەی چامەی " شەیتان " کرد، سیتانوف یەکەمجار ڕوانیە کتێبەکە، ئەوسا ڕوانییە ڕوخساری من، پاشان قلچەکەی لە سەر مێزەکە دانا، ئەژنۆکانی لە باوەش گرت، بزەیەکی بۆکرد، خۆی لە سەر کورسییەکەی بە پێش وپاشدا ڕادەژاندو کورسییەکە لە ژێریدا کەوتبووە جیرەجیر.

لاریونیچ، ئەویش دەستی لە کارەکەی هەڵگرت، لە مێزەکەی سیتانوف، کە من لەوێ شیعرم دەخوێندەوە نزیک بووەوە وگوتی : - گەلۆ، براینۆ بێدەنگ بن!

بە ڕاستی چامەکە زۆر خۆشحاڵی کردم. دەنگم دایەکزی، بە هۆی ڕوندکەوە، دێڕەکانم بە ڕوونی نەدەبینی، بێدەنگی ئامادەبووان هێندەی دی خۆشحاڵی کردم، هەستم دەکرد، موگناتیسێکی نادیار هەموویان بۆ لای من ڕادەکێشێت. وەختایەک بەشی یەکەمی چامەکە تەواو بوو، تەقریبەن هەموو نیگارکێشەکان لە دەوری مێزەکە خڕبووبوونەوە، بەدەم بزەی خۆشحاڵییەوە دەستیان نابووە سەرشانی یەکدی.

چیخاروف، بە ئەسپایی دەستی نایە سەر سەرم و بەرەو کتێبەکە سەری دانەواندمەوە :

- وەخوێنە، بەردەوام بە.

کە خوێندنەوەی چامەکە تەواو بوو، چیخاروف کتێبەکەی لە دەستم وەرگرت و تەمەشایەکی ناونیشانەکەی کرد وخستیە بن باخەڵی وگوتی : - ئەم کتێبە دەبێ سبەینێ، جارێکی دی بخوێنرێتەوە، من بۆتی هەڵدەگرم.

هەستا، کتێبەکەی لیرمانتوفی خستە چاوێکی مێزەکەیەوە و قفلی دا و گەڕایەوە سەر کارەکەی. ئیدی بێدەنگی باڵی بە سەر کارگەکەدا کێشا، ئامادەبووان بە بێدەنگی گەڕانەوە بۆ جێگاکانی خۆیان. سیتانوف چو بۆلای پەنجەرەکە، بەبێ جووڵە لەوێندەر وەستا، سەری نا بە شووشەی پەنجەرەکەوە، کەچی چیخاروف، دووبارە فلچەکەی لەلایەکەوە دانا و لێبڕاوانە گوتی:

- بەمە دەگوترێ ژیان کوڕینە، ئەوە ژیانی ڕاستەقینەیە!

هەردوو شانی هەڵتەکاند، سەری دانەواند و لە سەری ڕۆیی:

- من دکارم ئەم شەیتانە وێنە بکێشم، جەستەیەکی ڕەشی تووکن، دووباڵی ئاگر ئاسا، ڕوخسارێک و دوو پێ و دوو دەستی شینی کاڵ، وەکو بەفری بەر تریفەی هەیڤەشەو.

تاکاتی شێو، بە نیگەرانیەکی نائاساییەوە لەسەر کورسیەکەی دەجولا، بەسەری قامکەکانی بە مێزەکەیدا دەکێشا، لە بن لێوانەوە شتی نامەفهوومی دەربارەی شەیتان، دەربارەی حەوا، ژنان و بەهەشت دەگوت، دەربارەی ئەو خەتایانە دەگوت کە وەلیان و ڕوحانیان کردوویانە.

لێبڕاوانە گوتی:

- هەموو ئەمانە دروستە! ئەگەر پیاوچاکان و ڕوحانیان دەگەڵ ژنانی هەڵەکاردا دەست تێکەڵ بکەن و گوێ بە گوناح نەدەن هەڵبەتە شەیتان هەقی خۆیەتی شانازی بەوەوە بکات کە ڕوحێن پاک گومڕا بکەن..

کەس وەڵامی نەدایەوە، لەوە دەچوو، هەمووان وەکو من قڕوقەپیان کردبێت. هەمووان بە خاوی کاریان دەکرد، چاوێکیان هەر لە سەعات بوو، هەرکە زەنگی سەعات نۆ لێی دا هەموو بە کەڕەتێ دەستیان لە کار هەڵگرت.

سیتانوف و چیخاروف چوون بۆ مەیدانەکەی دەرەوە، منیش دوایان کەوتم. سیتانوف لەوێ، بەدەم تەمەشاکردنی ئەستێرەکانەوە گوتی:

*قافلەی وێڵن*

*بە بۆشایی ئەم ئاسای*

*ئاسماندا دەسوڕێنەوە...*

و لە سەری ڕۆیی : - پیاو ئەم شتانە لە کوێ پەیدا بکات؟

چیخاروف، کە بەدەم سەرما تووندەکەوە دەلەرزی، گوتی:

- من بە هیچ جۆرێ وشەکانم بیرنایەنەوە، هیچ شتێکم بیر نایەتەوە، بەڵام شەیتانەکە دەبینم! زۆر سەیرە کەسێک وات لێبکات بەزەییت بە شەیتاندا بێتەوە! وادیارە تۆش بەزەییت پێیدا دێتەوە، وانییە؟

سیتانوف، ڕەزامەندی نواند : - بەڵێ. تۆ بەزەییت پێیدا دێتەوە.

چیخاروف، ، بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

- تەمەشا، بزانە ئینسان بوون چی دەگەیەنێت. مانای چییە!

وەختێک گەڕایەوە بۆ ڕاڕەوەکە ئاگاداری کردمەوەو گوتی:

- ماکسیمیچ، لە دووکان، باسی ئەم کتێبە بۆکەس مەکە، چونکە ئەم کتێبە، بێگومان لە کتێبە قاچاخەکانە!

شــادییەکی گەورە دایگـرتم، کەواتە ئەم کتێـبە هەمـان ئەو کتێبەیە کە قەشەکە لە ئیعترافەکەدا لێی پرسیم!

شێو خوارن، بە بێدەنگی و بێهیچ ژاوەژاوێک تێپەڕی، وەکو ئەوەی بـویەرێکی گەورە قەومـابێ و هەر یەکێکمـان بـیەوێ لە هەمـوو ڕوویەکەوە بیـری لێبکـاتەوە. دوای شـێو، پـاش ئەوەی هەرکەسـە وچوو بۆ سەر جێگای خـۆی، چیخـاروف، کتێبەکەی دەرهێنا و پێی گوتم:

- فەرموو، دووبارە وەیخوێنە، زۆر بە هێواشـی و بـێ هـیچ پەلەپەلێک وەیخوێنە.

ژمـارەیەک لە کرێکارەکـان، لە جێگاکانیـان هـاتنەدەرێ و بە بێـدەنگی لە مێـزەکە هاتنەپێشـێ و هەربە جلکـی خەوەوە لە سەرچۆکان دانیشتن.

ئەمجـارەش وەختـایەک لە خوێنـدنەوەی چـامەکە بـوومەوە، چیخاروف بەسەری قامکان کێشای بەسەر مێزەکەدا وگوتی:

- ئەوە ژیـانە! ئـاخ ئەی شـەیتان، ئەی شـەیتان.. چـۆن ئەم شتەت لێ قەوما؟

سـیتانوف، بە سـەر شـانما دانەویـیەوە، چەنـد دێڕێکـی چامەکەی خوێندەوە و پێکەنی و گوتی:

- من ئەمانە لە دەفتەرەکەمدا دەنووسمەوە..

هەنگـێ چیخـاروف هەسـتا، کتێبەکەی هەڵگـرت و بـۆ سـەر مێزەکەی خۆی چوو، وادیاربوو دەیەوێ کتێبەکە لەگەڵ خۆیـدا ببات. لێ لە ناکاوا وەستا وبەدەنگێکی پڕ سـوێو و لەرزۆکەوە گوتی:

- ئـێمە وەکـو تـووتەڵە سـەگی کـوێر دەژیـن، لە بەر پێـی خۆمـان هێروەتـر نـابینین، شـتاقمان هـیچ نـازانین، نە خـوا دەیەوێین نە شـەیتان. ئایـا ئێمەمانـان بەنـدەی خـواین؟ ئەیـوب

بەندە بوو، خودی خوا دواندی. هەروەها موسای دواند. ئەوانە پیاوی خوابوون، ئەدی ئێمە کێین؟

کتێـبەکەی داخسـت و کەوتە لەبەرکردنـی جلەکـانی و سیتانوفی گاز کرد : - دێی بۆ بارەکە؟

سیتانوف بە ئارامی بەرسڤی دایەوە : - من دەچم بۆلای دەنکەکەم.

هەرکە ئەوان وەدەرکەوتن، من لە سەر ئەرزەکە ولە نزیکی دەرگاکەوە لە لای پاڤل ئودینتسوفەوە ڕاکشام. ماوەیەک بەدەم پرخەپرخەوە، تلاوتلی کرد، لە ناکاوا کەوتە گریان و هەنسک هەڵدان، دەسەپاچە بووم : - چیتە؟

وەلامـی دایەوە : - هـیچ. مـن بەزەیـیم بەمـانەدا دێـتەوە، نـزیکەی چواردانە ساڵە لە نێویانـدام، دەمـاری یەک بەیەکیـان دەناسم..

منیش وەکو پاڤل بەزەییم بەم خەڵکەدا دەهاتەوە، ماوەیەکی زۆر بە دەم ڕازانەوە(پـاڵکەوتن، ڕاکشـان)، بە دەنگـی نەوی باسـی ئەو خەڵکانەمـان کرد، باسـی دڵپاکی و ڕەوشت بەرزی هەر یەکێکیانمـان کـرد، ئەمە کـردیە کارێـک هێنـدەی دی بەزەییمان پیاندا بێتەوە.

دۆسـتایەتیەکی پتەو لە نێـوان مـن و باڤـل ئودینتسـوف کە پاشان بوو بە وەستایەکی نمرە یەک پەیدا بوو. لێ حەیفێ زۆر لە سـەر کـارەکەی بەردەوام نەبـوو! لە تەمەنـی سـی سـاڵیدا کەوتە مەیگوساری و ئالوودە بـوو. دوای مـاوەیەکی کورت لە بازاڕی خیستروف لە موسکۆ، لە نێو کۆمەڵێک خەڵکی وێڵ و سـەرگەردانـدا بینـیم. لە دوای ئەوە ئیـدی نەم بینیـیەوە، لەم دواییانەدا بیستم گوایە بە تیفۆ مردووە.

کە ئەم جۆرە هەواڵانە دەبیستم و ئەو مرۆڤە میهرەبانانەم وەبیـر دێـنەوە کە بە بێهـودە بە بەرچـاومەوە گیانیـان سـپارد،

لەرزم لێدێت و ترسم لێدەنیشێت. خەڵکی لە هەموو شوێنێک پیردەبن و دەمرن، ئەمە کارێکی زۆر ئاسایی و سروشتیە. بەڵام لە هیچ شوێنێکی دیکەدا بەم بێهودەیی و خێراییەی ڕووسیا، هەرەس نایەنن و نامرن.

پاڤڵ، ئەو کاتانەی کە من باسی دەکەم، دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو. گەنجێک بوو سەرخڕ، زیرەک، هۆشمن، بە ئینساف و دەست پاک و بەهرەمەند. هونەرمەندانە وێنەی فڕندان، کسۆک و پشیلانی دەکێشا. هەروەها کاریکاتۆری نیگارکێشەکانی خۆمانی بە پەڕ و باڵەوە دەکێشا. کاریکاتۆری سیتانوفی بە خەمینی و لەسەر یەک لاق دەکێشا، چیخاروفی لە شێوەی کەڵەبابێکی پۆپنە بڕیاگی هەنیە ڕووتاوەدا دەکێشا، داڤیدوفی نەخۆش و دەغەزاری، بە شێوەیەکی مردەلۆخی خەمبار دەکێشا. جوانترین وێنەی پاڤڵ، ئەوە بوو لە گوگولیفی پیری گۆڕهەڵکەنی کێشابوو، لە شێوەی شەمشەمە کوێرەیەکی گوێ پانی، لووت زلی، دوو پێی بچووکی شەش پەنجەدا دروستی کردبوو. دوو بازنەی سپی لە دەوری چاوەکانی کێشابوو، بیلبیلەی چاوەکانی لە دوو زومی زەق دەچوون، کە لە دەم وچاوە خڕەکەیەوە دەرپۆقی بوون ودیمەنێکی ترسناکیان پێدەبەخشی.

هیچ یەکێک لە نیگارکێشەکان، بە دیتنی ئەو کاریکاتۆرانە زویر نە دەبوون. بەڵام هەر هەموویان هەستیان بەوە کرد کە وێنەی گوگولیف، زۆر دزێو ومایەی قێز وبێزە، بۆیە دڵسۆزانە ئامۆژگاری پاڤلیان کرد وگوتیان:

– باشتر وایە ئەم وێنەیە یان بشاریتەوە یان بیدڕیت، دەنا ئەگەر پیرەمێرد ببینێ، کێشەت بۆ دروست دەکات، دەم وقەپۆزت دەشکێنێت!

ئەم كابرا شرۆڵە، پیس و پۆخڵە، نەخۆشە، هەمیشە مەستە، كابرایەكی ڕیاكار بوو، لە هەموو كەسێ پتر زوهد فرۆشی دەكرد. كابرایەكی بوغزن و ڕكونی بوو، هەر شتێك لە كارگەكەدا ڕووی بدابایە خێرا دەیگەیاندە دەفتەردار وشاگردی فرۆشگاكە، كە گوایە قەرار بوو خوشكەزاكەی، خانمی خاوەن فرۆشگاكە بخوازێت بۆیە ئەو كوڕە خۆی بە سەرۆك و ئەربابی هەمووان دەزانی. هەمووان لێی دەترسان و ڕقیان لێی بوو، ئەویش گوگولیفی كردبوو بە هەواڵدز بەسەریانەوە.

پاڤل، لە هەمووان پتر ڕقی لە گوگولیف بوو، بۆیە لێی نەدەبووەوە، هەر دەرفەتێكی دەست بكەوتبا هەوڵی دەدا ئەزیەتی بدات. منیش لەم ڕووەوە، بەجدی یارمەتیم دەدا، هەموو كرێكارانی كارگەكە ئەم هەڵوێست و ڕەفتارانەی ئێمەیان پێخۆش بوو. كەچی نەقاش و نیگاركێشەكان، ناو بە ناو ئاگاداریان دەكردینەوە و دەیانگوت:

- كوڕینە ئاگاتان لەخۆ بێ! ئەم هەواڵدزە لەقافا نەتانگرێت، دەنا خەشی خۆیتان پێ دەڕێژێت!

زاراوەی "هەواڵدز" ئەو نازناوە بوو كە نیگاركێشەكان لە گوگولیفیان نابوو. ئیدی لە سەرانسەری كارگەكەدا، بەو نازناوە ناسرابوو. كەچی ئێمە ئەو ئاگاداریانەمان بەهەند نەدەگرت. زۆرجار كە خەوی لێدەكەوت، بۆیەمان دەكرد بە دەم وچاوە مەی زەدەكەیەوە.

جارێك كە تەواو سیامەست بوو، هیچ ئاگای لە خۆ نەبوو، كەپوویمان كە لە ئیسفەنج دەچوو، لە بۆیە گرت، بە سێ دانەڕۆژ ئەوسا توانی بە تەواوەتی لووتی پاك بكاتەوە. بەڵام هەرجارێ كە یارۆی پیرەمێردمان زۆر تووڕە دەكرد، من كەشتیە هەڵمینەكە و ئەو سەربازە چكۆلەیەم بیر دەكەوتەوە كە لە فیاتكاوە هاتبوو، ویژدانم ئەزیەتی دەدام. گوگولیف،

هەرچەند بە تەمەن بوو، بەڵام زۆر بە قوەت بوو، زۆرجار غەدری لێدەکردین و لێی دەداین. هەرجارێ سەرمان بکردایەتە سەری لە لای خانم ئەرباب، سکاڵای لێدەکردین.

خانم ئەربابیش، مەی ئالوودە بوو، هەمیشە ڕووخۆش وبەکەیف بوو. دەستەکانی ڕادەوەشاندن و بە مست دەیکێشا بە مێزەکەدا و هاواری بە سەردا دەکردین:

- خوام لەو خوایە جارێکی دی لەم کارانە بکەن! نۆبەتی ئەو قەوانەیە، کابرایەکی پیرە، لە جیاتی ڕێزی بگرن، پێی ڕادەبوێرن! کێ لە جیاتی شەراب مەرەکەبی لە پەرداخەکەی کردووە؟

بە پێکەنینەوە وەڵاممان دەدایەوە : - ئێمە..

خانم، هەناسەیەکی هەڵدەکێشا ودەیگوت:

- تۆ تەمەشا تەمەشا، ئەم مەلعوونانە ناشی شارنەوە! باشە ئێوە نازانن، دەبێ ڕێزی پیران بگیرێت؟ جارێکی دی کاری وا نەکەن ها!

هەنگێ دەری دەکردین و، ئێوارێ لای شاگردی سەر دووکانەکە گلەیی لێدەکردین. شاگردی ناوبراو، بە توونی سەرکۆنەی دەکردم و دەیگوت:

- شتی وا چۆن دەبێت؟ تۆ بەردەوام کتێبان دەخوێنیتەوە، تەنانەت کتێبی پیرۆزیش دەخوێنیتەوە، کەچی ئەم کارە دزێوانە دەکەی! ئاگات لە خوا بێ کاکە!

خانم ئەرباب، بە تەنیا دەژیا، پیاو بەزەیی پێیدا دەهاتەوە. هەندێجار، کە شەرابێکی زۆری دەخواردەوە، لەبەر پەنجەرەکە دادەنیشت وگۆرانی دەگوت:

*کەس لە خەمی منا نییە*

*کەس بە حاڵی من نازانێ*

*کەس خۆشی ناوێم*

*کەس بەزەیی پێما نایەتەوە.*

هەنگێ لە ناکاوا، دایدەکورکاند و بەدەم هەنسک هەڵدانەوە دەینالآند : - ئوهو، ئوهو، ئوهو!

ڕۆژێک بینیم، بەخۆ و گۆزەیەک شیرەوە، بە قاڵدرمەکەدا دادەگەڕا، هێواش هێواش، پلە بە پلە دەهاتە خوارەوە، گۆزەکەی توونـد لە باوەش گرتبوو، شیرەکە بە جلەکانیا دەپژرا و ئەویش جنێوی بە گۆزەکە دەدا و دەیگوت : - بزانە چۆن دادەڕێژێی، هەی شەیتانی نەعلەتی!

خانم ئەرباب، قەڵەو نەبوو، بەڵکو باریکەلەیەکی داهێزراو، لە پیرە پشیلەیەک دەچوو کە توانای ڕاوە مشکی نەمابێت. ئیش و کاری بووبوو بە پاڵکەوتن و ڕازان و کاوێژکردنەوەی بیرەوەری و دەعوەت و ڕاوە سەرکەوتووەکانی.

سیتانوف، بە ڕوو گرژییەوەو لەبن لێوانەوە دەڵێت:

- ئێ ی دنیا! ئەم شوێنە ڕۆژێ لە ڕۆژان فرۆشگایەکی بەڕمێن وگەرمەبازاڕ بوو، ئەوسا کابرایەکی زیرەک بەڕێوەی دەبرد. بەڵام ئەمڕۆ تەواو کەساد بووە، هەرچی کاسبیەکی تیا دەکرێت، دەچێتە بەرکی هەواڵدزەوە. ئیدی کردەی ئێمە و بردەی ئەوە. ئەم بیرۆکەیە، بەجۆرێ ساردت دەکاتەوە، بە تۆ بێ دەست لە کارەکەت هەڵبگریت و سەربکەویتە سەربان و لەوێندەر پاڵبکەویت و چاو ببڕیتە ئاسمانی هاوین..

پاڤل ئودینتسوف، کەوتە ژێر باندۆری بیرەکانی سیتانوف. ئیدی بە چاولێکەری گەورەکان دووکەڵی سیغارەکەی دەکرد بە ئاسماندا و وەکو گەورەکان کەوتە فەلسەفاندن دەربارەی خوا، مەیگوساری، ژنان و بەروبوومی کار: خەڵکانێک هەموو کاتی خۆیان بۆ دروستکردنی شتان تەرخان دەکەن و خەڵکانی دی بێ ئەوەی قەدر و سوودی ئەوشتانە بزانن، دەیڕوخێنن.

لەو ساتانەدا ڕوخسارە چکۆلە جوانەکەی، پیر و پڕ چرچ و لۆچ دەهاتە بەرچاو. زۆرجار کە لە سەر جێگاکەی خۆی و لە سەر ئەرزەکە و دوور لە خەڵکەکە دادەنیشت و ئەژنۆکانی لە باوەش دەگرت و لە خەیاڵەوە دەچوو، بۆ ماوەیەکی درێژ لە پەنجەرەکانەوە، دەیڕوانیە ئەستێرەکان کە بە بەرۆکی ئاسمانی زستانەوە دەجریوانەوە..

نیگارکێش و کرێکارەکان، بە دەم خەوی قووڵەوە دەکەوتنە پرخ وهۆڕ. هەندێکیان دەیاننالاند. لەناکاوا یەکێکیان بەدەم خەوەوە دەکەوتە وڕینە. داڤیدوفی سیلدار دوا کۆکەی دەکرد بە بن میچەکەدا. لە سووچێکی ژوورەکەدا، سێ بەندە، سێ پیاوی خوا، بەپاڵ یەکەوە، شەکەت و ماندوو، مەست وخومار، لە غوڕابی خەودان : کاپندیوخین، سورکین و پیرشین.

کۆمەڵێک ئیکۆنە وشەمایلێن بێ ڕوخسار یان بێ دەست یان بێ لاق بە دیوارەکانەوە هەڵپەسێردراون و تەمەشای مە دەکەن. بۆنی هێلکەی بەسەرچوو و ڕۆنی مەیوو، لە درزی تەختەپۆشی ژوورەکەوە، بەرز دەبێتەوەو هەناسەت تەنگ دەکات و خەریکە خەفەت دەکات. پاڤل، لەبن لێوانەوە دەڵێت: -خودایا، چەند دڵم بە حاڵیان دەسووتێت!

هەمان بیرکردنەوە، بە سەر منیشا زاڵ بوو. بەڕای مە، وەکو پێشتریش گوتوومە، هەموو ئەوانە خەڵکی زۆر چاک بوون، بەڵام ئەو ژیانەی تیایبوون زۆر خراپ بوو، شایستەی ئەو ژیانە خراپە نەبوون. بەڵام هیچ چارێکیش نەبوو، بەو ژیانە مەحکووم بوون. کە زستان دەهات، با و زریان هەڵیدەکرد، دەیکردە کارێک کە ماڵەکان، درەختەکان ووهەموو شتێکی سەر زەوی بلەرزێ، هاواری لێبەرز ببێتەوەو بزیڕێنێت، ئیدی بێزاری باڵی بە سەر کارگەکەدا دەکێشا،

نیگـارکێش و کرێکارەکـان خەفە دەبـوون، هەناسـەیان سـوار دەبوو، ئیدی ئەو خەڵکە بێنەوایە، ڕوویـان دەکردە مەیخـانە و کاباریەکان و لەوێندەر خەمی خۆیان دەناشت.

لەوجۆرە شـەوانەدا خوێندنەوە دادی نەدەدان، ئیدی مـن و پاڤل هەوڵمانـدەدا، بە شـێوازی تـایبەتی خۆمـان کرێکارەکـان سەرگەرم بکەیـن: ئیدی دەم وچاوی خۆمـان لە بۆیە و تەنـی دەگـــرت و کڵاوقژمـــان لە ســـەر دەکـــرد و بۆخۆمـــان کومیـدیایەکمان دروسـت دەکـرد و دەورمـان تیـا دەبینـی و بەوجـۆرە کرێکارەکانمـان دێنـایە پێکەنـین و خەم و بێزاریمـان لێیان دەتاراند. من ° ئەفسانەی ئەو سەربازەم بیر کەوتەوە کە ژیـانی پەتروسـی گەورەی ڕزگـار کردبـوو ° و ئیـدی ئەو سـەربردەیەم کـرد بە دیـالۆگێکی درامـاتیکی. دەچـووینە سـەر تەختە خەوە بەرزەکەی داڤیدوف و لەوێوە تەمسیلمان دەکرد. شەڕی سەربازانی سـویدو ڕووسـمان نیشـاندەدا و بە تەمسـیل سەری سـەربازەکانی سـویدمان دەپەراند و تەمەشـاڤانەکانمان دێنایە پێکەنین و بەسەرکەوتنەکەی خۆمان دڵخۆش دەبووین.

نیگـــارکێش و کرێکارەکـــان زۆر حەزیـــان لە ئەفســـانەی بلیمەتی چینی تزینک یوتونگ دەکرد. پاڤل، دەوری ئەو کەسـە دامـاو و خێرخـوازەی دەبینـی ومـن هەمـوو دەورەکـانی دیـکەم دەبینی، دەوری پیاو و ژنـم دەبینی تەنانەت هەندێجار دەوری شێتیشـم دەبینـی. هەنـدێجار دەوری ئەو بەردەشـم دەبینـی کە کەسـە چینیـیە نائومێـدەکە دوای ئەوەی لە هەمـوو هەوڵێکـی خێرخوازیدا شکسـتی دێنـا و بۆ ئیسـراحەت سـەری لە سـەری دادەنا. لەم کاتەدا، تەمەشاڤانەکان لە قاقای پێکەنینیان دەدا. من حەزم دەکرد پێکەنینەکەیان بۆ شوێن و هەڵوێستی هەستیارتر هەڵبگرن، بەڵام فایدەی نەبوو تەمەشاڤانەکان، لەو شتانە حاڵی

نەدەبوون، دیاربوو کە کەیفیان بە ڕەفتاری ئێمە دەهات و بە دەم پێکەنینەوە هاواریان لە ئێمە دەکرد :- ئاه، ئەی لێبۆکان، ئەی گاڵتەجاڕان!

بەڵام تا پتر لە ژیان ڕادەمام، زیاتر ئەو قەناعەتەم لەلا دەچەسپی کە ئەمانە بە خەمێکی ئەبەدی گوش کراون، ئەوندەی خەم لە ڕوح و تەبیعەتیانەوە نزیکە، شادی لە ڕوحیانەوە نزیک نییە. شادی زۆر نەدەمایەوە، عەمری کورت بوو، بە ئاسانیش بەدەست نەدەهات، بەڵکو زۆر بە زەحمەت وەکو دەرمانی دەردی دڵی ڕووسان بەدەستمان دێنا. ئیدی ئەم سەرگەرمیانەی ئێمە پێشکەشمان دەکرد، بنەمایەکی ئەوتۆیان نەبوو، زیاتر خۆڕسک بوون و خۆ بە خۆ هەڵدەقولان بۆ ڕوناک کردنەوەو ڕەواندنەوەی ڕۆژگارە تاڵەکانمان.

زۆرجار خۆشی و شادی ڕووسی، لە ناکاوا و بلەز دەگۆڕا بۆ کارەساتێکی تاڵ، لە گەرمەی سەمایەکەدا، کاتێ کابرای سەماکار، لەوە دەچوو خۆی لە هەر کۆت و بەندێک ڕزگار بکات، دڕندەکەی ناخی لە پڕا بەڕەڵڵا دەبوو، دڕندانە پەلاماری هەرکەس و هەرشتێکی دەدا، دەی هاڕان، دەی نەڕان، دەیدڕان..

ئەم شادیە ساختەیەی کە لە سۆنگەی فاکتەرێن دەرەکییەوە چێ دەبوو، زۆری پەست دەکردم. تووڕە دەبووم و تەنانەت خۆم لە بیر دەکرد، لێ هەمیشە لە بیری ئەوەدا بووم کە شێوازێکیدیالۆگ و نمایشی ئەوتۆ دابهێنم کە بشێت شادی و خۆشیەکی درێژخایەنتر و قووڵتر لەلای تەمەشاڤانان و خەڵکیدا چێبکات!

هەندێجار ئەم هەوڵانەم بە فیڕۆ نەدەچوون، نیگارکێشەکان ئافەرین و ستایشیان دەکردم، بەڵام وێڕای ئەوەش، ئەو

نائومێدی و بێزارییەی کە وام خەیاڵ دەکرد بەسەریا زاڵ بووم، دووبارە و لە نوێ بەرۆکی دەگرتمەوەو، زیاتر بنجی دادەکوتا و چڕتر دەبووەوە.

لاریونیچ، ئەم پیاوە میهرەبانە، وەکو خووی هەمیشەیی خۆی پیرۆزبایی لێدەکردم و دەیگوت:

- کورپێژگەیەکی باشیت، خودا دەست بە باڵتەوە بگرێت!

چیخاروف دەیگوت:

- بەڕاستی کەسێکی بەهرەدارە، دەتوانێ خەڵکی سەرگەرم بکات. تۆ هەق وابوو، لە شانۆدا کاربکەی ئەلکسی، یان پەیوەندی بە سێرکەوە بکەی. دەشیای (دەتتوانی) بەم بەهرەیەتەوە، ببی بە لێبۆکێکی گەورە یان ئەکتەرێکی دیار!

تەنیا کاپندیوخین وسیتانوف، لە نێو هەموو کارمەندانی کارگەکەدا لە سەری ساڵدا یان لە ڕۆژانی مەرافەعەدا دەچوونە شانۆ. نیگارکێش و وەستا بەتەمەنەکان، داوایان لەو جووتە دەکرد، لە کەفارەی ئەو هەڵەیەیان، خۆیان لە ئاوی ڕووبار یان دەریا هەڵکێشن و تۆبە بکەن، چونکە شانۆ کەفارەی لە سەرە.

سیتانوف، بەردەوام بە گوێمیا دەدا : - واز لە هەموو شتێک بهێنە وببە بە ئەکتەر!

وبە هەڵچوونەوە باسی ' ژیانی ئەکتەر یاکوفلیف ' ی خەمناکی بۆ دەگێڕامەوە.

- تۆش دەتوانی بەوجۆرە بژیت!

حەزی دەکرد باسی ماری ستیوارت بکات، کە ناوی دێنا بە ' دێڵە ڕێوی ' نێوی دەبرد، زۆر لێبڕاوانە باسی ' خانەدانە ئەسپانیەکە 'ی دەکرد:

- دون سیزاردەبازان، کە خانەدانێکی نێو خانەدانان بوو ماکسیمیچ خۆی، خۆی پێگەیاندبوو، بە ڕاستی خودساز بوو!

ئەو بە خۆیشی، شتێکی لە تەبیعەتی ˚ خانەدانی ئەسپانی ˚ تیابوو. ڕۆژێک سێ پیاوی دایەرەی ئاگرکوژێنەوە، لە خۆت و خۆڕایی، هەر بۆ کەیف لە مەیدانەکەی نزیکی بورجی چاودێریدا، لە کابرایەکی جووتیار دەدەن. خەڵکانێکی زۆر، نزیکەی چل کەسێک ئەو شەڕ و لێدانە دەبینن، پیاوانی ئاگرکوژێنەوە هاندەدەن. سیتانوف خۆی بە گەرمەی شەڕەکەدا دەکات، باسکە درێژەکانی دەخاتەکار و بەردەبێتە ئاگر کوژێنەوەکان. جووتیارە هەڵدەگرێتەوە و دەڵەکی دەداتە ناو جەماوەرەکە و هاوار دەکات : - بیبەن، دووری بخەنەوە!

ئیدی بە تەنیا لە شەڕەکە بەردەوام دەبێت، یەک کەس بەرانبەر بە سێ کەس.

بنکەی ئاگرکوژێنەوەکە هەر دە هەنگاوێک لە شەڕەکەوە دوور بوو، یانی پیاوانی ئاگرکوژێنەوەکە، زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی داوای کۆمەک بکەن و دەرسێکی وەهای سیتانوف بدەن کە هەرگیز لە بیری نەچێتەوە. ئیدی خۆی و بەختی ترسان و هەڵاتن. لە دواوە هاواری لێکردن :- سەگبابینە!

لاوان ڕۆژانی یەک شەمموان دەچوون بۆ ˚ مەیدانی دارەکە ˚ کە کەوتبووە پشت گۆڕستانی قەدیسان پتروس و پۆڵس، تا بەشداری بۆکسێن بکەن دژی ئەندامانی ˚ تیپی ساغڵەمی ˚ و جووتیارانی گوندەکانی ئەو ناوە. تیپەکە بۆکسەرێکی بە ناوبانگیان هەبوو- زەبەلاحێک بوو بە ناوی موردوفی، کەسێکی سەربچکۆلەی چاوپرووش بوو، کە لە بەردەم هەوادارەکانی خۆیدا دەوەستا، لاقی بڵاودەکردەوە، بە سەی قۆڵە پیسەکانی چاوە پرووشەکانی دەسڕی و دۆستانە هاواری لە کوڕانی شار دەکرد: - ئەگەر حەزدەکەن، پێش ئەوەی تووشی سەرما بم وەرن!

هەمیشە کاپندیوخین، لە جیاتی مە ئامبازی دەبووەوە، بەڵام موردوفی هەمیشە بە سەریا سەردەکەوت.

کاپندیوخین، بە سەروچاوی خوێناوییەوە بە هانکەهانک هاواری دەکرد: - من بۆچی باشم ئەگەر نەتوانم ئەم موردوڤییە ببەزێنم؟

ئیدی بەزاندنی ئەو گەنجە (موردوڤی) بووبوو بە تاقە خولیای ژیانی. ڕاهێنانێکی توندی دەکرد، بادەنۆشی تەرک کرد، تەنیا گۆشتی دەخوارد، هەموو شەوێک بەرلەوەی بچێتە ناوجێگاوە، بەفری لە خۆی هەڵدەسوو، ئیدی جۆرەها شتی قورسی هەڵدەگرت تا ماسوولکە پەیدابکات. بەڵام ئەم کارانە دادیان نەدا. ئەنجام دووپارچە قورقوشمی لە ناو دەستکێشەکانی ناو، لە بەردەم سیتانوفدا خۆی فش کردەوە و گوتی: - ئەم گەرە کۆتایی بە موردوفی دێنێت!

سیتانوف، زۆر بەتووندی ئاگاداری کردەوە:- ئەم پارچە ئاسنانە دەربێنە، دەنا پێش ئەوەی دەست بە کێبڕکێیەکە بکرێ لە قاوت دەدەم!

کاپندیوخین باوەڕی نەدەکرد کە کاری وا دەکات. بەڵام سیتانوف لە ناکاوا پێش دەستپێکی کێبڕکێیەکە هاواری لە موردوفی کرد:

- فاسیلی ئیڤانوفیچ ڕاوەستە! من یەکەمجار، دەچمە مەیدانی کاپندیوخین!

دەم وچاوی یارۆی قوزاقی سوور بووەوەو هاواریکرد:

- من بۆکسێن لەگەڵ تۆدا ناکەم! لاکەوە لێرە!

سیتانوف، نیگایەکی توندی کرد و خێرا بەرەو ڕووی چوو: - بەڵێ، دەبێ بیکەیت.

کاپندیوخین، کەمێک سڵەمیەوە، ئەوجا دەستکێشەکانی داکەند و ئاخنینیە بەرکی پالتۆکەیەوەو بلەز لەوێندەر دوورکەوتەوە.

دیارە ئەوە سپرایزێکی ناخۆش بوو بۆ هەردوو لا، کابرایەکی بە ڕواڵەت سەنگین و ڕیزدار، بەرەو سیتانوف چوو و بە تووڕەیی گوتی:

- ئەمە پێچەوانەی یاسا و ڕێسای گەمەکەیە، لە پێشبڕکێی گشتیدا ڕقی شەخسی بەکاربەری!

ئیدی خەڵکەکە، لە هەموو لایەکەوە لە سیتانوف کەوتنە هاوار. سیتانوف ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، ئەوجا ڕوویکردە کابرا بە ڕواڵەت ڕێزدارەکە وگوتی:

- ئەدی ئەگەر بەم کارە تاوانێکی کوشتنم وەستاندبێت چی؟

کابرای بە دیمەن یەکسەر حاڵی بوو، کڵاوەکەی داکەند وگوتی:

- ئەگەر وابێ، هەموومان سوپاست دەکەین.

- بەڵام تکایە باسی ئەم مەسەلەیە مەکە و هەر بەینی خۆمان بێ!

- نا، بۆ باسی دەکەم؟

کاپندیوخین، بۆکسەرێکی کەم وێنەیە، کە زەربەیەک دەوەشێنێ دەبێتە مایەی تووڕە بوون -ئەمە دەزانین لێرە بە دواوە، پێش پێشبڕکێیەکە، تەمەشایەکی دەستکێشەکانی دەکەین.

- کەیفی خۆتانە، ئەوە پەیوەندی بە خۆتانەوە هەیە.

وەختایەک کابرای بە دیمەن ڕۆیی، جەماعەتی مە کەوتنە لۆمەی سیتانوف:

- بۆچی وات کرد قەل پیاو؟ یارۆی قوزاقی بۆڕی پێ دەدا، تەواو ئێمە دۆڕاین..

ماوەیەکی زۆر سەرزەنشتمان کرد وخەشی خۆمان ڕشت، هەنگێ سیتانوف هەناسەیەکی هەڵکێشا وگوتی: - ئاخ لات و لەوێرینە..

ئەوسا تەحەدای موردوفی کرد، ئەمە بووە مایەی سەرسامی هەمووان، موردوفی، خۆی ئامادە کرد، بە سوعبەتەوە هاواریکرد: - پێشبڕکێیەکی بچووک، بایی ئەوەی بەدەنم گەرم بکەمەوە!

هەندێک لە تەمەشاڤانەکان، دەستی یەکیان گرت، دڕیان بەوانە دا کە لە دوایانەوە وەستابوون، تا مەیدانێکی فراوان بکەنەوە.

هەردوو بۆکسەر دەستیان بە هەڵبەز ودابەز کرد، بە وردی لێکدییان دەڕوانی، هەردووکیان مستی ڕاستیان بۆ پێشەوە بردبوو، مستی چەپیان بە سینگیانەوە نا. تەمەشاڤانە شارەزاکان یەکسەر ڕایانگەیاند کە باسکێن سیتانوف، لە هی موردوفی درێژترن. ئیدی بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو شتێکا کێشا، تەنیا قرچەقرچی سەهۆڵی ژێر پێی جووتە بۆکسەرەکە نەبێت. یەکێک کە تەحەمووڵی ئەو دیمەنەی پێنەدەکرا، بە گلەییەوە گوتی:

- کاتی ئەوە هاتووە کە بە توندی پەلاماری یەکدی بدەن..

سیتانوف، دەستی ڕاستی نیشاندا، موردوفی دەستی چەپی بۆ بەرگری بەرزکردەوە، سیتانوف، بەدەستی چەپ یەکێکی بە سەرووی ورگیا کێشا. گەڕایەوەو بە ستایشەوە گوتی:

- غەشیم نیت، بە تایبەتی تۆ گەنجیت!

بەردەوام بوون، هەریەکەیان بەسینگی ئەویتریدا دەکێشا.
زۆری پێنەچوو کە هەردوولا بە هەڵچوونەوە کەوتنە هاوار: - دەی نیگارکێشی خوا، پڕی دەیە! ڕوخساری بنەخشێنە!

موردوفی لە سیتانوف بە هێزتر بوو، بەڵام وەکو ئەو باریک نەبوو. جا چونکە نەیدەتوانی بلەز هەڵسووڕێت، لە هەنبەر هەر بۆکسێکدا کە دەیوەشاند، دوو یان سێ بۆکسی دەخوارد. دیاربوو بۆکەسەکان کەمێک کاریان تێکرد، بەڵام هێشتا هەر نەعرەتەی دەکێشا و گاڵتەی بە خەنیمەکەی دەکرد. ئەوجا لە ناکاوا، جەزرەبەیەکی توندی ئاراستەکرد، ڕێک بەر باسکی ڕاستی سیتانوف کەوت، لە شانیەوە لەجێ چوو. یەکسەر چەند دەنگێک بەرزبوونەوە:

- لێکدیان دووربخەنەوە. بەرانبەر!

تەمەشاڤانان، هێرشیان هێنا و جووتە بۆکسەرەکەیان لێکدی کردەوە. موردوفی بە ڕاوێژێکی دۆستانە گوتی:

- ئەم نیگارکێشی خوایە بەهێز نییە، بەڵام زۆر تەڕدەستە. دەبێت بە بۆکسەرێکی باش، بێ هیچ شەرمێک دان بەوەدا دەنێم.

ئەو گەنجانەی کە تەمەشای کێبڕکێیەکەیان دەکرد، دەستیان بە شەڕ کرد، بەڵام من ' سیتانوف ' م برد بۆلای جەڕاح و شکستەبەند. ئەوکارەی سیتانوف کردی، هێندەی دی لەلام خۆشەویستی کرد وزیاتر دڵبەندی بووم.

پیاوێکی مەرد و ڕەند بوو، بە ویژدان و شەریف بوو، پێدەچوو ئەوە بەئەرکی خۆی بزانێت. کەچی ' کاپندیوخین ' ی بەرەڵلا گاڵتەی پێدەکرد. دەیگوت:

سیتانوف، تۆ ئاسایی ناژیت، ژیانت ساختەیە! ڕێک وەکو چۆن سەماوەر سیقال دەدەنەوە، ئاوا خۆت سیقال داوە و بەخۆتەوە دەفشێیت، واتە بریقە وباقەکەت دەستکردە —

تەمەشای من بکەن بریقە وباقی من خۆڕسکە، ئەسڵە! بەڵام تۆ لە ڕاستیا لە جەوهەر و کرۆکدا، وەکو مس وایت، ئینسان لێت بێزار دەبێت..

سیتانوف، وەڵامی نەدەدایەوە، دەچووە سەر کارەکەی خۆی، شیعرەکانی لیرمانتوفی لە دەفتەرە چکۆلەکەی خۆیدا دەنووسییەوە. وەختی دەستبەتاڵی خۆی بە نووسینەوە دەبردەسەر. جارێک پێمگوت:- باشە تۆ پارەت هەیە، بۆ نوسخەیەک لەو کتێبە بۆ خۆت ناکڕیت؟

بەرسڤی دایەوە: - نا، شیعر ئەوکاتە خۆشە کە بەدەستی خۆت دەینووسیتەوە!

دوای ئەوەی لاپەڕەیەکی دەنووسییەوە هەنگێ چاوەڕوانی دەکرد تا مەرەکەبەکە وشک دەبووەوە و بەدەنگێکی خۆش شیعرەکەی دەخوێندەوە:

*بەبێ ماڵاوایی و خاترخوازی*
*دنیا بچووکەکەت بەجێدێڵی*
*خەڵکە باشەکە و*
*ڕۆژانی گەورە و خۆش*
*بەجێدێڵی.*

چاوەکانی بچووک دەکردنەوەو دەیگوت:

- ئەمە دروست وایە، حەقیقەتێکە ئاو لێڵ ناکات، ئاە! بەڕاستی شاعیر جوان حەقیقەتی پێکاوە!

شێوازی مامەڵەی سیتانوفم لە گەڵ کاپندیوخین دا، زۆر بەلاوە جوان و سەیر بوو. وەختێ کاپندیوخین سەرخۆش دەبوو و شەڕی بە سیتانوف دەفرۆشت، سیتانوف، زۆر بە حەوسەڵەوە هەوڵی لە گەڵ دەدا کە وازبێنێ، بەکاوەخۆ دەیگوت:- لێم دوورکەوە، وازم لێبێنە، دەستم تێوە نەدەی!

ئەوجا سیتانوف، زۆر بێڕەحمانە دەکەوتە وێزەی کابرای بەدمەست، ئیدی نیگارکێشەکانی دی، ئەوانەی حەزیان دەکرد شەڕەکە بدینن، فریا دەکەوتن و دەکەوتنە ناوبژی جووتە برادەر و لێکیان دەکردنەوە. دەیانگوت:

- ئەگەر دەستی سیتانوف نەگرین، دەیکوژێت، بێئەوەی بیر لە ئاقیبەتی کارەکەی خۆی بکاتەوە، هەر لێی دەدات.

کە کاپندیوخین، مەست نەبوایە، بە ئارەزووی خۆی سەری دەکردە سەری سیتانوف، گاڵتەی پێدەکرد کە حەزی لە شیعرە، گاڵتەی بە ئاشقێنیە ناکامەکەی دەکرد، هەموو هەوڵێکی دەدا کە پەستی بکات، بەڵام بێهودە، هەر پەست نەدەبوو. سیتانوف، بێئەوەی گوێ بداتێ، گوێی لە تانە وتەشەرەکانی یارۆی قوزاقی دەگرت و بگرە هەندێک جار گوێ بەگوێی کاپندیوخین پێدەکەنی.

ئەم جووتە لە لای یەکەوە دادەنیشتن، پاڵدەکەوتن و تا حەوت نیوەشەو بە چپە یەکیان دەدواند و هەر فسکەفسکیان دەکرد.

ئەم فسکەفسکەیان دڵی کرمێ دەکردم، لە دڵی خۆدا دەمپرسی ئاخۆ ئەم جووتە، کە دانوویان بەیەکەوە نەدەکولا، باسی چی دەکەن؟ کە لێیان نزیک دەبوومەوە، کابرای قوزاقی خێرا هەڵیدەدایێ: - ها چ دەکەی لەم ناوە؟

سیتانوف، فەرامۆشی دەکردم.

جارێک بانگیان کردم بۆ نک خۆیان. یارۆی قوزاقی گوتی:

- ماکسیمیچ، ئەگەر پارەیەکی باشت هەبوایە چیت پێدەکرد؟

- دەمدا بە کتێبان.

- چیتر؟

- نازانم.

کاپنـــدیوخین، هەناســـەیەکی نەبەدڵـــی هەڵکێشـــا و ڕووی لێوەرگێڕام.

سیتانوف، بە ئارامی گوتی:

- بینیت؟ کەس نازانێت – نەپیر و نە گەنج نایزانن. من پێت دەڵێم کە دەوڵەمەندی بە تەنیا ناکاتە هیچ. هەر شتێک دەبێ فایدەیەکی هەبێت..

پرسیم:- باسی چیتان دەکرد؟

یارۆی قوزاقی بەرسڤی دایەوە: - هیچ، کات بەسەر دەبەین – خەومان زڕاوە.

پاشـــان تـــوانیم گـــوێ لە قســـەکانیان بگـــرم، ئیـــدی بـــۆم بەدیـارکەوت کە باسـی هەمـان ئەوشـتانە دەکەن کە خەڵکی لە ژیـانی ڕۆژانەدا باسـی دەکەن: خـودا، دادپەروەری، شـادمانی، مەکـــر وفێڵـــی ژان و کەرێتیـــان، تەماعکـــاری و چـــاوچنۆکی دەوڵەمەنـــدان و، ئەو حەقـــیقەتەی کە ژیـــان ئـــاژاوەیەکە کە ئەوسەری نییە.

بە بەردەوامـــی گـــوێم هەڵدەخســـت تـــا بـــزانم چ دەڵـــێن. قسەکانیان کاری لە ناخم دەکرد، کە دەمبینی ئەوانیش هەمـان ڕای منیـان هەیە، پێیـان وایە کە ژیـان گەندەڵە و دەبێ باشـتر بکرێ، کۆڵێ دڵم خۆش دەبوو. لە هەمـان کاتدا هەستم دەکرد کە ئـارەزووی ژیـانێکی باشـتر، نـابێ بەبـارگرانی بەسـەر هـیچ کەسێکەوە، هەروەها ئـارەزوو بە تەنیا ژیـانی نـاو کارگەکەیـان پەیوەنـــدی نێـــوان نیگارکێشـــەکان نـــاگۆڕێ. ئەم قســـانە ئەو قەناعەتەیان لە لا دروستکردم کە ژیان بۆشاییەکی ترسـناکە و خەڵکی خۆیـانی بەدەمەوە دەدەن، ڕێـک وەکـو گەڵای وشـکی سـەر دەریـاچەیەک کە بـا بێهـودە و بەبـێ هـیچ مەبەسـت و ئامانجێـک ڕایـدەماڵێت. ئەوان خۆشـیان لەمە بێـزارن کە بەبـێ ئامانج تاو دەدەن.

نیگارکێشەکان هەمیشە، یان خۆیان هەڵدەکێشا، یان داخیان دەخوارد، یان سەرزەنشتی خەڵکانێکیان دەکرد، یان لە سەر شتی زۆر بچووک و تورەهات، دەیانکرد بە قەرقەشە و دەم بۆڵە و، یەکتریان دەشکاند. کاتی خۆیان بە قسە وباسێن دوور ودرێژ دەبردە سەر و، ئاکامی ئەو دنیای خۆیان بەر مەزەندان دەدا. بەڵام لێرە، لە نزیکی ئەو سەتڵەی کە لەلای دەرگاکەوە بوو و بەرماوەی خوراکیان تێدەکرد کونێک هەبوو، جێگەی کۆڵەکەیەکی داربوو، بایەکی ساردی لێوەدەهات کە پێیەکانمانی دەچایاند. لەگەڵ پاڤڵدا کونەکەمان بە پوش وپەڕۆ کۆن گرت. کرێکارەکان زۆرجار باسی ئەوەیان دەکرد کە کۆڵەکەیەکی تازە دابنەن، کونەکە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبوو. لە ڕۆژانی باهۆز و گژە بادا، بایەکی توونذ بە لورەلور خۆی بە کونەکەدا دەکرد و دەتگوت فوو بە شەیپورێکدا دەکرێ، تووشی کۆکە و هەلامەت دەبووین. ئەو قەپاخە تەنەکەیەی لە سەر کونی هەواکێشەکەدا دانرابوو، لوورەلوورێکی هێندە ترسناکی لێوەدەهات، کە کرێکارەکان دەکەوتنە پیسترین جنێودان. کەکەمێک چەورم کرد، چیخاروف، گوێی هەڵخست، گوتی: - سەد خۆزگەم بەجاران، لووره لوورەکەی لە جاران ترسناکترە!

کرێکار ونیگارکێشەکان وەختایەک لە حەمام دەهاتنەوە، خۆیان دەدا بەسەر تەختەخەوە پیسەکانیاندا. ئیدی چڵکنی وپڵکنی جێگاکانیان و بۆنە ناخۆشەکان کەسیان بێزار نەدەکرد، مێشک و کەپووی پڕ کردبوون. زۆرشتی لەم بابەتە کێماسیانە هەبوون، کە ژیانیان تاڵ دەکرد، زۆریش بە ئاسانی چارەسەر دەبوون ، لێ کەس نە بیری لێدەکردەوە نە خۆی لێ بە خاوەن دەکرد.

زۆرجار گوێم لێیان دەبوو کە دەیانگوت:

- کەس بەزەیی بە بەشەردا نایەتەوە، نە خواو نە بەشەرەکە خۆیشی بەزەیی بەخۆیدا دێتەوە.

وەختایەک من و پاڤل، داڤیدوفمان کە نەخۆش بوو و خەریک بوو دەمرد و کێچ و ئەسپێ تێی دابوو، شۆرد، گاڵتەی دنیایان پێکردین، ناوی ناترو کیسەکێشیان لێناین. نیگارکێش و کرێکارەکان هەر بۆ ڕابواردن کراسەکانیان دادەکەند و بە سوعبەتەوە داوایان لێدەکردین بۆیان بکوڵێنین تا ئەسپێکانیان لێ ببێتەوە، بەجۆرێ مامەڵەیان لەتەکدا دەکردین وەکو ئەوەی کارێکی نەنگین و پڕ شەرمەزاریمان کردبێت.

داڤیدوف، لە نوئێلەوە تا ڕۆژووی گەورە لە جێگادا کەوت، دەکۆکی ئەمما کۆکین، خوێنی هەڵدێنا، تفی ڕۆدەکردە ئەرزەکە، هەندێ شەو کە تای لێدەهات، دەکەوتە وڕێنە وهەموو هاوڕێکانی بێدار دەکردەوە. تەقریبەن هەموو بەیانیەک ئەم قسەیەیان دووبارە دەکردەوە:

- پێویستە بۆ نەخۆشخانەی بەرین!

پاشان سەیرمان کرد، پەساپۆرتەکەی بەسەر چووەو دەبێ تازە بکرێتەوەو بەبێ پەساپۆرتیش لە نەخۆشخانە وەری ناگرن. پاشان کەمێک وەخۆهاتەوە. ئەنجام بڕیاریان دا کە:

- پێویست بەو زەحمەتە ناکات. هێندەی بەبەرەوە نەماوە، بەم زووانە دەمرێت!

یارۆی نەخۆشیش، هەمان قسەی ئەوانی دەکرد و دەیگوت:

- بەڵێ. زۆرم بە بەرەوە نەماوە!

کابرا بە تەبیعەت سوعبەتچی بوو، هەوڵیدەدا، ئەو بێتاقەتی و نائومێدی و بێزارییەی کە باڵی بەسەر کارگەکەدا کێشابوو بڕەوێنێتەوە، لە سەر قەرەوێڵە بەرزەکەیەوە، سەرە ڕەق

وتەقەکەی بەرز دەکـــردەوەو بە دەنـــگە زیقـــاوڵەکەی پێـــی دەگوتین:

- گەلۆ، گوێ لەم دەنگە بگرن، کە لەم بەرزییەوە دەڵێت:

*من لەم بەرزییەدا دەژیم*

*بەیانیان زوو لەخەو ڕادەبم*

*بەڵام خەوتبم یان بێدار بم*

*بەدەست ساس و ئەسپێوە*

*ژیانم ژیان نییە.*

گوێگرەکان دەیانگوت: - هێشتا هەر گەشبینە!

هەنـدێجار مـن وپاڤـڵ دەچـووین بـۆلای. بە دەم بزەیەکـی کاڵەوە خێرهاتنی دەکردین:

- بەخێـــرێن میـــوانی ئـــازیز، مەیلتـــان لە چیـــیە؟ چـــۆنە جاڵجاڵۆکەیەکی تازەتان پێشکەش بکەم؟

فتیلەی ژیانی زۆر بە خاوی بەرەو کوژانەوە دەچوو، زۆر لەوە بێـزار بـوو کە بـۆ زوو نامرێـت. بە کەســـەرەوە داخـــی هەڵدەکێشا ودەیگوت:

- نازانم بۆ نامرم، ئەمەش بۆ خۆی بەد شانسیەکە!

ئەم بێبـــاکیەی لە مـــردن، پـــاڤلی زۆر دەترســـاند، شـــەوان تەکانی دەدام کە لەخەو ڕادەبووم، بە گوێیدا دەچپاندم:

- ماکسـیمیچ! واهەسـت دەکەم مـردووە.. دەترسـم شـەوێک بەم شێوەیە بمرێت. خودایە! چەند لە مردووان دەترسم!

و لە سەری دەڕۆیی: - ئـاخر کەی وەختـی مردنیەتـی؟ خۆ هێشتا بیست ساڵی تەواو نەکردووە!

شەوێکی هەیڤەشەو بێداری کردمەوە، چاوەکانی لە ترساندا ئەبڵەق بووبوون : - گوێ بگرە!

داڤیـــدوف، لە ســـووچە بەرزەکەی خۆیـــدا دەینالانـــد، بە دەنگێکی لەز وخویا دەیگوت : - ئێرە، بیدە بە من، ئێرە..

دیاربوو کەوتبووە ئاویلکە و لە گیانەڵڵای مەرگا بوو.

پاڤـــڵ، تەواو شـــپرزە بووبـــوو، دەیگـــوت: - کەوتـــووەتە ئاوزینگ، بە زاتی خوا دوادواییەتی!

مـــن بە درێژایـــی ڕۆژەکە، ئەو بەفـــرەم کە لە حەوشـــەکەدا مـــاڵی بـــوو، بـــۆ دەرەوە بردبـــوو، زۆر شـــەکەت بـــووم، پێویســـتم بەخەو بوو. بەڵام پاڤڵ دەستبەردار نەدەبوو و هەر دەپاڕایەوە:

- توخوا مەخەوە! تۆ زاتی خوا مەخەوە! تکایە مەخەوە!

ئەوسا کەوتە سەرچۆکان و لە هۆڕژنی گریانی دا: - ڕابن، گەلۆ ڕابن، داڤیدوف مردووە!

چەند کەسێک لە کرێکارەکان ڕابوون و لە جێگاکانیان هاتنە دەرەوە. ئیدی هەر پرسیار بوو لە گۆشە وکەناری ژوورەکەوە بەرز دەبووەوە.

کاپنـــدیوخین، بـــۆ هەورەبـــانەکە ســـەرکەوت و چـــووە دیـــار تەختەخەوەکەی، بە حەپەساویەوە گوتی: - لەوە دەچێ مردبێ، هەرچەند بەدەنی هێشتا گەرمە..

بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان. چیخـــاروف نیشـــانەی خـــاچی کێشـــا، لـــێفەکەی لە خـــۆیەوە پێچـــا و گـــوتی: - دەی هەزار ڕەحمەتی لێبێت!

یەکێک لە کرێکارەکان گوتی: - باشتروایە بیبەینە دالانەکە...

کاپنـــدیوخین هـــاتەخوارەوە، لە پەنـــجەرەکەوە نیگـــایەکی دەرەوەی کـــرد و گـــوتی:- بـــا تـــا بەیـــانی هەر لەوێ بـــێ، کە زندووش بوو کەسی ئەزیەت نەدەدا.

پاڤڵ، سەری وەژێر سەرینەکەی دا و، دەستی بە گریـــانێکی بە سوێ کرد. بەڵام سیتانوف هەر هەڵیش نەستا.

## (١٨)

بەفر لە کێڵگە و دەشت و دەران وردە وردە دەتوایەوە. هەوری زستان بەری ئاسمانی بەردا، ڕێژنەی باران و بەفر بە توونــدی دایــدەکرد. ڕۆژ بەرە بەرە درێــژ دەبــوو، هەتــاو لە جاران دێرتر ئاوا دەبوو، هەوا بەرەو گەرمی دەچوو، بەهار بەرێوە بوو، بەڵام بەر لەوەی بگاتە شار، بە ئاسمانی کێڵگە و دێهاتەکانەوە سەرەتاتکێی دەکرد و خۆی ئامادە دەکرد لە ناکاوێکا خۆی بەشاردا بکات. قوڕ و حەڕی سورباوی کوچە و کۆڵانەکان خەریک بوو وشک دەبوونەوە. ئاوی جۆگەلەی قەراخ شۆستەکان بە خێرایی دەڕۆیی، چۆلەکە و پاساری، چوست و چالاک، شاد و بەکەیف بە سەر گۆلاوە پەراگەندەکانی مەیدانی ئەریستانسکادا باڵەفڕکەیان دەکرد. خەڵکی بوژانەوە. زەنگی ڕۆژانی ڕۆژووی گەورە لە بەیانیەوە تا ئێواری لە لێدان نەدەکەوت و دەزرینگایەوە و تێکەڵ بە ئاوازی بەهار دەبوو و، بە ئاوازە نەرمەکانی لای لایەی بۆ دڵان دەکرد. ئەم زرینگانەوەیەش، وەکو ئامۆژگاری پیرەمێران، بە جۆرە خەمینییەکی سارد بارگاوی بوو. وام هەستدەکرد کە زەنگەکە بە ڕاوێژێکی خەمین، ئێمە دەدوێنێت و لە تۆ وایە دەڵێت:

- تەواو بووە، تەواو، تەواو.

لە جەژنی ساڵیادی لە دایکبوونما، کارگەکە ئیکۆنەیەکی بچووکی، کە لە سەر شێوەی ئەلکسی پیاوی خوا دروستکرابوو، بە دیاری پێشکەش کردم. چیخارۆف بەم بۆنەیەوە، بە دەنگێکی پڕ ویقارەوە وتارێکی دا کە تا ئێستاش لە یادگەما نەخش بووە.

برۆکانی وێک هێنانەوە، بە قامکان لە مێزەکەی دەدا، گوتی:

- تۆ کێیت؟ بستە منداڵێکی، بابایەکی سێوی، لە تەمەنی سیازدەساڵیدایت. زۆرچاکە، تەمەنی من چوارهێندەی تەمەنی تۆ دەبێت، پڕ بەدڵ پیرۆزباییت لێدەکەم و ئافەرینت دەکەم چونکە تۆ لە ژیان هەڵنایەی بەڵکو ڕوو بە ڕووی ژیان دەبیتەوە! ئەمە کارێکی زۆرچاک ودروستە، هەمیشە هەر وابە، ڕوو بە ڕووی کارەکان ببەوە!

ئیدی باسی بەندەو پیاوانی خوای کرد، بەڵام ئەو، ئەو دوو گروپە پیاوەی لێکدی جیادەکردنەوە و بەیەکی نەدەزانین، بەڵام من لە جیاوازییەکەیان حاڵی نەبووم. ئەو بەخۆیشی ئەو جیاوازیەی زۆر لە لا ڕۆشن نەبوو. وتارەکەی زۆر خاو ویەکنەوا بوو، ئامادەبووان گاڵتەیان پێدەکرد. من کە ئیکۆنەکەمبە دەستەوە بوو نەمدەزانی چۆن ڕابوەستم. ئیدی تەواو پەشۆکابووم و نەمدەزانی وەک دەڵێن لە سەر کام پا بڕەقسم. ئەنجام کاپندیوخین، بێتاقەت بوو، منی لەو تەنگژەیە ڕزگارکرد وگوتی: - بەسە، ئەم شیننامەیە تەواو بکە! ئەم منداڵەت گێژ کردا

چەند جارێک دەستی بە شانا دام و پیرۆزبایی لێکردم و گوتی:

- خەسیەتی هەرە چاکی تۆ ئەمەیە کە دەزانیت چۆن لە گەڵ هەرکەسێکدا ڕەفتار بکەیت! ئەو سوخەتەتم بە دڵە. بۆیە هەرکاتێ شایەنی گلەیی یان جەڵدەش بیت، پێمان ناخۆشە ئەو سزایە بدرێیت!

هەموو کرێکارەکان دۆستانە لێیان دەڕوانیم و بە میهرەبانیەوە گاڵتەیان بە شەرمکردن و پەشۆکانەکەم دەکرد. خۆ ئەگەر ئاهەنگەکە کەمێکی دی درێژەی بکێشابایە، بێگومان لە خۆشیا، لە خۆشی ئەوەی کە سوودێکم بۆ ئەو خەڵکە هەبووە، دەستم بەگریان دەکرد.

هەمان بەیانی شاگردی دەفتەرداری دووکانەکەی لەمەڕ خۆمان بە " پیوتر فاسیلیفیچ"ی گوتبوو: - ئەم کوڕە خوێنتاڵە.. بە کەڵکی هیچ نایەت!

وەکو هەمیشە بەیانی زوو بۆ دووکان چووم، بە ماوەیەکی کەم دوای نیوەڕۆ، شاگردە دەفتەردارەکە پێی گوتم:

- بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، بەفری سەربانی عەمارەکە بماڵە و بیخە ژێرخانەکەوە..

بێگومان نەیدەزانی ئەو ڕۆژە، ڕۆژی لە دایکبوونمە، بەخۆیشم نەمدەویست بەکەس بڵێم و خەڵکی بەو بۆنەیەوە بخەمە زەحمەتەوە.

ئاهەنگی پیرۆزبایی لە کارگەکە تەواوبوو، بلەز جلکی کارم لەبەرکرد و بەغاردان چوومە نێو حەوشە، سەرکەوتمە سەربانی عەمارەکە. بەفرەکەم ماڵی، ئەو زستانە بەفرێکی یەجگار زۆر باری بوو. ئیدی بۆ نەگبەتی، کە هێشتا مەستی ئەو ئاهەنگە بووم کە لە کارگەکەدا بۆ منیان گێڕابوو، بیرم چوو هەوەڵجار دەرگای ژێرخانەکە بکەمەوە، ئیدی هەموو بەفرەکە لەبەر دەرگاکە کەڵەکە بووبوو. بلەز هاتمە خوارەوە و دەستم بە ماڵین ولادانی بەفرەکە کرد. بەڵام دنیا ئەوەندە سارد وتەزی بوو، بەفرەکە بووبوو بەبەستەڵەک و بەفرماڵەکە دەرەقەتی نەدەهات، بێڵچەی ئاسنیشم نەبوو، ئیدی بەفرەماڵەکەم بە هۆی قورسی بەفرەکەوە شکا. ڕێک لەو کاتەدا شاگردی دەفتەرداری فرۆشگایەکەمان پەیدا بوو، وەک ڕووسان دەڵێن: " هەر خۆشییەک ناخۆشیەکی لەدوایە " ڕێک ئەوە لە من ڕوویدا. یارۆی دەفتەردار بەرەبەرە لێم نزیک بووەوە، بە تووڕەیی هاواری بەسەرما کرد:

- تەمەشـا، تەمەشـا! بە ڕاسـتی کرێکـاری چـاکی! هەی قەل پیاو بەڕاسـتی وەختـی ئەوەهـاتووە، یەخەت بگرم و بۆ حەوت پشتت ئاقڵت بکەم..

دەستی دایە کلکی بەفرەماڵە شکاوەکە کە دارکاریم بکات، پاشەوپاش کشامەوە، بەتووڕەیی هـاوارم کرد: - من بۆ ئەوە نەهاتووم خزمەتکاری و نۆکەری تۆبکەم!

دارەکەی خێواندە پێیەکانم، منیش تۆپەڵە بەفرێکم هەڵگرت و کێشـام بە دەم وچاویـدا. بەدەم تـف کـردنەوە هەڵات. مـن یەکسـەر بـۆ کـارگەکە گەڕامەوە، دوای چەنـد خولەکێـک دەزگیرانەکەی یارۆی دەفتەردار بە هەڵەداوان هات، کچۆڵەیەک بـوو لە هەڕەتـی جەوانیـا، سەرشـێت، لەخۆبـایی، دەم وچـاوی یەکپـارچە عـازەبە بـوو، هـاواری کـرد: - ئەلکسـی، بـڕۆ بـۆ سەرەوە!

وەڵامم دایەوە: - ناڕۆم!

لاریونیچ کە لە وەڵامەکەی من حەپەسـابوو، لەبن لێوانەوە پرسی:

- ئەمە چییە؟ چما ناچیتە سەرەوە؟

مـن مـاجەراکەی خـۆم بـۆ گێـڕایەوە. نێوچـاوانی تێکنـا، دەبیرەوە چوو، ئەوسا بەخۆی بۆ سەریَ ڕۆیی. گوتی: -کوڕی خوم، ئەمە گۆساخیە تۆ دەیکەی. وانابیَ!

ئیـدی هەمـوو کرێکارەکـان کەوتـنە نەفـرەت لە یـارۆی دەفتەردار.

کاپندیوخین گوتی:- بێگومان دەرت دەکەن!

زۆر بـاکم بە دەرکـردن نەبـوو. مـاوەیەک بـوو پەیوەنـدیم دەگەڵ یارۆی فرۆشیاردا (دەفتەردار) خراپ بـوو بوو، ڕقی لە مـن بـوو، بە ئاشـکراش دەری دەبـڕی و بەد ڕەفتـاری دەگەڵـدا دەکردم. هەڵبەتە من ئەمەم زۆر لەبەر گران بوو، بەڵام حەزم

دەکرد بزانم بۆچی بەو ڕکونیە مامەڵەم لەتەکدا دەکات. بۆ نموونە هەندێک دراوی خوردەی بە ئانقەست لە ژوورەکەدا فڕێ دەدا، وەختایەک ژوورەکەم گسک دەدا، هەڵم دەگرتنەوەو دەمخستنە ئەو سەندوقەوە کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، تا ئەگەر سواڵکەرێک ڕوی کردە دووکانەکە، لەو پارانە شتێکی بدەمێ. ڕۆژێک سەبارەت بەو داوەی کە ئەوەندە گەوجانە بۆی نابوومەوە تا تێی بکەوم، بە یارۆی فرۆشیارم گوت:

- تۆ بە خەیاڵی خاوی خۆت بۆیە ئەو پارانە فڕێ دەدەیت، تا من هەڵی بگرم و تۆش بە دزی تاوانبارم بکەیت! بەڵام ئەو خورمایەی تۆ خواردووتە ناوکەکەی وا لە گیرفانی مندا! سلاو لە ئەقڵی خاوت!

توورەبوو، دەم وچاوی سوور هەڵگەڕا، گۆساخانە هاواری بە سەرا کردم:

- تۆ ڕێگە بە من نیشاندەدەی! حەدت چییە، من خۆم دەزانم چیدەکەم! هەرچییەک دەکەم پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە!

بەڵام بلەز بایدایەوەوگوتی:

- بە چیبیا دەڵێی من بە ئانقەست و بە مەبەست ئەو پارانە فڕێ دەدەم؟ وانییە، ئەو پارانە بەڕێکەوت دەکەون.. بۆ تاقیکردنەوەی تۆ نییە.

ئەو کابرا نەی دەهێشت لە دووکاندا کتێبان بخوێنمەوە، دەیگوت:

- یانی چی؟ ناشێ بتەوێ ببی بە زانا و دانا؟ تەمەشا ئەم چەکلە ناکەی!

ئیدی بەردەوام بوو لە سەر ئەو پیلانەی کە بە دزییەوە بمگرێت، ئیدی دڵنیابووم لەوەی کە ئەگەر دراوێکی بیست کوپیکی بەدەم گسک دانی ژوورەکەوە بکەوێتە درزێکەوە، کەم وزۆر سڵ لەوە ناکاتەوە کە بیخاتە ئەستۆی من و بڵێ تۆ

دزیـوتە. بۆجـاری دووەم داوام لێکـرد کە دەسـتبەرداری ئەو تەڵەکەبازیە ببێت، بەڵام هەر هەمـان ئەو ڕۆژە وەختـایەک مـن بە کتریەک ئاوی گەرمەوە لە بارەکە دەگەڕامەوە، گوێم لێبـوو، بەکرێکارە تازەکەی عەمارەکەی تەنیشتی خۆمانەوەی دەگوت:

- کـارێکی وابـکە کتێبـی مزمارەکـان بـدزێت - بەو زووانە چاپی تازەمان بۆدێت - سێ کارتۆنی تەواومان بۆ دێت.

زانـــیم باســـی مـــن دەکەن. هەرکە وەژوور کەوتـــم، هەردووکیان پەشۆکان. دەمێک بوو، هەستم دەکرد، بەتەمـان داوێکم بۆ بنەنەوە.

ئەم دراوسێ دووکانەمان، پیاوێکی لاوازی مردەلۆخی، چاو فێڵاوی بوو. ناو بە نـاو کـاری دەکـرد. کـابرایەکی مەیگوسـاری ئالوودە بوو، کەچی بە وەکیلێکی زۆرباشیان دەزانی. هەرکـاتێ خـووی دەدایە خـواردنەوە، خـاوەن کـارەکە جـوابی دەکـرد، پاشـان دەیهێنـایەوە سـەرکارەکەی. بە ڕواڵەت کەسـێکی خـاکی بـوو، بەدڵـی خـاوەن کـارەکەی دەکـرد، هەر داوایەکـی، چەنـد توورەهــاتیش بــوایە، لێبکــردایە، جێبەجێــی دەکــرد، بەردەوام بزەیەکـی کـاڵ بەسـەر لێـویەوە بـوو، بـۆنی دەمـی هەرچەنـدە ددانەکانی ساغ بوون وەکو کەسـانێک ددانیـان کرمـۆڵ بـووبێ، زۆر پیس وناخۆش بوو.

ڕۆژێـک ڕەفتـارێکم لـێ بینـی زۆرم پـێ سـەیر بـوو: بەدەم زەردەخەنەیەکەوە لـێم نزیـک بـووەوە، لە ناکـاوا کـڵاوەکەی لە سەر داکەندم ولە قژم نەوی، بەیەکدا هەڵگژاین. لە ڕاڕەوەکەوە بۆ ناو دووکانەکە ڕایکێشام، دەیویست بمدات بەسەر کۆمەڵێک ئیکۆنـــانی گەورەدا، کە لە ســـەر ئەرزەکە دانرابـــوون. ئەگەر ئەوەی بـۆ بچـووایە سـەر، بێگومـان شووشـەکان دەشـکان، نەخش ونیگارەکان دەشکان، وێنە بەنرخەکان خراپ دەبوون. جـا چۆنکە کەسـێکی ڕێـوەڵەی بـابردەڵە بـوو، زۆر بە ئاسـانی

بەرهەقم کرد وبە سەریا زاڵ بووم. کە بینیم ئەو زەلامە زلە ڕیشنە لە سەر ئەرزەکە دانیشت و بە دەم سڕینی دفنە (لووت) برینداره‌کەیەوە دەستی بەگریان کرد، زۆر سەرم سوڕما.

ڕۆژی دوایی، لای بەیانیەکەی، هەر هەردووکمان بووین، وەستاکانمان پێکەوە دەرچووبوون، بەدەم خوراندنی کەپووە ئاوساوەکەی و ژێرچاوە شینەوە بووەکانییەوە بە ڕاوێژێکی دۆستانە گوتی:

- تۆ پێت وایە من هەر لە خۆوە شەڕت پێ دەفرۆشم؟ ئەوەندە کەر نیم. دەمزانی تۆ لە من بە قوەت تری. من بابایەکم ڕێوەڵە، سەرخۆش. وەستا گاڵی دام ئەوکارە بکەم. گوتی: " لێی بدە و هەوڵبدە، گەورەترین زیان بە دووکانەکەیان بگەیەنیت. بەوە زەرەرێکی زۆریان لێدەکەویت ". دەنا باوەڕبکە من لە خۆوە ئەو کارەم نەدەکرد. تەمەشای دەم وچاوم بکە بزانە چیت بەسەر هێناوم، ئەوە حاڵە منی تیام!

باوەڕم پێکرد، دڵم پێی سووتا. دەمزانی کابرایەکی ماندوو و نیمچە برسییە و دەگەڵ ژنێکا دەژی، کە بە ئارەزووی خۆی دەیچەوسێنێتەوەو لێی دەدا. وێڕای ئەوەش لێم پرسی:

- باشە ئەگەر ئەمریان پێکردی کەسێک دەرمانخواردوو بکەیت، دەیکەیت؟

بەڕاوێژێکی نەرم و بەدەم بزەیەکی بێ دەسەڵاتانەوە گوتی:

- لەوانەیە ناچارم بکات.. کابرایەکە دەتوانێ ئەوەم پێبکات.

جارێکی دی پێی گوتم:

- تاقە یەک کوپیکم پێ نییە. لە ماڵەوەش نانی ژەمێکمان نییە، ژنەکەم بەردەوام بە سەرما دەبۆڵێنێت. ئەگەر ئیکۆنەیەک لە عەمبارەکەی ئەنگۆ بدزم بۆخۆم دەیفرۆشم. دەتوانی ئیکۆنەیەکم بۆ بدزیت؟ یان کتێبێکی مەزمورانم بۆ بدزیت؟

یەکسەر عەمباری پێڵاوەکان و پاسەوانی کڵێساکەم بیرکەوتەوە، لە دڵی خۆدا گوتم: بێگومان ئەم گەنجە خەبەرم لێدەدات. بەڵام دڵم نەهات داواکەی ڕەفز بکەم. ئیدی ئیکۆنەیەکم دایێ. هەرلە خۆوە، خۆیشم نازانم چما، هەستم کرد ئەگەر کتێبێکی مەزموران کە بایی چەند ڕۆبڵێک بوو، بدزم، ئەمە تاوانێکی گەورەیە. سەیر ئەوەیە هەموو بەهما مۆراڵیەکانمان، بە حیساباتی بازرگانی بارگاویە..

وەختایەک گوێم لە فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان بوو، ئەو گەنجە بە سەزمان وداماوە هاندەدات، تا من تەفرە بدات وکتێبێکی مەزموورانی بۆ بدزم، یەکسەر دزینی ئەو ئیکۆنەیەم بیرکەوتەوەو ترسێکی سەیرم لێنیشت. دەمزانی فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان لە هەموو شتێک ئاگادارە و، کابرای دراوسێمان هەموو شتێکی بۆ گێڕاوەتەوە.

بێ مانایی پیاوەتی لە سەر حیسابی خەڵکی و، ئەو پیلانە دزێوەی دژی من نابوویانەوە، زۆری پەست کردم و کردیە کارێک ڕقم لە خۆم و لە هەموو خەڵکی ببێتەوە. زۆرم چاوەڕوان کرد تا کتێبە تازەکان گەیشتن. ئەنجام گەیشتن. لە کاتێکا خەریک بووم لە عەمبارەکەدا کارتۆنەکانم هەڵدەپچڕی، کابرای عەمبارداری دراوسێمان خۆی بەژوورا کرد و داوای لێکردم کتێبێکی مەزموورانی وێدەم.

لێم پرسی : - مەسەلەی ئیکۆنەکەت بە وەستام گوت؟

نامەردانە گوتی: - بەڵێ. من ناتوانم هیچ ڕازێک بشارمەوە براله..

تووشی شۆک بووم. لە ئەرزەکەدا ڕۆنیشتم، چاوم تێبڕی، لەبن لێوانەوە و بە پەلەپەل کەوتە ورتەورت، زۆر پەشۆکابوو، هی ئەوەبوو بەزەییت پێیدا بێتەوە:

- وەستات گومانی کرد، یان وەستام گومانی کرد و بە وەستاتی گوت..

هەستم کرد من تەواو بووم. ئەوانە بە هەموویان تەفرەیان دام، خستیانمە داوەکەوە، گومانی تیانییە، ڕەوانەی زندانی چاکسازی مێرمندالآن دەکرێم. ئەگەر شتەکە هەر بەوەندەوە بوەستێ خەمم نییە! گۆم تا قوولْ بێ مەلەی خۆشترە! قیروسیام کرد و کتێبی مەزموورانەکەم دایە کابرای عەماردار، خستیە ژێر پالْتۆکەیەوە و وەدەرکەوت، لێ زوو بە زوو گەڕایەوە و کتێبەکەی لەبەر پێم دانایەوە.

گوتی: - ناتوانم بیبەم! دەبێتە بایسی لە ناو چوونم..

لە مانای وشەکانی حالْی نەبووم. بۆچی من دەبمە بایسی لە ناوچوونی؟ بەلآم زۆرم پێخۆشبوو کە کتێبەکەی نەبرد. دوای ئەم بویەرە ئیدی دووکانداره چکۆلەکەی لەمەڕ خۆمان، بە گومان و دژمنایەتیەکی زیاترەوە تەمەشای دەکردم.

هەرهەموو ئەم شتانەم وەبیر کەوتنەوە. لاریونیچ بە قالْدرمەکەدا سەرکەوت، لە هەموو ڕۆژێک گرژ ومۆنتر و ئارامتر بوو. پێش نانی ئێوارێ، کە تەنیا هەردووکمان بووین و کەسی دیمان لەگەلْدا نەبوو، گوتی:

- زۆرم هەولْدا، لە کاری دووکانەکە دەرت بکەن و وازت لێبێنن هەر لە کارگەکەدا ئیش بکەیت. کەچی سەری نەگرت، ئاو لە دووی بێلْم نەهات! کوزما بە گوێی نەکردم زۆر دژی تۆیە..

من هەر لەو مالەدا دژمنێکی دیکەشم هەبوو، ئەویش دەزگیرانەکەی دەفتەردارو فرۆشیارەکەی لەمەڕ خۆمان بوو. ئەم کچە زۆری حەز لە دەستبازی و نازفرۆشی بوو. هەموو نیگارکێشە گەنجەکانی کارگەکە دەستبازیان لەگەلْ دەکرد و لە ڕاڕەوەکەدا چاوەڕوانیان دەکرد تا لە ئامێزی بگرن و

ڕاموسانی لە گەڵ بکەن. ئەویش هیچ خۆی شلوێ نەدەکرد، زۆر زۆر تەنگەتاویان بکردبایەئەوپەڕی وەکو تووتکە سەگ دەوەڕی. هەمیشە گیرفانەکانی پڕبوون لە نوقڵ و نەبات و چۆرەکان، لە بەیانییەوە تا ئێواریێ دەمی دەجولا. ڕوخساری گەوجاتی لێدەباری، چاوەکانی چکۆلە و نیگەران بوون، ئێسکی گران بوو. هەمیشە مەتەڵ و لەگەزی وای لە من و پاڤل دادەهێنا کە وەلامەکانیان زۆر بێ ئەخلاقانە بوو، هەندێک دەستەواژەی فێر دەکردین ئەگەر پیاو بە خێرایی بیگوتبانەوە، نەنگین ترین مانایان لێدەکەوتەوە.

ڕۆژێ یەکێک لە نیگارکێشە هەرە پیرەکان پێی گوت: - تۆ زۆر هەرزە و بێحەیای ها!

زۆر بە ڕووداریەوەو، بە چەند وشەیەکی گۆرانیەکی بازاڕییەوە وەلامی دایەوە:

*ئەگەر کچ سەنگین و بەحەیا بێ*

*کوڕان نایەن بەلایا، ئەمەت*

*لەلا عەیان بێ!*

ئەوە یەکەمجارم بوو کە کیژی لەو جۆرە بدینم، کردەوەکانیم زۆر لە لا کرێت و ترسناک بوو. کەزانی ئەو جۆرە ڕەفتارانەم بەدڵ نین، هێندەی دی شوولی لێ هەڵکێشا.

ڕۆژێک، من و پاڤل، لە ژێرخانەکەدا یارمەتیمان دەدا کە بەرمیلێک سرکەی تاوتوێ دەکرد. زۆر بە ڕاشکاوی گوتی: - کوڕینە، حەز دەکەن فێری ماچ ماچێنتان بکەم؟

پاڤل، بە دەم سووکە پێکەنینێکەوە گوتی: - من ماچ ماچێن لە تۆ باشتر دەزانم.

من بە تەوسەوە گوتم بڕۆ دەزگیرانەکەت ماچ بکە.

زۆر تووڕە بوو:

- هەی جلفی سووک و چروک، ئاوا وەڵامی مجامەلەی کیژ دەدرێتەوە. ئەو لێت دێتە پێشەوە و تۆ لووتی لێ هەڵدەکەی!

ئەوجا بە دەم پەنجە ڕاوەشاندنەوە گوتی:

- ڕاوەستە بۆم، بزانە چۆن ئەم درکەت لە ژێرپێ دەربێنم!

پاڤل، لە سەر من هاتە جواب وگوتی:

- ئەگەر دەزگیرانەکەت بەم ڕەفتارانەت بزانێ، مەگەر خوا بزانێ چیت پێ بکات!

جۆرە بێزاری وبێباکیەک بە ڕوخسارە زیپکاویەکەیەوە بە دیارکەوت و گوتی:

- من لێی ناترسم! بەو جیازیەی من، دەیان دەزگیرانی وەکو ئەو ئاو بەکەوشەکانما دەکات، خۆ قاتی پیاو نییە. کیژان، تا شوودەکەن دەتوانن بە دڵی خۆ بکەن.

ئیدی لە گەڵ پاڤل دا ڕایدەبوارد. ئیدی لەوە بە دواوە لێم بوو بە دژمنی باوە کوشتە، هەمیشە هەڕەشەی فرۆشیارەکەی لە مەڕ خۆمانی لێدەکردم و بوختانی بۆ دەکردم.

ژیانم لە دووکانەکەدا زۆر تاڵ ودژوار بوو، هەرچی کتێبی ئاینی هەبوو هەر هەمووویم خوێندبووەوە، ئیدی گەنگەشە وموناقەشەی شارەزایانیشم لەبەرچاو کەوت. هەمیشە بە شێوازی جیاواز باسی هەمان بابەتیان دەکرد و هەمان شتیان بێ هیچ گۆڕانێک کاوێژ دەکردەوە. تەنیا پیوتر ڤاسیلیفیچ، بە حوکمی ئەوەی شارەزاییەکی زۆری سەبارەت بە نهێنگە ونهێنییە ڕەشەکانی ژیانی تیرەی بە شەر هەبوو، سەرنجی ڕادەکێشام، ئەمە جگە لەوەی پیاوێکی زۆر زمان پاراو و دەماوەر بوو. هەندێجار لە دڵی خۆدا دەمگوت تومەز ئیلیا پێغەمبەریش لەکاتی خۆیدا، ئاوا بە تەنیا و داخ لە دڵ لەم سەرزەمینەدا ژیاوە.

وەختایەک، بە ڕاشکاوی باسی بیر وبۆچوونەکان و سەرنج و تیبینییەکانی خۆم سەبارەت بە خەڵکی، بۆ پیرەمێرد دەکرد، زۆر بە دیقەت گوێی لێدەگرتم، ئەوسا هەموو شتێکی بۆ فرۆشیارەکە، کە یان سەرزەنشتی دەکردم یان گاڵتەی پێدەکردم دەگێڕایەوە.

ڕۆژێک بە پیرەمێرم گوت کە هەندێجار قسەکانی لەو دەفتەرەدا کە شیعر و پەرەگرافی کتێبانم تیا دەنووسیەوە، دەنووسمەوە. دیاربوو ترسا، یەکسەر سەری لە پەناگوێم نا و بەترس و دوودڵیەوە پرسی:

- بۆ ئەمە دەکەی؟ ئەمە کارێکی باش نییە برادەر. بۆ ئەوەی لە بیرت نەچێتەوە؟ نا، نابێ ئەوە بکەیت! کە منداڵێکی بزێو و نەسرەوتی! ئەو دەفتەرەم دەدەیتێ؟

ماوەیەکی زۆر، بە ڕژدیەوە هانیدام کە دەفتەرەکەی وێدەم، یان بەلای کەمەوە بیسووتێنم. ئەوسا ئەوەی بە فرۆشیارەکە گوت.

یارۆی فرۆشیار، کە بۆ ماڵ دەگەڕاینەوە، بە دەم ڕێگاوە پێی گوتم:

- وادیارە تۆ شتێکی لە بابەتی بیرەوەری دەنووسیت. واز لەو کارە بێنە، تێدەگەی؟ تەنیا پیاوانی هەواڵگری ئەم کارە دەکەن!

لەپڕ لە دەمم دەرچوو وگوتم: - ئەدی سیتانوف؟ خۆ ئەویش یاداشت دەنووسێتەوە.

- ئەویش؟ کە کەرە!

دوای بێدەنگیەکی زۆر، بە نەرم ونیانیەکی نائاساییەوە پێشنیازی کرد:

- باشـە، دەفـتەرەکەی خـۆتم پـێ نیشـانبدە، دەفـتەرەکەی " سیتانوف " شم بۆبێنە. نیو ڕۆبڵت دەدەمێ! زۆر بەبێدەنگی ئەو کارە بکە، مەیەڵە سیتانوف پێی بزانێت..

پێدەچوو، دڵنیابێت کە ئەوکارە دەکەم. ئەوجا لە سـەر لاقە کورتەکانی وەرسـوڕایەوە و بێ ئەوەی چ قسـەیەکی دی بکـات ڕۆیی و دوورکەوتەوە.

کە گەیـیمەوە مـاڵی سـیتانوف " م لە حـاڵ و حیکـایەتەکە ئاگادار کردەوە، نێوچاوانی تێکنا و گوتی:

- بـۆچی بـۆت باسـکردووە؟ هەڵـبەتە یەکێـک دەنێرێـت کە دەفتەرەکانمـــان ئەوەی تـــۆ و ئەوەی منـــیش بـــدزێت. کـــوا دەفتەرەکەی خۆتم وێدە. با لە شوێنێکا بیشارمەوە کە پەی پێ نەبات. بێگومان بەم زووانە دەرت دەکات، بەخۆت دەیبینی!

گومانم لەوە نەبوو، بۆیە لێبڕام هەرکە نەنکم هـات بۆلام لە گەڵیـا بڕۆمەوە. نەنکم هەمـوو زسـتانەکەی لە بالاخنا بەسـەر بردبوو، بانگیـان کردبوو کیژان فێری گوڵـدۆزی بکـات. بابـام دووبـــارە لە کونـــافینو گیرســـابووەوە، بەڵام مـــن هـــاتوچۆم نەدەکـرد، ئەویـش کە دەهـات بـۆ شـار، سـەردانی نەدەکـردم. ڕۆژێـک بە ڕێـکەوت لە جادەیەکـدا بینـیم، هێـدی هێـدی ڕێـی دەکـرد، پـاڵتۆیەکی ئەسـتووری لەبەر کردبـوو، بە ویقـارەوە هەنگـاوی دەنـا لە دوورەوە لە قەشـە دەچـوو، سـلاوم لێکـرد، دەستێکی کرد بە سێبەر بۆچاوی و خەیالاوی و لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەهـا ئەمە تـۆی، بـووی بە نیگارکێشـی خواوەنـدان، دەی زۆرچاکە، بەردەوام بە، بەردەوام بە!

ئیدی منی لە سەر ڕێگای خۆی لادا و بە هەمـان سـەنگینی و ویقـارەوە درێـژەی بەڕێکردنـی خـۆی دا. لەو سـەروبەندەدا بەدەگـمەن داپیـرەم دەبینـی. ئەم پیـرەژنە ئـازیزە نەیـدەپەرژا

سەری خۆی بخورێنێت، بەردەوام کاری دەکرد، نەک هەر مێردەکەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر بەرەو شێتی دەچوو بەخێو دەکرد، بەڵکو مشووری کوڕەزاکانیشی دەخوارد، یەکێک لە کوڕەزاکانی کە ساشای کوڕی میخائیل بوو، زۆری داخ دەدایێ. ساشا کوڕێکی قۆز بوو، کوڕێکی خەیاڵپەروەر بوو، هەمیشە خەریکی کتێبان بوو. ئەم کوڕە کرێکاری خمچی بوو، لە سەر ئەو ئیشە بەردەوام نەبوو، هەر ڕۆژێ دەچووە لای وەستایەک کە لەو بەینانەدا بێکار دەبوو، دەبوو بەبار بەسەر ئەنکمەوە، دەبوا ئەو پیرەژنە بکەوێتە هەوڵ وتەقەلا کە کارێکی بۆ بدۆزێتەوە. ژیانی خوشکەکەی ساشاش هەر بەملی دایە گەورەمەوە بوو، ئەم کچە تووشی بووبوو بە تووشی مێردێکی مەیگوساری بێ سەروبەر و خراپەوە. هەرجارێ کە مەست دەبوو، بەردەبووە وێزەی ژنەکەی و لە ماڵ وەدەری دەنا.

هەرجارێ کە داپیرەم دەبینی، بەشێوەیەکی سەیر پەیم بە جوانی ڕوحی ئەو دەبرد و هێندەی دی دڵبەندی دەبووم. بەڵام هەستم دەکرد کە ئەم ڕوحە، لە هەنبەر کرێتی و دزێوییەکانی ژینگە دەوروبەرەکەی خۆیا، پیر دەبێت، و هەست بە ئازار و ڕەنج بێوەری من ناکات... زۆر بە ڕوونی و ڕاشکاوی بە منی دەگوت : - ئەلکسی گیان چارنییە، دەبێ تەحەمولی ژیان و ئەرک و دژوارییەکانی ژیان بکەین.

هەرجارێ کەباسی ژیان و دژواریەکانی ژیانی خۆم، ئێش و ئازار و بێزاری خەڵکم بۆ بکردایە، هەر ئەو وەڵامەی دەدامەوە. منیش تووڕە دەبووم.

من کەسێکی بە سەبر وحەوسەڵە نەبووم. ئەگەر هەندێجار وەکو گیانلەبەرانی ماڵی و دار وبەرد وشتی بێگیان ڕەفتارم دەکرد، ئەمەم تەنیا لەبەر ئەوەبوو کە خۆم تاقیبکەمەوە، بۆ

ئەوەم بوو تا بزانم ڕادەیەی بەرەڤانی خۆم بۆمانەوە لە سەر زەوی چەندە. زۆرجار کوڕێن مێردمندال، لە بەر سەرسەختی و خۆڕانان یان حەسوودی بە خەڵکانی گەورە، بارێکی قورسی ئەوتۆ هەڵدەگرن، کە زۆر گەورەترە لە هێز و توانای خۆیان. ڕێک وەکو ئەو پاڵەوانانەی کە دەتوانن قورسایی گەورە بەرز بکەنەوەو بە کەش وفشەوە خۆ دەنوێنن و پەیتاپەیتا نیشانەی خاچ دەکێشن.

منیش وام دەکرد، لە هەر دوو لایەنی دەروونی و جەستەییەوە وام دەکرد. ئیدی خۆم و بەختم نەمردم یان شوێنێکم سەقەت نەبوو و نەبووم بە بار بەسەر ژیانەوە. هیچ شتێک بە قەد ئەوە مرۆڤ ناچروسێنێتەوە، کە بچێتە ژێر بارێکی قورستر لە هێز وتوانای خۆی. دەتوانم بە جۆرە شانازییەکەوە بڵێم، بە درێژایی چل دانە ساڵ ڕوو بە ڕووی ئەو هەوڵە بەردەوامەی خەڵکانێک بوومەوە کە دەیانویست ڕوحم گومڕا بکەن و بیشێوێنن، وەکو کەڤر و تاوێران لەبەر دەمیاندا وەستام و کۆڵم نەدا.

زۆرجار ئارەزوویەکی مندالانە، هانی دەدام هەندێ کاری مندالانە بکەم. دڵی خەڵکی خۆش بکەم، خەمیان بڕەوێنمەوە، بیانهێنمە پێکەنین. لەو کارانەشدا سەرکەوتوو بووم. بەهرەی لاسایی کردنەوەم هەبوو، لاسایی بازرگانانی بازاڕی نیژنی نوڤگوردم دەکردەوە، لاسایی کڕیار و فرۆشیارانی شەمایلێن پیرۆز، بەهەمـوو فڕوفێڵ ویەکـدی خاپانـدن و دەستبڕییەکانیانەوە دەکردەوە. ئیدی کرێکاران و کارمەندانی کارگەکە لە پێکەنینا دەخنکان، زۆرجار دەستبەرداری کارەکانیان دەبوون و دەهاتن بۆ تەمەشاکردنی نمایشەکانی من. لاریونیچ، زۆرجار بە ڕاوێژێکی نەرم ئامۆژگاری دەکردم و دەیگوت:

- نمایشـەکانت بـۆ دوای شـێو هەڵگـرە، تـا کارەکەمـان ڕانەوەستێ.

کە لە نمایشـەکە دەبـوومەوە، هەسـتم بە ئاسـوودەییەکی ڕاستەقینە دەکرد. وەکو ئەوەبوو، بارێکی قورسم لە سەرشان لاچووبێت. ئیدی بەو جۆرە بۆ ماوەی سەعاتێ یان زیاتر بەتاڵ دەبـوومەوە، سـەر ڕەحەت و بارسـووک دەژیام، بەڵام وردە وردە مێشـکم جەنجاڵ دەبـووەوە، لە تـۆ وایە مێشـکم بزمارڕێژ دەکەن.

هەرچیم لە دەوروبەرە وەکو هەریسـەیەکی پیس دەکوڵێت. هەستدەکەم خەریکە تیایدا نقوم دەبم. لە دڵی خۆدا دەڵێم:

- باشە دەکرێ هەموو ژیانم بەمجۆرە بەرمەسەر؟ باشە دەکـردێ مـن وەکـو ئەم بێنەوایـانە بەم ژیـان و چارەنووسـە ڕازی بم، خۆم بدەمە دەست قەزا و قەدەر و بیر لە ژیانێکی باشتر نەکەمەوە؟!

ڕۆژێک چیخـاروف، ڕوو بە ڕووم وەسـتا، سـەراپای بەنیگا دابێژتم و گوتی: - ئەلکسی تۆ خەریکە عەسەبی دەبیت.

سـیتانوفش، زۆرجـار لە کـار دەوەسـتا و دەیگـوت : - ئەلکسی چیتە؟

مـن نەمـدەزانی چ وەڵامێکیـان بـدەمەوە. زبـری و دژواریەکانی ژیان هەموو چاکییە خۆڕسک و میهرەبانەکانی لە زەینم دەتاراند، لەجیاتی ئەوانە، گەوجاتی و شـەقاوەتخوازی گەنجانە شـوێنی پڕدەکردنەوە. ئەم گۆڕانە لە هەمـوو شـتێک زیاتر ئازاری دەدام. ئیدی بەجۆرە سەرسـەختیەکی هۆڤیانەوە مقاومەتم دەکرد، لە هەمان ڕووبارا مەلەم دەکرد کە خەڵکی مەلەیـان تیـا دەکـرد، بەڵام ئـاوەکەی بـۆمن سـاردتر بـوو، نەمدەتوانی بەو ئاسانیەی ئەوان مەلە بکەم و بگرە وام دەهاتە بەرچاو کە خەریکە لە گێژاوێکا غەرق دەبم.

هەموو کارمەند و کرێکارانی کارگەکە، بەڕێز و میرەبانیەوە مامەڵەیان لەتەکما دەکرد، وەکو پاڤل هاواریان بە سەرما نەدەکرد، لێم تووڕە نەدەبوون، گاڵتەیان پێنەدەکردم. بە پێچەوانەوە زۆر ڕێزیان دەگرتم، بە ناوی خۆم و باوکمەوە بانگیان دەکردم. من زۆرم دڵم بەوە خۆش دەبوو. ئاو دەکرا بە دڵ و دەروونما. بەڵام هەرکاتێ هاوکارەکانم بە مەستی دەبینی زۆرم خەفەت دەخوارد و ناڕەحەت دەبووم، ئەمە جگە لەوەی زۆر لە بیر و بۆچوونیان دەربارەی ژنان لە ژیاندا، بێزار بووم. ئیدی گەیی بوومە ئەو قەناعەتەی کە ژیان و خۆشیەکانی ژیان تەنیا لە ژن و خواردنەوەدا دەبینن، ئەمەم زۆر لەبەر گران بوو. بیرم لە نەنکم دەکردەوە، لە شاژنە مارگۆ، تۆ بڵێی ئەوانەش بووکەڵەی دەست وئامێری ڕابواردن بن؟

کە بیرم لە شاژنە مارگۆ دەکردەوە، هەستم بە جۆرە ترس و نیگەرانیەک دەکرد، وام دەهاتە بەرچاوی خەیاڵ، لە خەونا دیتوومە.

لەوە بە دواوە زۆر بیرم لە ژن دەکردەوە. ئەنجام لە خۆم پرسی ئەرێ بۆ یەک شەممەیەک نەچم بۆ ئەو شوێنەی کە خەڵکانێک بۆ ڕابواردن بۆی دەچن. ئەمە زادەو ڕەنگدانەوەی ئارەزوویەکی جەستەیی نەبوو. بەڵکو زادەی ئەوەبوو، کە ماوەیەک بوو، پێویستم بەوە بوو، بوونەوەرێکی ئازیز و میرەبان لە ئامێزم بگرێت، بێ هیچ لە ڕوو دامانێک وەکو دایکێک گرێی دڵی خۆمی بۆ بکەمەوەو هەموو ئازار و ژان و ئەندێشەکانی خۆمی بۆ بگێڕمەوە.

شەوێک لەگەڵ پاڤڵدا، لە تەنیشت یەکەوە ڕاکشابووین، وەختایەک پاڤل، باسی ئاشقێنی خۆی لەگەڵ کارەکەرەکەی

ماڵەکەی بەرانبەرماندا بۆ گێڕامەوە، خۆزگەم پێ دەخواست، دەیگوت:

- زۆر سەیرە هاوڕێ. هەمووی مانگێک لەمەوبەر بوو کە تۆپەڵە بەفرم دەخێواندێ. هیچ حەزم لە چارەی نەبوو. کەچی ئێستاکێ کە لە سەر تەختێک لەلامەوە دادەنیشێت و بەخۆوەی دەگوشم، لە دنیادا کەس لەو ئازیزتر و نزیکتر لە خۆمەوە نابینم.

- باسی چی دەکەن؟

- باسی هەموو شتێک دەکەین. ئەو باسی خۆیم بۆ دەکات، من باسی خۆمی بۆ دەکەم، ئەوسا یەکدی ماچ دەکەین، بەڵام ئەو زۆر ئابڕوومەندە.. هاوڕێ خۆزگە دەتزانی چەند خۆشە. ئەوە چیە تۆ جگەرە زۆر دەکێشیت، دەڵێی کۆنە عەسکەریت!

نەهەقی نەبوو، جگەرەم زۆر دەکێشا، کاریگەری نیکۆتینەکە خاوی دەکردمەوە، خەم و پەژارەی دەرەواندمەوەو مێشکم ئیسراحەتی دەکرد. بەڵام شوکر لە تام وبۆنی ڤۆدکا زۆر بێزاربووم، حەزم لێنەدەکرد. بەڵام پاڤڵ وانەبوو، بە کەماڵی ئارەزوو دەیخواردەوە. لە ڕادەبە دەر ڕموودەی ڤەخوارن بوو، کە مەست و خەیاڵ دەبوو، دەکەوتە گریان.

- دەمەوێ بۆ ماڵ بڕۆمەوە، وازم لێبێنن با بڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆم.

ئەم نەگبەتە ماڵی نەبوو، داک و بابی ژمێژ بوو مردبوون، نە برای هەبوو نە خوشک، لە تەمەنی هەشت سالییەوە، خەڵکی بێگانە بە خودانیان کردبوو.

لە گەڵ هاتنی وەرزی بەهارا، نیگەرانیم زیاتر بوو، ئیدی کەڵــکەڵەی ئەوەم کەوتە ســەر کە جــارێکی دی لە ســەر کەشتیەکە کارێک پەیدا بکەم و هەرکە گەیمە ئەستراخان ولەوێندەرەوە سەفەری وڵاتی فارس بکەم. خۆشم نازانم چما

وڵاتی ئێرانم هەڵبژاردبوو، ڕەنگە لە خۆشی ئەو بازرگانە فارسانە بووبێ کە لە بازاڕی نیژنی نوڤگورد دیتبوومن و چووبوونە دڵمەوە، ئەمانە بە دەم نێرگەلە کێشانەوە خۆیان دەدایە بەر هەتاو. لە بت دەچوون، چاوە درشت و ڕەشەکانیان، ڕدێنە لە خەنە گیراوەکانیان، وای دەنواند، کە لە هیچ نهێنییەکی ژیان غافڵ نین.

ئیدی بەر لەوەی بڕیارەکەم جێبەجێ بکەم، جەژنی پاکی هات بەسەرا، ژمارەیەک لە کرێکار و نیگارکێشەکان، چوونەوە بۆ زێد و دەڤەری خۆیان. هەندێکی دی ڕوویان کردە باڕو مەیخانەکان و کاتی خۆیان لەو شوێنانە بەسەر دەبرد. من بەتەنیا لە کەناراوەکانی ئوکا پیاسەم دەکرد، ڕۆژێکی هەتاوی خۆشبوو، لە ناکاوا تووشی وەستا کۆنەکەی خۆم، خوارزاکەی داپیرەم بووم، پاڵتۆیەکی کەوەیی تەنکی لەبەربوو، دەستەکانی لە گیرفانی پانتۆڵەکەی نابوو، کڵاوەکەی لە تیلاکەی سەری نابوو و جگەرەیەک بەلالێویەوە بوو، کە لێی نزیک بوومەوە، بزەیەکی دۆستانە لێوەکانی ترازاند. ڕواڵەتی ماقووڵی پیاوێکی ئازادی هەبوو، شاد وسەرحاڵ بوو، تەنیا هەردووکمان لەو دەشت و دەرە بووین. هاواری کرد:

- ئەلکسی! ئەوە چییە، دیمانەت بەخێر، مەسیح زندوو بووەتەوە!

وەختایەک لە ماچ و مشتاق بووینەوە و پیرۆزبایی جەژنمان لەیەکدی کرد، ئیدی لە ڕەوشی پرسیم و خەریکی چیم و بەتەمای چیم، بە ڕاشکاوی پێمگوت کە لە کارگە و لە شار و لە هەموو شتێک بێزار وبێتاقەتم و بڕیارم داوە بۆ وڵاتی فارس بڕۆم. هیچ پێکەنینی بەو بڕیارەی من نەهات، بەڵکو بە پێچەوانەوە گوتی:

- واز لەم بیرۆکەیە بێنە، فارس لە پێکە! بە نەعەلەتی بکە! منیش کە منداڵ بووم حەزم لەو سەرکێشیانە هەبوو، هەمیشە لە بیری سەفەر و سەرەڕۆییدا بووم، بۆکوێ؟ خۆشم نەمدەزانی! مەگەر هەر شەیتان بیزانیبا بۆکوێ!

شێوازی قسەکردنەکەی و گاڵتەکردنەکەیم بە شەیتان لە لا خۆشبوو. ئەو ڕۆژە سەروسیمای پوورزایەکەم، زۆر شاد و بەهاری بوو، شادی و ئاسوودەیی لە سەراپای دەباری. قوتوویەکی زیوینی پڕ لە جگەرەی عالی کردەوەو لە بەردەممدا ڕایگرتو گوتی: - جگەرە دەکێشیت؟

ئەم خوڵکە گەرمە قەناعەتی پێکردم.

- گوێ بگرە بشکوف گیان! بۆ نایەیتەوە بۆ لای من ولەگەڵ مندا کاربکەیت؟ من ئەمساڵ پرۆژەیەکی چل هەزار ڕۆبڵیم بە دەستەوەیە. بەخۆت دەزانی کە ئەم پارەیە، پارەیەکی یەجگار مۆڵە. من تۆ لەوێندەر دادەنێم تا ئاگات لە کارەکان و کرێکارەکان بێت. کەرەستەکان وەردەگریت و هەموو شتێک لە شوێن و کاتی دیاریکراودا وەردەگریت و چاودێری کرێکارەکان دەکەیت تا دزیم لێنەکەن. باشە بەدڵتە؟ کرێ؟ مانگی پێنج ڕۆبڵ و پێنج کوپیکشت بۆ خواردن دەدەمێ! سەروکارت نە لەگەڵ دایکم نە لەگەڵ ژنەکەم نابێت. بەیانی زوو دەچیتە سەرکار وشەوێ دەگەڕێیتەوە و هەقت بەسەر ئەوانەوە نابێت. سەروکارت تەنیا لەگەڵ مندا دەبێت، ڕۆژی یەک شەممە وەرە، بەوان مەڵێ ئێمە یەکمان دیتووە، ئیدی لەماڵەوە، مەسەلەکە دەبڕینەوەو ڕێک دەکەوین.

دۆستانە لێکدی جیابووینەوە. بەرلەوەی بڕوات تەوقەی لەگەڵ کردم. کە ئاوڕم دایەوە، کڵاوەکەی دۆستانە بۆ هەڵتەکاندم.

وەختایەک هەواڵی نیازی ڕۆیشتنی خۆم بە کرێکارەکانی کارگەکە ڕاگەیاند، زۆریان پێناخۆش بوو. پاڤل، لە هەموویان زیاتر پێوەی دیاربوو. بەڕاوێژێکی گلەیی ئامیزەوە گوتی:

- تۆزێ بیر بکەوە، تۆ ناتوانی لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا هەڵبکەی، ئەوانە وەکو مە نین، دارتاش و بازرگان و بەناو، خمچی وەکو مە نین! تۆ وئەوانە کوجا مەرحەبا!

چیخاروف لەبن لێوانەوە گوتی:

- گەنج وەکو ماسین، وەکو چۆن ماسی حەزیان لە ئاوی قووڵە، گەنجانیش حەزیان لە سەرکێشی و کارێن بەڕیسکە..

جیابوونەوەمان خەمناک بوو. چیخاروف، هێندەی خواردبوەوە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، گوتی:

- هەڵبەتە پێویستە هەرکەسێک لە خەمی گۆڕینی ژیانی خۆیدا بێ. سەر بە هەر کون و کەلەبەرێکا بکات، مل بە هەر قولاپێکەوە بنێت. ژیان بجەڕبێنێت. بەڵام دەبێ لە هەوەڵەوە، سەری یەک گوریس بگرێت.

لاریونیچ، بە ڕاوێژێکی ئارام گوتی: - ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات.

هەستم کرد، ئەو قسانەیان تەنیا بۆ مجامەلەیە، چونکە نەدەکرا بە بێ هیچ قسەیەک لە یەکدی جیا ببینەوە، ئیدی ئەوە عادەت بوو. ئەو داوانەی بەیەکەوەیان گرێ دەداین، لە ناکاوا پچڕان.

گوگولیفی مەست و سەرخۆش لە سەر تەختەخەوە بەرزەکەیەوە گینگڵی دا و بەدەنگێکی گڕ گوتی: - ئەگەر بمەوێ هەمووتان دەخەمە زندانەوە! چونکە من ئەوە دەزانم کە ئێوە شتاقتان باوەڕتان بە خوا نییە!

ئیکۆنە و شەمایلە نیوەچڵ و تەواو نەکراوەکان، بە دیوارەکەوە هەڵپەسێردرابوون، گڵۆپەکانی بن میچەکە لە تەنی و دووکەڵدا ڕەش هەڵگەڕابوون. ماوەیەک بوو لەبەر ڕووناکی کارمان نەدەکرد، بۆیە پێویستمان بەو گۆیە شووشانە نەبوو، ئیدی دووکەڵ و تەنی داپۆشی بوون. ئەو دیمەنانە بە جۆرێ لە یادگەمدا نەخش بووبوون، کە ئێستاش چاو دەنووقێنم، ژوورە تاریکەکەم بە هەموو مێزەکانەوەو بە هەموو قوتووە بۆیەکانی سەر قەراخی پەنجەرەکانەوە دێنە بەرچاوم، چەپکە فلچەکان، ئیکۆنەکان و تەنەکەی خۆڵەکە کە لەژێر دەستشۆرە مسینەکەدا بوو و، لە کڵاوخودی پیاوانی ئاگرکوژێنەوە دەچوو، وەکو خۆیان دێنەوە بەرچاوم. تەنانەت پێیە خاوسەکانی "گوگولیف" ش کە وەکو پێی کەسێکی خنکاو لە تەختەخەوە بەرزەیەکەوە شۆڕ بوو بوونەوە، دەبینم.

دەمویست زۆر بە هەشتاو کۆتایی بە ڕێوڕەسمی خاترخوازی و مالاواییەکە بێنم، بەڵام لە ڕووسیادا عادەتە کە درێژە بەڕێوڕەسمی دوعاخوازی و مالاوایی دەدەن. دوعاخوازی خێرا وبلەزیان بەلاوە شوومە.

چیخاروف، کە ڕەنگی تەواو تێک چووبوو گوتی:

- ناتوانم کتێبی "شەیتان" ەکەت بۆ بگێڕمەوە. ئەگەر دەتەوێ، بیست کوپیکانت لە جیاتی کتێبەکە دەدەمێ

هەڵبەتە زۆرم پێناخۆش بوو ئەو کتێبەی لیرمانتوفم لە کیس بچێت، بە تایبەتی کە سەرۆکە پیرەکەی تیمی ئاگرکوژانەوە بە دیاریی دایبوومێ. وێڕای ئەوەش قەبووڵم نەکرد پارەی لەجیاتی وەربگرم، چونکە بە ڕاستی ئەو ڕەفتارەی چیخاروفم زۆر لا ناخۆش بوو، ئیدی پارەکەی بە ئەسپایی خستەوە ناو کیسەکەی و بە ساردییەوە گوتی:

- کەیفی خۆتە. بەڵام کتێبەکەت وێنادەمەوە! چونکە ئەوە بۆ تۆ مەترسیدارە. ئەگەر ئەو کتێبەت پێ ببینرێ، کێشەت بۆ دروست دەکات.

- بەڵام لە هەموو دووکانەکاندا دەیفرۆشن، من بە چاوی خۆم دیوومە.بە قەناعەتەوە بەرسڤی دایەوە: - ئێ چییە؟ دەمانچەش لە دووکاناندا دەفرۆشن.

ئەنجام کتێبەکەیان نەدامەوە.

وەختایەک بۆ خودا حافیزی لە بێوەژنە خاوەن کارگەکە، سەرکەوتمە سەرێ، لە ڕاڕەوەکەدا تووشی کچەکەی برازای بووم، لێی پرسیم: - دەڵێن بە تەمای ڕۆیشتنی؟..

- بەلێ!

بەڕاستگۆییەوە گوتی: - ئەگەر بەخۆت نەڕۆشتبای، دەریان دەکردیت.

خانم ئەرباب، کەمێک خەیاڵ بوو، گوتی:

- خوات لەگەڵ! تۆ کوڕێکی لاسار و سەربە گۆبەندی! من بەش بەحاڵی خۆم هیچ خراپەیەکم لێ نەبینیوی. بەڵام هەمووان لێت بە گلەیی و گازنن و دەڵێن یەک پولی قەڵب نایەنی!

هەنگێ لە ناکاوا وبێ هیچ هۆیەک دەستی بەگریان کرد. بە دەم ڕوندک ڕشتن و هەنسک هەڵدانەوە گوتی:

- ئەگەر مێردە ڕەحمەتیە داماوەکەم، خوا عافوی بکات، بمابایە، دەیزانی چۆن گوێت دەسوێتەوە و هەقی خۆتی لە قولی مستی دەنای. بەڵام دڵنیام هەرگیز لێرە دەری نەدەکردیت. حەزی لەم کارانە نەبوو. لێ ئەمڕۆ هەموو شتێک گۆڕاوە. هەرکە شاگردێک بە ئاستەم پێ خوار دابنێت، یەکسەر دەری دەکەن! خودایا، دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆیت بچکۆلە؟ چارەنووست چ دەبێت؟

## (١٩)

من و وەستام بە سواری بەلەمێک بە ناو جادەکانی کامپەکەدا وەڕێکەوتین، بە ناو ئەو بینایانە کەوتین کە ئاوی ڕووبارەکە لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهارا تا ئاستی نهۆمی دووەم هەستابوو. من سەوڵم لیدەدا و، وەستام کە لە کۆتایی بەلەمەکەدا دانیشتبوو زۆر ناشیانە سووکانەکەی ئاراستە دەکرد، سووکانەکە بریتی بوو لە سەوڵێک کە بە قووڵایی ئاوەکەدا ڕۆچووبوو، ئیدی بەلەمەکە جارێ لووتی دەکردە ئەم شەقام و جارێ لووتی بەسەر ئاوە لیڵ و خەمناکەکەدا بەرز دەکردەوە.

وەستام جگەرەیەکی پێکرد، بۆنی دووکەڵەکەی لە بۆنسۆی پەڕۆ کۆن دەچوو، لە بن لێوانەوە گوتی:

- تۆ بزانە ئەم بەهارە ئاوەکە چەند بەرز بووەتەوە! شەیتان بە نەعلەت بێ! کارەکانم دوا دەکەون!

بە ترسەوە هاواریکرد : - وریابە! خۆ لەو عامودی کارەبایە نەدەین!

دوای ئەوەی ئاراستەی بەلەمەکەی ڕاستکردەوە گوتی:

- ئەو سەگبابانە بەلەمێکی خراپیان پێ داوین!

ئاماژەی بۆ ئەو شوێنە کرد، کە دەبوا دوای نیشتنەوەی ئاوەکە دەست بە نۆژەن کردنەوەی دووکانەکان بکەین. بە ڕدێنە تاشراو و سمێڵە کورتکراوەکەی و جگەرەکەی لالێویەوە هیچ لە قۆنتەراتچی نەدەچوو، پالتۆیەکی چەرمی لە بەر وجووتێ پووتی درێژی تا ئەژنۆی لەپێ بوو. جانتایەکی ڕاوچیانی دابوو بە شانیا، تاپڕێکی جووت لوولەی مارکەی "لیبل" ی لەبەر پێدا بوو. بە نیگەرانیەوە دەستی لە کلاوە

چەرمیەکەی دەدا، جاری دەیهێنایە سەر چاوەکانی و لێوەکانی هەڵدەقورتاند و بە نیگەرانیەوە دەیڕوانیە دەوروبەری و جاری دەیبردە پشتی سەرییەوەو لە ناکاوا بچووکتر لە تەمەنی خۆی دەهاتە بەرچاو، ناو بە ناو وەکو ئەوەی بیرۆکەیەکی شادی بۆهاتبێ، هەر لەخۆیەوە بزەیەکی دەهاتێ. ئیدی شەپۆلە بیرۆکەیەک بەوجۆرە ڕایدەماڵی، هیچ لەوە نەدەچوو کە کارێکی زۆری هەبێت، لەوەش نەدەچوو پەلەی کارکردنی بێت یان خەمی نیشتنەوەی هێواشی ئاوەکەی بێت.

من لەلای خۆمەوە، گیرۆدەی کۆمەڵێک پرسیاری ئارام بووم : دیتنی ئەم شارە مردووە، کە لە ئاوا غەرق بووە، بیناکانی بە ڕیز پەنجەرەکانیان کراوەتەوەو کە بە بەلەمەکەمان بە ناویاندا تێدەپەڕین لە تۆ وایە بەخۆشیەوە مەلە دەکەن!

ئاسمان لێڵ بوو. هەتاو کەوتبووە ژێر کۆمەڵێک گەواڵە هەورەوە، کە ناو بە ناو وەکو بازنەیەکی زیوین، لە درزی هەورەکانەوە سەرەتاتکێیەکی دەکرد.

ئاوەکەش لێڵ و تەزی بوو، شەپۆلی ئاوەکە بە ئاستەم هەستی پێدەکرا و نەدەکرا. لە تۆ وایە ئەویش وەکو بینا سستەکان و ڕیزە دووکانە گەمارەکان، تەواو مت بووە و جووڵەی لە بەر براوە. وەختایەک هەتاوی سپیواژ لە بەینی هەورەکانەوە سەری دەرهێنا، هەموو شتێک ڕوناک بووەوە، ئاسمانی لێڵ لە ئاوەکەدا ڕەنگی دایەوە، لە تۆ وایە بەلەمەکان لە حەوادا، لە نێوان دوو ئاسماندا هەڵواسراوە. بینا بەردینەکانیش لە لای خۆیانەوە ڕابوون، بە ئەسپایی بەرەو ڤولگا و ئوکا کەوتنە نەرمە مەلە. ئیدی بەرمیلە شکاو، سەندوق، زەمیلە و قەرتاڵە، پارچەدار و پوش و پەلاش بە

سەر ئاوەکەوە سەمایان دەکرد و قەدی درەخت و ئەستوونان بەسەر ئاوەکەوە وەکو ئەژدیهای مردوو بەلاماندا تێدەپەڕین.

لێـــرەو لەوێ پەنجەرەیەکـــی کـــراوە دەبینـــرا، جلکـــان لە سەربانی خانە بازرگانیەکە هەڵواسرابوون تـا وشـک ببنەوە، هەنـــدێک پـــێڵاوی لبـــادین بە مـــحەجەرە ئاســـنینەکانەوە هەڵواســـرابوون، ژنێـــک لە بەر پەنـــجەرەیەک ڕۆنیشـــتبوو، دەیـڕوانیە ئـاوە لـێڵەکە، لە سـەر ترۆپکـی پـایەیەکی ئاسـنینی خـــانەکەوە، بەلەمێـک بەســـترابووەوە، کە هەردوو تەنیشـــتە سوورەکەی بە ڕوونی لە ئاوەکەدا ڕەنگی دابووەوە. وەستام ئاماژەی بۆ پەیوەندییەکانی ئەم ژیانە کرد وگوتی:

- پاسـەوانی زەوی کـامپەکە لێـرە دەژی. لە پەنـجەرەکەوە سەر دەکەوێتە سەرەوە و سواری بەلەمەکەی دەبێت، ئیدی بە دەم ســەوڵ لێـدانەوە بە دووی دزانەوە ئێـرە وئەوێ دەگەڕێ. ئەگەر تووشی هیچ دزێک نەبێت، خۆی دەکەوێتە دزی..

بەڕاوێژێکی خاو قسەی دەکرد، بیری لە لای بابەتێکی دیکە بوو. هەموو شتێک لەبێدەنگی و بۆشاییدا نقوم بووە، جێگەی بـاوەڕ نیـیە، زیـاتر لە خەون دەچێـت تـا لە واقیـع، هەردوو ڕوبـاری ڤولگـا وئوکـا تێکەڵ مـوون و بـوون بە دەریـاچەیەکی گەورە. شـــار لە دوورەوە، بەســـەر هەردە و زورگـــانێکی تێکڕژاوەوە بە دیارکەوت، یەکپارچە چڕە بێستانی ڕەشـی بێ بەر بوو، بەڵام بە چڕۆ و خونچە ئاوەدان بوو، دار ودرەخت پەردەیەکی سەوزیان بەسـەر مـاڵ و کڵێساکاندا دابوو. دەنگی زەنگی هەفتەی پاک بە سـەر ئاوەکەوە دەنگی دەدایەوە. بەڵام لێرەدا هەمـوو شـتێک کڕوکـپ، لە گۆڕسـتانێکی چـۆڵ وهـۆڵ دەچوو.

بەلەمەکەمـان، بە نێوان دوو ڕیـزە درەختـی تاریکدا پێچـی کردەوە، ئێمە بە درێژایی ئەو جادە سـەرەکیەدا کەوتینەڕێ کە بۆ کەتەدرائیە کۆنەکە دەچوو. دووکەڵی جگەرەکەی وەستام دەچـووە چاوەکـانیەوە. بەلەمەکەش خـۆی دەکێشـا بەقەدی دار ودرەختەکاندا، تـا وەسـتام بەڕقەوە هـاواریکرد: - نەعـلەت لەم بەلەمە!

- واز لە ئاراستەکردنی سووکانەکە بێنە.

پرتانـدی: - چـۆن شـتی وادەبێ؟ کە دووکەس لە بەلەمیکـا بـن، دەبـێ یەکێکیـان سـەوڵ لێبـدات و ئەویتریـان سـووکانەکە ئاراستە بکات. تەمەشا دووکانەکانی ڕیزی چینی.

من لە مێژ بوو، مەیدانی کامپەکەم دیتبوو و بست بەبستی شـارەزا بـووم. ئەم دووکـانە کۆمیـدیە، سـابیتە ڕۆژئاواییـانەم زۆرباش دەناسی، کە چوار دەورەکانیان بە پەیکەرێن گەچینی کاراکتەرانی چینی ڕازاندبوونەوە، کاتی خۆی مـن و هاوڕێکـانم بەردبارانمـان دەکـردن، مـن بەخـۆم دەسـت و سـەری چەنـد پەیکەرێکـم لەو پەیـکەرە چینیـانە لێکردبـووەوە. بەڵام ئێسـتا شانازیم بەوکارەوە نەدەکرد..

وەستام، بە دەم ئاماژەوە بۆ خانووەکان گوتی:

- کـوختەن. خـۆزگە ڕێگەیـان دەدام لە نـوێ دروسـتم دەکردنەوە..

فیکەیەکی کێشا، کڵاوەکەی بە پشتا برد.

هەر لە خـۆوە وام هەسـتکرد، بە هەمـان شـێواز و سـتایل دروسـتیان دەکـاتەوە و لە هەمـان شـوێندا ولەم نزمـانیەدا، کە هەمـوو بەهـارێ لە ئـاوی لافـاوی دوو ڕوبـاردا غەرق دەبێـت، دروسـتیان دەکـاتەوە. ڕەنـگە بێـت بە خەیاڵیـا، شـتێکی دزێـوی وەکو دووکانەکانی ڕیزی چینییەکان دروست بکات.

پاشماوەی جگەرەکەی توورِ دا وئەوجا بە تـووڕەیی تفێکـی بە دوودا نارد و، گوتی:

– پشکوف گیان، بەڕاستی ژیانێکی نـاڕەحەتە، پیـاو لەگیـانی خۆی وەڕز دەبێت! خەڵکانی ڕۆشنبیر نین، کەسێک نییە قسـەی لەگەڵدا بکەی. هەندێجار پیاو حەزدەکات تۆزێ خۆی بنوێنێ و کەمێـک بەخـۆی بفشـێ، کەسـت دەسـت نـاکەوێ، لەبەرچـاوی خـۆت بنـوێنی! کەس لێرە نییە! جگە لە دارتاشـان و بەنایـان و دزان..

تەمەشـایەکی نکـالی ڕاسـتی کـرد، مزگەوتێکـی سـپی جـوان، بەسـەر زورگێکـی لە ئـاوا نقـوم بە دیـار کەوت، وەکـو یەکێـک شتێکی لە بیرکراوی بیر کەوتبێتەوە لە سەر قسەکەی ڕۆیی:

– مـن بە چـاولێکەری ئەڵمانەکـان دەسـتم بە بادەنۆشـی و جگەرەکێشـــان کـــرد. ئەڵمانیـــانی بزنســـمان. بـــرادەر! مەی خواردنەوە – زەمانێکی خۆشبوو، ڕۆیی، بەڵام وادیـار بـوو، لە گەڵ جگەرەکێشـــانا هەر ڕا نەهـــاتم. هەرکـــاتێ جـــگەرەیەک پێبکەی، ژنەکەت دەکەوێتە گلەیی ودەڵێت: " ئەمە چییە، بۆنی زیـن درووت لێـدێت؟ " ئـاخ، خۆشـمان نـازانین چ بکەیـن تـا ماقوولییەت بە ژیان بدەین!... هانێ تۆ بەلەمەکە بازۆ..

سـەوڵەکەی لە قەراخ بەلەمەکە دانـا، تـاپڕەکەی هەڵگـرت، فیشەکێکی بە یەکێک لە پەیکەرەکانی سـەربانەوە نـا. پەیکەری چینیـــیەکە هـــیچ ئاســـیوێکی پـــێ نەگەیـــی، گـــوللەکە بەقەد دیـــوارەکەوە پەرش و بڵاوبـــووەوە، تەپ وتـــۆزی لـــێ بەرزکردەوە.

دووبارە فیشەکی خستەوە بەر تاپڕەکەی، بەبێ موبالاتیەوە گوتی:

– نەم پێکا. بەینت لەگەڵ کیژاندا چۆنە؟ باشـە؟ باش نییە؟ من لە تەمەنی سیازدە ساڵیا کەوتمە دڵداری و ئاشقێنی..

ئەوسا وەکو یەکێک بیرەوەری خەونێکی خۆی بگێڕێتەوە، حیکایەتی یەکەمین دڵداری خۆی بۆ گێڕامەوە. ئەمە کارەکەر بوو لەلای ئەو ئەندازیارە تەلارسازەی کە لەلای ئەو مەشقی دەکرد. لە گەڵ قسەکانی ئەودا، پرژەی ئەو ئاوەی خۆی بە سووچی بینایەکاندا دەکێشا، بەسەر وچاوماندا دەپڕژرا. لەودیو کەتەدرائیەکەوە، پانتاییەکی فراوانی ئاو هەبوو، لە سپیدارا بریقەی دەهات.

نیگارکێشەکانی کارگەی ئیکۆنە و شەمایلان زۆرجار سروودێکی مەکتەبلیانەیان دەگوت:

*دەریای شینی شین*

*دەریای بە گەرداو..*

مەگەر هەر خوا بزانێ کە ئەو دەریا شینی شینە، چەند ناخۆش بووە!

وەستام گوتی:

– شەوان خەوم دەزڕا، لە جێگاکەم هەڵدەستام، لەبەر دەرگا دەوەستام، وەکو تووتەڵە سەگ هەڵدەلەرزیم. ماڵەکە سارد بوو ئەمما سارد!وەستای کچە زۆرجار شەوان سەری دەدا، زۆر نزیک بوو بە ئاسانی لە لای کچەکە بمگرێت، بەڵام من بە هیچ جۆرێ نەدەگیرام.

زۆر بە کاوەخۆ قسەی دەکرد، وەکو یەکێک بەهەندێ جل و بەرگی کۆنا بچێتەوە تا بزانێ بە کەڵکی ئەوە دێن لەبەر بکرێن یان نا.

– منی بینی، بەزەیی پێمدا هاتەوە. دەرگای کردەوەو گازیکردم: " وەرە، کوڕۆ، قەل پیاو! "

زۆرم لەو چیرۆکانە بیستبوو، بێزار بووبووم، هەرچەندە لە هەموو ئەو چیرۆکانەدا یەک خاڵی ئەرێنی هاوبەش هەبوو :

خەڵکی بەبێ هیچ شانازییەک باسی یەکەم ئەزموونی ئاشقێنی خۆیان دەکەن، بێ هیچ جنێودان و سخێفێک و زۆرجار بە کەسەرێکی قووڵی ئەوتۆوە باسی دەکەن کە دڵنیا دەبم ئەوە جوانترین ساتی ژیانیان بووە. ئەو ساتە وا دێتە بەرچاو کە بە ڕاستی، تاقە شتی خۆش بووە، کە جەڕباندوویانە.

وەستام، بە دەم پێکەنین و سەر لەقاندنەوە، بە سەرسامی گوتی :

- بەڵام تا ئێستا زاتم نەکردووە ئەم چیرۆکە بۆ ژنەکەم بگێڕمەوە! نەک لەبەر ئەوەی هەڵەیەکی تیابووبێ، هەر زاتم نەکردووە بۆی بگێڕمەوە. ئێ..

چیرۆکەکەی بۆ من نەدەگێڕایەوە، بەڵکو بۆ خۆی دەگێڕایەوە. چونکە لەو جۆرە بێدەنگی و بۆشاییانەدا، پێویستە قسە بکەی یان گۆرانی بڵێیت، یان ئوکوردیون بژەنیت، دەنا لەو شارە مردووەی، نقومی ئاوی سارد و لێڵدا بۆ هەمیشە خەوت لێدەکەوت.

ئاگاداری کردمەوەو گوتی:

- بەر لە هەموو شتێک.. نەکەی بە منداڵی ژن بێنیت! ژن هێنان یەجگار هەستیارە! لە هەر کوێیەک و چۆن بژیت – چ موسوڵمانێکی وڵاتی فارس بیت، چ پۆلیسێک بیت لە موسکۆ، چ جوڵا بی چ دزێک بێ، هەمیشە دەتوانی کار وکاسبیەکەت، ئەگەر بە دڵت نەبێت، بگۆڕیت. بەڵام ناتوانی ژنەکەت بگۆڕی! خۆ ژن پێڵاو نییە، هەرکاتێ بتەوێ دایکەنیت و فڕێی بدەیتە لایەکەوە!

تەمێک ڕوخساری داپۆشی، نێوچاوانی تێکنا و چاوی بڕییە ئاوە لێڵەکە، بە قامکی کەپووە خوارەکەی دەخوراند و لە بن لێوانەوە دەیگوت:

- بەڵێ برادەر.. دەبێ وریابی، چاوت تیژ بێت! ڕەنگە لەو کەسانە بیت کە بەدەم باوە دەچەمێنەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش لە ڕیشەوە هەڵناکەندرێی، بە هەرحاڵ، هەرکەسێک گلانی خۆی هەیە، سوار تا نەگلێ نابێت بەسوار..

تاکو دەوەنە جارەکەی دەریاچەی میشیرسکویە ڕۆیشتین، کە لەو شوێنەدا دەڕژایە ڕوبارە ڤۆلگاوە.

وەستام لوولەی تاپڕەکەی کردە قامیشەڵانەکە و بە چپە گوتی: - بە هێواشی سەوڵ لێبدە.

چەند ساچمەیەکی نا بە باڵندە و مەلە کێوییە لاوازەکانەوەو گوتی:

- با بۆ کونافینو بڕۆین! تا شەوێ لەوێندەر دەمێنمەوە، تۆ بە ماڵەوەمان بڵێ کە هەندێ کارم لەگەڵ قۆنتەراتچییەکدا هەیە.

لە شەقامی یەکێک لەو گوندانەدا کە ئاو غەرقی کردبوو، بەجێم هێشت، ئیدی ڕێ و ڕێ لە مەیدانی کامپەکەوە بۆ ستریلکا زڤڕیمەوە. لەوێ بەلەمەکەم بەستەوەو دانیشتم وکەوتمە تەمەشاکردنی یەکانگیری دوو ڕوبارەکە، شارەکە، کەشتیەکان و ئاسمان. هەورێن سپی بە ئاسمانەوە لە باڵی مەلێکی گەورە دەچوو. خۆری زێڕین لە کەلێن ودرزی هەورەکانەوە سەرەتاتکێی دەکرد، ئەم خۆرەی کە تاقە تیشکێکی بەشی ئەوە دەکات، هەموو جیهان بگۆڕێت. هەموو دەور وبەرم لە هەڵچوونێکی جواندا بوو، یەک زنجیرە کەڵەکی بێکۆتایی، بە خێرایی بە دەم ڕەوت و شەپۆلی ئاوەکەوە دەڕۆیشتن، پیاوانی تۆکمە وبەهێز وڕیشن بە سەر ئەم کەڵەکانەوە دانیشتبوون و سەوڵیان لێدەدا و یەکتریان گاز دەکرد، بانگیان لە ڕێبوارانی سەر کەشتیەکی هەڵمی دەکرد. کەشتییە چکۆلەکە، بەلەمێکی گەورەی بەتاڵی بە پێچەوانەی

ڕەوتی ئاوەکەوە ڕادەکێشا. ڕووبارەکە بەم لاو بەولایدا دەبرد، دەتگوت ماسی کراکییە، هانکە هانک بە گژ ئاوەکەدا دەچووەوە کە زۆر بێ بەزەییانە، هێرشی دەکردە سەر. چوار پیاو شان بەشانی یەک لە نـاو بەلەمە گەورەکەدا دانیشتبوون، لە قەراخەکەیەوە لاقیان شۆڕ کردبووەوە، یەکێکیان کراسێکی سووری لەبەر بوو، بە کۆمەڵگۆرانیەکیان دەچڕی کە بە باشی نەدەگەییە گوێم بەڵام دەمناسییەوە.

وام هەستدەکرد، لەوێ، لە سەر ڕووبارەکە هیچ شتێک نییە بۆ من نا ئاشنا و گۆنگ بێت. هەموو شتێک قابیلی تێگەیشتن و دەرک کردن بوو. بەڵام شارەکەی پشتمەوە، کە غەرقی ئاو بوو، وەکو خەونێکی ناخۆش و شووم وابوو، ڕێک وەکو وەستام وابوو، نە دەهاتە تێگەیشتن و دەرک کردن.

پاش ئەوەی لە تەمەشای دیمەنی ڕووبارەکە تێر بووم، بەرەماڵ بوومەوە، هەستم دەکرد پیاوێکی گەورەم، دەتوانم هەر کارێکم پێ بسپێردرێت ئەنجامی بدەم. بەدەم ڕێگاوە لە سەر ئەو زورگەی کە قەڵای سەرای کەوتبووە سەر، ڕاوەستامتا دوا نیگای ڤۆلگا بکەم. لە بەرزاییەوە. ڕاستە دەشتانیەکە وادەهاتە بەرچاو کە سنووری نییە، مژدەی سەرکەوتنی پێیە.

لە ماڵەوە چەند کتێبێکم هەن. ئەو شوقەیەی کە جاران شاژنە مارگۆی تیابوو، ئێستا خێزانێکی گەورەی تیایە، پێنج کچیان هەیە یەک لەیەک خشیک ترن، دوو برایان هەن خوێندکاری قۆناغی دواناوەندین. ئەمانە کتێبیان بە ئەمانەت دەدامێ. ئیدی لە بەرهەمەکانی تورگینیفدا نقوم دەبم، زۆرم پێخۆشن، نووسینەکانی سادە ومەفهوومن، ڕوون وخۆیا لە

ڕۆژگـــاری پـــاییز دەچـــن. قارەمانەکـــانی نەجیمـــزادە و بە حورمەتن، ئەوەی نووسەر دەیڵێت بەلامەوە گەورە وجوانە.

مـــن کتێبێکـــی " پومیالوســـکی " م بە ناونیشـــانی " ژیـــانی قوتابخـانەی ئـاینی " خوێنـدەوە، حەپەسـام، دەقـاودەق وەکـو ژیانی نـاو کارگەکەی ئێمە وابوو. من بۆخۆم ئەو نائومێدیەم جەڕبانـــدبوو، کە لە پڕێکـــا دەگۆڕێـــت بـــۆ هەڵچـــوون و یاخیبوونێکی هۆڤیانە. تیایدا ژیابووم.

بە هەرحـــاڵ خوێنـــدنەوەی ئەم کتێـــبە ڕووســـیانەم پـــێ خۆشبوون، زۆر بە زەقی گیانە خەمناکە باوە ڕووسیەکەیانتیا بەدی دەکەم، ڕێـــک دەڵێـــی زەنگـــی ڕۆژووی گەورە لە بـــن دیرەکانیانـــدا حەشـــار دراوە، هەرکە کتێبێـــک دەکەمەوە، بە ئارامی زەنگی خۆی لێدەدات.

" گیـانی مردووەکـان "م بە بێ موبـالاتی خوێندەوە. وەکـو کتێبـــی " یادگاریەکـــانی خـــانەی مـــردووان " وابـــوو. "گیـــانە مردووەکان" و "خانەی مردووان" و " مەرگ " و " سێ مەرگ " و " مومیـــــای زنـــــدوو " — هەر هەمـــــوو ئەم کتێبـــــانە کە ناونیشانەکانیان لێکدی دەچن، بەدەست خۆم نەبوو ڕایانگرتم، جـۆرە بێزارییەکیـان لە لا دروســتکردم. هەروەهـا " ئامـاژەی تەنگژە " و " هەنگاو بە هەنگاو : و " چ بکرێ" و " بویەرەکانی گوندی سمورین " و زۆر کتێبانی دیکەی لەو جۆرەم نەچوونە دڵەوە.

لـــێ دیکنـــز و ولترســـکوت سەرمەســـتیان دەکـــردم. زۆر بەخۆشـیەوە هەر کتێبێکـی ئەم نووسـەرانەم سـێ چـوار جـار دەخوێنـدەوە. کتێبەکـانی ولتـر سـکوت، نـوێژێکی بەشـکۆی لە کڵێسایەکی بە ئیحتوباری بە بیری مرۆڤ دێنایەوە. دیکنز تاکو ئەمڕۆش بەلای منەوە لەو نووسـەرە گەورانەیە کە بە ڕیزەوە

له بەردەمیا بوەستی و دەست بە سینگەوە بگریت بۆی – نووسەرێکی بێ هاوتایە کەییوەتە لوتکەی کەماڵ لە قورسترین هونەردا – هونەری خولقاندنی مەحەبەت و خۆشەویستی لە نێوان خەڵکیدا.

شەوان، کۆمەڵە گەنجێک لە سەر قالدرمەکانی باڵەخانەکە کۆ دەبوونەوە: لەوانە خوشک وبرایەکانی ماڵەکەی ناو شوقەکەی شاژنە مارگۆ، خوێندکارێکی لووت پس بە نێوی فیاچسلاف سیماچکۆ و هەندێکی دیکە. هەندێجار مادموزیل پیتزین، کەکیژی کارمەندێکی پایەبەرز بوو لەو کۆڕ و مەجلیسانەدا ئامادە دەبوو. گفتوگۆ و گەنگەشەمان سەبارەت بە ئەدەبیات دەکرد، من چونکە لەوانی دی کتێبانم پتر خوێندبووەوە، ئەم بابەتانەم زۆر پێخۆش بوون و بە ئاسانی تێیان دەگەیشتم. ئەوان بە زۆری باسی کێشە وگرفتەکانی قوتابخانەیان دەکرد. گلەییان لە مامۆستاکانیان دەکرد، من کە خۆم لەوان ئازادتر دەبینی، سەرم لە سەبر و هەداری وان دەسوڕما. بەڵام بە هەرحاڵ خۆزیام پێدەخواستن کە خوێندکاربوون و مژوولی خوێندن بوون.

ئەم گەنجانە لە من گەورەتر بوون، بەڵام وام هەستدەکرد من لەوان پوختەترو بە ئەزموونترم. ئەم هەستە نارەحەتی دەکردم وهەندێجار لەوانی دوور دەخستمەوە، حەزم دەکرد زیاتر لێیانەوە نزیک بم، ئێواران درەنگ لە سەر کار دەگەڕامەوە، هیلاک و ماندوو، تەپ وتۆزاوی، هەر بەو حاڵەوە دەچوومە ناویان، ئیدی بیرکردنەوەی من زیاتر بە دەوری ئەو جیاوازیە ڕواڵەتیەدا دەسووڕایەوە کە لە نێوان من و ئەواندا هەبوو. بابەتی سەرەکی گفتوگۆی کوڕەکان، کچان بوو، ئیدی ئاشقی ئەم یان ئەو کیژ دەبوون و هەوڵیاندەدا شیعریان پێدا

بڵێن. ئیدی لەم جۆرە کارانەدا پێویستیان بە کۆمەکی من دەبوو. من بە حوکمی ئەوەی ئەزموونی هۆنینەوەی شیعرم هەبوو، بە ئاسانی کێش و سەرواوم بۆ دەهات. بەڵام خۆیشم نازانم چما شیعرەکانم بە زۆری مۆرکێکی شۆخیبازیانەیان لەخۆ دەگرت، بۆ نموونە مادموزێل ' بتزین ' م کە زۆربەی شیعرەکان بۆ ئەو دادەنران، بە سەوزەوات یان بە پیاز دەشوبهاند.

سیماچکو پێی گوتم: - بەمە دەڵێی شیعر؟ ئەمە دووکانی سەوزە فرۆشیە.

ئەوەندەم شیعر بە جوانی مادموزیل پیتزیندا گوت، ئەنجام خۆیشم کەوتمە داوی عەشقی ئەوەوە. من تەنیا کۆتاییەکەی ئەم عەشقەم لە بیر ماوە کە کۆتاییەکی خەمناک بوو. ڕۆژێک پێشنیازم بۆ کچە کرد کە بە دوو قۆڵی بە سواری تەختەدارێک، پیاسەیەکی ناو زەلکاوەکانی زفیزدین بکەین. کیژێ قاییل بوو، من تەختەکەم لە کەنارەکە نزیک کردەوەو چوومە سەری. تەختەکە بتەو بوو، تەحەممولی قورسایی منی دەکرد، کیژی کە جوان خۆی ڕازاندبووە و خۆی لە تەل دابوو، لەو سەری تەختەکە دانیشت، من دارێکی باریکم لە جیاتی سەول بەکار دەبرد و تەختەکەم لە کەنارەکە دوور خستەوە، لە ناکاوا تەختەکە خوار بووەوەو کیژێ کەوتە ئاوەکەوە، ئازایانە خۆم هەڵدایە ئاوەکەوەو کیژێم نەجات دا و هێنامەوە کەنارەکە. کیژەی تاین لە قوڕ و قەوزەدا هەڵکشابوو، بە تووڕەیی دەستی لێ ڕادەوەشاندم و هاواری بەسەرمدا دەکرد:

- تۆ بە ئانقەست دەتویست بم خنکێنی!

ئیدی هەرچیم کرد و کۆشا، لێی نەبوردم، لێم هەڵگەڕایەوە و بوو بە دژمنی سەرسەختم.

هەڵبەتە دەبێ ئەوە بڵێم کە گەڕانەوەم بۆماڵی ئەربابەکەی جارانم کارێکی سادە وئاسان نەبوو. پیرەژن هێشتا لێم پڕبوو، بووکەکەی بە گومانەوە سەیری دەکردم، ڤیکتوریش لەجاران خراپتر بوو، لەگەڵ کەسا هەڵینەدەکرد، لەگەڵ تڕی خۆیا بەشەڕ دەهات.

بەڵام وەستام، کارو پرۆژەکانی لەوە زۆرتر بوون کە تەنانەت بە کۆمەکی براکەشی دەرەقەتیان بێت و پێیان ڕابگات. بۆیە ناچاربوو داوای یارمەتی لەمامم، مێردی دایکم بکات.

ڕۆژێک هەندێک زوو لە بازاڕ زڤڕیمەوە، وەختایەک خۆم بە ژووری نانخواردندا کرد، ئەم پیاوەم بینی، بە تەواوەتی لە بیرم چووبووەوە. لەپشت مێزەکەوە و لەگەڵ وەستاما دانیشتبوو و چای دەخواردەوە. دەستی هێنایە پێشی وگوتی: - سڵاو، چۆنی؟

غافڵگیر بووم، زمانم بەسترا. لە ناکاوا هەموو ڕابردووم وەبیر کەوتەوە ودڵم بە تەواوەتی گوشرا. وەستام گوتی: - منداڵەکەت ترساند!

باوەپیارەکەمبەدەم بزەیەکی کاڵەوە، چاوی لە دوڕ چاوم بڕی. چاوە ڕەشەکانی کرابوونەوە، تەواو داکەوتبوو. دەستم خستە نێو قامکە لاواز و گەرمەکانیەوە. کۆکەیەکی کرد وگوتی:

- نەمردین، دووبارە یەکمان گرتەوە.

من بەجێم هێشتن. ئازام داهێزرابوو، لە کەسێک دەچووم حەسیر مەیدانێکی باش کرابێت.

پەیوەندییەکی شێواومان لە نێواندا هەبوو، بە ناوی خۆم و باوکمەوە گازی دەکردم، وەکو هاوتایەکی خۆی دەیدواندم :

- دەتوانی ئەگەر چووی بۆ دووکان ڕوبعە کیلۆیەک تووتنی "لافیرم" و سەد پەڕە سیغاری "ڤیکتورسون" و کیلۆیەک "باسترمە"م بۆ بکڕی..

که پـــارەی ئەو شـــتانەی دەدامـــیّ، بە هـــۆی دەســـتە گەرمەکانیەوە، هێندە گەرم بوون پیاو دڵی لێیان تێکهەڵدەهات. دیاربوو کە نەخۆشی دیق و دەردە باریکە زۆری بۆ هێنابوو و لە دوا دوایی عەمریا بوو، بەخۆیشی ئەوەی دەزانی، دەستی بە ڕدێنە ڕەش و زبرەکەیدا دێنا وبە ئارامی دەیگوت:

- ئەم نەخۆشـییەی مـن بـیّ دەرمـانە. هەرچەنـدە دەڵـێن ئەوەی گۆشـتی زۆر بخـوات لەگیـنە چـاک ببێـتەوە – بەڵکـو منیش چاک ببمەوە.

خواردنی زۆری دەخوارد، بەڵام لە هەمان کاتدا سیغاریشی دەکێشا. هەموو ڕۆژێ باسترمە، قاورمەی ڕان وساردینم بۆ دەکڕی. لـیّ خوشـکەکەی نەنکـم، بەکینەیەکەوە کە هـۆیەکەیم نەدەزانی، دەیگوت: - بەخواردن و بەهارات بەرگری لە مەرگ ناکرێت. مردن نایەتە خاپاندن نا، نایەتە خاپاندن!

جووتە ژن، مدارایەکی زۆری باوەپیارەکەی منیان دەکرد، بەردەوام ئامۆژگاریان دەکرد کە ئەم دەرمان یان ئەو دەرمان بخـوات. بەڵام هەرکە لەبەرچاویـان دیـار نەدەمـا، گاڵتەیـان پێدەکرد.

وەستاژنم، بە تەشەرەوە دەیگوت:

- تـۆ تەمەشـای ئەم شـازادەیە، هەمیشـە ئەمـر دەکـات کە پاشـــماوەی نـــانەکە کـــۆبکەینەوە، چـــونکە بەرمـــاوە مـــێش ڕادەکێشیت.

پیرەژنیش بۆی دەسەندەوە:

- پیـف لەم شـازادەیە! تەمەشـای جلەکانی بکە بزانە چـۆن تـاڵکیش بـوون، ئەوەنـدە شـۆردراون، سـواون، دەبـریقێنەوە، کە کابرایەکی بەفیز و قۆرەدەماغە.

وەستام، وەکو ئەوەی بیەوێ هێوریان بکاتەوە دەیگوت:

- سەبر وحەوسەڵەتان بێ، مریشکانی بە گارەگار. پەلە مەکەن ئەم کابرایە هێندەی بەبەرەوە نەماوە، بەو زووانە دەمرێت!

ئەم هەڵوێستە، دزێوەی ئەو خەڵکانە سەبارەت بە بابایەکی نەجیب و خانەدان، دەیاننواند کردیە کارێک لە باوەپیارەکەم نزیک ببمەوە. خەریک بوو لەو ژینگە چەپەڵەدا خەفە دەبوو. لە ماسییەک دەچوو کە کەوتبێتە کولانە مریشکێکەوە. ئەمە لێکچواندنێکی سەخیفە، هیچی لەو ژیانە سەخیفە کەمتر نەبوو کە تیایدا بووین.

وردە وردە هەندێ خەسڵەتی کابرای " ئەمە جوانە "م کە بە عەمراتم لەبیرم ناچێتەوە لە یاداشتەکانی دەورانی منداڵیم دا باسم کردووە، لە باوەپیارەکەم دا کەشف کرد. من هەموو ئەو خەسڵەتە پەسند و جوانانەی لە قارەمانانی ئەو کتێبانەدا کە دەمخوێندنەوە، دەدایە پاڵ کابرای " ئەمە جوانە " و شاژنە مارگۆ. باوەپیارەکەم لەم ڕووەوە لە یارۆی " ئەمە جوانە" دەچوو، چونکە پیاوێکی غەریب بوو و کەس لەو ماڵەدا خۆشی نەدەویست. بە یەک چاو تەمەشای هەمووانی دەکرد، لە خۆیەوە قسەی نەدەکرد، ئەگەر پرسیارێکی لێکرابایە، بەوپەڕی ئەدەب و نەزاکەتەوە وەلامی دەدایەوە. کە ئامۆژگاری وەستامی دەکرد زۆر حەزم دەکرد گوێی لێبگرم. بە سەر مێزەکەدا دادەنەوییەوە، بە نینۆکە درێژەکەی دەیکێشا بەسەر کاغەزە ئەستوورەکەدا. بە ئارامی دەستی پێدەکرد:

- پێموایە دەبێ لێرەدا پایەیەکی دارین بخرێتەبەر قەنتەرەکە تا گوشار وپاڵەپەستۆیەکە بە یەکسانی دابەش ببێت. ئەگەر وا نەکەین، پایەکان بەسەر دیوارەکەدا دەڕوخێن.

وەستام دەکەوتە مینگەمینگ : - دروستە. بەداخەوە کەوایە.
وەختـایەک مـاکزیموف ٭ باوەپیـارەکەم ٭ دەچـووە دەرێ وەستاژن دەیگوت:
- من نازانم تۆ بۆچی رێگەی دەدەیت بەوجۆرە دەرست دابدات؟
بەڵام ئەوەی لە هەمووشتێک پتر وەستاژنی پەست دەکرد ئەوەبـوو کە باوەپیـارەکەی مـن دوای نـانخواردن بە فڵـچە وماجووم ددانەکانی دەشت و ئاوی لەدەمی وەردەدا و بەدەم غەرغەرەوە قورتمی بە زەقی بەرز ونزم دەبووەوە.
جارێک وەستاژن، بە راوێژێکی وشک پێی گوت:
- بەڕای من، بۆ تۆ زۆر خراپە بەو شێوەیە خۆت بە پشتا ببەی!
ماکزیموف، بزەیەکی بۆکرد و زۆر بە ئەدەبەوە پرسی: - چۆن ئەمەت بەبیرا هات؟
- هەروا.
ئێسـقانێکی وردی هەڵگـرت و کەوتە خـاوێنکردنەوەی بنـی نینۆکەکانی کە شین دەچوونەوە.
وەختێ ئەو ڕۆیی، وەستاژن بەجارێ دەهری بوو:
- تەســەورکەن! نینۆکەکانیشــی خاوێنــدەکاتەوە! پێــی بە لێواری قەبرەوەیەو کەچی..
وەستام هەناسەیەکی هەڵکێشا : - کە کەرن!
ژنەکەی بە ناڕەزاییەوە گوتی: - بۆ وا دەڵێیت؟
پیرەژن، شەوان، گلەیی بەلای خواوە دەکرد:
- دیســان ئەم پیـاوە نەخـۆش ودەغەزارەیـان بەســەرما داسەپاندووە، چبکەم، ڤیکتور دووبارە فەرامۆش کراوەتەوە.
ڤیکتـور، کەوتە لاسـایی کـردنەوەی بـاوە پیـارەکەی مـن — ڕێکـردنە خـاوەکەی، جـووڵەی ئەرسـتۆکراتیانەی دەسـتەکانی،

چۆنیەتی بەستنی بۆینباخەکەی، شێوازی نانخواردنەکەی بەبێ ئەوەی دەمی بکاتەوە یان ملچەملچ لە زاریەوە بێت بەردەوام بە ڕەقی لێی دەپرسی:

- ماکزیموف، بە فەرەنسی بە ' ئەژنۆ ' دەڵێن چی؟

زڕبابەکەم بە ئارامی بۆی ڕاستدەکردەوە: - ناوم ' یەڤگینی فاسیلیفیچ ' ە.

- باشە، ئەدی مەمک؟

ڤیکتور، لە سەر خوانی شێوی، هەرشتێکی ویستبا بە فەرەنسی داوای لە دایکی دەکرد.

پیرەژن، بە خۆشحاڵییەوە دەیگوت: - باشە، فەرەنسی گیان!

زڕبابەکەم، بە کاوەخۆ گۆشتەکەی دەجوو، دەتگوت لاڵە، بەبێ ئەوەی تەمەشای هیچ یەکێک لە ئامادەبووان بکات بە بێدەنگی نانی خۆی دەخوارد.

ڕۆژێک برا گەورە، بە برا بچووکەکەی گوت:

- ئەنجام فێری زمانی فەرەنسی بوویت، ئیدی هەق وایە ماشقەیەکیش بۆخۆت پەیدا بکەیت.

لە بیرمە کە لەو کاتەدا مێردەکەی داکم بزەیەکی ڕەزامەندی هاتێ.

وەستاژن، کەوچکەکەی (مراک) تووڕدا و بە ڕووی مێردەکەیا هەڵشاخی وگوتی: - چۆن لە حوزووری منا ئەم قسە نەنگینە دەکەیت؟

هەندێجار مێردەکەی داکم دەهات بۆلای من، من لە ژێر قالدرمەکانی هەورەبانەکە دەخەوتم، بەر لەوەی بخەوم، لە سەر پلیکانەیەک بەرانبەر پەنجەرەکە دادەنیشتم و کتێبم دەخوێندەوە.

جارێک، بە دەم هەڵمژینی تۆپەڵێک دووکەڵی سیغارەوە، کە قرچەقرچـــی لە ســـینگییەوە بەرز دەکـــردەوە، پرســـی: - دەخوێنیتەوە، ئەوە چ کتێبێکە؟

ناونیشـانی کتێبەکەم نیشـانی دا، گـوتی: - ئەهـا، وابـزانم خوێندوومەتەوە. جگەرە دەکێشیت؟

بە دەم جگەرەکێشـانەوە، لە پەنـجەرەکەوە دەمـانڕوانیە نـاو حەوشە پیسەکە. گوتی: - حەیفێ کە تۆ ناخوێنیت، هەستدەکەم بەهرە و توانایەکی زۆرت تیایە.

- بەڵام من دەخوێنمەوە، کتێبان دەخوێنمەوەو زۆرشت فێر دەبم..

- ئەمە بە تەنیـا بەس نیـیە. دەرس خوێنـدن میتـۆدی خـۆی هەیە، دەبێ بچیتە قوتابخانە، مامۆستات هەبێت..

دەمویست پێی بێژم:

- قوربـــان تـــۆ چـــوویتە قوتابخـــانە، مەکتەبیشـــت تەواو کردووە، چ سوودێکیت دیتووە؟

لەوە دەچوو، بیری منی خوێندبێتەوە, بۆیە لە سەری ڕۆیی وگوتی:

- ئەگەر کەسـێک بەهـرەی تیـابێ، قوتابخـانە زۆر یـارمەتی دەدات کە بەهـــرە وتوانـــاکەی بگەشـــێتەوە. تەنیـــا خەڵکـــانی خوێندەوار و زانا دەتوانن بە پەیژەی ژیانا سەربکەون..

چەند جارێک ئامۆژگاری کردم وگوتی :

- هەقە لێرە بڕۆیت. مانەوەی تۆ لێرە هیچ مـانـایەکی نییە و هیچ سوودێکت پێناگەیەنێت..

- بەڵام من کرێکارەکانم خۆشدەوێن.

- چۆن، خۆشیت بە چیاندا چووە؟

- مایەی سەرنجن.

- ڕەنگە..

جارێکی دی گوتی:
- بەڕاستی ئاغایەکانمان هیچ و پووچن، بەڕاستی حەیوانن
- تا بڵێی ڕکونی و دڵڕەشن.
ڕێک دایکمم بیرکەوتەوە کە زۆرجار ئەو جۆرە قسانەی دەکرد. خۆ بە خۆ لە زرباباکەم دوور کەوتمەوە. بە دەم زەردەخەنەیەکەوە پرسی: - باوەڕ بە قسەکەم ناکەی؟
- با، باوەڕ دەکەم.
- هەڵبەتە، من ئەوە بۆچوونمە.
- بەڵام من وێرای ئەوەش دڵبەندی وەستام.
- لەگینە پیاوێکی باش بێت، بەڵام زۆر لاوازە.
ویستم باسی کتێبانی لە گەڵ بکەمەوە، بەڵام وادیار بوو حەزی لە کتێبان نەبوو- زۆرجار دەیگوت:
- زۆر خۆتی پێوە خجڵ مەکە. کتێبان هەمیشە حەقیقەت دەشێوێنن، بێ لایانانە حەقیقەتەکان ناڵێن، زۆربەی نووسەران وەکو ئەم ئاغایەی ئێرەمان، خەڵکانی بیر تەسکن..
هەڵبەتە من ئەو بیرانەم پێ پەسند بوون، بۆیە زیاتر دڵبەندی دەبووم. ڕۆژێک لێی پرسیم: - گونچاروفت خوێندووەتەوە؟
بەرسڤم دایەوە: - ڕۆمانی " کەشتی جەنگی بلادا "م خوێندووەتەوە.
- کەشتی بلادا، پیاو بێتاقەت دەکات. گونچاروف، یەکێکە لە نووسەرە زیرەک و هەرە باشەکانی ڕووسیا. حەزدەکەم ڕۆمانێکی هەیە بەناونیشانی " ئوبلوموف "، ئەوە بخوێنیتەوە — ئەمە لە هەموو کتێبەکانی دیکەی باشترە، حەقیقەت وجورئەتێکی زۆری تیایە. بە شێوەیەکی گشتی لە کارە هەرە باشەکانی ئەدەبی ڕووسییە.. سەبارەت بە دیکنز گوتی:

- وڕێــنەیە، هەرزەوێــژی و درێــژدادڕی بێهــودەیە. ئەم قسەیەم بەهەند وەربگرە. بەڵام شتێک هەیە کە حاڵی حازر لە پاشکۆی ڕۆژنامەی " سەردەمانی مودرین " بڵاودەکرێتەوە، بە ناونیشانی " گومڕاکرنی قەشە ئەنتوان " پێویستە بیخوێنیتەوە. وادیارە تۆ دڵبەندی کڵێسا وشتە ئەکلیریکیەکانیت، خوێندنەوەی " گومڕاکردن " سوودت پێدەگەیەنێت..

بەخۆی بەستەیەک لە پاشکۆی ناقبری بۆهێنام، ئەو کارە سەنگینەی گوستاف فلوبیرم خوێندەوە. ژینامەی هەموو ئەو قەشە زۆر و زەبەندانەی وەبیر هێنامەوە کە خوێندبوومنەوە، هەروەها هەندێک لەو چیرۆکانەشی وەبیر هێنامەوە کە دیندارە سەختگیرەکان بۆیان گێڕابوومەوە. بەڵام هیچ کاریکی تێنەکردم، زیاتر لەزەتم لە خوێندنەوەی " یاداشتەکانی ئوبیلیو فایمالی ڕاهێنەری گیانداران " بینی کە لە پاشکۆکاندا بڵاوکرابووەوە.

کە ئەو ئیعترافەم بۆ باوەپیاڕەکەم کرد، بە ئارامی گوتی:

- ئەمە مانای وایە هێشتا لەوە مندالتری کە ئەم بابەتە شتانە بخوێنیتەوە. بەڵام ئەو کتێبە لەبیر مەکە.

هەندێجار ماوەیەکی زۆر لە لام دادەنیشت و هیچی نەدەگوت، تەنیا جارجار کۆکەیەکی بۆ دەکرد و دووکەڵی جگەرەکەی بەبا دەدا. چاوە جوانەکانی گرێکی ناخۆشیان لێدەبووەوە. کە ژێراوژێر سەیری ئەم پیاوەم دەکرد، ئەوەم لەبیر دەچووەوە کە ئەم پیاوەی بەم سادەییە، بەبێ هیچ بێزاری و گازنێک بەرەوپیری مەرگ دەچوو، ڕۆژێ لە ڕوژان خۆشەویستی دایکم بووە و زۆری خراپە دەرهەق بە دایکم کردبوو. دەمزانی کە حاڵی حازر لەگەڵ ژنێکی خەیاتدا دەژی، لە دڵی خۆدا بەزەییم بەم ژنە بێنوایەدا دەهاتەوە. سەرم لەوە دەسوڕما، چۆن ئەم ژنە بێزی دەهات دەم لە نێو دەمی ئەم

پیاوە بنێت و ئەو ئێسکە پەیکەرە لە هەمێز بگرێت! لێو بخاتە سەر لێوانێک کە بۆن بۆگەنیان لێدەهات؟

مێردەکەی داکم وەکو یارۆی ' ئەمە جوانە ' هەندێجار هەر لە خۆوە و لە ناکاوا کۆمەڵێک قسەی بێ سەروبەر و هەلەق ومەلەقی دەردەپەڕاند. وەکو:

– من تاژیم خۆش دەوێن، هەرچەندە حەیوانن، بەلام من زۆرم خۆش دەوێن. زۆر جوانن، بەلام ژنانی جوان، بە زۆری هەست سزن، کەرن.

من، لە دڵی خۆدا دەمگوت: – ئەگەر شاژنە مارگوت دەناسی، ئەو قسەیەت نەدەکرد!

جارێک گوتی: – هەموو ئەو کەسانەی ماوەیەکی زۆر لەیەک شوێندا دەژین بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، دەشوبهێنە سەریەک، دوو گا لە دۆڵێ نەچنە پێستی یەکەوە دەچنە خووی یەکەوە.

ئیدی ئەم دەستەواژەیەم لە دەفتەرەکەی خۆمدا تۆمار کرد.

من ئەو پەند و قسە نەستەقانەم کۆ دەکردەوە، زۆر کەیفم پێیان دەهات، بەتایبەتی کە لە ماڵێکا دەژیام جگە لە قسەێن بۆش و بەتاڵ و قسەی کڵێشەیی بێتام هیچی تری تیا نەدەبیسترا.

ماکزیموف، کەم وزۆر باسی دایکمی نەدەکرد. قەت لەبەردەم مندا ناوی نەدەبرد. ئەمە کردیە کارێک، کە تا رادەیەک ڕێزی بگرم.

جارێک، نازانم لە چ بۆنەیەکدا بوو، دەربارەی خوا پرسیارم لێکرد، نیگایەکی لەزگینی کردم و بە هێمنی وەلامی دامەوە: – نازانم. من باوەڕم بە خودا نییە.

سیتانوفم بیرکەوەتەوە، بۆ باوەپیارەکەمم باسکرد. پاش ئەوەی بە وردی گوێی لێگرتم، بە هەمان ڕاوێژی ئارام گوتی:

- دڵـی تەنـگە بـۆیە گەنگەشــە دەکـات، گەنگەشــەکاران، هەرچۆنێ بیربکەنەوە، کەم دابێژێک باوەڕیان هەیە، باوەڕیان بە شتێک هەیە. بەڵام من باوەڕم بە هیچ شتێک نییە.

- باشە شتی وادەبێ، مەحاڵ نییە؟

- بۆ نابێ، چما مەحاڵە؟ ئەوەتا من بە بەرچاوی خۆتەوە باوەڕم بە هیچ نییە..

هەسـتم دەکـرد خەریـکە دەمرێـت و لە سـەرە مەرگـدایە، نـاکرێ بڵـێم دڵـم بەحـاڵی دەسـووتا، بەڵام دەتـوانم بڵـێم بـۆ یەکەمجــار لە ژیانمــا بیــرم لەوە دەکــردەوە کە ئەم بەدەنە دەگۆڕێـت، دەبێـت بە جەسـتەیەکی ساردوسـڕ، بـۆ یەکەمجـار بیرم لە مەتەڵ و لەگەزی مردن کردەوە.

بـوونەوەرێکی زنـدوو لەلامەوە ڕۆنیشـتووە، ئەژنۆکـانی لە ئەژنۆکــانم گیربــوون، هەناســە دەدا، بیردەکــاتەوە، زیــرەکە، بەگــوێرەی پەیوەنـدی لەگەڵ خەڵـکەکەدا دەیانـدوێنێت. باسـی هەمــوو شــتێک دەکــات، لە تــۆ وایە گەرەکیەتــی، هەمــوو کاروبارەکـان هەڵبســەنگێنێت. مـن جـۆرە سـۆزو میرەبـانیەکی دەرهەق بە خۆم تیا دەبینم. هەزار ویەک بیر وخولیا لە دڵ و دەرونیـا، لە ویژدانیـا ئـاوێتەبوون و لە کـاردان، لە ململانـێ و کێشماکێشـێکی بـێ بـڕانەوەدان. هەسـتی مـن هەرچـیەک بـێ بەرانـبەری، کـار لە منـیش دەکات، تـێکەڵ بە دەروونـم دەبێت. ڕوحمــان یەکــانگیر دەبــن. هەمــووی ئەمــڕۆ و ســبەینێ یە، دەڕوات، لەبەر چاومـا نامێنێت، بە یەکجـارەکی لەبەر چـاو ون دەبێـت، بە هەمــوو ئەو شــتانەوە لە مێشــکی دایە، بە هەمــوو ئەوشتانەوە لە ناخ و دەروونیدایە، بەو هەموو خولیایانەوە کە لە چــاوە جوانەکانیــا بەدی دەکــرێن. دەڕوات. کە ئەو بــڕوات یەکێـک لەو داو وڕشـتانەی کە مـن بە جیهـانەوە گـرێ دەدات دەپچڕێـت و تەنیـا وەکـو یادگارێـک دەمێنێـت، کە هـیچ شـتێک

نەتوانێت بیسڕێتەوە یان لە نێوی بەرێت، بەڵام جەستەکەی، فەوت و فەنا دەبێت. ئەوە تەنیا بۆچوونە، بەڵام، مرۆڤ کە لە ڕواڵەتەکانی ژیان ورد دەبێتەوە، یەکسەر ئەو پرسیارەی لە لا دروست دەبێت: چما؟

شەوێ کە باران لە دەرێ ڕا دەبریقایەوە، زڕبابەکەم پێی گوتم:

- پێموایە دەبێ بە ناچاری لە جێدا بکەوم، تەواو کەسیرە بووم و دەستم ناچێتە هیچ شتێک، ئارەزوو و ئیشتیای هیچم نییە!

سبەی شەو، پاش چا خواردنەوە زۆر بە وردی کەوتە کۆکردنەوەی ئەو ورتکە نانەی ڕژابووە ژێر مێزەکە و سەر ئەژنۆکانی، پێدەچوو هەڕەشەیەکی پەنهان و نەدیار لە خۆی دوور بخاتەوە. دایکی وەستام ژێراوژێر نیگایەکی کرد و، نێوچاوانی تێکنا و بە گوێی بووکەکەیدا چپاند:

- تەمەشا دەڵێی خۆی کۆدەکاتەوە و خۆی ئامادە دەکات!

سبەینێ بۆکار نەهاتەوە، دوای دوو ڕۆژ پیرەژن، زەرفێکی سپی گەورەی دامێ وگوتی:

- ئەمە بۆ تۆ هاتووە، دوێنێ لای نیوەڕۆ ئافرەتێکی گەنج هێنابووی، بەڵام من بیرم چوو بتدەمێ، ئافرەتێکی چکۆلەی خشێک بوو، نازانم چ پەیوەندییەکی بەتۆوە هەیە و دەکاتە چی تۆ..

زەرفەکە ئەدەرسی خەستەخانە وئەم چەند دێڕەی تیابوو:

"ئەگەر دەرفەتت هەبوو، وەرە سەرێکم بدە. من لە خەستەخانەی مارتینوفسکایا کەوتووم. م. ی."

سبەی بەیانی خۆم گەیاندە نەخۆشخانەی ئاقبری، لە لای قاچی زڕبابەکەمەوە لە سەر قەرەوێڵەکە دانیشتبووم. لە قەرەوێڵەکە درێژتر بوو، پێیەکانی لە بەینی شیشەکانی

قەرەویڵەکەوە دەرچوو بوون. جووتێ گۆرەوی خوری بۆری لە پێدا بوو. چاوە جوانەکانی بە دیوارە زەردباوەکانا دەگێڕا، لە ناکاوا نیگای لە سەر ڕوخساری من و دەستە چکۆلەکانی ئەو کچۆڵەیە گیرسایەوە کە لە ژوور سەریەوە دانیشتبوو. کیژێ دەستی لەسەر بالیفی نەخۆشەکە دانا، ماکزیموف، ڕوومەتی لە دەست و پەنجەی کیژەکە هەڵدەسوو و دەمی دەکردەوە. کچەکە بەدەنێکی پڕی هەبوو، کراسێکی ڕەشی زۆر ئاسایی لەبەربوو: ڕوندک بە ئەسپایی بە دەم و چاوە هێلکەییەکەیا دەهاتەخوارێ. چاوە شینەکانی لە ڕوخساری داچەکیو ودەم ولووتی لاوازی زڕبابەکەم نەدەگواستەوە، لەبن لێوانەوە گوتی:

- دەبێ قەشەی بێنینە سەر، بەڵام ڕازی نییە. باوەڕی بە هیچ شتێک نییە.

کچە دەستی لە سەر بالیفەکە لابرد، هەردوو دەستی لە سەر سینگی تێک هاڵاندن، دەتگوت لە نوێژا وەستاوە.

زڕبابەکەم، بۆساتێک وەخۆ هاتەوە. بە گرژی ڕوانیە بن میچەکە، لە تۆ وایە شتێک وەبیر دێنێتەوە، ئەوسا دەستە ئارەقاویەکانی بۆمن ڕاکێشا وگوتی:

- تۆی؟ سوپاست دەکەم. بەخۆت دەبینی من... هەستدەکەم.. زۆر بێتاقەتم.

بەو جووڵەیە شەکەت بوو، چاوەکانی نوقاندن. کەوتمە نەوازشی ئەنگوستە درێژ و ساردەکانی. نوخانەکانی (نینۆک) شین هەڵگەڕابوون، کچۆڵەکە، بە ڕاوێژێکی خەفە لێی پاڕایەوە:

- یەڤگینی ڤاسیلیفیچ، تکایە با کەشیشێک..

زڕبابەکەم بە ڕاوێژێکی نامەفهووم کچۆڵەکەی بێدەنگ کرد، خۆیشی بێدەنگ بوو، ئەوجا بەچاو ئاماژەیەکی بۆلای کچەکە کرد وگوتی: - حەزدەکەم بیناسیت، کچێکی زۆرباشە..

بێدەنگ بوو، زاری کرایەوە، لە ناکاوا هاوارێکی ناخۆشی لێبەرز بووەوە. کەوتە لەقەفرتێ و حەولەوەلا، چەرچەفەکەی لە سەر خۆی لابرد. کچۆڵەکەش کەوتە هاوار، ڕوخساری لە بالیفە چرچ ولۆچەکەدا نقوم کرد. بەڵام باوەپیارەکەم، زۆر خێرا دوا هەناسەی دا، ئیدی ڕوخساری ئارام بووەوە، جوان تر بووبوو- مردبوو.

من لە کاتێکا ژێر باڵی کچۆڵەکەم گرتبوو، لە خەستەخانەکە وەدەر کەوتم. کچە بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە، وەکو یەکێک نەخۆش بێ بەلادا دەهات. دەگریا، دەستەسرێکی گرمۆڵە کردبوو و چاوەکانی پێدەسڕی. ئەم دەستەسڕەی گرمۆڵە کردبوو و وەکو گەنجێکی گرانبەها تەمەشای دەکرد.

لە ناکاوا وەستا، خۆی بەمنەوە قرساند، بە ڕاوێژێکی خەمینی پڕ لە نائومێدی گوتی: - حەیفێ نەگەییە زستان.. ئەی خوایە گیانە!

دەستەکانی کە لە ڕوندکا هەڵکشابوون بۆلای من هێنایە پێشێ وگوتی: - بە دوعا، ئەو تۆی زۆر خۆشدەویست! سبەی بەخاکی دەسپێرن.

- حەزدەکەی بتگەیەنمەماڵەوە؟

تەمەشایەکی دەوروبەری کرد وگوتی: - نەخێر، سوپاس، هێشتا دنیا ڕوناکە.

لە سیلەی کۆڵانەکەدا وەستام. دووراودوور تەمەشام دەکرد. زۆر بەخاوی ڕێی دەکرد، وەکو کەسێکی نائومێد کە هیچ کەسێک چاوەڕوانی نەبێت، بەو ئاوایە ڕێی دەکرد.

مانگی ئاب بوو، تازە گەڵای درەختەکان زەرد دەبوون و دەڕژان، من دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخسا کە لە ڕێوڕەسمی ناشتنی زڕبابەکەما بەشداری بکەم، لەوە بە دواوە کچۆڵەکەشم نەبینییەوە.

## (٢٠)

هەموو بەیانیەک، سەعات شەش دەچووم بۆ سەرکارەکەم. لەوێ تووشی کۆمەڵێک خەڵکی باش دەبووم، لەوانە: ئوسیبی تەختەبەست و دارتاش، کە پیاوێکی سەربۆزی زمان تیژ بوو، لە کاری خۆیدا زۆر مەعلان و کارامەبوو، سەروسیمای لە قەشە نیکۆلای دەچوو، یان یفوموشکا کە ئاسنگەرێکی قەموور بوو. یان پیوتەری بەنا، کە پیاوێکی مەندی خواناس بوو، ئەویش لە قەشە دەچوو. یان گریگوری شیشلین، وەستای سپیکاری کە کورێکی قۆزی چاوشینی ڕدێن زەرد بوو، چاکی ومیهرەبانی لە سەراپای دەچۆڕا.

من کە بۆ جاری دووەم بۆلای ئاغام گەڕامەوە، ئەو خەڵکانەم ناسی، ئەمانە هەموو یەک شەمموانێک لە مووبەقەکەدا کۆ دەبوونەوە، خەڵکانێکی سەنگین و سەلار بوون، زمانیان شیرین و بەگفت ولفت بوون، هەریەکەیان خەسڵەتی تایبەتی خۆیان هەبوو، ئەوەندە خەڵکی باش و میهرەبان بوون، لە گەڵ پیاوانی ڕیاگۆ وهیچ وپووچ و مەیگوسارانی ئالوودەی خەڵکی کونافینودا ئاسمان و ڕێسمان بوون.

شیشلین ' گەچکار وسپیکار لە هەموو ئەوانی دیکە پتر سەرنجی ڕاکێشام. ئەمە وایکرد داوای لێبکەم فێری کارەکەی خۆیم بکات، بەڵام زۆر بە لوتفەوە داواکەی ڕەفز کردم. لە کاتێکا پەنجە گەچاویەکەی بە برۆ زەردەکانیا دێنا گوتی:

- تۆ هێشتا منداڵی، کارەکەی ئێمە زۆر قورسە، تۆ دەرەقەتی نایەی، جارێ زووە، یەک دووساڵ چاوەڕوان بکە.

ئەوجا سەرە جوانەکەی لەقاند ودرێژەی دایێ:

- تۆ لە ژیانا ئاسوودە نیت؟ گوێ مەدەیە. پیاو دەبێ بە سەبر و حەوسەڵە بەرەنگاری بەدبەختی ببێتەوە. خۆت ڕابێنە، مرۆڤ لە گەڵ هەموو شتێکا ڕادێت.

نـاڵێم سـوودم لە ئامۆژگـارییەکەی ئەو وەرگـرت، بەڵام هەمیشە بە مەمنوونیەوە یادی دەکەمەوە.

هەمـوو ئەو پیـاوانە، بەیانیـانی یەک شـەممە بۆلای وەسـتام دەهاتن. لە سـەر تەختەکانی دەوری مێزەکەی نـاو مـووبەقەکە دادەنیشـتن، بە دەم چـاوەڕوانکردنی ئاغـاوە، قسـەی خۆشـیان دەکرد. وەستام هەمیشـە بە ڕووخۆشـی و بەگەرمـی پێشـوازی دەکـردن و دەسـتی دەگوشـین، لە گۆشـەی لای ئیکۆنەکـانەوە دادەنیشت. هەنگێ بە ستە ئەسکەناسە ژمێردراوەکانی دەردێنا، پیاوەکـان دەفـتەرە شـڕ ولیسـتەکانی خۆیـان لە سـەر مێـزەکە دەکـردەوەو، حیسـابی هەفتـانەی خۆیـان دەکـرد و وەریـان دەگرت.

وەستا، هەوڵیدەدا بە زمانلووسـی و قسـەی خۆش فریویـان بـدات و ئەوانـیش، لەلای خۆیـانەوە هەوڵیانـدەدا بیخەڵەتێـنن. هەندێجار گەنگەشە و موناقەشەی توونـدیان دەکەوتە بەینەوە، بەڵام هیچ کاتێک درێژەی نەدەکێشا و ئەنجام هەموو دەکەوتنە پێکەنین و بە وەسـتامیان دەگـوت: - بـرادەر، تۆ زۆر غەداری، لە شەیتانیا بەشی کەست نەهێشتووەتەوە.

ئەربـاب (خـاوەن کـار) بە سـووکە بزەیەکـی شـەرمنانەوە دەیگوت:

- ئەدی ئێوە؟ حەوت پەڵتان بە هەنگڵی شەیتاندا داوە. دزی هەر لە خۆتان دێت!

یفوموشکا، ئیعترافی دەکرد: - ئیدی ئەوە بووە بە عـادەت، ئاساییە.

پیوتر، بە ڕاوێژێکی توونـد دەیگوت:

- ئێمە بە دزی دەژیـن، ئەوەی بە حەڵاڵـی پەیـدای دەکەیـن، هەمووی بۆ خوا و بۆ تزارە..

وەستام پێدەکەنێت و دەڵێت:

- بۆیە، حەقی خۆمە شتێک بۆخۆم بپچڕم.

هەموو بەدەمیەوە پێدەکەنن و دەڵێن:

- بڵێ هەقی خۆمە پێستتان بگرووم.

- دەستمان ببڕیت؟

بەڵام گریگـۆری شیشـلین، بەهەر دوودەسـتی ڕدێـنەکەی بەسینگییەوە دەچەسپێنێ و بەدەنگێکی نەرم و لیریکی دەڵێت:

- هاوڕێیان، با مەردانە و بێ هیچ غەل وغەشێک کاری خۆ بکەین! مرۆڤ کە پاک و بێ شێلە و بێلە بێ، زۆر ئاسوودە و خۆشحاڵ دەبێ.

لە داخـا ڕونـدک لە چـاوە شـینەکانیا قەتـیس دەمێنێـت، لەو کاتـانەدا ڕوخسـاری جـوانتر دەنوێنێـت. هەمـووان سـڵ لە پێشـنیازەکەی دەکەنەوە و بە پەسـتیەوە ڕووی لێـوەردەگێڕن. ئوسـیپ، ئـاهێکی بە کەسـەرەوە هەڵدەکێشـێت و وەک بڵێـی بەزەیی بە هاوڕێکانیا بێتەوە دەڵێت:

- کرێکاران ناتوانن فێڵی زۆر لە خەڵکی بکەن.

بەنا، ڕەشەکە، بەسەر مێزەکەدا دادەنەوێتەوە و بەتووندی دەڵێت:- خەتا و غەش وەکو زەلکاوە – تا زیـاتر بچیتە نـاوی، پتر ڕۆدەچیت و تیایدا نقوم دەبێت.

وەستام بەهەمان ڕاوێژی وان وەڵام دەداتەوە:

- منیش دەنگم دەخەمە پاڵ دەنگی ئەنگۆ!

ئەوسـا، تـا مـاوەیەک بە هەمـان گەرم وگـوڕی درێـژە بە گفتوگۆ و فەلسەفە ڕێسییەکانی خۆ دەدەن. ئەوسا دەگەڕانەوە

سەر دزی و دەستبڕیەکانی خۆیان. کە حیساب و کیتابیان تەواو دەبوو، ماندوویەتی زۆری بۆ دێنان و ئازایان لە ئارەقەدا هەڵدەکشا، دەچوون بۆ کافەکە تا چاتەک وەخۆن، وەستاکەی منیشیان دەعوەت دەکرد.

ئەرکی من لە کامپەکەدا ئەمە بوو کە ئاگادار بم کرێکارەکان بزمار و چەکوش و کەرپووچ (خشتی سوور) یان لەوح و تەختە نەدزن، ئەمانە سەرێکیان هەبوو و هەزار سەودا، جگە لەوکارەی لەلای وەستام دەیانکرد، لە شوێنانی دیکەش ئیشیان بە قونتەرات دەگرت و، هەوڵیان دەدا ژێراوژێر ئەو شتانە لە وەستام بدزن، کە لە کارەکانی خۆیاندا بەکەڵکیان دەهات.

ئەم کرێکارانە زۆر دۆستانە و بەگەرمی پێشوازی منیان دەکرد. ڕۆژێک شیشلین گوتی:

- بیرت دێت دەتویست لەلای من کرێکاری بکەیت؟ تەمەشا بزانە چۆن تەرەقیت کردووە، هەنووکە بوویت بە بەرپرسی ئێمە.

ئوسیپ بە سوعبەتەوە دەیگوت:

- دەی زۆرچاکە، جاسووسیمان بەسەرەوە بکە، وریابە، خودا دەست بەباڵتەوە بگرێت.

پیوتر، بە نارەزاییەوە پرتاندی:

- ئەمە وەکو ئەوەیە پشیلەیەکی بچووک بنێرن تا چاودێری مشکێکی گەورە بکات، ئاخر بۆ؟

من ئەم کارەم زۆر لەبەر گران بوو، شەرمم لەو پیاوانە دەکرد، پێم شەرم بوو چاودێریان بکەم. لە کاتێکا ئەرکی من ئەوەبوو وەکو دز و دەسبڕ تەمەشایان بکەم. هەوەڵین ڕۆژەکانی سەرەتا بۆ من زۆر سەخت بوو. نەمدەزانی دەبێ چ

بکەم، چ بڵێم و چ هەڵوێستێکم هەبێت. ئوسیپ هەستی بەمە کرد و ڕایکێشامە پەنایەکەوە وگوتی:

- گوێ بگرە کوڕی خۆم، زۆر خۆت سەغڵەت مەکە، دادت نادات. لێم حاڵی بووی؟

هەڵبەتە هیچ حاڵی نەبووم، وەکو ئەوەبوو گوێزم بۆ بژمێرێت بەڵام هەستم کرد ئەم پیرە پیاوە پەی بە هەستیاری ودژواری کارەکەم دەکات. ئیدی زۆر زوو متمانەمان لە نێواندا چێبوو، و تەنانەت هەندێ نهێنیشی لەلا درکاندم.

جارێک دوور لە چاوی ئەوانی دی، شتێکی بە گوێدا دام:

- ئەگەر دەتەوێ گەورەترین دزی ناو ئێمە بناسیت، وەرە لە من بپرسە، پیوتەری بەنایە. ئەمە دزێکی لە زەبر و سەرگەڤاری خێزانێکی گەورەیە، ڕەشە خێزانێکی بەملەوەیە. چاوی لێ غافڵ مەکە. هەموو شتێکی پێویستە، ئیدی چ شتی گەورە و چ شتی بچووک بێ، لە چنگێ بزمارەوە بیگرە تا دەگاتە کەرپووچ یان کیسەیەک گەچ و بۆرەک – هەموو شتێکی پێ لازمە! لەگەڵ ئەمەشا پیاوێکی باشە، بە دینە، لە خوا ترسە، بە هەڵوێستە، خوێنەواریشی هەیە، بەڵام سەری لە دزیان دەخورێ. یفوموشکا، کوشتەی ژنە، بۆ ژن دەژی. پیاوێکی هێمن و هێدی و بێوەیە زیانی بۆ کەس نییە، وەکو هەموو قەمووران زیرەکە. بەڵام گریگوری شیشلین، پیاوێکی گێل و گێژە، تەماحی لە دزینی دەرزییەک نییە، چاوی لە ماڵی کەس نییە، تەنانەت هەقەکەی خۆشی دەبەخشێتەوە، منداڵێک دەتوانێ هەڵی بخەڵەتێنێ، بەڵام ئەو کەسی پێ ناخەڵەتێ! ئیدی بەبێ بیرکردنەوە دەژی..

من پرسیم: - باشە پیاوێکی میرەبانە؟

ئوسیپ، لە دوورەوە تەمەشایەکی کردم و گوتی:

- بەڵێ میرەبانە، هیچ شتێک بۆ پیاوی تەمەڵ و تەوەزەل لە میرەبانی ئاسانتر نییە. میرەبانی پێویستی بە ئەقڵ و ئاوەز نییە.

لە ئوسیپم پرسی: - ئەدی تۆ؟ تۆ چۆنیت؟

ئوسیپ، سووکە بزەیەکی کرد و بەرسڤی دایەوە:

- من وەکو کچۆڵانی ناو حیکایەتانم. کەی بووم بە نەنک باسی خۆمت بۆ دەکەم، دەبێ تا ئەو کاتە چاوەڕوان بکەیت، یان هەوڵبدە بە خۆت بمناسە و بزانە کێم.

ئیدی هەموو بۆچوونێکی دەربارەی خۆی وهاوڕێکانی شێواند. بەهیچ جۆرێ گومانم لە حەقیقەتی قسەکانی نەبوو. بەچاوی خۆم ئەوەم دەبینی کە یفوموشکا، پیوتر و، گریگۆری ئەم پیرەمێردە جوانەیان لە خۆیان بە زیرەکتر وپڕ ئەزموونتر دەزانی، بۆیە لە هەموو شتێکا شیرەتیان پێدەکرد، بە بایەخەوە گوێیان لێدەگرت، زۆر ڕێز وحورمەتیان دەگرت.

لێی دەپاڕانەوەو دەیانگوت: - پیاوی چا بە، ئامۆژگاریمان بکە، ڕێگەمان پێ نیشانبدە.

دوای ئەم هەموو پاڕانەوە و لالانەوەیە و پاش ئەوەی ئوسیپ ڕۆیی، گوێم لە یارۆی بەنا بوو، بە چپە گریگۆری دەدواند و دەیگوت: - کابرایەکی بیدعەتچی و هەرتەقەبازە.

گریگۆری بە تەوسەوە گوتی: - لێبۆکە!

یارۆی گەچکار، وەکو دۆستێک ئاگاداری کردمەوە:

- ئاگاداری ئەو پیرەمێرە بە ماکسیمیچ، دەبێ ئاگاداربی ها. ئاگات لەخۆ نەبێ، لەچاو تروکانێکا لە سەر پەنجە تووتەی هەڵت دەسووڕێنێت! ئەو خەڵکانەی لە بۆتەی کارا قاڵ دەبنەوە، مەگەر هەرخوا بزانێ، چۆن لنگە وقووچ پیاو هەڵدەواسن!

بەجارێ سەرم لێشێوا، سەر وخواری ئەو شتەم بۆ جیا نەدەکرایەوە کە ئەوان دەیانگوت.

من پێموابوو، بەنایەکە لە هەر هەموویان ماقوولترە، باسی هەر شتێکی کردبا، بە کورتی وبە بەڵگەوە باسی دەکرد، باسەکانی بە زۆری دەربارەی خودا و دۆزەخ و مردن بوون. دەیگوت:

- براینۆ، مرۆڤ هەرچی بکا و بکۆشێت، هەر خۆزیەک بخوازێت، ئاقیبەت و چارەنووسی هەر مردن و گۆڕە!

سک یەشەیەکی بەردەوامی لە گەڵدا بوو، جاری وا هەبوو بە ڕۆژ دەمی بە زەوادەوە نەدەدا، پارووە نانێک حاڵی بێ حاڵ دەکرد، دەڕشایەوە.

" یفوموشکا " شم بە لاوە کەسێکی نەفس بەرز و میهرەبان بوو، ئەگەرچی بڕێک کومیدی بوو. هەندێجار ئەوەندە ساویلکە بوو، گەمژە وگێل دەهاتە بەرچاو، هەر ژنێکی دیبا حەزی لێدەکرد و بە هەمان دەستەواژە باسی هەرهەموویانی دەکرد:

- باوەڕ بکە، شتێکی سەیرە، ئافرەت نییە، بەڵکو گوڵێکە بەسەر قاپێک کەرەوە.

خۆ ئەگەر کیژانی کونافینو بهاتبان بۆ سڕین وشۆردنی زەمینەی دووکانە تازەکان، یفوموشکا، یەکسەر لە سەر تەختە بەستەکانەوە دەهاتە خوارێ ولە سووچێکا دەوەستا و خەیاڵ دەیبردەوە و، چاوەکانی بچووک دەکردنەوەو دەمی تا بناگوێ دادەچەقاندو لە بن لێوانەوە دەکەوتە ورتەورت:

- بزانە ئەمرۆکە خوای گەورە چ پارچەیەکی پێ مەرحەمەت فەرمووم، چ خۆشییەکی بۆ نازڵ کردووم! تەمەشا چ گوڵێکە! گوڵێکە بەسەر قاپێک کەرەوە. نازانم بە چ زمانێک سوپاسی خوای بەرز وبالا بکەم کە ئەم دیارییە جوانەی بۆ

ناردووم؟ ئەم جوانییە دڵم ئاوا و ئاوەدان دەکاتەوە، ئەفسوونم دەکات.

ئافرەتەکان، لە سەرەتاوە گاڵتەیان پێدەکرد و دەیانگوت:

– تەمەشـا ئەم کـابرا قەمـوورە! چ قەشـمەڕێکە! خەریـکە دەتوێتەوە.

ئەم وەستای تەختەبەستە گوێی لەو تانە وتوانجانە نەبوو. خۆی لە گێلی دەدا، قسەکانی لە قسەی کەسێک دەچوو بەدەم خەوەوە قسـە بکـات و دیـاربوو ژنەکـان بە ڕواڵەت زۆریـان کەیف بە قسە خۆشەکانی دەهات. ئەنجام یەکێکیان کە لەوانی دیکە گەورەتر بوو، دەیگوت: – تەمەشـاکەن، ئەم پیرەمێردە چ قسـانێک دەکـات، گەنجـیش قسـەی وای بـۆ نـایەت، ئەگەر وابـڕوات گەنـج دەبێـتەوە. ئەوانـی دی وەڵامیـان دەدایەوە: – وەکو بولبول دەخوێنێت.

ئافرەتە گەورەکە بەڕاوێژێکی گڕ دەیگوت: – نا، لە گەدای بەردەرکی کڵێسایان دەچێت.

بەڵام یفوموشکا، هەرگیـز لە دەرۆزەکەر نەدەچـوو. وەکـو درەختێکی بە تەمەنی ئەستوور، لە جێی خۆی ڕەق ڕادەوەستا و بە دەنگە خۆشەکەی، وشە و پەیڤی جوان و جادوو ئامێزی بەگوێدا دەدان وژنەکانیش بە بێدەنگی گوێیان لێدەگرت. لە تۆ وایە خەریکە بە دەم ئەو گوتە ئەفسووناویانەوە دەتوێتەوە.

ئیدی ئەم چیرۆکە هەمیشـە بە یەک شێوە کۆتـایی دەهـات، کە لەکـار دەبـووەوە یـان بـۆ شـێوخواردن دەهـاتەوە، سـەرە گەورە و بـژەکەی دەلەقانـد و بە هاوڕێکـانی دەگـوت: – گەلـۆ، ئەم ژنانە چەند خۆشن، چەند شیرینن! لە هەموو ژیانما ئەمە یەکەمجارە تووشی ژنی وابیم، کە خۆشبوو!

یفوموشکا بە بێ هیچ خۆڕانانێک یان سووکایەتی کرنێک بەو ژنەی خۆی ڕادەست دەکرد، سـەربهوردی ڕاوەژنـی خۆی

دەگێڕایەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە چاوە قاوەییەکانی دەگەشانەوەو منەتباری و سوپاسگوزاریان لێدەباری.

ئوسیپ، بە دەم سەرلەقاندنەوە دەهاتە قسان و دەیگوت:

- کە پیاوێکی داوێن پیسی! تەمەنت چەندە؟

- چل و چوارساڵم! بەڵام ئەمڕۆ پێنج ساڵ گەنج بوومەتەوە. ئەمڕۆ دوو چەلان خۆم لە ئاوی حەیات هەڵکێشاوە، دڵم زۆرخۆشە، کە ژنی جوان لەم دنیایەدا هەن! جوانییان لە تەسەور بە دەرە!

بەنایەکە بەجدی گوتی: - با بگەیتە پەنجا ساڵی ئەوسا خۆت دەبینیتەوە، بزانە چۆن باجی ئەم داوێن پیسییەی خۆت دەدەیت! هەنگی کاڵەک بە ئەژنۆ دەشکێنی.

گریگوری شیشلین، لە گۆشەیەکەوە ئاهێکی هەڵکێشا وگوتی:

- یفوموشکا، بەڕاستی تۆ پیاوێکی بێ شەرمی.

هەستم کرد ئەم گەنجە قۆزە بەغیلی بە یارۆی قەموور دەبات، کە لە ڕاوە ژناندا سەرکەوتوو بوو.

ئوسیپ، بڕۆ زیوینە لوولەکانی وێک هێنانەوەو تەمەشایەکی هەمووانی کرد و بە ڕاوێژێکی خۆش گوتی:

- هەموو ئەو ئافرەتانەی تۆ باسیان دەکەی بەرماوەی جووتیارە گوندییەکانن، جووتیارەکان تەفرەیان داون – هەندێکیان بە شیرینی و هەندێکی تریان بە مرواری و مت وموووران. ئەو ئافرەتانەی تۆ باسیان دەکەی خەریکە دەبن بە نەنک.

شیشلین، ژنی هێنابوو، بەڵام ژنەکەی لە گوندی دانابوو، زۆری نەبرد ئەویش کەوتە چاوبڕکێ دەگەڵ ئەو ئافرەتانەی کە فەڕاشییان دەکرد، ئەرزەکەیان دەشت و دەسڕی. ئەم ژنانە شتاقیان سڵیان نەدەکرد، دەستەمۆ بوون، هەرهەموویان لە

پێناوی تۆزێک پارەدا (ئیزافەکاریان) دەکرد. ئەم کارە لەم گەڕەکە هەژار نشینەدا ئاسایی بوو، وەکو هەر کارێکی دیکە تەمەشا دەکرا. کەچی ئەم جووتیارە (شیشلین) جوان و گەنج و قۆزە دەستی بۆ ژنان نەدەبرد، بەڵکو لە دوورەوە تەمەشای دەکردن و جۆرە سۆز وبەزەییەک لە نیگایدا بەدی دەکرا، هیچ دیار نەبوو کە بەزەیی بە خۆیدا دەهاتەوە یان بە ئافرەتەکانەوە. ئەگەر ژنەکان چاوبڕکێیەکیان لە گەڵیدا بکردایە، ئەوا دەپەشۆکا، بە دەم پێکەنینێکی شەرمنانەوە، لەو ناوە دوور دەکەوتەوە.

یفوموشکا، سەرکۆنەی دەکرد:

- بە ڕاستی پیاوێکی بێ مانای، کەس هەیە ئەم هەلە لە کیسی خۆی بدات؟

گریگوری شیشلین، بیری دەخستەوە: - من پیاوێکی ژندارم!

- خۆ ژنەکەت ئاگای لەم کارە نییە کە تۆ دەیکەیت.

- ژن هەستیارە، هەست بە خیانەتی مێردەکەی دەکات، مەحاڵە کەس بتوانێ لەم ڕووەوە ژن بخاپێنێ، ئەوە تۆ چ دەڵێیت برا!

- ئاخر چۆن هەست دەکات؟ خۆ ڕاداری پێ نییە.

- ئەمەیان نازانم. بەڵام هەر ژنێک بە خۆی داوێنپاک بێ، هەرکاتێ پیاوەکەی ناپاکی لێبکات، بە هەست دەزانێ، بە پێچەوانەشەوە هەرپیاوێک داوێنپاک بێ، کە ژنەکەی ناپاکی لەگەڵ بکات، بە هەست دەزانێت..

یفوموشکا هاواریکرد: - چۆن؟

گریگوری شیشلین، بە ئارامی بەرسڤی دایەوە: - ئەمەیان نازانم.

یارۆی تەختەبەست، بە تووڕەیی دەستی هەڵتەکاند وگوتی:
- تەمەشای ئەمە بکەن! نایزانی، بەڵام هەست دەکات، سڵاو لە ئەقڵت!

***

کرێکارەکانی شیشلین کە حەوت کرێکار بوون، زۆر لە وەستاکەیان ڕازی بوون، لە هاوڕێیان دەچوو نەک لە وەستایان. بەڵام لە پاشملە ناویان نابوو گوێرەکە. ئەگەر بهاتبا بەسەرا وبیدیبان کە کار ناکەن و خاوەخاو دەکەن، دەستی دەدایە ماڵنجێک (ماڵە) و بلەز دەکەوتە کارکردن و بە ڕاوێژێکی دۆستانە دەیگوت: - دەی کوڕینە، بتانڕەژم!

ڕۆژێک لە سەر داوای وەستام، چووم بۆ لای گریگوری و پێمگوت:
- ئەم کرێکارانەی تۆ کرێکاری باش نین.

ئەوسا وەکو یەکێک قەت بە تەمای ئەو قسەیە نەبووبێ، گوتی: - بە ڕاست؟
- ئەم کارە دەبوایە دوێنێ نیوەڕۆ تەواو ببێت، کەچی وادیارە ئەمڕۆش تەواو نابێت.

بە بێ زویربوون گوتی: - ڕاست دەکەی، ئەمڕۆش تەواوی ناکەن.

دوای بێدەنگییەکی کەم، بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:
- من هەموو شتێک دەبینم، ڕاستە خاوەخاو دەکەن، بەڵام شەرم دەکەم زۆریان لێبکەم – هەموویان ناسیاون، خەڵکی هەمان گوندەکەی جارانی خۆمن. خوای گەورە فەرموویەتی کە پیاو دەبێ بە ئارەقەی نێوچەوانی نانی خۆی پەیدا بکات. ئەمە هەمووومان دەگرێتەوە، وانییە؟ بەمن و تۆشەوە؟ بەڵام تۆ ومن لەوان کەمتر کار دەکەین، لەوان کەمتر ماندوو دەبین. بۆیە شەرم دەکەم بە تۆبزی بیانگرمە ژێر کار.

ئەم پیاوە دەبیرەوە دەچوو، هەندێجار بە شەقامێکی چۆڵی کامپەکەدا دەڕۆیی تا دەگەییە سەر پردێکی سەر کەناڵی ئوبفودنوی، لەویَ دەوەستا، خۆی بەسەر موحەجەرەکەدا دەدا، تەمەشای ئاوەکەی دەکرد، یان سەیری ئاسمانی دەکرد، یان دەشت و دەرە بەرینەکەی ئەودیوی ڕوباری ئوکای بە نیگا دادەبێژت. خۆ ئەگەر یەکێک چووبا بەسەریا و لێپرسیبا: " چ دەکەی لێرە؟ " ڕادەچڵەکی وبزەیەکی شپرزە دەکەوتە سەرلێوی و دەیگوت: " هیچ، ویستم بایەکی باڵی خۆ بدەم و تەمەشایەکی دنیا بکەم ".

زۆر جار دەهاتە قسان ودەیگوت: " خوای گەورە هەموو شتێکی بە جوانی دروستکردووە: ئاسمان، زەوی، ڕوبار، کەشتی و بەلەم. دەتوانی سواری بەلەمێک ببیت و بە کەیفی خۆت، کوێت پێخۆشە بۆ ئەوێندەر بڕۆیت — بۆ ڕیازان یان ڕیبینسک، بۆ پرم یان ئەستراخان. جارێکیان چوومە ڕیازان — شارێکی ناخۆش نییە، بەڵام چۆڵە، لە نیژنی نوڤگورود چۆڵترە. نیژنی شوێنێکی دڵگیرە. ئەستراخان خەمناکە. ئەستراخان لە کالمیکیاندا جمەی دێت، من ڕقم لەو خەڵکانەیە. ڕقم لە موردوفی و کالمیکی و فارس و ئەڵمانیان و هەموو ئەوانە دەبێتەوە، کە بیانی ڕەچەڵەکن. "

بە کاوەخۆ قسەی دەکرد، لە کەسێکی هەڤڕەئی خۆی دەگەڕا.

بیوتەری بەنا، بۆی سەندەوە: - ئەوانە بیانی ڕەچەڵەک نین، بەڵکو غەوارە وبێگانەن.

پیوتر، بە ڕاوێژێکی توند تەکەزی کردەوە:

- لە دەرێ لە دایک بوون، باوەڕیان بە مەسیح نییە، بەبێ مەسیح دەژین.

گریگوری، ڕووی گەشایەوە:

- چی دەڵێی بۆخۆت بیڵێ برادەر، من ڕووس نەژادانم خۆشدەوێن. ڕقم لە جوولەکەشە، لەوەتای هەم بیر لەوە دەکەمەوە کە خوای گەورە بۆچی بیانیانی دروستکردووە، تێناگەم. دەبێ حیکمەتی لەوە قووڵتری تیابێت کە من تێی بگەم..

یارۆی بەنا بە پەستیەوە گوتی:

- ڕەنگە حیکمەتێکی قووڵی تیابێ، بەڵام زۆرشت لەم دنیایەدا هەیە کە دەتوانین بەبێ ئەو حیکمەتەش ئەنجامی بدەین وبیکەین.

ئوسیپ، پاش ئەوەی گوێ لەو قسەوباسانە دەگرێت، ئەویش بە تەوسەوە و بەڕاوێژێکی توند دەڵێت: - بەڵێ، زۆر شت هەیە دەتوانین بەبێ ئەو حیکمەتەس بیکەین، بۆنموونە شتی وەکو ئەو قسانەی تۆ. بە ڕاستی ئەوەی بۆ تۆ پێویستە شەلاخکارییە!

ئوسیپ، زۆرجار خۆی ساغ ناکاتەوە، نازانێ بەلای کێدا دایدەکێشێ. هەندێجار وات دێت بە خەیاڵا، تای هەموو لایەک و هەموو شتێک دەگرێ، کەچی برێک جار وا دێتە بەرچاو لە هەموو شتێک بێزارە و هەموو کەسێک بە کەر دەزانێت.

ئاوڕی لای پیوتر وگریگوری و یفوموشکا دەداتەوە ودەڵێت: - ئێ، بەراز باوکینە، ئێوە!

ئیدی، هەموو بە نەبەدڵی بەدەمیەوە پێدەکەنن.

وەستام ڕۆژانە پێنج کۆپیکی بۆ نانخواردن دەدامێ، ئەمە پارەیەکی کەم بوو، بەشی نەدەکردم، ناچار زۆربەی کات بە برسێتی دەمامەوە. کرێکاران بەمەیان دەزانی، ئیدی بۆ فراڤین و شێڤ دەعوەتیان دەکردم. قونتەراتچیەکانیان هەندێجار بۆ

چا خواردنەوە، لە گەڵ خۆدا بۆ کافەکەیان دەبردم. منیش بێ هیچ شەرم و دوو دڵییەک دەعوەتەکەیانم قەبووڵ دەکرد. منیش کۆڕ و مەجلیسیانم پێخۆشبوو. گوێم لە گفتوگۆ ئارام و چیرۆکە سەیرەکانیان دەگرت. شارەزایی منیان لەمەڕ کتێبانی ئاینی، زۆر پێخۆش بوو. ئوسیپ چاوە شینەکانی بەجۆری تێدەبڕیم کە لە مەبەستی حاڵی نەدەبووم، دەیگوت: - ورگت پڕ بووە لە کتێبان، ئینتەلات کردووە.

ئەوسا لە سەری دەڕۆیی:

- ئەم زانیاریانە لە بیر نەکەی ها، جوان ئەزبەریان بکە، ڕەنگە ڕۆژێ بێت بە کەڵکت بێن. کە گەورە بیت دەتوانی ببیت بە قەشە و، بە وەعزە ناسکەکانت، ئازاری خەڵک سووک بکەیت.. یان دەتوانی ببیت بە مشبر "مەبەستی مبشرە کە دەکاتە مژدەبەر"..

یارۆی بەنا، بە ڕاوێژێکی کز بۆی ڕاستدەکاتەوە:

- مبشر (مژدەبەر: قەشە یان ڕەبەنە، دەنێردرێ بۆ دەڤەرانی دوورە دەست، یان شار وباژێرۆکان تا ڕێنماییەکانی حەزرەتی مەسیح لە ناو خەڵکیدا بڵاوبکاتەوە)

ئوسیپ دەپرسێت: - چی؟

- بەوانە دەگوترێ مبشر، خۆ کەڕ نیت.

- باشە.. مبشر.. بۆ دژایەتی بیدعەتچیەکان. ڕەنگە بتوانی بچیتە ڕیزی هەرتوقی و بیدعەتچیەکانیشەوە – ئەمەش بۆ خۆی کاسبیەکە و دەستکەوتیشی بۆ خاوەنەکەی تیا دەبێت. خۆ ئەگەر کەسێک زیرەک بێ و ئاوەزی خۆی بەکار بێنێ دەکارێت لەو ڕێگەیەوە نانێکی باش دەربێنێ.

گریگۆری گاڵتەی پێدێت. پیوتر، لە نێو ڕدێنە درێژەکەیەوە دەپرتێنێ:

- ئەدی جادووگەرەکانــــت بەلاوە چــــۆنن؟ ئەدی ئەوان دەسکەوتی باشیان نییە؟ هەموو خەڵکانی بێ دین شانسیان هەیە.

بەڵام ئوسیپ، خێرا قسەکەی پێدەبڕێت:

- جــادووگەران زانــا نــین- پێویســتیان بە خــوێنەواری و کتێبان نییە.

ئەوجا ئاوڕی لای من دەداتەوە:

- گوێ بگرە بـرادەر، لە گوندەکەی مەدا کوڕێکی زگـورت هەبوو، نـاوی توچینکوف بـوو، تـا حەزکەی گێژ و گێل بـوو، گەمشـۆیەک بـوو لەو گـۆڕەی، تەنیـا بـاڵ و بـێکەس بـوو، لە هەرحەوت ئاسمانا تاقە ئەستێرەیەکی نەبوو، وەکو پووشەکەی بەربا وابوو – دەمێ لێرە بوو گاڤێ لەوێ بوو، نە کابرایەکی تەمەڵ بوو نە ئیشکەر و کاری. بە کورتییەکەی بە کەڵکی هیچ نەدەهات. ئیدی ژیان تەواو تەنگی پێ هەڵچنی، نەیدەزانی چـی بکـات، کاتێکمـان زانـی گوتیـان چـووە بـۆ حەج. دوو ســاڵێک گـۆڕی گـوم بـوو. پاشــان لە ناکـاوا پەیـدا بـووەوە. ڕەنـگ وڕوویەکـی وەبەر هـاتبووەوە- قـژی بەردابـووەوەو بەشـان و ملیـا داڕژا بـوو، کڵاوێکــی بەلا تــیلاکەی ســەریەوە نــابوو، چاکەتێکی کەتانی لەبەر بوو. لە بەیانیەوە تـا ئێواری بە گوێیدا دەخوێنـدین : " خـوا نەناسـینە، بەراز بـاوکینە تـۆبە بـکەن! " خەڵکی لە هەوەڵەوە گوێیـان پێنەدەدا، بەڵام ژنـان کە هەمیشـە جۆرە واز وازییەکیـان لە دڵ و دەروونـدایە، بەجـارێ ڕوویـان تێکـرد، ئیـدی بەرەبەرە بەختــی کـرایەوە. توچینکـوف، دوای مـاوەیەک ڕەنـگ وڕوویەکـی هەڵێنـا، نـان وئاوێـک هەبـوو پێـی بژی، سەبارەت بە ژنانیش، ئەوە هەر مەپرسە..

یارۆی بەنا بە نیمچە تووڕەییەکەوە هەڵیدایێ: - نان وئاو هەموو شتێک نییە!

- ئەدی بە قەناعەتی تۆ چی، چییە؟

- کار، قسە وپەیڤان، تێگەیشتن و ویژدان.. شتە!

- ئەمانە قسەی ڕووتن، من لە قسە و ویژدان و ئەم شتانە بێزار بووم، قسەی دنیام لە لایە، چی لە قسەی ڕووت بکەم. هەزاری پولێکی قەڵب ناهێنێ.

پیوتر بە ڕاوێژێکی گڕەوە ئەوەی گوت.

گریگۆری بە بێدەنگی هەردوو چاوی داخست و بەدەم تەمەشاکردنی پەرداخەیەکەوە گوتی:

- ئێمە ئەم توچینکوفە دەناسین. بە خۆی نێوی دیمتری و بابی فاسیلی ناوە.

ئوسیپ، بۆ ئەوەی کۆتایی بە گەنگەشەکە بێنێ گوتی:

- حەزم لە گەنگەشە و موناقەشە نییە. هەر ویستم ئەو ڕێگایانە بە ماکسیمیچ نیشانبدەم کە دەتوانێ لە میانیانەوە بژێوی خۆی پەیدا بکات..

- هەندێ لەو ڕێگانە دەچنەوە بۆ زندان..

ئوسیپ، سەری ڕەزامەندی لەقاند وگوتی:

- زۆربەیان دەچنەوە بۆ زندان. زۆر کەمیان دەچنەوە سەر خواناسی. دەبێ بزانیت بە کامیانا دەڕۆیت..

هەمیشە گاڵتەی بە خەڵکانی پاکی وەک سپیکارەکە و بەنایەکە دەکرد، پێدەچوو ڕقیشی لێیان بێت، بەڵام ئەو هەستەی دەرنەدەبڕی. بە شێوەیەکی گشتی، زۆر زەحمەت بوو هەڵوێستی لە مەڕ خەڵکی بێتە زانین.

دەرهەق بە یفوموشکا، بە لوتف ومیرەبان بوو. تەختەبەستەکە بەشداری ئەو گەنگەشانەی نەدەکرد کە

دەربـــارەی خـــوا و، دادپەروەری، مەزەب و ئـــولان و، خەمە بەشەرییەکان دەکران کە باس وگەنگەشەی ئەو بابەتانە لە لای هاورێکانی خۆشبوو.

یفوموشــکا کورســییەکەی لە ســەر لا دادەنــا بــۆ ئەوەی قەمووریەکەی پشتی بەرپشتی کورسییەکە نەکەوێت. چایەکەی قوم قوم دەخواردەوە. لە ناکاوا گورج دەبووەوە، چاوی بە ناو ژووره پـــــڕ دووکەڵەکەدا دەگێـــــڕا. لە میـــــانی ژاوەژاوی دەنگەکانەوە گوێی هەڵدەخست، ئەوسا هەڵدەستایە سـەرپێیان ولە ژوورەکە وەدەردەکەوت. ئەوە نیشـــانەی ئەوە بـــوو کە یەکێک لەخاوەن قەرزەکانی، خاوەن قەرزی زۆر بوون، لە دە کەس زۆرتـر بـوون، خـۆی کـردووە بە کـافە و بـاڕەکەدا. بەو حیسابەی هەندێک لە خاوەن قەرزەکان بە نیازبوون، بە شەق قەرزەکانیـان وەربگـرنەوە، ئیـدی ئەم وەسـتای تەختەبەسـتە هەمیشە حازر و ئامادە و لە سەر پێیان بوو.

– ئەمــانە زۆر ســەیرن، بە ڕاســتی خــراپ تــاقیبم دەکەن، مایەی پێکەنینە. خۆ بەڕاستی حەزم دەکرد ئەگەر هەمبوایە، بێ قرە وبرە قەرزەکانیان بدەمەوە.

ئوســیپ، کە ئەو دەڕۆیــی دەیبۆڵانــد: – تفــو لەو پشـــتە قەموورەت!

یفوموشــکا، هەنـدێجار دادەنیشــت و لە فکـران ڕادەچـوو، هیچی نەدەبینی، گوێی لە هیچ نەدەبوو، نێو چاوانی تێکدەنا، ڕوخســـارە ڕەق وتەقەکەی دادەهێـــزرا، چـــاوە جوانەکـــانی دەکرانەوە. زۆرجار لێیان دەپرسی: – بیر لە چی دەکەیتەوە برادەر؟

– بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەگەر دارا بوایەم، ژنێکی ژنـانەم دەهێنا، ژنێکی خانەدان، بۆ نموونە کیژی کابرایەکی کۆلۆنێل.

هەنگێ بزانە چەندم خۆشدەویست! براینە جارێک، لە گوندیدا ساپیتەیەکی تازەم بۆ خانووی کابرایەکی کۆلۆنێل دروستکرد..

پیوتر، دەیویست بیهاڕوژێنێت: - کیژێکی بێوەژنی هەبوو. ئەم چیرۆکە کۆنە، بیستوومانە!

بەڵام یفوموشکا، خۆی شلوێ نەکرد، بە ئارامی درێژەی بەقسەکەی خۆی دا، بە هەردوو دەستان، ئەژنۆکانی دەشێلان وبەخۆی و پشتە قەموورەکەیەوە، خۆی بۆ پاش و پێش ڕادەژەند:

- ئەم کیژە دەهاتە ناو باخچەکە، زۆر سپی و جوانکیلە بوو، لە ساپیتەکەوە تەمەشام دەکرد و لە دڵی خۆدا دەمگوت: شەڕ لەگەڵ هەتاودا دەکات، دنیا بەوەوە جوانە، بەبێ ئەو ناکاتە هیچ! خۆزگە باڵم دەبوو، لە شەقەی باڵم دەدا و وەکو کۆترێک لەبەرپێی ئەودا دەنیشتمەوە! چرۆ بوو، چرۆیەکی کەسک لە سەر قاپێک کەرە! هاوڕێیان، هەرکەسێک تاقە شەوێک لە گەڵ خانمێکی وەهادا بژی، ئیدی بەو بێ هەر شەو بێ ورۆژ نەبێتەوە.

پیوتر بە توندی پرسی: - ئەدی نان چۆن پەیدا دەکەی؟

ئەو قسەیە بە هیچ جۆرێ کاری لە یفوموشکا نەکرد. گوتی:

- خودایا! نانی چی و پەیداکردنی چی؟ بە خۆی دەوڵەمەند بوو!

ئوسیپ پێکەنی: - ئەرێ یفوموشکا، تۆ کەنگێ واز لە ژن وباسی ژن دێنیت؟

یفوموشکا، تەنیا باسی ژنی دەکرد. لە کارکردنیشا کابرایەکی جدی نەبوو. هەندێجار بەپەلە و بەباشی کاری دەکرد. هەندێجاری دی خاو دەبووەوەو زۆر بە تەمەڵی چەکوشە دارینەکەی بەکار دەبرد و تەختە و دارەکانی بە

جوانی نەدەدایە دەم یەکەوە. هەمیشە بۆنی زەیتی نەهەنگی لێدەهات، بە خۆیشی بۆنێکی تایبەتی هەبوو، بۆنێکی خۆش، لەبۆنی قەدی درەختی تازە بڕاو دەچوو.

قسەکردن دەگەڵ تەختەبەستەکەدا، سەبارەت بە هەر بابەتێک مایەی سەرنج بوو، زۆر خۆش نەبوو، بەڵام مایەی سەرنج بوو. وشەکانی هەمیشە شپرزە وشێواو بوون، زۆر زەحمەت بوو بزانی کابرا سوعبەت دەکات یان بە جدیەتی.

باسی دڵخوازی گریگوری شیشلین، باسی خوا بوو، کە زۆری خۆشدەویست و لەکانگای دڵەوە باوەڕی پێی بوو.

جارێک پێموت: - گریگۆری، دەزانی خەڵکانێک هەن باوەڕیان بە خوا نییە؟

سووکە پێکەنینێکی بۆکرد: - چۆن؟

- دەڵێن خوا نییە.

- ئا، بەڵێ، دەزانم.

وەکو یەکێک شتێکی نادیار لە خۆی دوور بخاتەوە، بەدەم دەست جووڵاندنەوە لە سەری ڕۆیی:

- شا داود گوتوویەتی: " خەڵکی گەوج لە دڵی خۆیدا دەڵێت خوا نییە "؟ تۆ تەمەشا بکە بزانە چۆن دنیاداری ئەو گەوجانەی لە ناو بردووە. مرۆڤ، بەبێ خوا هەڵناکات، ناژی.

ئوسیپ، وەکو ئەوەی هاوڕەئی ئەوبێ گوتی:

- تۆ وەرە پیوتر لە ئیمان بە خوا، داماڵە – بزانە چۆن بە گژتا دێتەوەو ئەگەر دەسەڵاتی هەبێ دارکاریت دەکات!

شیشلین، ڕووی گرژ دەبوو، قامکە گەچاویەکانی بە ڕدێنی خۆیدا دێنا و، بەڕاوێژێکی نەوی دەیگوت:

- خودا، لە هەموو بوونەوەرێکی زندوودا هەیە. ویژدان و ناخ بەخششی خودایە، سەرچاوەکەی خودایە.

- ئەدی خەتا وگوناح؟

- خەتا، زادە وبەرەنجامی کرێتی جەستەیە، سەرچاوەکەی شەیتانە. خەتا شتێکی دەرەکییە. کەسێک زۆر بیر لە خەتا نەکاتەوە خەتا وگوناح ناکات. ئەگەر بیر لە خەتا وگوناح نەکەیەوە، خەتا و گوناح ناکەیت. بیرکردنەوە لە خەتا گڵاوە، کاری شەیتانە. جەستە سەرچاوەی ئارەزوو و شەهوەتە.

یارۆی بەنا بە گومانەوە گوتی: - مەسەلەکە بە تەواوی وانییە..

- با، تەواو وایە. خواوەند خەتا نازانێ، بەشەریش لە سەر وێنە وشێوەی خودادا هات هاتووەتە دروستبوون، نموونەی خوایە، خەتا و گوناح لەلایەن شێوەوە لە لایەن جەستەوە ئەنجامدەدرێت، نموونە توانای خەتاکردنی نییە، نموونە دەکاتە ڕوح..

بزەیەکی سەرکەوتووانەی بۆ کرد، پیوتر لەبن لێوانەوە گوتی:

- پێموایە مەسەلەکە بە تەواوی وانییە..

ئوسیپ، بە بەناکەی گوت:

- هەر بە قسەکانی تۆدا، ئەوە دەردەکەوێت ئەگەر خەتا نەبێت، تۆبەش نابێت، کەسێک خەتا نەکات تۆبە لەچی بکات، کە تۆبەش نەبوو، ڕزگاری نابێت.

- ئەمە دروستە، " ئەگەر شەیتان لەبەرچاو نەمێنێ، خواش لە بیر و زەیندا نامێنێ "، وەکو پیران دەیڵێن..

شیشلین، کە لە سەر بادە نۆشی ڕانەهاتبوو، بە دوو پێک مەی سەرخۆش دەبوو. دەم وچاوی سوور دەبووەوە. چاوەکانی دەگەشانەوە، دەنگی خۆشتر و سازگارتر دەبوو:

- ئاه براینۆ، ژیانێکی خۆش دەژین - کارێکی کەم دەکەین، برسی نابین با شوکرانەی خوا بکەین! ژیانێکی جوان دەبەینە سەر!

دەستی بەگریان کرد، ڕوندک بە سەر گۆنا وردێنە ئاوریشمینەکەیا وەکو مورووو دەدرەوشایەوە.

لە فرمێسکە شووشەییەکانی، لەوەی کە هەمیشە ستایشی ژیانی دەکرد، بێزار بووم، شوکرانە و ستایشەکانی نەنکم بۆ ژیان زۆر لەمەی ئەم قەناعەتبەخشتر وسادەتر بوون.

ئەم قسانە، جۆرە نیگەرانیەکی بەردەوام و ترسێکی گونگ وبەمژ ودوومانی لە لا دروست دەکردم. من کتێبی زۆرم دەربارەی کرێکاران خوێندبووەوە، بەلام ئێستا هەستم دەکرد و زۆر چاک دەمزانی جیاوازییەکی زۆر لە نێوان کرێکارانی ناو کتێبان و کرێکاری واقیعیدا هەیە. کرێکارانی ناو کتێبان هەرهەموویان، بەچاک وخراپیانەوە، هەر هەموویان بونەوەر وگوراوی بێنەوابوون، نەزان و نەخوێنەواربوون، ڕێک بە پێچەوانەی کرێکاری زندوو و واقیعییەوە بوون. کرێکارانی ناو کتێبانْ بەدەگمەن باسی خوا وئۆل وکلێسایان دەکرد، زیاتر باسی شتە دڵخوازەکانی خۆیان دەکرد، باسی ئەرز، باسی سەختی و دژواریەکانی ژیانیان دەکرد. هەروەها بە کەمی باسی ژنیان دەکرد، ئەگەر باسیشیان بکردبایە، بەم خراپیە باسیان نەدەکردن و ئامادەی هاوسۆزی بوون لەگەڵیاندا. ئافرەت بەلای پیاوی واقیعییەوە، ئەوزاری ڕابواردن بوو، دەبوا هەمیشە لە گەڵیا بەفێڵ و دەهۆ بی ونەیەڵێت بەسەرتا زاڵ بێت وژیانت هێندەی دی لێ تاڵ بکات. پیاوی ناو کتێبان، چ چاکیان چ خراپیان، یەکهاوی بوون، لەهەر گۆڕانێک بەدەر بوون، من ئەمەم بەدڵ نەبوو، پێم قەبوول نەبوو، بەلام پیاوی ناو واقیع

تـێکەڵەیەکن لەچـاکی و لە خراپـی، مـایەی سـەرنجن. پیـاوی واقیعـی چەنـدیش گرێـی دڵـی خۆیـت بۆبکـاتەوە هێشـتا هەر هەسـت دەکەیـت، شـتێکی نهێنـی هەیە و نەهـاتووەتە باسـکرن، ئەم شـت ونهێنییەی کە نەهـاتوەتە باسـکرن، بێگومـان دەکـاتە جەوهەری ئەو کەسە، دەکاتە ڕوحی ئەو کەسە.

من لە هەموو کرێکارانی ناو کتێباندا، پیوتری ناو چیرۆکی 'کۆمەڵەی تەختەبەست'م بەدڵ بوو. دەمویست ئەم کتێبە بۆ هاوڕێکانم وەخوێنم، کتێبەکەم، لەگەڵ خۆدا بۆ کـامپەکە برد. زۆرجـار شـەوان لە لای ئەم تـاقمە کرێکـارە یـان ئەویـان دەمامەوە، بە ڕۆژەوە ئەوەندە ماندوو دەبووم، تاقەتم نەبوو، بۆماڵ بڕۆمەوە.

وەختـایەک گـوتم کتێبـێکم دەربـارەی تەختەبەسـتان هەیە، هەرهەموویـان، بەتـایبەتی ئوسـیپ کە کتێـبەکەی لە دەسـتم وەرگـرت، کەوتە هەڵـدانەوەی بەرپەڕەکـانی، بە دەم سـەر لەقانـدنەوە، کە لە سـەری کەشیشـان دەچـوو، بە جـۆرە گومانێکەوە گوتی:

– ئەم کتێبە دەڵێی دەربارەی ئێستای ئێمە نووسراوە! کێ نووسیویەتی، نەجیمزادەیەک؟ ئەها، منیش بیرم بۆئەوە دەچوو! خانەدان و فەرمانبەران لە هیچ شتێک ناپرینگێنەوە! ئەوەی خوا پێی ناخۆشە دەیکەن!

پیوتر گوتی: – تۆ بە ڕێزەوە باسی خوا ناکەی.

– گـوێ مەدەیە، ئەو قسـانەی مـن لەلای خـوا نـاکەنە هـیچ، نیگەران مەبە، من وتۆ، ناتوانین وەکو پێویست خودا بناسین!

لە ناکـاوا، پەشـۆکا، هەڵچـوو، دنیـای دایە بەر دەمرێـژی جنێوان. لە ڕۆژێکا چەندین جار دووبارەی دەکردەوە: – ئەرێ ماکسیمیچ، شتێکمان بۆ ناخوێنیتەوە؟

که لەکار دەبووینەوە، دەگەڕاینەوە بۆ کەمپەکە تا شیڤ بخۆین، دوای شیڤ، پیوتر دەگەڵ ئەردالیون و شیشلین و کوڕێکی بچکۆلەیا بە نێوی فوما دەهاتن بۆلامان. چرای ئەو کەپرەی کە کرێکارەکان لە ژێریا دەنووستن هەڵدەکراو دەستم بە خوێندنەوە دەکرد. ئەوان، بەبێدەنگی بێ ئەوەی کەس بجوڵێتەوە، یان ورتەی لێوەبێ گوێیان دەگرت، تا ئەردالیون بە هەڵچوونەوە هاواریدەکرد: - بەسە!دەچێتە دەرەوە. گریگوری لە پێش هەموو ئەوانی دیکەوە دەخەوێ. لە سەرسامیا دەمی دادەچەقێنێ. یارۆی تەختەبەستیش وەکو ئەو دەمی دادەچەقێنێت. بەڵام پیوتر و ئوسیپ و فوما لە دەورم خڕ دەبنەوەو زۆر بە وردی گوێم لێدەگرن.کە تەواو دەبم ئوسیپ یەکسەر چراکە دەکوژێنێتەوە. بە ئەستێرەکانا بۆمان بەدیار دەکەوێ کە کات هێشتا نیوەشەوە.پیوتر لە تاریکیەکەوە دەپرسێت: - مەبەست لەم جۆرە کتێبە چییە؟ دژی کێیە؟

ئوسیپ، بەدەم داکەندنی پێڵاوەکانیەوە، دەڵێت: - وەختی خەوتن هاتووە.

فوما، لە گۆشەیەکا مت دەبێت.

پیوتر بە ڕژدی دووبارە دەکاتەوە: - دەڵێم ئەم کتێبە دژی کێیە؟

ئوسیپ ، بەدەم ڕاخستنی جێگاکەیەوە، بەرسڤ دەداتەوە:

- خۆیان دەزانن!

یارۆی بەنا دەڵێت:

- ئەگەر دژی باوەژنان نووسرابێ، مانای وایە هیچ مەبەست و ئامانجێکی نییە، ئەم جۆرە کتێبانە باوەژنان چاک ناکەن. خۆ ئەگەر دژی پیوتریش نووسرابێ، ئەوا هیچ مانایەکی تیانییە. ئەو باوەڕی بەوەیە کە لە چارەی نووسراوە.

جارێـک تـاوانێکی کـرد و ڕەهەنەی سـیبریا کـرا، ئەوە بەلای ئەوەوە سـزایەکی دادپەروەرانە بـوو. ئەم کتێـبە لەو لایەنەوە هـیچ یـارمەتیەکی ئەو نـادات و بـاری سـووک ناکـات.. مەحـاڵە، وانییە؟

ئوسیپ وەڵامی نەدایەوە، بەنایەکە کۆتایی بە قسەکەی هێنا وگـوتی: - ئەو نووسـەرانە هەمـوو کـاتێ بابەتیـان نییە، ئیـدی خۆیـان لە کێشـەی خەڵکـانی دی هەڵـدەقورتێنن. لە کـۆڕ و مەجلیسی ژنـان دەچن. دەی باشـە، شـەوباش، وەختـی خەوتـن هاتووە..

مـاوەیەک لە نـاو دەرگـاکەدا، کە تـریفەی شـینباوی مـانگەکە ڕونـاکی دەکـردەوە، وەسـتا وئەوجـا پرسـی: - تـۆ دەڵێـی چـی ئوسیپ گیان؟

ئوسیپ، بە ڕاوێژێکی خەواڵووەوە بەرسڤی دایەوە: - چی؟

- ئاە، باشە. بنوو.

شیشـلین، لە کوێ دانیشـتبوو، هەر لەوێدا ڕاکشـا. ' فومـا ' ش لەلای مـنەوە، لە سـەر کۆمـایەک پـوش پـاڵکەوت. هەمـوو گەڕەک نووسـت. لە دووری دوورەوە دەنگـی شـووتی قیتـار و تەق وهۆڕی چەرخی قیتار دەهات. جۆرەها دەنگـی پرخ وهۆڕ لە ژێر کەپر و جەمەلۆنەکە بەرز بووەوە. زۆر پەست بووم: بە تەمـای گەنگەشـەیەکی جـدی بـووم، بەلام هـیچ گەنگەشـەیەک چێنەبوو..

ئوسیپ، لە ناکاوا و زۆر بە ئارامی و ڕوونی گوتی:

- بـرادەرینە زۆر گـوێ بەو شـتانە مەدەن. ئێـوە هێشـتا گەنجـن. زۆرتـان بەبەرەوە مـاوە. بیـرە تایبەتیەکـانی خۆتـان هەڵگرن بۆ ئایندە، هەر بیرێک کە دای دەهێنن، بەرانبەر بە دوو بیری خەڵکانی دیکەیە. فوما گیان خەوتوویت؟

فوما، به گورجی بەرسڤی دایەوە: - نەخێر.

- هەردووکتـــــان دەزانـــــن بخـــــوێننەوە، دەســـــتبەرداری خوێندنەوە مەبن. بەڵام باوەڕ بە هەموو نووسراوێک مەکەن، ئەمانە ئەو شتانە چاپ و بڵاو دەکەنەوە کە خۆیان مەبەستیانە.

هەردوو لاقی لە سەر کۆما پووشەکەوە شۆڕ کردەوە، ڕووەولای مە دانەوییەوە و لە سەری ڕۆیی:

- کتێب – کتێب چییە؟ سەرچاوەی هەواڵە، وەکو یەکێک وایە بڵێت : تەمەشاکە، بڕوانە ئەمە لە پیاوێکی ئاسایی دەچێت، لە تەختەبەستێک دەچێت. پاشان بڵێت تەمەشا ئەمەش لە خانەدان ونەجیب زادەیەک دەچێت، وەکو ئەوەی لە خەڵکانی دی جیاواز بن. کتێب بەبێ ئامانج و مەبەست نایەتە نووسین. بۆ بەرگری لەم ئینسان یان ئەو ئینسان نووسراوە.

فومـــا، بـــلەز هەڵیـــدایە: - پیـــوتر زۆر چـــاکی کـــرد ئەو قۆنتەراتچییەی کوشت.

- قسەی وا بۆدەکەی؟ هیچ شتێک ئەوە نایەنێ مرۆڤێکی لەسەر بکوژرێ. دەزانم تۆ ڕقت لە گریگۆرییە، بەڵام پێویستە ئەو بیرە لە مێشکی خۆت دەربکەیت. کەسمان دەوڵەمەند نین. بۆ نموونە ئەمرۆ من وەستام، سبەی دەبمەوە بە کرێکارێکی ئاسایی..

- من باسی تۆ ناکەم، هاپۆ ئوسیپ گیان.

- فەرق ناکات.

- تۆ پیاوێکی دادپەروەر و بە ئینسافیت.

ئوسیپ، قسەکانی بە فوما بڕی و گوتی:

- پەلە مەکە، من باسی ناوەڕۆکی کتێبەکەت بۆ دەکەم. کتێبێکی زۆر خراپە. نەجیمزادە و خانەدان جیان لە کرێکار، کرێکار جیان لە نەجیمزادە و خانەدان. تـۆ تەمەشـاکە –

خانەدان و نەجیمزادە بوغزنن، شەڕانین، کرێکار لەوان باشتر نین. نەجیمزادە توورە و تڕۆن، کرێکار مەیگوسار و ڕکۆنین. ئەمە نێوەڕۆکی چیرۆکەکەیە.. دەیەوێ پێمان بڵێت باشتر وایە پیاو سەری خۆی کز بکات وخزمەتی ئاغای خۆی بکات: یانی ئاغا خۆی بداتە پاڵ کۆیلە و کۆیکە خۆی بداتە پاڵ ئاغا، هەردووکیان لە سەر یەک دەژین. من نکۆڵی لەوە ناکەم کە ژیان لە سایەی کۆیلایەتیدا ئارامترە. ئاغا و موڵکداران، کرێکاری بە قوەت و مێشک پووتیان دەوێ، قازانجیان لەوەدایە. من نزیکەی چل دانە ساڵ لە ژێر نیری موڵکدارانا ژیاوم، ئەزموونێکی زۆرم پەیدا کردووە.

هەستم دەکرد ئەمە هەمان بیرکردنەوەی پیوتەرە کە سەری کابرای بڕی بوو، هەستم بە جۆرە نیگەرانیەک دەکرد کە هزر وبیرەکانی ئوسیپ، دەگەڵ هەمان بیرکردنەوەو هزرینی ئەو پیرەمێرە تاوانکارەدا تێکی دەکردەوە.

ئوسیپ، دەستی خستە سەر لاقم، درێژەی بە قسەکانی دا وگوتی:

- دەبێ توانای تێگەیشتن و درککردنی مانای ئەو شتەت هەبێ کە لەم کتێبە و کتێبانی دیدا نووسراوە. کەس، هیچ کارێک لە خۆڕایی و بەبێ مەبەست ناکات، تەنانەت ئەگەر مەبەستەکەشی بشارێتەوە، هەر مەبەست و ئامانجێکی ژێراوژێری هەیە. نووسینی کتێبش بەبێ مەبەست نییە، ئەم کتێبانەی زەینت دەشێوێنێت. هەموو شتێک ئەقڵ و ئاوەزی دەوێت، بیرکردنەوەی دەوێت، تەنانەت داربڕینەوەو پێڵاو دروستکردنیش ئاوەزی دەوێت..

مــاوەیەکی زۆر لە ســەر قســان بەردەوام بــوو، بە دەم قسانەوە جاریَ پاڵدەکەوت و جاریَ ڕادەپەڕی تـا قسـەکانی بە ناو بێدەنگی و تاریکیەکەدا تۆو بدات:

- دەڵێن جیـاوازییەکی گەورە لە نێوان موڵکدار وکرێکـاردا هەیە. ئەمە ڕاسـت نییە. هەموومـان وەکـو یەکین، بەڵام ئەو لە لـوتکەدایە مـن لە بنـار. موڵکـدار و ئەربابـان بەزمـانی کتێبـان دەئاخفن، من بەزمانی ماڵنج، پاشەڵی ئەو لە هی من سپی ترە، گەلـۆ ئەمەیە جیاوازیەکـانی نێـوان ئـێمە. براینـۆ وەختـی ئەوە هـاتووە کە سیسـتەمێکی تـازە لەم دنیـایەدا بەرپـا بکرێـت، ئەم کتێبـانە تـووڕ بـدەن، وەختـی ئەوە هـاتووە، هەرکەسـێک ئەم پرسـیارە لە خـۆی بکـات: مـن کـێم؟ هەڵبەتە مـرۆڤم. ئەدی ئەو کێیە. جیاوازیەکەمان لە چیدایە؟ ئەویش بەشـەرێکە وەکو مـن. باشــە خــوا بە دوو پێــوەریَ جیــاواز مــامەڵە لەگەڵ بەشــەردا دەکات؟ نەخێر هەموومان لە نوڕینی ژیان و خوادا یەکسانین..

ئەنجام، سپێدە زوو، وەختایەک مرواری سـتێران ئـاوابوون، ئوسیپ ڕووی کردە من و گوتی:

- ئەریَ زۆرم نەڕێسا؟ ئەمشەو باسی زۆر شتم کرد، قەت ئەوەنـدە سـوێرە قسـە نەبـووم. هاوڕێیـان قسـەکانم بەهەنـد وەرمەگرن – بۆیە ئەوەندەم ڕێسا چونکە خەوم زڕابوو. پیـاو کە پاڵـدەکەویَ و خەوی دەزڕیَ، جۆرەهـا حیکـایەت بۆخـۆی دادێنـیَ : ڕۆژیَ لە ڕۆژان، عەیـامیَ بەو عەیـام چێڵێـک هەبـوو، کێڵگە و مەزرایانی بەجێهێشت، ڕووی کردە هەردە و باسکان، لەم مەزرا بۆ ئەو مەزرا، ژیـانی بەسـەر برد، ئەنجـام نەخـۆش کەوت و مردار بووەوە، بۆگەنی کرد و وشـک بـووەوە. مانـای ئەم چیرۆکە چییە؟ هیچ مانایەکی تیانییە. دەی باشە با بنووین، دەبیَ دوای تۆزێکی دی لە خەو ڕابین.

## (٢١)

ئوسـیپ، لەبەرچـاوم، ڕێـک وەکـو یـاکوفی تـوونچی، بەڕادەیەک گەورە بوو، کە هیچ مرۆڤێکی دیکەم بەو گەورەییە نەدەبینی. زۆر خاڵی هاوبەش لە نێوان ئەم دووانەدا هەبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا بابام و پیوتر فاسیلیڤی دیندار و سموری ئاشپەزیشی وەبیر هێنامەوە، هەرچەندە هەموو ئەوانەی وەبیر دێنـامەوە، خۆیشـی سـات بە سـات زیـاتر لە هـزر ودڵمـا دەچەسـپی و جێی خـۆی دەکـردەوە. هەڵـبەتە دوو شـێوازی بیرکـردنەوەی هەبـوو: بەڕۆژەوەو بەدەم کـاری ڕۆژانەوە بیرکردنەوەی زۆر سادەتر و خێراتر و ڕوونتر و پراکتیکی تر بوو لەبیرکردنەوەی شەوانی، بە تایبەتی کە خەوی دەزڕا، یان لە ئێواران کە بە دوو قۆڵی دەچووین بۆ شـار تا سـەردانی ژنێکـی خزمـی بکـات، کە کـارگی دەفرۆشـت. شـەوان ڕاوبۆچـوونی تـایبەتی هەبـوو. لە هەمـوو لایەکەوە تیشـکی دەهاوێشت، وەکو شـەوقی چرا، بەڵام من لایەنە دروستەکانیم پێ جیا نەدەکرایەوە، یان نەمدەزانی خۆی کام لایەنەیانی پتر بەدڵ بوو.

وام وێنا دەکرد، لە هەموو ئەو پیاوانە زیرەکترە کە تا نها دیتبـوومن، ئیـدی زۆر بە دەوریـا دەهـاتم و خـۆم تێـی هەڵدەسوو، وەکو چۆن ئەوەم لەگەڵ یاکوفی توونچیدا دەکرد، دەمویست ئەم پیاوە بناسم و لێی حاڵی ببم، کەچی ئەو خۆی دوور دەگـرت و خـۆی لێدەدزیمەوە. چـۆن پەی بە حەقیقەتـی ئەو پیاوە بەرم؟ چ دیوێکی بە دیوی ڕاستەقینەی ئەو بزانم؟.

قسەیەکی خۆیم بیرکەوتەوە کە جارێک پێی گوتم:

- مێشکت بخەکار تا بمناسیت، دەی هەوڵی ئەوە بدە!

زۆر بە خۆما شكامەوە، غرووری بریندار كردم، بەڵام ئەو شتە لە غروور وكبریا باڵاتر بوو. من زۆرم مەبەست بوو كە لەو پیرەمێردە تێبگەم و بیناسم.

وێڕای هەموو چاو وڕاوەكانی، كەسێكی سەنگین وبە ویقار بوو. وام بە خەیاڵدا دەهات كە ئەگەر سەد ساڵی دیكەش بژی، هەر بەو دەقە دەمێنێتەوەو بە هیچ جۆرێ ناگۆڕێت و نابێت بە یەكێك لەو خەڵكانەی زۆر بلەز و بەشێوەیەكی سەیر دەگۆڕێن. كاتی خۆی هەمان باری سەرنجم سەبارەت بە پیوتر فاسیلیف ش هەبوو، بەڵام شتێكی ئەوتۆم تیا بەدی نەكرد كە مایەی شادی بێت. سەنگینی و ویقاری ئوسیپ، جۆرێكی دی بوو، سەرنجڕاكێش تر بوو.

بێ باری بەشەری، هەلپەرستی خەڵكی ، بەردەوام دەچوو بە چاوما، كوێری دەكردم، هەروەها، بەرزبوونەوەی لە ناكاوی خەڵكی لە پۆستێكەوە بۆ پۆستێكی دی زۆری پەست دەكردم، چەند بیرم لە هۆی ئەمە دەكردەوە، نەدەگەیمە هیچ ئەنجامگیرییەك و بەرە بەرە خۆشەویستیم بەرانبەر بە خەڵكی دەیدایە كزی.

ڕۆژێك هەوەڵی مانگی تەمووز بوو، عەرەبانەیەكی شەق وشڕ خۆی كرد بەو مەیدانەدا كە كارمان تیا دەكرد، مەیتەرەوانە سەرخۆشەكە لە پێشەوە ڕۆنیشتبوو، سەری كۆت بوو، دەم و پلی هەر خوێن بوو، بە سەر ڕدێنیا دەڕژا. گریگۆری شیشلین لە سەر كورسیەكەی دواوە ڕۆنیشتبوو، فوول سەرخۆش بوو، كچێكی قەڵەوی سەر گۆنا ئاڵ گرتبووی، كیژێ كڵاوێكی حەسیری لە سەر نابوو، قەراخەكانی بە نەوار و ئۆیەیەكی سوور و چەند مووروویەكی گێلاس ئاسا، ڕازابووەوە، جووتێ نەعلی لە پێیە ڕووتەكانی كردبوو. لە گەڵ

هەر تاسەیەکی عەرەبانەکەدا بەلادا دەهات و چەترەکەی دەستی هەڵدەبڕی، بە دەم پێکەنینەوە هاواریدەکرد:

- های، شەیتانینە! ئەوەتا کامپەکە داخراوە، کامپ نەماوە. کەچی بە تۆبزی بۆ کامپەکەم دێنن!

گریگۆری، بەلارەلار لە عەرەبانەکە دابەزی. لە ئەرزەکە دانیشت، بە دەم ڕوندک ڕشتنەوە گوتی:

- ئەوەتام، کەوتوومەتە سەر چۆکان – تاوانێکی گەورەم کردووە! بیرم لە هەموو شتێک کردووەتەوەو تاوانم کردووە – ئەوەتام! یفوموشکا دەڵێت: گریگۆری، گریگۆری، ئەو دەڵێت.. ڕاستیش دەکات، بەڵام.. بمبوورن! دەمەوێ هەمووتان دەعوەت بکەم. ئەوەی ئەو دەیڵێت ڕاستە: ئێمە یەک جار دەژین.. مەحاڵە لە جارێ زیاتر بژین..

کچەی تاین بە دەم قاقای پێکەنینەوە، هەر هەڵدەبەزییەوە و دەهات و دەچوو، نەعلەکانی ون کردبوو، عەرەبانچییەکە هاواری دەکرد: - دەی با بڕۆین! دەی – ئەسپەکەم پێ کۆنترۆڵ ناکرێ!

لەوە دەچوو ئەسپەکە، کە زۆر لەڕ و لاواز بوو و کەف لالغاوەی گرتبوو، لە ئەرزەکەدا چەقی بێت، دیمەنەکە بەگشتی مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕی بوو. کرێکارەکانی گریگۆری تەمەشای وەستاکەیان و خانمەکەیان و عەرەبانچییەکەیان دەکرد و پێدەکەنین.

تاقەکەسێک کە پێنەکەنی فوما بوو. فوما لەلای منەوە و لە ڕاڕەوی کۆگاکەدا وەستابوو و لەبن لێوانەوە دەیگوت:

- ئەنجام، ئەو بەرازە بەڕەڵڵا بوو! لە کاتێکا لە گوندی ژنێکی زۆر جوان و شەنگولی هەیە!

عەرەبـانچیەکە داوای لێـدەکردن کە بـڕۆن. ئـافرەتەکە لە عەرەبانەکە دابەزی، گریگۆری لە دووی خۆی ڕاکێشا و لە بەر پێی خۆیدا پاڵی خست، چەترەکەی بەرز کردەوەو هاواریکرد:

- ئێمە دەڕۆین!

کرێکارەکان لە سەر داوای فوما کەوتنەوە کار، فوما زۆری پـێ ناخۆشـبوو کە گریگـۆری بەوجـۆرە خـۆی کردبـوو بە گەپجـاڕ. ئیـدی هەنـدێک قسـەی دۆسـتانەیان سـەبارەت بە وەستاکەیان کرد، لەوەش دەچوو ژێراوژێر بەغیلی پێ بەرن.

فوما، لە بن لێوانەوە گوتی:

- بە خۆیشی دەڵێت وەستا. هەمووی بخەیە سەریەک یەک هەیڤـی دیـکەیە، کارەکەمـان تەواو دەکەیـن و بـۆ گوندەکەمان دەگەڕێینەوە، بەڵام خۆی نەگرت و نەیتوانی چاوەڕوان بکات..

منـیش لە لای خـۆمەوە لە گریگـۆری پەسـت بـووم. لەوە دەچوو ئەو کیژە قردێلە بەسەرە، لە گەڵیا نەگونجێت و ناکۆک بێ! زۆرجار دەمپرسی بۆچی گریگۆری شیشلین وەستا بێ و فوما توچکوف کرێکارێکی سادە بێت.

فومـا، کەسێکی تۆکمە و بە داروبـار، قژ زەردی قژ لـوول، کەپوو دەندووکە داڵاشی، چاو کەوەیی چاوگەش، دەم وچاو خڕبـوو. لە جووتیـاران نەدەچـوو، خـۆ ئەگەر جلێکـی هەنـدێک شایسـتە وجـوانی لە بەر بکـردایە، خەڵکـی وایانـدەزانی کـوڕە بازرگانێکی دەوڵەمەندە. کوڕێکی بەد مگێز، کەم دوو، واقیعبین بوو. بەحوکمی ئەوەی خوێندنەوە و نووسین بەڵەد بوو، ئیدی کـاری ژمێریـاری وسـەرفیاتی بـۆ قـونتەراتچییەکەی دەکـرد. دەیتـوانی کـارێکی وەهـا بکـات کە کرێکارەکـانی هـاوڕێی دەستبەکار بن، کرێکارەکان بەقسەیان دەکرد، فوما، ئەو کارەی بـۆ قـونتەراتچییەکەی دەکـرد، هەرچەنـدە ئەو هـیچ لـوتفێکی بەرانبەری نەبوو.

به هێمنی دەیگوت: - من ناتوانم لە یەک دەورەی ژیاندا فریای هەموو شتێک بکەوم.

ڕقی لە کتێبان بوو:

- هەموو شتێک چاپ دەکرێ. فەرموون.. ئەگەر بتانەوێ دەتوانم هەرئێستا چیرۆکێکتان بۆ دابنەم – هیچ زەحمەتێکی تیانییە..

زۆر بە وردی گوێی لە هەموو شتێک دەگرت، هەرچیەک بگوترابا گوێی لێدەگرت، ئەگەر شتێک سەرەنجی ڕاکێشابا، هەوڵی دەدا بچێتە بنج وبناوانی، پاشان ئەنجامگیری بۆ دەکرد و بە پێوەر و پێوانەی خۆی هەڵیدەسەنگاند.

جارێک بە فومام گوت، هەقە ببیت بە قونتەراتچی، بە ساردی بەرسڤی دامەوە:

- ئەگەر لە هەوەڵەوە هەزار ڕۆبڵێکم هەبوایە، خراپ نەبوو. بەڵام تۆ هەمیشە نیگەرانی ئەوە بێ چۆن بەپارەیەکی کەم کاروباری ژمارەیەک کرێکار بەڕێوە بەری – فایدەی چییە؟ نەخێر، چاوەڕوان دەکەم تا دەرفەتێکی گونجاوم بۆ هەڵدەکەوێ، هەنگێ خۆ دەگەیەنمە دێرێک لە ئورانکا. من کابرایەکی قۆزم، ئێ بەڵکو بێوەژنی بازرگانێک حەزم لێبکات. ئەو شتانە ڕوودەدەن. گەنجێکی خەڵکی سیرگاتشی، زەماوەندێکی لەو بابەتەی بە نەسیب بوو، لە ماوەی دوو ساڵدا ئاواتەکانی هاتەدی، کچێکی خەڵکی شاری خواست، کە کوڕە ئیکۆنان بۆ ئەم ماڵ و ئەوماڵ دەبات، کچە دەیبینێ و حەزی لێدەکات..

ئەوە نەخشە وبەرنامەی بوو. زۆر چیرۆکانی دەربارەی پیاوانێک بیستبوو کە لە ڕێگەی ڕەبەناتی دێرانەوە، گەیی بوونە ژیانی خۆش. زۆر ڕقم لەو چیرۆکانە بوو، شێوازی

هزرینی فومام بە دڵ نەبوو، بەڵام دڵنیابووم کە درەنگ یان زوو، پەنا وەبەر دێرێک هەر دەبات.

فوما، لە گەڵ کردنەوەی کامپەکەدا بوو بە بۆی لە کافەیەکدا، ئەمە بوو بە مایەی سەرسامی هەمووان. ناتوانم بە شێوەیەکی بنجبڕ بێژم کە ئەم کارەی هاوڕێکانی حەپەساند، بەڵام گاڵتەیان پێدەکرد. کە لە ڕۆژانی یەک شەمموان یان جەژناندا بیانویستبا بڕۆن چایەک بخۆنەوە، لە بەینی خۆیاندا و بە پێکەنینەوە دەیانگوت: - بابڕۆین بۆلای فوما، با دوو پوولی دەست بکەوێ!

کە دەگەیینە کافە، بە کەش وفشەوە بانگیان دەکرد:

- ئەهای گارسۆن – تۆ، قژ لوول – وەرە بۆ ئێرە!

دەچوو بۆ لایان، سەری بەرز دەگرت و، دەیپرسی: - چیتان دەوێ؟

- چییە هاوڕێ کۆنەکانت ناناسیتەوە؟

- من زۆر سەرقاڵم..

دەیزانی هاوڕێکانی پێی ڕادەبوێرن وگەرەکیانە تووڕەی بکەن، بە سەبر وبێزارییەوە تەمەشای دەکردن، ڕوخساری گرژ لە تۆ وایە دەیەوێ بڵێت: - باشە، خێرا بێژن چیتان دەوێ..

ئیدی ماوەیەکی زۆر، سەریان بە سەر کیسەی پارەکانیاندا شۆڕ دەکردەوەو دەیانگوت:

- وادیارە بەخشیشت دەوێ!

ئەوجا لە کافەکە وەدەر دەکەوتن بە بێئەوەی تاقە کوپیکێکی وێدەن.

لە فومام پرسی، باشە بۆ بوویت بە بۆی، ئەدی تۆ بەتەما نەبووی ببیت بە ڕەبەن. بەرسڤی دایەوە:

- هەرگیز لە نەخشە و بەرنامەما نەبووە ببم بە ڕەبەن. بەتەماش نیم ماوەیەکی زۆر لە کاری بۆیمانیدا بمێنمەوە..

دوای چوارساڵ لە تساریتسین دا دیتمەوە، لە کافەیەکا پێشخزمەت و شاگرد بوو، پاشان لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە کە فوما توچکوف بۆ دزی چووەتە سەر ماڵێک و گیراوەو خراوەتە زندانەوە.

چیرۆکی ئەردالیونی بەناش زۆر کاری تێکردم، ئەم پیاوە باشترین و بەتەمەنترین کرێکاری گروپەکەی پیوتر بوو. پیاوێکی ڕووخۆشی ڕدێن ڕەش، لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو، لە دڵی خۆدا دەمپرسی چۆن، لەدڵی خۆدا دەمپرسی بۆچی دەبێ پیوتر لەجیاتی ئەو وەستا بێ. زۆر بەکەمی دەیخواردەوە، ئەگەر بشیخواردباوە بەدمەست و سەرخۆش نەدەبوو. لە کارەکەی خۆیا دەست ڕەنگین بوو، لە کارکرنا بێ غەل وغەش بوو، کەرپووچان لە دەستیا وەکو پۆلە کۆتران دەفڕین. پیوتری ڕوو گرژی، دەغەزار لە چاو ئەوا نەیدەکردە هیچ. زۆر حەزی لەم قسەیە بوو:

- من خانووی کەرپووچ بۆ خەڵکی دروست دەکەم، تا کفنی دارین بۆخۆم دروست بکەم.

ئەردالیون، بە دەم دانانی کەرپووچانەوە هاواری دەکرد:

- دەی کوڕینە، لە ڕای شکۆی خوادا یارمەتیم بدەن!

بۆی دەگێڕانەوە کە بە تەمایە بەهاری داهاتوو بۆ تومسک بڕوات کە زاواکەی لەوێ بونیاتنانی کڵێسایەکی بە قونتەرات گرتووە و بەڵێنی بەم داوە بیکات بە سەرۆکی کرێکارەکان. گوتی:

- هەموو شتێکم یەکلایی کردووەتەوە. بونیاتنانی کڵێسان، ئەم کارەم پێخۆشە!

ئاوڕی لای منی دایەوە:

- تۆش لە گەڵما وەرە، ژیان لە سیبریا بۆ خەڵکی خوێنەوار زۆر خۆشە، خوێنەوار لەوێ بە قەدرە و کرێی چاکی دەدەنێ.

قاییل بووم کە بچم، ئەردالیون لە کەیفان هاواریکرد: - زۆرچاکە! خۆ بە جدیتە، گاڵتە ناکەی.

ڕەفتاری لە هەنبەر پیوتر وگریگۆری دۆستانە بوو، جۆرە باڵا دەستیەکی پێوە دیاربوو، وەکو ڕەفتاری گەوران لە گەڵ منداڵاندا وابوو، ڕووی کردە ئوسیپ وگوتی:

- ئەم فەخر فرۆشانە ناکەی! هەرچیەکیان بەمیشکا بێت بەیەکی دەڵێن، لەو وەرەقبازانە دەچن، کە دەستەکانیان نیشانی یەک دەدەن و ئەم بەو دەڵێ تەمەشا ئەم دەستە جوانە، ئەو بەم دەڵێ، بردنەوەم مسۆگەرە! ئەوەیە دەست!

ئوسیپ وەڵامێکی گونگی دایەوە:

- چ قەیدیە؟ فەخرفرۆشی تەبعێکی بەشەرییە. هەموو کچان لە ڕێکردنا ناز وفەخر فرۆشی دەکەن..

ئەردالیون، بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

- ئەمان دەڵێن خوا لێرەیە و، کەچی خوا لەوێیە، ئیش وکاریان پارە کۆکردنەوەیە.

- ناتوانی بۆمی بسەلمێنی کە گریگۆری پارە کۆدەکاتەوە.

- من باسی ئەوی دی دەکەم. بۆچی سەری خۆی هەڵناگرێ و ناچێ بۆ لێرەواران و دەشت دەران ولەوێندەر لە گەڵ خوادا بژی، خودایا، من لە هەموو شتێکی ئێرە بێزار بووم. هەرکە بەهار هات دەڕۆم، بۆ سیبریا دەڕۆم..

کرێکارەکانی دی دەیانگوت، بەغیلی بە ئەردالیون دەبەن.

- ئەگەر زاوایەکی وەکو زاواکەی تۆمان هەبوایە، نەک بۆ سیبریا بۆ بنی دنیاش دەچووین.

ئەردالیــون، لە ناکــاوا دیــار نەمــا، ڕۆژی یەک شــەممە کـامپەکەی بەجێهێشــت، ســێ دانە ڕۆژ بــوورین و کەســمان نەمانزانی چی بە سەرهات، کێوە چوو.

ئیدی هەرکەسە ومەزەندەیەکی ترسامێزی لێدەدا:

- تۆ بڵێی یەکێک لە پەنایەکەوە کوشتبێتی؟

- لەگینە چووبێ بۆ مەلە و خنکابێ.

ئەنجـام یفوموشـکا هــات و بە جـۆرە شــەرمەزارییەکەوە گوتی:

- ئەردالیون، خۆی لە شەرابا نقوم کردووە.

پیوتر، بە گومانەوە هاواریکرد: - درۆیە!

- خەریکی خـواردنەوەیە، خەریکی مەیگوساریە، خەریکی جگەرەکێشانە، دەڵێی ژنەکەی مردووە..

- مــاوەیەکی زۆری بە بێوەپیــاوی بە ســەر بــردووە. لە کوێیە؟

پیــوتر، بە تــوورەیی چــوو بە فریــای ئەردالیـونەوە، بەڵام جەزرەبەیەکی بە دەستی وی خوارد.

ئوســیپ، لێـوی گەســت، هەر دوودەســتی لە گیرفــانی نــاو گوتی:

- بە خۆم دەچم تا بزانم مەسەلە چییە. پیاوێکی باشە، لە بنەماڵەیەکی باش وخانەدانە.

لە گەڵی چووم. ئوسیپ بەدەم ڕێگاوە وگوتی:

- تەمەشــای ئەم ڕۆژ وڕۆژگـارە بـکە. پیاوێـک بە هەمـوو حـورمەت و ڕێـزداریەوە دەژی، کەچــی لە ناکــاوا کلکــی لــێ هەڵدەبڕێ و دەکەوێت بە سەر کۆمایەک پۆخڵەواتا. ماکسیمیچ، چاو بکەوە، دەرس و عیبرەت لەمەوە وەربگرە!

گەیینە، یەکێک لە هەرزانترین قەحپەخانەکانی ٭ شاری کاباریەکانی کونافینو ٭ تووشی پیرەژنێکی سلۆک بووین. ئوسیپ چەند وشەیەکی بە گوێیدا چپاند، بردینی بۆ ژوورێکی چکۆلەی بەتاڵی تاریکی پیس، هەزار خۆزگەی بە تەویلە. ژنێکی قەڵەو لە سەر قەرەوێڵەیەکی گەڕۆک، بەدەم خەوەوە تلی دەدا. پیرەژن کێشای بە سمت و کەفەڵیا وگوتی:

– هەستە، گوێت لێیە؟ بچۆ دەرێ هەی نێرە قورباقە!

ژنە بە ترسەوە ڕاپەڕی، دەم وچاوی هەڵگوفت و هاواریکرد:

– چییە، چی قەوماوە، کێ لێرەیە؟

ئوسیپ بە ویقارەوە گوتی: – پۆلیسی نهێنی هاتوون.

ژنەی تاین بە هانکەهانک خۆی دەرباز کرد، ئوسیپ لە دواوە تفێکی لێکرد، ئەوجا گوتی:– ئەوەندەی لە پۆلیسی نهێنی دەترسن، لە خودی شەیتان ناترسن..

پیرەژنەکە ئاوێنەیەکی بچووکی، کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو لابرد، پارچە مقەبایەکی هەڵدایەوە: – تەمەشایەک بکە. ئەوە خۆیەتی؟

ئوسیپ، لە کونەکەوە تەمەشایەکی کرد.

– ئەوەیە خۆیەتی، ئەو کیژە دەربکە..

منیش تەمەشایەکم کرد. چرایەک لە قەراخ پەنجەرەیەکدا کە هەر دوو تاکە دارینەکەی داخرابوو، دەسووتا، ژوورەکە زۆر بچووک و پیس بوو، لە ژوورەکەی ئێمە دەچوو. کیژێکی تاتاری چاو چەپ وخێل، بە ڕووت وقووتی لە لای چراکەوە دانیشتبوو و ژێرکراسەکەی دەدووریەوە. لەو دیو کیژەکەوە ڕوخساری ئاوساوی ئەردالیون کە نابوویە سەر دوو سەرین دیاربوو. ڕدێنە ڕەشە وشکەکەی بە هەموو لایەکا گف

بووبـووەوە. کیـژە تاتـاریەکە ڕاچڵەکـی، بەژێـر کراسـەکەی ناوگەڵی داپۆشی، بەلای قەرەوێلەکەدا تێپەڕی و لە ناکاوا هـاتە ژوورەکەی مە. ئوسـیپ تەمەشـایەکی کـرد و دووبـارە تفێکـی کرد:

- تفۆ لە چارەت هەی سۆزانی بێ ئابڕوو!

بە دەم پێکەنیـنەوەو بە ڕاوێژێکـی شـکاوەوە گـوتی: - تـۆ پیرەمێرێکی گەوجی!

ئوسیپ ش پێکەنی وپەنجەی لێڕاوەشاند.

خۆمـان بە ژوورە بچـووک و پیسـەکەی کیـژە تاتـاریەکەدا کرد، پیرەمێر لەلای پێی ئەردالیونەوە ڕۆنیشت. مـاوەیەکی زۆر هەوڵـی لە گەڵا دا کە بێداری بکـاتەوە، کەچـی ئەردالیـون لەبـن لێـوانەوە دەیگـوت: - ئـۆە، چـاکە.. کەمێـک سـەبر بـکە، ئەوسـا دەڕۆین..

ئاخری بێدار بووەوە، حایر و حەپەساو چاوی بڕییە مـن و ئوسیپ، ئەوسا چاوە ئاوساوەکانی نووقاندن و لە بن لێوانەوە گوتی: - ئێ؟

ئوسـیپ، بە ئـارامی و بێهیچ سەرزەنشـتێک پرسـی: - چـی بووە؟

ئەردالیون، بە دەم کۆکە کۆکێکی تووندەوە گوتی: - سـەرم ون کردووە.

- چۆن؟

- بەوپەڕی ئاسانی..

- وادیارە ڕەوشت خراپە.

- دەزانم..

ئەردالیـون، بـوتڵێکی کـراوەی ڤودگـای لە سـەر مێـزەکە هەڵگرت وکەوتە هەڵقوڕاندنی، ئەوسـا خـولکی ئوسـیپی کـرد: - قومێک ناخۆیتەوە؟ هەقە لێرەدا خواردنش هەبێ..

پیرەمێـر قـومێکی خـواردەوە، خەم دایگـرت، بە کـاوەخۆ کەوتە داکرماندنی گوێچکە نانێک، ئەردالیون، کەوتە چەنەبازی:

- دەبینـی.. بووم بە هـاوڕێی ئەم کیـژە تاتـاریە. یفوموشـکا ئەمەی پێکردم. گوتی کچۆڵەیەکە.. هەتیوە خەڵکی کازیموفە - حەزی کردووە بچێت بۆ کامپەکە.

لە دیـوارەکەوە گوێمـان لە هەنـدێ قسـەی بـێ سـەروبەر وسەروگوێ شکاو بوو:

- تاتـــاریەکە باشـــترە! لە فڕوجێکـــی چکـــۆلە دەچێـــت. پیرەمێرەکە وەدەردەنێ. خۆ باوکت نییە.

ئەردالیون، ڕوانیە دیوارەکە، لەبن لێوانەوە گوتی: - ئەوەتا لەوێندەرە..

ئوسیپ گوتی: - دیتم.

ئەردالیون، ئاوڕی لای منی دایەوە: - بزانە چم بەخۆ کرد برا..

چاوەڕوانم دەکرد ئوسیپ بکەوێتە سەرزەنشتی ئەردالیـون، یـان ئامۆژگـاری کردنـی، کە تاوانکـاران پێویسـتە تۆبە بـکەن. بەڵام هیچ یەکێک لەوانە ڕوویان نەدا. لەوێ شانبەشانی یەکدی دانیشـتن و بە ئـارامی قسـەیان دەکـرد. بوونیـان لەوێ، لەو ژووره چکۆلە تاریک وپیسـەدا، مـایەی خەمبـاری بـوو. کیـژە تاتاریەکە، لە کونی دیوارەکەوە، بە ڕاوێژێکی ڕووسی تێکشکاو هەر قسـەی دەکـرد، بەڵام ئەمـان فەرامۆشـیان کـرد. ئوسـیپ، ماسیەکی وشکەوەبووی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و کیشـای بە پێڵاوەکەیـدا وکەوتە پـاککردنی. پرسـی: - هەمـوو پـارەکەت بە فیڕۆ دا؟

- تۆزێکیم بە قەرز داوە بە پیوتر.

- پێویسته به زووترین کات بۆ تومسک بڕۆیت. ئێستا دەتوانی بڕۆیت؟
- سەبارەت بە تومسک زۆر دڵنیانیم.
- بۆچی، پەشیمان بوویتەوە؟
- ئەگەر خزمەکانم دەعوەتیان نەکردبام..
- چی؟
- خوشکەکەم و مێردەکەی..
- ئێ؟
- خۆش نییە پیاو لای خزم کاربکات.
- خاوەن کار هەموویان وەکو یەکن، چ خزم بن چ بێگانە.
- وێڕای ئەوەش..

لەوێ دانیشتن، زۆر دۆستانەو بە سەنگینی قسەیان دەکرد، کیژە تاتاریەکە بێدەنگ بوو. خۆی بە ژوورەکەدا کرد، کراسەکەی کە بە بزمارێکەوە هەڵواسرابوو برد و بە بێدەنگی ڕۆیی.

ئوسیپ گوتی: - منداڵە.

ئەردالیون، تەمەشایەکی کرد، بە ڕاوێژێکی دۆستانەوە گوتی:

- هەرهەمووی خەتای یفوموشکایە. جگە لە ئافرەت بیر لەهیچی دی ناکاتەوە.. کچە تاتاریەکە خۆشە بەڵام زۆر سوێرە قسەیە، بەردەوام قسەی قۆڕ دەکات..

ئوسیپ ئاگاداری کردەوە: - ئاگات لە خۆبێ، دەنا خۆت پێ بەڕێوە نابرێت و هەنگێ پەشیمانی دادت نادات..

دوای ئەوەی دوا پارووە ماسیەکەی خوارد، هەستا. لە ڕێگای گەڕانەوەدا پێمگوت: - باشە بۆچی هاتیت؟

ئوسیپ، هەمان قسەی پێشووی خۆی دووبارە کردەوە:

- هاتم بزانم خەریکی چییە، لە چ حاڵێکایە. برادەرمە. زۆرم لەوشتانە دیتوون: پیاو دەژی، پاشان لە ناکاوا، دێت بە سەریا و دەڵێی لە زندان هەڵدێت.

لە سەری ڕۆیی: - واز لە ڤودکا بێنە!

دوای تۆزێک هەرخۆی گوتی: - بەڵام ژیانیش بەبێ ئەو ناخۆشە!

- بەبێ ڤودگا؟

- بە لێ. هەرکە قومێکی لێدەخۆیتەوە، وا خەیاڵدەکەی لە دنیایەکی دیدا دەژیت..

ئەردالیون، وەزعی باش نەبوو، خۆی پێ بەخێو نەدەکرا. دوای چەند ڕۆژێک گەڕایەوە بۆ کارکردن، سەر لەنوێ لەو شوێنەدا کە بەهارێ لەگەڵ کۆمەڵێک ئاوارەی دیکەدا، خەریکی شکاندنی ئەو بەستەڵەکانەی دەوری کەشتیەکە بوون، بۆ گواستنەوەی کالا وکەل وپەل بە ڕوبارەکەدا، یەکترمان بینییەوە. بە یەکدی شا وشوکور بووینەوە. بە دوو قۆڵی بۆ چاخواردنەوە چووین بۆ کافەکە.

بە دەم چا خواردنەوە، بە خۆڕانانەوە گوتی:

- لە بیرتە چتۆ کرێکارێک بووم؟ بەڕاستی لە کارەکەی خۆما کارامە بووم. دەکرا سەدان ڕۆبڵ پاشەکەوت بکەم..

- بەڵام هیچت پاشەکەوت نەکرد.

بە کەش وفشەوە گوتی: - هەڵبەتە نەمکرد. من زۆر باکم بەکار نییە!

بە جۆرێ دەنگی لێهەڵبڕی کە سەرنجی خەڵکەکەی ناو کافەکەی بۆلای خۆمان ڕاکێشا.

- لە بیرتە پیوتر، ئەو دزە مەندە، چی سەبارەت بە کارکردن دەگوت؟ خانووی کەرپووچ بۆ خەڵکی و تابووتی دارین بۆ خۆت! ئەوە ئەنجامی کارە!

گوتم: - پیوتر پیاوێکی نەخۆشە. لە مردن دەترسێت.

ئەردالیون هاواریکرد: - منیش نەخۆشم. ڕوحم، دەروونم نەخۆشە!

ڕۆژانی یەک شەمموان، لە شار دەردەچووم و بۆ شەقامی میلیونایا کە مەکۆی ئاوارە و سەرگەردانان بوو، دەڕۆیشتم. بەچاوی خۆم دیتم کە ئەردالیون چەند بە خێرایی بوو بەیەک لەو بێزراوانە. ساڵێک لەوەپێش، یەکێک بوو لە کرێکارە زۆرباش و بەڕێز وجدیەکان، کەچی ئەوەتا ئێستا بە دەنگی بەرز قسان دەکات، بەلارەلار و باڵ فشکردنەوە ڕێدەکات، بێباکانە دەڕوانێتە دەوروبەری و سینگ دەردەپەڕێنی وەکو ئەوەی بە خەڵکەکە بڵێ کێ پیاوە با بێتە مەیدان.

بە خۆڕانانەوە دەیگوت: - تەمەشا بزانە خەڵکی چۆن گوێم لێدەگرن. من لێرە فەرماندەم.

هەر پارە وپولێکی پەیدا دەکرد، هەمووی خەرج دەکرد، تاقە پولێکی پاشەکەوت نەدەکرد، ئاوارە وخانە بە کوڵەکانی دەعوەت دەکرد، هەمیشە داکۆکی لە دۆڕاو دەکرد و، زۆرجار هاواری دەکرد: - کوڕینە، ئەمە ڕەوا نییە! دەبێ ڕەفتارمان دادپەروەرانە بێ!

بەوجۆرە نازناوی " دادپەروەر " یان لێنا، کەلە دڵی خۆیدا ئەمەی زۆر پێخۆش بوو.

بەو جۆرە نازناوی "دادپەروەر"یان لێنا، کە لە دڵی خۆیدا ئەمەی زۆر پێخۆش بوو.

دەمویست لەو خەڵکانە تێبگەم کە خزابوونە ئەو گۆشە بەردینەی ئەو شەقامە کۆنە پیسەوە. هەرهەموویان لەو خەڵکانە بوون کە لە ڕەوتی سەرەکی ژیان دابڕابوون، لێ پێدەچوو ژیانێکی تایبەتیان بۆ خۆ خوڵقاندبێت، ژیانێکی خۆش و جیا لە ژیانی خەڵکانی دی. زۆر بوێر و نەترس بوون، دنیایان دابووە بەر کلکان، ئەو چیرۆکانەیان وەبیر دێنامەوە کە بابام دەربارەی کرێکارانی بەلەم ڕاکێشانی ڕوباری ڤۆلگا دەیگێڕانەوە، ئەوانەی زوو بە زوو هەڵگەڕانەوە بوون بە ڕێگر یان پارسا و تۆبەکار. وەختایەک کاریان وەدەست نەدەکەوت، دەکەوتنە وردە دزی لە کەشتیانی نەفەربەر و کەشتیانی بازرگانی، ئەم کارەیان بە هیچ جۆرێ پەستی نەدەکردم. هەستم دەکرد، دزی پینەیەکە بە ژیانەوە، ڕێک لە پاڵتۆیەکی کۆن دەچێت کە پینە کرابێ، بە داوێکی قاوەیی دوورابێتەوە. بەڵام هەندێجاریش دەمبینی، بۆنموونە لەکاتی ئاگر کەوتنەوە، یان شکاندنی بەستەڵەکی سەر ڕوبارەکە، یان بارکردنی بەپەلەی کەشتیەکان، ئەو کەسانە زۆر بەجۆش و خرۆش و دڵسۆزییەوە کاریان دەکرد، هیچ خاوەخاو وتەمەڵییەکیان نەدەکرد. بە هەرحاڵ ژیانیان بە شێوەیەکی گشتی زۆر لە ژیانی خەڵکانی دی خۆشتربوو.

ئوسیپ، کە بینی زۆر لە ئەردالیون نزیک بوومەتەوە، بە ڕاوێژێکی باوکانە پێی گوتم:

- گوێ بگرە کوڕم، هەست ناکەی زۆر لەوانەی شەقامی میلیونایا، نزیک بوویتەوە؟ ئاگات لە خۆ بێ نەبا ئاسیوێکت پێ بگەیەنن..

بۆم ڕوونکردەوە، کە من ئەو خەڵکانەم خۆشدەوێن، کە خەمیان تەڵاق داوە ودنیایان داوەتە بەر کلکان و لە هەر کارێک بێباکن.

بە پێکەنینەوە قسەکەی بڕیم:

- ئازادن وەکو کێشکان! لەبەر ئەوەی خەڵکانی تەمەڵ و تەوەزلن و بەکەڵکی هیچ نایەن. کار بەلای ئەوانەوە، جۆرە سزایەکە!

- کارکردنی مە هیچ فایدەیەکی نییە! پەندی پێشینیانە کە کەس نییە بکارێت بەکاری ئابڕوومەندانە کۆشکێک بۆ خۆی دروستبکات.

خۆ بە خۆ ئەم پەندەم بە زارا هات، ئەوەندەم بیستبوو، لێم بووبوو بەڕاست و دروستێکی بێ چەند وچوون. بەڵام ئوسیپ، تووڕە بوو و هاواریکرد:

- کێ ئەم جۆرە پەندانە دەڵێتەوە؟ گەوجان و تەمەڵان، پێویست ناکات گوێ لەم قسە هەلەق ومەلەقانە بگری، تووتەڵە! تەنیا بەغیلان و نائومێدان، ئەو قسە بۆش و بەتاڵانە دەڵێنەوە. تۆزێ پەڕ دەربکە ئەوجا هەوڵی فڕین بدە! جا سەبارەت بەم دۆستایەتیەت لەگەڵ ئەوانەدا، من بە وەستات دەڵێم، دوایی گلەییت لە سەر خۆت.

بە وەستامی گوت. وەستام لە بەرچاوی ئوسیپ پێی گوتم:

- پشکوف گیان لەو جماعەتەی میلیونایا دووربکەوە، ئەوانە هەموو دز و بەڕەڵلان، ئەو شەقامە دەچێتەوە سەر زیندان یان خەستەخانە. لێیان دوور بکەوە!

کەوتمە نکۆڵی کردن لەوەی کە سەردانی شەقامی میلیونایام کردبێ، بەڵام، زوو بە زوو وازم لە هات وچۆی ئەوێندەر هێنا.

ڕۆژێک لە گەڵ ئەردالیون و هاوڕێیەکیا کە پێیان دەگوت (ولید) لە سەربانی کەپرێکی ناو حەوشەی کاروانسەرایەک دانیشتبووم. (ولید) بە ئاو وتاو ئەوەی بۆ دەگێڕاینەوە کە چۆن

به پێیان له روستوفی کەنار دۆنەوە تا موسکۆ ڕۆییوە. ئەمە کۆنە سەربازی سریەی ئەندازە بوو، میدالی خاچی قەشە جۆرجی وەرگرتبوو، له شەڕی تورکیادا ئەژنۆی پێکرابوو و ئیدی بۆخۆی لەنگ بووبوو. پیاوێکی کورتەبالای بەخۆوە بوو، دەستەکانی زۆر بەهێز بوون، بەلام چونکە لەنگ بوو، ئەو هێز وتوانایە جێگەی هیچی بۆ نەدەگرتەوە، نەیدەتوانی کار بکات. تووشی هەندێ نەخۆشیان بوو، هەموو قژی و ڕدێنی وەری، سەری ساف بوو، دەتگوت سەری منداڵێکی تازە لەدایک بووە. که قسەی دەکرد چاوەکانی دەگەشانەوە و دەیگوت:

- بەوجۆرە گەییمە سیربوخوف، لەوێندەر ڕەبەنێکم بینی که له حەوشەی پشتەوە ڕۆنیشتبوو، چووم بۆلای و گوتم: - ئەرێ تۆزێ پارە نادەیە قارەمانێک له قارەمانانی شەڕی تورکی..

ئەردالیون، سەرێکی لەقاند وگوتی: - ئۆی لەو درۆ گەورەیە! که درۆزنی!

'ولید ' بێئەوەی تووڕەبێ گوتی: - بۆ درۆزنم؟

ئەردالیون، به ڕاوێژێکی سەرزەنشامێزەوەو بەخاوی گوتی:

- دەبێ ڕاست و دروست بژی، دەبێ به ڕەنجی شانی خۆت بژی، ئەگەر تۆ له کارکردن بیت، دەتوانی ببیە پاسەوانی شەو، وەکو هەموو ئەوانەی دەلەنگن، کەچی تۆ له بری ئەوەی سەری گوریسێ بگریت، بەدزییەوە بەم لاو به ولادا دەسوڕێیتەوە ودرۆیان دەکەیت..

- ئەوەم هەر بۆ سوعبەت وگاڵته کرد - بۆ ئەوەی خەڵکەکە بێنمە پێکەنین..

- پێویسته بەخۆت پێبکەنیت.

هەرچەنــدە دنیــا هەتــاو بــوو، ژنێــک خــۆی بە مەیــدانە تــاریکەکەدا کــرد، شــتێکی بەســەرەوە بــوو، هــاواری دەکــرد: - کچینە کێ تەنوورە دەکڕێت، تەنوورەی باشمان پێیە!

ژنـان لە کـون وکەلەبەرەکـانەوە بەدەر کەوتـن و لە دەوری ژنەی فرۆشــیار خڕبــوونەوە. یەکســەر ناســیمەوە، ناتالیــای جلشــۆر بــوو. بەڵام تــا مــن ســەرکەوتمە ســەربان، ئەو تەنــوورەکەی فرۆشــت و خەریــک بــوو، مەیــدانەکەی بە جێدەهێشت و دەڕۆیی.

لە دەرێی دەروازەکەدا خۆم گەیاندێ و بە دەنگێکی زوڵاڵ گوتم: - سڵاو!

بە تیلەی چاو تێی ڕوانیم وپرسی: - هەر ئەوەندە وتەواو؟

لە ناکاوا وەستا، بە تووڕەیی هـاواری کـرد: - خودایا! ئەوە چ دەکەی لێرە؟

هاوارەکەی ڕای چڵەکاندم. حیرەت و حەپەسـان بە ڕوونـی بە ڕوخســارە زیــتەڵەکەیەوە دیــاربوو، دڵنیــابووم کە خەمــی منیەتــی. بــلەز بــۆم ڕوونکــردەوە کە مــن لێــرە، لەم شــەقامە دانانیشم، بەڵام هەروا هاتم چاوێ بەم ناوەدا بگێڕم.

دووبارە بە تەوسەوە گوتی:

- هەروا چاوێ دەگێڕی ها؟ تەمەشایەکی ئەم ناوە دەکەی؟ تەمەشای گیرفانی ڕێبواران و کراسی ژنان دەکەی، وانا؟

دەم وچــاوی ســیســەڵە دیــاربوو، هەردوو لێــوی شــۆڕ بوونەوە، ژێر چاوەکانی شین بووبوونەوە.

لەبەر دەرگای کافیەکە وەستا وگوتی:

- وەژوور کەوە، بـا پەرداخــێ چـا بخــۆینەوە. تــۆ جلکــی خاوێنت لەبەردایە لەوانە ناچیت، بەڵام بە هەرحاڵ من بـاوەڕت پێناکەم..

هەرکە خۆمـان بە کـافەکەدا کـرد، وادیـاربوو متمـانەی پـێ پەیدا کردمەوە. چای تێکرد و بە خەمینیەوە کەوتە گێڕانەوەی ئەوەی کە چـۆن سـەعاتێک لەوەپـێش لەخەو ڕابـووە و هیچـی دەست نەکەوتووە بیخوات یان بیخواتەوە.

- دوێشـەو بەسەرخۆشـی وەکو عەرەبانچیەک خـۆم بەنێو جێگاکەمـا کـرد، بەڵام لەبیـرم نەمـاوە لەکـوێ و لەگەڵ کێـدا خواردبوومەوە.

زۆرم خەفەت بـۆ خـوارد و لە حوزووریـا پەشـۆکام، زۆرم حەزدەکـرد هەواڵـی کـچەکەی بپرسـم. دوای ئەوەی چـایەک وکەمێـک ڤودگـای خـواردەوە، کەوتە باسـی ئەو زبـرییە هاوبەشەی کە لە نێوان هەموو ژنانی ئەو شەقامەدا هەبوو. کە هەواڵی کچەکەیـم پرسـی، یەکسـەر تـۆنی قسـەکەی گـۆڕی و، گوتی: - بۆ دەپرسیت؟ ئۆە، نا، هەرگیز ناگەیتە کچەکەم!

قومێکی دیکەی خواردەوە ولە سەری ڕۆیی:

- کیـژەکە پەیوەنـدی بە مـنەوە نەبـوو. مـن کـێم؟ بابـایەکی کـارەکەری جلشـۆر. مـن سـەبارەت بە خەڵکـی وەکـو ئەو چتـۆ دایکێکم؟ ئەو خوێنەوار و ڕۆشنبیرە. ئەمە بایەخی خـۆی هەیە، بـرام! ئیـدی بەجێـی هێشـتم و ڕۆیـی دەگەڵ یەکێـک لە دەسـتە خوشکەکانیا دەژی، لەگەڵ کیژێکی دەوڵەمەنـدا، وادیـارە دەبێت بە دایەن وپەروەردەکەری منداڵان..

دوای بێدەنگیەکی کەم بە ڕاوێژێکی خۆش گوتی:

- کەس جلشۆر یان قاپشۆری ناوێ، لەوانەیە سۆزانیەکیان بوێ؟

یەکسـەر وام خەمڵانـد کە بـووە بە ڕووسـپی و سـۆزانی — هەموو ئەو ژنانەی ئێرەش سۆزانین. ئەوەندەم پێنـاخۆش بـوو کە ئەو زاراوەیەی سـەبارەت بەخـۆی گـوت، لە شـەرمانا و لە

سوێیاندا فرمێسک زاییە چاوانم. دەنگدانەوەی ئەو وشەیە لە گوێما زۆر بە ئازار بوو، بەتایبەتی کە لە زاری ناتالیاوەم ژنەوت، ئەم ژنەی کە پێش ماوەیەکی کورت، ئازا و بە ورە وسەربەست بوو!

مۆڕەیەکی لێکردم، ئاهێکی هەڵکێشا و بە توندی گوتی:

- کەرە چکۆل، لێرە هەڵێ! من ئامۆژگاریت دەکەم، لێت دەپاڕێمەوە کە جارێکی دی ڕوو لێرە نەکەی! چونکە تیا دەچیت.

پاشان بە سەر مێزەکەدا دانەوییەوە، بە قامکان وێنەی شتێکی لە سەر سینیەکە کێشا، ئەوجا بەدەنگێکی خۆش وبە وشەێن پچڕپچڕ، وەکو یەکێک خۆی بدوێنێت گوتی:

- بەڵام ئامۆژگاری من بۆتۆ فایدەی چییە، بەچی دەچێت؟ ئەگەر فایدەی هەبوایە، کچەکەم بە گوێی دەکردم.. هەمیشە پێمدەگوت: " نابێ دایکت بەجێ بێڵیت! نابێ کاری وابکەیت! " وەڵامی دەدامەوە: " کەواتە خۆم دەکوژم! " . ئیدی ڕۆیی بۆ قازان – چوو لەوێ تەمرێز بخوێنێت. ئەوە کارێکی بەجێ و باشە. بەڵام ئەدی من؟.. سەبارەت بە من، ئەوەتا دەمبینی. ئاخر پەنا بۆکێ بەرم؟ بۆ ئەو پیاوانەی لەم شەقامەدا دەژین..

لەوێ دانیشت، لە فکران ڕاچوو، خەیاڵ بردیەوە، لێوەکانی بەبێدەنگی دەجوڵان، وادیاربوو منی فەرامۆش کردووە. هەردوو گۆشەی لێوەکانی داچەکی بوون و دەمی لە هەیڤۆک دەچوو، کە لێوەکانیم بەوجۆرە بینی زۆرم خەفەت بۆخوارد، لەرەی چرچ ولۆچی دەم وچاوی پەیامێکی بێدەنگی دەنواند. ڕوخساری بریندای دیمەنێکی منداڵانەی هەبوو. چەپکێک لە قژەکەی لە ژێر سەرپۆشەکەیەوە هاتبووە دەرێ و بە سەر گۆنایدا ڕژابوو، لە پشت گوێچکە چکۆلەکەیەوە لوول بووبوو.

دڵۆپە ڕوندکێک کەوتە ناو چایە ساردەکەیەوە. کە تەمەشام کرد، پەرداخەکەی لادایە لاوە وهەردووچاوی بە توونــدی نوقاندن، دوو دڵۆپە فرمێسکی دیکەش لەچاوی بەربوونەوە و بە لکەی سەرپۆشەکەی دەم وچاوی سڕی.

نەمتوانی لەوەی پتر لە گەڵیا دانیشم، بە ئەسپایی هەستام:

- بە دوعا!

بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕێت ئاماژەی کردمێ کە لەوێ دوور بکەومەوە. لەوە دەچوو بیری چووبێت من کێم، گوتی: - ئێ؟ بڕۆ، ئەسپاردەی شەیتان بیت!

گەڕامەوە بۆ مەیدانەکە، لە ئەردالیون دەگەڕام کە قەولم دابوێ پێکەوە بچینە ڕاوەماسی. دەمویست سەربهوردی ژنەکەی بۆ بگێڕمەوە، بەڵام لە سەربانەکە نە ئەوم بینی نە (ولید). لەوکاتەداکە لە مەیدانە جەنجاڵەکەدا بۆ وان دەگەڕام، گوێم لە هەرا و هەنگامەی شەڕێکی باوی ئەو شەقامە بوو.

لە دەرگاکەوە وەدەر کەوتم، خەریک بوو خۆم بە ناتالیادا بکێشم. بەلارەلار بەسەر شۆستەکە کەوتبوو، لە تۆ وایە چاوی لە دەست داوە، هەنسکی هەڵدەدا و بەدەستێکی بە سەرپۆشەکەی دەم وچاوە بریندارەکەی دەسڕی وبەدەستەکەی دیکەی قژەکەی بۆ دواوە هەڵدەدایەوە. ئەردالیون و (ولید) لە دوایەوە دەهاتن.

"ولید" هاواریکرد: - با جارێکی دیکەش تێ هەڵدەین، دەی!

ئەردالیون، خۆی گەیاندە ژنەی داماو، کوڵە مستی لێ ڕاوەشاند. ژنێ بە دەم وچاوی شێواوەوە ڕوو بە ڕووی وەستایەوە. گڕی ڕق لە چاوانی دەبووەوە. هاواریکرد: - دەی، لێمدە!

خێرا دەستی ئەردالیونم گرت، بە حەپەساوی لێی ڕوانیم: - چیتە؟

بەهانکە هانک گوتم: - دەستی بۆ نەبەیت.

لە قاقای پێکەنینی دا:

- تۆ کێی، ماشقەی تۆیە؟ ئاە، ناتالیا، هەی هیچ وپووچ، نەمردی قەشەیەکت ڕاو کرد!

(ولید) لە قاقای پێکەنینی دا، هەردوو دەستی خستە کەلەکەی و بە دوو قۆلّی کەوتنە جنێودانی من. ئیدی ناتالیا دەرفەتی بۆ ڕەخسا ورزگاری بوو. کە هەستمکرد لەوەی پتر تەحەموول ناکەم، تا هێز لە بازووما بوو مستە کۆلّەیەکم بەسەر سینگی " ولید " دا کێشا و تەختی ئەرزەکە بوو، ئەوسا تا لاقم گرتی پێم وەغارەوە نا.

ماوەیەکی زۆر ڕووم نەکردە شەقامی میلیونایا، بەلاّم جارێکی دی لەگەلّ ئەردالیون دا یەکمان گرتەوە – ئەمجارەیان لە سەر کەلّەکێک تووشی بووم. بە ڕووگەشییەوە گوتی:- سلاّو، دیارنیت؟

بۆم گێڕایەوە کە من لەبەر ئەوەی لە ناتالیای دا و سوکایەتی بەمن کرد، تووڕە بووم. پێکەنینێکی دۆستانەی کرد وگوتی:

- چما واتدەزانی بە ڕاستمانە؟ هەر بۆ ڕابواردن تووڕەمان کردیت. بەلاّم سەبارەت بە ناتالیا – بۆچی لێی نەدەین؟ قەحپەیەکە وبڕایەوە. کە پیاو بتوانێ لە ژنی خۆی بدات، بۆچی لە قەحپەیەکی وەکو ئەو نەدات؟ بەلاّم ئێمە گالّتەمان دەکرد. بۆکس هیچت فێرناکات، من ئەمە زۆرچاک دەزانم.

- تۆ بە خەیالّی خۆت دەتوانی چی فێری ئەو ژنە بکەیت؟ خۆتۆ زۆر لەو باشتر نیت.

دەستی خستە سەرشانم و ڕایتەکاندم. بە تەوسەوە گوتی:

- شەڕەکە لەمەدایە، کەس لەکەس باشتر نییە. من هەست بەهەموو ئەمە دەکەم، براله – هەست بە هەرهەمووی دەکەم، بە شێوە و ناوەڕۆکیانەوە هەستیان پێدەکەم. خۆمن یەکێک نیم لە جووتیارە خوێڕیەکانی گوندەکەی تۆ.

مەست بوو، ڕوخساری ڕوناک بوو، وەکو مامۆستایەک ڕاهێنان بە قوتابیەکی گەمژە بکات، بە نەرمی و دۆستانە لێم ورد بووەوە.

ناو بە ناو ' پاڤل ئودینتسوف 'م دەبینی، لە جاران سەرحاڵ و چەلەنگتر بوو، جلکی گەنجانەی لەبەر دەکرد و زۆر بەڕێز و حورمەتەوە مامەڵەی لەگەڵما دەکرد. جارێک بەجۆرە نارەزاییەکەوە گوتی: - بۆچی ئەم کارەت هەڵبژاردووە؟ ئەگەر لەگەڵ ئەم جووتیارانەدا کار بکەیت هیچ بە هیچ ناکەیتوله جێی خۆت دەچەقیت..

ئەوجا، بە خەمینییەوە هەواڵی کارگەکەی بۆ گێڕامەوە:

- چیخاروف هێشتا لەگەڵ ژنە قەڵەوەکەدایە. پێدەچێت سیتانوفش حەزی لەو شتانە هەبێت. زیاد لە پێویست سەری کردووەتە خواردنەوە. گوکولیف، گورگان خواردوویانە – لە شەوی نوئیل دا لەماڵەوە دەبێت، فوول سەرخۆش دەبێت، ئیدی گورگەکان پارچەپارچەیان کردبوو. پاڤل، لە قاقای پێکەنینێکی بەکوڵی دا، جڵەوی بۆ خەیاڵ بەردابوو:

- گورگەکان خواردبوویان، ئەوانیش سەرخۆش بووبوون! بە شادی بەڕەڵڵای ناو لێرەوارەکە بووبوون، وەکو سەگی سێرکان لە سەر پاشووان ڕێیان دەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی توپی بوون.

منیش بەدەم گوێگرتنەوە دەستم بە پێکەنین کرد، بەڵام لە ناخی خۆما دڵنیابووم کە کارگەکە بۆمن تەواو بوو، بوو بە بەشێک لە ڕابردوو. هەڵبەتە زۆرم پێناخۆش بوو.

# (٢٢)

که زستان هات، هەموو کارەکانم لە پێشانگەکە وەستا، بازاڕ تەواو کز بوو. ئیدی دەبوایە لەماڵەوە هەمان کارە کۆنەکانی جاران بکەم. ئیدی ئەو وردە ئیشانە هەموو ڕۆژەکەی لێدەبردم، بەڵام ئێواران دەستم بەتاڵ دەبوو. ئیدی ئەو چیرۆک و ڕۆمانانەم بۆ ماڵی ئاغام دەخوێندنەوە کە بە زنجیرە لە " نیفا " و " پەیامی موسکۆ " بڵاو دەبوونەوە، بەڵام ئەو ڕۆمان و چیرۆکانەم بەدڵ نەبوون. بۆیە شەوانم بۆ خوێندنەوەی کتێبانی دڵخوازی خۆم و هەوڵی شیعرنووسی تەرخان کردبوو.

ڕۆژێک دوای ئەوەی هەردوو خانمی ماڵێ بۆ نوێژی ئێوارێ لە ماڵ وەدەرکەوتن و وەستام بەهۆی سووکە نەخۆشیەوە لە ماڵ مایەوەو لەگەڵ ژنەکانا بۆ نوێژ نەچوو. پێی گوتم:

– ڤیکتور دەڵێت گوایە تۆ شیعر دەنووسیت، ڕاستدەکات یان گاڵتە؟ دەتوانی هەندێک لەو شیعرانەتم بۆ وەخوێنی؟

نەمتوانی ئەو داوایەی ڕەت بکەمەوە. هەندێک لە شیعرەکانم بۆ خوێندەوە، پێدەچوو بەدڵی نەبن، بەڵام وای نواند کە پێی خۆشن و هانیدام کە بەردەوام بم و درێژە بە ئەزموونی خۆم بدەم، گوتی:

– بەردەوام بە، بەردەوام! بەڵکو پوشکینێکی دیکەت لێدەربچێت. شیعرەکانی پوشکینت خوێندوونەوە؟

*ئایا دەتوانی جنۆکەیەک بکوژی*
*یان لەگەڵ جادووگەرێکا*
*زەماوەند بکەی؟*

- خەڵکی ئەو سەردەمە باوەڕیان بە جنۆکە هەبوو، بەڵام ئەو باوەڕی پێیان نەبوو، ئەو شیعرەی هەر بۆ شۆخی گوتبوو.

کەمێک دەفکرەوە چوو ولە سەری ڕۆیی:

- بەڵێ، بەڵێ ڕاستە. تۆ هەق بوو لە سەر خوێندن بەردەوام بی، بەڵام تازە درەنگە. مەگەر هەر خوا بیزانیبا دەبوویت بە چی. دەفتەری شیعرەکانت لە ژنەکان بشارەوە، ئەگەر پێ بزانن وازت لێناهێنن، ژنان حەزی زۆریان لە شیعرە، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کە گاڵتە بە پیاو دەکەن!

وەستام ماوەیەک بوو، زیاتر بیری دەکردەوەو کەمتر قسەی دەکرد. بەترس وگومانەوە دەیڕوانیە دەوروبەر. لە لێدانی زەنگی دەرگا ڕادەچڵەکی. هەندێجار بەشتی زۆی هیچ هەڵدەچوو و تووڕە دەبوو. دژی هەموو کەس وگشت شتێک بوو. لە ماڵ وەدەر دەکەوت و درەنگانی شەو مەست و کەلەلا بۆ ماڵ دەزڤڕییەوە. خۆیا بوو کە جۆرە ناکامییەک ژیانی لێ تاڵ کردووە. بەڵام چونکە متمانەی بەکەس نەبوو، گرێی دڵی بۆ چ کەسێک نەدەکردەوە و ئەم نهێنییە هەر بە پەنهانی مایەوە.

یەک شەمموان، لە دوای نیوەڕۆ تا سەعات نۆی شەوێ دەچوومە پیاسە و گەڕان، سەرێکی کافەی یامسکایام دەدا. بەڕیوەبەری کافەکە پیاوێکی قەڵەوی سادە بوو بە نێوی گاروف، ئەم پیاوە لە هەموو وەرزێکا ئارەقەی دەکردەوە. زۆر حەزی لە ئاواز وسترانان بوو. دەنگبێژانی هەموو کڵێساکان بەمەیان دەزانی، ئیدی بۆ ئەوەی لە دانی پارەی چا و ڤودگا و بیرە بخەلەسن، دەهاتن لە لای ئەو کۆدەبوونەوە. ئەم دەنگبێژانە زۆربەی هەرە زۆریان بادەنۆش و مەیگوسار و خەڵکی حازرخۆری بەر سێبەر بوون. ئیدی بۆئەوەی

خواردنەوەکەیان حەڵاڵ بکەن، دەستیان بە گوتنی سروودێن بێتام و بێ زەوق دەکرد. جا لەبەر ئەوەی مەیگوسارە بەدینەکان، پێیان وابوو کافە وبار، شوێنی ئەم جۆرە ئاواز و موزیقایانە نییە، ئیدی بەڕێوەبەری کافەکە، هەندێجار سروودبێژەکانی بۆ ژوورە تایبەتیەکەی خۆی دەعوەت دەکرد. ئیدی کە دەرگای ژوورەکەیان دادەخست، دەنگیان تەواو کز دەبوو، مەگەر لە پشت دەرگاکەوە گوێم لێیان بگرتبایە.

زۆرجار وا ڕێدەکەوت کە دەنگبێژ و سروود بێژانی پیشەیی و زەوقی تێکەڵ دەبوون. یارۆی کافەچی هەمیشە تاقیبی دەنگبێژانی چاکی دەکرد و کون وکەلەبەری بازاڕیان بۆ دەگەڕا و سەخاوەتمەندانە خەرجی دەکێشان. لە ڕۆژانی بازاڕا دەچوو بۆ ناوشار، لە نێو ئەو گوندیانەی کە لە هەر چوارنکاڵی دەڤەرەکەوە بۆ شار دەهاتن، بۆ دەنگخۆشان دەگەڕا و بۆلای خۆی دەعوەتی دەکردن.

ئیدی دەنگبێژ و سترانڤانە تازەکە، لە نزیکی بارەکەوەو لە هەنبەر بەرمیلێک ڤودگادا، کورسیەکی دەدرایە، سێبەری سەری لە سەر بەرمیلەکە، وەکو ئەوەی لە چوارچێوە گیرابێ دەردەکەوت.

کلیچوف لە نێو سترانڤانە تازەکاندا لە هەموویان باشتر بوو، کابرایەکی زیندرووی، کورتەبالای مردەڵەی لاواز بوو، کۆمەڵێک گۆرانی زۆرباشی لەبەر بوو. شێوەی لە کەڵای سیسەوە بوو دەچوو، قژی سوور بوو، لووتی لووس لە کەپووی مردوو دەچوو، چاوە بچووک و خەواڵووەکانی بە ئاستەم دەجولان. کە بیویستبا گۆرانی بڵێت دەینوقاندن، پشتی سەری دەنا بە بۆشکە ڤودگاکەوە، سنگی دەردەپەڕاند و بەدەنگ و ئاوازێکی زوڵاڵ هەڵیدەکردە گۆرانی:

*مژ ودوومانی ئاسمان ڕەوییەوە*

*دەشت ودەر وەزراکانی داپۆشی*
*نە ڕێگە دیاربوو... نە جێ پێ..*

هەڵدەستا وشانی لە سەر بۆفیەکە دادەدا و سەری دەبردە دواوەوەو چاوی دەبڕییە بن میچەکە و لە سەری دەڕۆیی:

*. بۆکوێ بڕۆم من*
*چۆن لەم سەرەولێژە*
*ڕێگەی خۆم بدۆزمەوە من؟*

دەنگی نزم بوو، بەڵام ڕوون و خۆش و زوڵاڵ بوو، وردە وردە بە سەر هەموو کافەکەدا زاڵ دەبوو، وشە خەمناکەکانی، ئاە وناڵەکانی، قەرار وجوابەکانی، کارێکی سەیریان لە تێکڕای موشتەرییە مەستەکان دەکرد ولە فکران ڕادەچوون و بە بێدەنگی چاویان دەبڕییە مێزەکەی بەردەمیان. ئەم ئاواز و موزیکە کاری لە ناخی من دەکرد.

بێدەنگیەکی بە سام، وەکو بێدەنگی کڵێسا، باڵی بەسەر کافە و بارەکەدا دەکێشا، سترانڤانەکەم وەکو قەشەیەکی پیاوچاکی بەسام وویقارِ دەهاتە بەرچاو، وەعزی بۆ خەڵکەکە دانەدەدا، بەڵکو بە هەموو دڵ و گیانیەوە، لە پێناوی هەموو تیرەی بەشەردا نوێژی دەکرد و بە دەنگی بەرز بیری لە هەموو داماویەکانی ژیانی تیرەی بەشەر دەکردەوە. ئەو پیاوە ڕیشنانە لە هەموو ئالییەکەوە، نیگای منداڵانەیان تێدەبڕی. هەندێجار یەکێکیان هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و لەو ڕێگەیەوە گوزارشتی لە ئاستی بەرزی گۆرانیەکە دەکرد. لەو کاتانەدا وام خەیاڵ دەکرد کە ئەم بینەوایانە کە تا ئەوکاتە لە ژێر باری ڕەنجی ڕۆژانەدا پشتیان چەمابووەوە، تازە لە مانای ژیان تێدەگەن.

لیزوخا قەڵەوم لە سووچێکا بینی، ژنێکی هەرزەی لەشفرۆش سەری کردبوو بە نێوان شانە پانەکانیا و دەگریا،

ڕوندک وەکو بارانی بوهار بەچاوە باشقاڵەکانیا دەهاتەخوارێ.
لە شوێنێکی نزیکی ئەوەوە، مترووپولسکی دەنگبێژی باریتون، دانیشتبوو. بە کەلەشە زەلام و قژە لوولەکەیەوە لە سەر مێزێک پان بووبووەوە، چاوە درشتەکانی بڕیبوونە پەرداخێک ڤۆدکا کە لە بەردەمیا دانرابوو. لە قەشەیەک دەچوو کە لە کڵێسا دەرکرابێ. جارجار پێکەکەی هەڵدەگرت و بۆ لێوی دەبرد، بێئەوەی دەمی تێوەبدات، بە شێنەیی دایدەنایەوە. لەوە دەچوو پێی نەخورێتەوە.

هەموو ئەوانەی لە کافە وبارەکەدا بوون لە خۆدا غەرق بووبوون، خەیاڵاوی و بێدەنگ گوێیان لە ئاواز وگۆرانیەکی خۆش و دڵگیر دەگرت.

کە کلیچوف، لە گۆرانیەکەی دەبووەوە، خاکیانە لە سەر کورسیەکەی دادەنیشت و بەڕێوەبەری کافەکە، پەرداخەکەی تەژی ڤودکا دەکرد وبە منەتباریەوە بزەیەکی بە ڕوویا دەدا.

- دەنگت نەڕزێ، بەڕاستی سترانڤانی، هەرچەندە سروود دەخوێنی نەک گۆرانی، بەڵام بەڕاستی هونەرمەندیت و کەس ناتوانێت نکۆڵی لە هونەرمەندیت بکات.

کلیچوف بە کاوەخۆ ڤودکاکەی هەڵدەدا، گەرووی پاک دەکردەوەو بە ڕاوێژێکی شیرین دەیگوت: - هەرکەسێک دەنگی خۆش بێت دەتوانێ گۆرانی بچڕێت، بەڵام کەس ناتوانێ لە من باشتر، گوزارشت لە جەوهەر و ڕوحی گۆرانیەکە بکات!

- باشە، زانیمان دەنگت خۆشە، بەڵام ئەوەندەش بە خۆتەوە مەفشە!

یارۆی دەنگبێژ، بە هەمان ئارامی بەڵام بەڕژد بوونێکی زیاترەوە دەڵێت:

- ئەگەر کەسێک بەهرەیەکی تیا نەبێ، لە خۆڕایی خۆی هەڵناکێشێت!

کابرای کافەچی کە لەم خۆ هەڵکێشانەی یارۆی سترانڤان پەست دەبێ، دەڵێت:

- کلیچوف، تۆ زۆر لە خۆباییت!

- من بە ئەندازەی خۆم لە خۆباییم، نە زیاتر ونەکەمتر.

متروپولسکی، لە جێگاکەی خۆیەوە پەست وتووڕە هاوار دەکات:

- ئێوە، ئەی مێروولانی گەندەڵ، توانای ئەوەتان نییە پەی بە بەهرەی ئەم فریشتە گوناحکارە بەرن!

ئەم پیاوە لە گەڵ کەسدا نەی دەکێلا، باسی هەر شتێکی بکردبایە ئەوەندە بە خراپی باسی دەکرد، کە هەموو یەک شەممەیەک لە لایەن دەنگبێژانەوە بیرازێکی باش دەکرا.

کافەچیەکە، زۆری حەز لە گۆرانیەکانی کلیچوف بوو، بەڵام تەحەمولی خودی گۆرانیبێژەکانی نەدەکرد،حەزی لە چارەی نەدەکرد، هەرکاتێ دەرفەتی بۆ ڕەخسابا زەمی دەکرد و بە ئاشکرا بێڕێزی پێدەکرد ودەیکرد بە گەپجاڕی خەڵکی، هەموو هاتوچۆکەرانی کافەکە و تەنانەت کلیچوف بەخۆیشی هەستی بەمە دەکرد.

کافەچیەکە، بەڕاشکاوی ڕای خۆی دەردەبڕی:

- سترانڤانێکی زۆرچاکە، بەڵام زۆر خۆی هەڵدەکێشێت، پێویستە ئەم تەبیعەتەی پێ تەرک بکەین.

ئامادەبووان بۆیان دەسەلماند: - دروستە گەنجێکی خۆپەسندە!

کافەچیەکە دەیگوت:

- ئاخر چی هەیە تا خۆی پێوە بابدات! غافڵە لەوەی کە خوا ئەم دەنگەی پێداوە – خۆ خۆی دروستی نەکردووە! دەنگەکەشی، شتێکی زۆر نائاساییو دەگمەن نییە.

خەڵکەکە دووبارەیان دەکردەوە:

- تەواو دروستە، دەنگی زیاتر بەهرەی خودادادیە، تا شتێکی دیکە بێت.

ڕۆژێک دوای ئەوەی کلیچوف ماندوو بوو، لە کافەکە وەدەرکەوت یارۆی کافەچی، کەوتە دنەدانی لیزوخا خەپەلە وگوتی:

- ماریا ییفدوکیموفنا، پێویستە هەندێک پێی ڕابوێری — کەمێک چاوبازی دەگەڵ بکە، ها؟ ئەم کارە بۆ تۆ ئاسانە.

ژنەی تاین، سووکە پێکەنینێکی بۆ کرد وگوتی:

- ئەگەر کەمێک گەنجتر بوایەم ئیهێکی تیابوو.

یارۆی کافەچی، بەجۆش و خرۆشەوە، ڕژد بوو لە سەر دنەدانی.

- کچانی گەنج ئەو شتانە نازانن، تۆ دەبێ ئەمە بکەیت، ئەوکارە هەر لە تۆ دەوەشێتەوە! چەند حەزدەکەم بە چاوی خۆ بیدینم بە دەوری تۆدا بخولێتەوە! دەبێت خەمێک بخەیتە دڵیەوە، هەنگێ باشتر دەسترێت. ییفدوکیموفنا، ئەم کارە لەبەر خاتری من بکە، زۆر مەمنوونت دەبم!

بەڵام لیزوخا، پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە. لە جێی خۆی قەڵەو وخەپان دانیشتبوو، سەری دانەواندبوو، گەمەی بە گێزو گوڵینگ و ڕیشووی سەرپۆشەکەی خۆی ەکرد و بە ڕاوێژێکی گونگ وخاوەوە دەیگوت: - نا، بۆ ئەم جۆرە کارانە ئافرەتێکی لە من گەنجتر پێویستە، ئەگەر کەمێک گەنجتر بوایەم، سێ و دووم لێنەدەکرد.

کافەچیەکە، زۆری حەز دەکرد کلیچوف مەست بکات، بەڵام ئەو هەرکە دوو سێ بەندی دەگوت، یەک دوو قومی دەخواردەوەو ملپێچێکی خوری لە ملیەوە دەئاڵاند و کاسکێتەکەی لە سەرە گڤنەکەی دەنا و دەڕۆیی.

کافەچیەکە زۆرجار دەنگبێژانی زەوقی دێنان، تا هەڤرکی یارۆی زیندروویان پێبکات. وەختایەک ناڤبری بە شەوق و زەوقەوە و بەدەم چەپڵە و ئافەرینی ئامادەبووانەوە، گۆرانیەکەی خۆی تەواو دەکرد، کافەچیەکە بە شادمانیەوە دەیگوت:

- برادەرینە، ئەمرۆ دەنگێکی خۆشی دیکەمان لە گەڵە، با پێتانی بناسێنم. وەرە برادەر! با گوێمان لە دەنگە خۆشەکەت بێ، هەمووومان تاسەمەندی دەنگی تۆین!

هەندێجار، وا ڕێدەکەوت کە ئەم دەنگبێژە خۆڕسک و دێمیە، دەنگی خۆش بێت، بەڵام هەرگیز بیرم نایەت کە هیچ کەسێکیان توانیبێتیان، بە هەمان سادەیی و قووڵی سۆزی کلیچوفەوە، ئەم پیاوە کورتەباڵا و بێ دیمەنە، ستری بن.

یارۆی کافەچی، بە ڕاوێژێکی تاڵ و کەسەردارەوە دەیگوت:

- بەڵێ، بەڵێ خراپ نەبوو، ڕاستە دەنگت باشە، بەڵام ڕوحی..

ئامادەبووان پێدەکەنین: - وادیارە کەس هەڤرکی یارۆی زیندروی پێناکرێت!

کلیچوف، لە ژێر برۆ سوور وچرەکانیەوە، نیگایەکی ئامادەبووانی دەکرد و بە ڕاوێژێکی هێدی پڕ نەزاکەتەوە، ڕوو لە کافەچیەکە دەیگوت: - تۆ بەخۆڕایی کاتی خۆت بە فیڕۆ دەدەیت، کەسی لە من بەهرەدارترت دەستناکەوێ، ئەم بەهرەیەی من خودادادیە..

یەکێک، بەجدی هەڵیدەدایێ: - مەگەر چ شتێک خودادادی نییە؟

کلیچوف وەڵامی دەدایەوە: - هەرهەموو مەی ناو بارەکە بخورێتەوە و تەواو بێ، پولێک لە گیرفانتاندا نەمێنێ، هاوتایەکی منتان دەست ناکەوێ.

کافەچیەکە، دەم وچاوی سوور دەبووەوە و لەبن لێوانەوە دەیگوت: - بابزانین، بابزانین..

کلیچوف لەسەری دەڕۆیی: - بەخۆت دەزانی، گۆرانی شەڕە کەڵەشێر نییە.

- ئەم وەعز دادانەت لە چییە؟

- من وەعز دانادەم، بۆتی ڕوون دەکەمەوە : سەرچاوەی گۆرانی ڕوحە.

- واز لەم وڕینانە بێنە! لە جیاتی ئەمە گۆرانیەکمان بۆ بڵێ.

کلیچوف، قاییل دەبێت: - زۆرچاکە، من ئەگەر خەویشم لێبکەوێ دەسبەرداری گۆرانی نابم..

سووکە کۆکەیەکی بۆ دەکات وهەڵدەکاتە گۆرانی.

ئەوسا، هەموو وردە گلەیی و قسە وقسەڵۆکێکی ناو کافە و بارەکە وەکو ئەوەی فوویەکی ئەفسووناوی لێبکرێت، دەرەوییەوە و دووکەڵ ئاسا بە ئاسمانا دەچوو. هەنگێ شنەیەکی تازە بەسەر ئامادەبووانا دەهات و ژیانێکی تازەی مەحەبەت و میهرئامیز هەمووانی لە ئامێز دەگرت.

من بەغیلیم بەم پیاوە دەبرد، لە ناخی دڵەوە. بەغیلیم بەو بەهرەیەی دەبرد کە دەیتوانی خەڵکی بە دەنگ و ئاوازی خۆی سەرمەست بکات. حەزم دەکرد زیاتری بناسم و پتر لێی نزیک ببمەوە و دەربارەی هەموو شتێک قسەی دەگەڵ بکەم، لێ جورئەتم نەدەکرد لێی نزیک ببمەوە، بە شێوازێکی سەیر دەیڕوانیە دەوروبەری خۆی و لە تۆ وایە ئەو خەڵکەی بەردەمی نابینێت. شتێکی تیابوو حەزم لێی نەدەکرد، وێڕای ئەوەش حەزم دەکرد دڵبەندی خۆمی بۆ دەرببڕم. کە دەمبینی کاسکێتەکەی بە شێوەیەکی ناشیرین لەسەر دەنا وەکو پیرەمێران دەیهێنایە سەر گوێچکەکانی و بە کەش وفشەوە

ملپـــێچە ســـوورەکەی لە ملـــی دەپێچـــا و دەیگـــوت: - ئەمە دڵدارەکەم بۆی چنیوم، کیژێکی گەنجە.

ڕقم هەڵدەستا.

وەختـــایەک گـــۆرانی نەدەچـــڕی، غروورێکـــی قێـــزەون لە سەروسیمای دەنیشت. سـەری کەپووی دەخوراند و زۆرکەم قسەی دەکرد وبە کورتی وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەدایەوە.

جارێـک لە لایەوە دانیشـتبووم و شـتێکم لێپرسـی کە بیـرم نەماوە چی بوو، ئەو بەبێئەوەی لەخۆی بگرێ ئاوڕم لێبداتەوە، بەتووندی گوتی: - وازم لێبێنە کوڕۆ!

میتروپولسکی کۆرسم زیاتر دەچووە دڵەوە. وەختـایەک بـۆ کـافەکە دەهـات. بە هەنگـاوی قورسـەوە، وەکـو کەسـێکی زۆر مانـدوو بە ڕاڕەوەکەدا تێـدەپەڕی. بەنـووکی پـا کورسـییەکی دەدایە لاوە، لە سـەری دادەنیشـت، هەردوو ئانیشـکی دادەدایە سـەر مێـزەکەی بەردەمـی، سـەرە گەورە و قـژنەکەی لە نێـو هەردوو دەستی دەنا، بە بێدەنگی دوو سێ پێکی ڤودگای دوا بە دوای یەک هەڵـدەدا و پاشـان قرقێنەیەکـی بەرزی لێـدەدا. خەڵـکەکە ئاوڕیـان لێـدەدایەوە، ئەویـش نیگـایەکی گۆسـاخی بەڕوویانـدا دەگێڕا و، لە ناکـاوا بە دەنگێکـی دلێر دەیپرسـی: - چییە؟ تەمەشای چی دەکەن؟

هەندێجار وەڵامیان دەدایەوە: - تەمەشای شەیتان دەکەین!

شەوی وا هەبوو، دەهات، بەبێئەوەی ورتەی لێوە بێ، تـاقە وشەیەکی لەزار بێتەدەرێ، تـا حەوت نیوەشـەو دەیخـواردەوە، بەبێـــدەنگی هەڵدەســـتا وخـــۆی بکـــێش دەکـــرد ودەڕۆیـــی. زۆرجـاریش گـوێم لێـی دەبـوو، کە لە خەڵکـی تـووڕە دەبـوو، لەشـــێوەی پێغەمبەرانـــا ئامۆژگـــاری دەکـــردن و هەڕەشـــەی لێدەکردن:

- من بەندەی ئەمینی خودام. وەکو ئەشعیای پێغەمبەری دێرین سەرکۆنەتان دەکەم. ئاگادارتان دەکەمەوە. واوەیلا بەحاڵی شاری ئەریول کە بووە بە مەکۆی حیز ودزان، هەرزە و داوێن تەڕان و ئەوانەی لە جەرگەی شەهوەتڕانی خۆدا نقووم بوون! واوەیلا بە حاڵی ڕێگاوبانە ئاوی و وشکانیەکان، کە جگە لە حەیواناتی بەشەری کەسی تر ناگرنەخۆ، ئەو حەیواناتەش ئەنگۆن، ئەی بەد مەستانی چەپەڵ و خوارۆخ (زۆرخۆری نەوسن)، ئێوەی خڵتەی ئەم دنیایە! ژمارەتان بەقەد خاک و خۆڵە، هەی دواتان بڕێت، ڕۆژێ دێ، ئەم خاک وخۆڵەش ناتانگرێتە خۆی!

دەنگە زوڵاڵەکەی شووشەی پەنجەرەکانی دەلەراندەوە، مشتەریەکان تووڕە بوونەکەیان پێخۆش بوو وستایشیان دەکرد: - چەند دەماوەری! چ زمانێکت پێوەیە!

دۆستایەتی گرتن دەگەڵ ئەم پیاوەدا زۆر ئاسان بوو — هەرکە پێکێکت بۆ کڕیبا، ئیدی دەبوو بە ئاشنات. هیچ شەرمی نەدەکرد داوای بوتڵێک ڤودگا و پارچەیەک جگەری گات بە بەهاراتەوە لێبکات، ئەوە خواردنی دڵخوازی ئەوبوو. چونکە دەم و ورگی دەسووتانەوە.

ڕۆژێک داوام لێکرد ڕێنوێنیم بکات کە چ کتێبانێک بخوێنمەوە، یەکسەر بە پرسیارێک وەڵامی دامەوە: - بۆ کتێبان دەخوێنیتەوە؟

کە بینی لە پرسیارە ناگەهانیەکەی ڕاچڵەکیم، دەنگی نرم کردەوەو لە سەری ڕۆیی: - کتێبانی ئاینیت خوێندووەتەوە؟

- بەڵێ.

- دووبارە بیانخوێنەوە، ئەوەندەت بەسە. هەموو شتێکی کۆن و نوێیان تیایە، فەلسەفەی پێشینیان و پاشینیان لە خۆ

گرتووه. تەنیا کەر و حەیواناتی زمان نەزان لێیان تێناگەن. واتە کەس لێیان تێناگات. تۆ چ کارەی، سروودخوانی کڵێسای؟

- نەخێر.

- بۆ نەخێر؟ پێویستە گۆرانی بڵێیت. ئەمە ئاسانترین و توورەهات ترین پیشەیە.

پیاوێکی سەر مێزەکەی دی گوتی: - ئەدی خۆت.. گۆرانیبێژ نیت؟

- من؟ کابرایەکی سەرگەردان و ئاوارەم. باشە؟

- هیچ نیت.

- بێگومان. هەموو خەڵکی دەزانن، مێشکت هیچی تیانییە و، هیچی تیا نابێت. ئامین!

ئەو شێوازە ئاخافتنەی تەنانەت دەگەڵ منیشدا بەکار دەبرد، هەرچەندە دوای ئەوەی دوو سێ جار دەعوەتم کردبوو، کەمێک لە گەڵ منا نەرم ڕەفتار بوو، تەنانەت ڕۆژێک بەجۆرە حەپەسانێکەوە پێی گوتم: - هەرچەند سەیرت دەکەم دەمەوێ تێبگەم کە تۆ کێی، دەکەیتە چی و بۆچی؟ دەتوانی خۆت بە شەیتان بسپێریت، هەر بە خەیاڵما نایەت!

هەرچی سەرم دێنا و سەرم دەبرد، لە هەڵوێستی وی سەبارەت بە کلیچوف حاڵی نەدەبووم. بەدڵ و بەگیان گوێی لە گۆرانیەکانی دەگرت، هەندێجار بزەیەکی دۆستانەشی بۆ دەکرد، بەڵام نەیدەویست دۆستایەتی بکات، بگرە هەندێجار لە عەلەییشی دەدوا:

- کابرایەکی لێبۆکە! نەفەسی درێژە، دەزانێ چۆن گۆرانی دەڵێت، بەڵام وێڕای ئەوەش زۆر کەرە، کەرێتی کردووە بە کێڕێن!

- بۆچی؟

- چونکە بە کەرێتی لە دایک بووە.

من حەزم دەکرد ئەو کاتانە بیدوێنم کە سەرخۆش نەبوو، بەلام ئەوکاتانە هەمیشە هەر دەیبۆلاند و بەڕاست و چەپیا مۆڕەی لەم ولەو دەکرد. پاشان لە خەلکانێکم زانی ئەم پیاوە داماوەی کە نها هەمیشە مەستە، کاتی خۆی لە ئەکادیمیای قازان خوێندنی بالای تەواو کردووەئەگەر خۆی گەرەکی بوایە لە گین بوو ببێت بە قەشە باشی. لە هەوەلەوە باوەڕم بەو قسەیە نەکرد. بەلام ڕۆژێک، کە دەم دواند، هەروا خۆ بە خۆ ناوی قەشەباشی " کریسانت "م بەزارا هات.

متروپولسکی بەدەم سەر لەقاندنەوە گوتی:

- کریسانت؟ دەمناسی. مامۆستا و پشتیوانم بوو. ئەو لە قازان، لە ئەکادیمیای قازان بوو. کریسانت بە مانای " گوڵی زێڕین " دێت، وەکو بامفا بیرندا گوتی. ئەلهەقی ئەم کریسانتە لە زێڕ بوو!

پرسیم: - ئەدی بامفابیریندا کێیە؟

متروپولسکی، بە پەستی وبە کورتی گوتی: - ئەوە ئیشی تۆ نییە.

وەختایەک گەیمە مالەوە، لە دەفتەری یاداشتەکانما نووسیم: "دەبێ ئەم بامفابیریندایە بخوێنمەوە " هەر لە خۆمەوە بیرۆکەیەکم لەلا دروست بوو، کە گوایە بیریندا وەلامی گشت ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە ڕوحم عەزاب دەدەن.

ئەم دەنگبێژی کۆرسە، حەزی دەکرد ناوی سەیر سەیر و وشەیێن تێکەل وپێکەڵ بەکار بەرێت و، منیش بەمە پەست دەبووم.

جارێکیان گوتی: - ژیان مرۆڤانی نییە.

پرسیم: - ئەدی کێ مرۆڤانیە؟

کە بینی پەشۆکام، پێکەنی وگوتی: - یەکێک لە خەلکان.

ئیدی بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە و ئەو حەقیقەتەی کە لە ئەکادیمیا خوێندوویەتی، کردیانە کارێک بیر لەوە بکەمەوە کە ئەم پیاوە کۆگای مەعریفەیە، زۆرم لە بەر گران بوو کە زۆر بە نە بەدڵی و بە لەگەزەوە قسانی دەکرد. نەمدەزانی چۆن لێی نزیک ببمەوە.

وێڕای ئەوەش کاری لە ڕوح ودەروونم کرد. شێوازی بوێرانەی قسەکانیم، کە بە هەمان شێوازی نەبی ئەشعیا دەیکردن، پێخۆشبوو. دەی پرتاند: - ئاخ لە گەندەڵی و بۆگەنی زەوی! بەدڵی شەڕانیان دەچەرخێ و پیاوچاکان لە قوڕی ڕەش دەنێت. بەڵام هاکا ڕۆژی پەسلان هات، هەنگێ کار لە کار ترازاوە و هەموو شتێک براوەتەوە!

کە گوێم لەو هاوارە پڕ نائومێدیە دەبوو کابرای ˚ ئەمە جوانە ˚م بیر دەکەوتەوە، ناتالیای جلشۆرم بیر دەکەوتەوە کە ڕۆژی بەم ڕۆژگارە ڕەشە گەیی بوو، شاژنە مارگۆم بیردەکەوتەوە کە ئەو هەموو قسە وقسەڵۆکە پیسانەی دوو خرابوو. زۆرشتی دیکەم بیر دەکەوتەوە!..

ئاشنایەتیە کورتەکەم لە گەڵ متروپولسکی دا، بە شیوەیەکی سەیر کۆتایی هات.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی بەهارا، لە کێڵگە و مەزرایەکی نزیکی سەربازخانەیەک تووشی بووم. بە تاقی تەنیا، بە پێیان، وەکو مراوی ڕێی دەکرد، وەکو وشتر سەری تەکان دەدا. بەدەنگێکی گڕ پرسی:

- هاتوویە پیاسە؟ وەرە با پێکەوە پیاسە بکەین. منیش دەمەوێ بایەکی باڵ بدەم، بەڵام برادەری ئازیز، من نەخۆشم، بەڕاستی نەخۆشم.

چەند هەنگاوێک بەبێدەنگی ڕێمان کرد، لە ناکاوا پیاوێکمان لە قووڵایی کەندێکا بەدی کرد، لە سەرلا پاڵکەوتبوو، شانی بە

دیـوارێکەوە دابـوو، پـاڵتۆکەی لە یەک لاوە بەخۆیا دابـوو وتـا سـەرووی گوێچکەکـانی هـاتبوو، لەوە دەچـوو ویسـتبێتی دای بکەنێت و نەیتوانی بێ دایبکەنێت.

یـارۆی بـاریتون وەسـتا، کـابرای نەناسـی نیشـانی مـن دا وگوتی: - نەگبەتە سەرخۆشە!

بەڵام مـن لە دۆڵەکەدا، لە سـەر گیـایە تـازەکەدا، لە دەوری کابرادا دەمـانچەیەکی گەورەو کڵاوێک و بوتڵێک ڤودگام بینی کە تــۆزێکی لێخورابــووەوە. کــابرا یــاخەی پــاڵتۆکەی هەڵــدابووەوەو وەکــو یەکێــک شــەرمەزاربێ بەو ئــاوایە سەروچاوی داپۆشی بوو.

مـاوەیەک بە بێدەنگی وەسـتاین، هەنگێ میتروپولسـکی لاقە درێژەکانی بڵاوکردنەوەو گوتی:

- خۆی کوشتووە!

یەکسـەر زانـیم کـابرا مەسـت نیـیە، بەڵکـو مـردووە. بەڵام کـارەکەم ئەوەنـدە بەلاوە سـامناک بـوو کە بـاوەڕم بە چـاوی خۆم نەدەکرد.

لە بیـرمە ئەوسـا کە تەمەشـای کەلـلە زەلام وسـافەکەی و گوێچکە شینەوە بووەکانی یارۆم دەکرد کە بە ئاستەم لە ژێر یـاخەی پـاڵتۆیەکەیەوە دیـاربوو، هەسـتم نە بەتـرس و نە بە بەزەیی نەدەکرد کە مرۆڤێک لە ڕۆژێکی بەهاری ئەفسـووناوی وەهادا دەستی بچێتە خۆی و بتوانێ خۆکوژی بکات.

میتروپولســکی، بــلەز کەوتە هەڵگڵــۆفتنی هەردوو گۆنــا گۆشــتنەکانی، لە تــۆ وایە ســەرمایانە و دەیەوێــت گەرمیــان بکاتەوە. ئەوجا بە دەنگە گڕەکەی گوتی:

- پیـاوێکی پیـرە. ڕەنـگە ژنەکەی ناپـاکی لێکردبێـت، یـان کێشەی دارایی بۆ چێبووبێ..

ئەوسا منی بۆ شار ڤڕیکرد تا پۆلیس ئاگادار بکەمەوە، بەخۆیشی لە قەراخ کەندەکە ڕۆنیشت و لاقەکانی لێشۆڕ کردەوە. پالتۆ شڕەکەی دابوو بە شانیا. هەرکە پۆلیسم ئاگادارکردەوە، بە هەشتاو گەڕامەوە، بەڵام میتروپولسکی دەنگبێژ، دەرفەتی هێنابوو وبوتڵە ڤودگاکەی خواردبووەوە و چۆڕبڕی کردبوو، بوتڵە بەتاڵەکەی بەدەوری سەریا بادەدا و هاواریدەکرد:

- ئەمە بە کوشتی داوە! وێرانی کردووە!

بە تووڕەیی و هەڵچوونەوە بوتڵەکەی تووڕ دا و ورد وخاش بوو.

کابرای پۆلیس بە غار لە دوای منەوە هات، تەمەشایەکی لەزگینی ناو کەندەکەی کرد، کڵاوەکەی داکەند، نیشانەی خاچی بە دەوری خۆیدا کێشا و ئەوسا ڕوویکردە میتروپولیسکی ئاوازخوێن وگوتی: - تۆ کێیت؟

- ئەمە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

پۆلیسەکە کەمێک دەبیرەوە چوو، ئەوسا بە نەزاکەتەوە پرسی:

- یانی چی، کابرایەکی مردوو لەو گۆڕە کەوتووەو تۆش مەستیت؟

میتروپولیسکی ئاوازخوێن، بەکاوەخۆ وەڵامی دایەوە: - من بیست دانە ساڵی ڕێکە مەستم!

من دڵنیابووم، لە سەر ئەوەی کە ڤودگاکەی کابرای مردووی خواردبووەوە دەیگرن. هەندێ خەڵکی کە دیارنەبوو چۆن بە هەواڵەکەیان زانی بوو بە هەشتاو لە شارەوە هاتن. مفەوەزێک بەخۆ و عەرەبانەیەکەوە گەییە جێ، بە پەلە دابەزی، خۆی هەڵدایە ناو کەندەکەوە، پالتۆکەی سەر مردووەکەی

هەڵـدایەوە. تەمەشـایەکی سـەروچاوی کـرد وپرسـی: - کـێ یەکەمجار هاتووەتە دیاری؟

میترو پولسکی بەرسڤی دایەوە: - من.

مـفەوەزەکە، نیگـایەکی لەزگینـی کـرد، لەبـن لێـوانەوە و بەڕاوێژێکـی هەڕەشـە ئـامیزەوە گـوتی:- ئـاه، بە دیتنـت خۆشحاڵم، ئەی پیاوە جوانەکە!

خەڵـکەکە، کە ژمارەیـان نـزیکەی پـازدە کەسـێک دەبـوو بە هانکەهانـک و هەڵچـوونەوە، لە قەراخ کەنـدەکە خڕبـوونەوە و تەمەشای تەرمەکەیان دەکرد. یەکێکیان هاواریکرد:

- مـن دەیناسـم. خەڵکـی کـۆڵانەکەی ئـێمەیە. فەرمـانبەری دایەرەیە!

میتروپولسـکی کە بە زەحـمەت خـۆی بە پێـوە دەگـرت، کاسـکێتەکەی لە سـەری داکەنـدبوو، لە بەردەم مـفەوەزەکەدا ڕاوەسـتابوو، هەژدە هەژدە قسـەی گونـگ ونـامەفهوومی بـۆ دەکـرد. مـفەوەزەکە پـاڵێکی بە سـینگیەوە نـا، میتروپولسـکی کەوتە سـەر ئەرزەکە، مـفەوەزەکە بەکـاوە خـۆ پەتێکـی ئەسـتووری لە بەرکـی دەرهێنـا و، هەردوو دەسـتی میتروپولسـکی لەپشـتەوە توونـد بەسـت. ئەوجـا هـاواری لە خەڵکەکە کرد: - دەی بڵاوەی لێبکەن، هیچ وپووچینە!

پۆلیسێکی دیکەی چاو سووری چاو پرووش بە هەڵەداوان هات، لە ماندوویەتیدا دەمی داچەقی بوو، سەرێکی ئەو پەتەی کە دەستی یارۆی دەنگبێژیان پێ بەستبوو، گرت و بەکاوەخۆ بەرەو شاری برد.

مـن کە تەواو پەشـۆکابووم و ترسـم لێنیشـتبوو لە شـوێنی بـویەرەکە دوور کەوتـمەوە. ئیـدی ئەم قسـانە، وەکـو قـرەی ناسـازی قەلەڕەش لە یادگەمـا دەنگـی دەدایەوە: ' واوەیـلا بە حاڵی شاری ئەریول! '

هەرچیم دەکرد، ئەو دیمەنە خەمناکەی پۆلیسەکەم کە بە کاوەخۆ پەتەکەی لە بەرکی دەرهێنا لەبیر نەدەچوو، لە کاتێکا پێغەمبەری پەست، هەر دوو دەستە سوورە تووکنەکەی بە ملکەچیەوە خستە پشتی خۆیەوە، دەتگوت بۆ جاری هەزارەمینە ئەم جوڵەیە دووبارە دەکاتەوە.

دوای چەند ڕۆژێکی کەم زانیم کە میتروپولسکی داماو دوورخراوەتەوە. دوای ماوەیەکی دی ' کلیچوف 'ش دیار نەما. ژنێکی دەوڵەمەندی هێنابوو، چوو بوو بۆ گوندی و لەوێندەر دووکانێکی زیندرووی بۆ خۆی دانابوو.

بەڵام پێش ئەوەی بۆ گوندی بڕوات، وەستاکەم، کە من زۆر تاریفی دەنگبێژی و سترانڤانی یارۆی زیندرووم بۆ کردبوو گوتی: - دەبێ بچم بۆ ئەو کافە وبارە تا گوێی لێبگرم.

ئەو کارەمان کرد، چووین بۆ کافەکە، لە دەوری مێزێکی بچووک دانیشتین، وەستام لە ڕێگادا گاڵتەی بەمن دەکرد، تەشەری لە هاتوچۆکەرانی ئەم بار و کافەیە دەدا، کە بۆن بۆگەنیان سەرداری بێسەر دەکرد. وەختایەک کە کابرای زیندروو هەڵیکردە گۆرانی، بزەیەکی تەوسامێز نیشتە سەر سیمای وەستام، پەرداخێک بیرەی بۆخۆی تێکرد، چاوانی ئەبڵەق بوون. برۆکانی وێک هێنانەوە، لە ناکاوا هەڵوەستەیەکی کرد وگوتی: - هەی زۆڵ!

بە ئەسپایی بوتڵە بیرەکەی لە سەر مێزەکە دانایەوە. کاتێ کە کلیچوف لە گۆرانیەکەی بووەوە، وەستام گوتی: - نەهەقت نییە برادەر. دەزانێ چۆن گۆرانی بچڕێت، شەیتانە مەستی کردم!

یارۆی زین دروو، دەستی بە ستران کردەوە، سەری بەرز کردبووەوە و چاوانی بە بن میچەکەدا دەگێڕا:

*جوانێکی دێهاتی ڕێگە*

*بەکیژێ*
*دەگرێ*
*کە بە کەنار مەزرایانا*
*رادەبرێ*

ئاغـام، بە دەم ورتە ورتەوە، سـووکە پێکەنینێکـی بـۆکرد و سەری لەقاند:- بەڵێ، چاکی دەڵێت!

کلیچوف، وەکو بولبول دەیچرپیکاند:

*کیژێ وەڵامی دەداتەوە*
*من هەتیوم، لەم دنیایەدا*
*کەسم نییە.*

ئاغام، چاوە سوور هەڵگەڕاوەکانی دەتروکێنێت: - بەڕاستی جوانە! زۆڵە جوانی دەڵێت.

تەمەشـــای دەکەم، زۆر ئاســـوودەم، وشـــە خەمناکەکـــانی گۆرانیەکە، بە سەر ژاوەژاو و هەرا و هەنگامەی کافەکەوە زاڵ دەبێت و هێندەی دی گەشکە و زەردەخەنە بە ڕوح دەدات:

*من لە گوندیدا بە تەنێ*
*بێ دۆست و بناژۆ دەژیم*
*نە خۆشەویستم هەیە نە هاوڕێ*
*کەس لایەکم لێناکاتەوە،*
*لە دەرگام نادات*
*ویستیان بمدەن بە بێوە پیاوێ*
*ئاخر، تۆ ئەمە بە ڕەوا دەزانی؟*
*من بەم چارەنووسە ڕازی نیم،*
*بۆ بەختی خۆم دەگریم.*

ئاغـام، بەبێئەوەی زەڕەیەک شـەرم بیگـرێ، کەوتە گریـان. سەری لەبەرخۆ ناوەو بەدەنگی بەرز هەنسک هەڵدەدا وڕوندک

به گۆنایدا دێتەخوارێ و زەنگوڵ زەنگوڵ، بە سەر ئەژنۆکانیا دادەبارێ.

دوای گۆرانی سێیەم، کە تەواو هەڵچووبوو، بە منی گوت:

- من ناتوانم لەوەی پتر لێرە بمێنمەوە، خەریکە دەخنکێم، بۆنی ئێرە زۆر ناخۆشە، با بڕۆینەوە!

بەڵام کە لە بارەکە وەدەرکەوتین و چەند شەقاوێک ڕۆیشتین ڕای خۆی گۆڕی، گوتی:

- پشکوف، با بچینە ڕیستۆرانێک و شتێک بخۆین و چایەکی بەسەرا بکەین، حەزناکەم لە ئێستاوە بۆ ماڵ بڕۆمەوە!

بەبێ هیچ مامەڵە و سەوایەک گالیسکەیەکی بەکرێ گرت وسوار بووین و بە درێژایی ڕێگا ورتەی لێوە نەهات. زاری لێکنەکردەوە، بەڵام هەرکە گەیینە پانسیونەکە، خۆی گەیاندە سووچێک و لەسەر کورسییەک دانیشت، پەست و خەمگین، بەدەم چاوگێڕانەوە گوتی:

- ئەم پیرە سابرێنە ژانی بردە دڵمەوە. بەڕاستی تووشی ڕەشبینی کردم. گوێبگرە، تۆ کە کتێبان زۆر دەخوێنیتەوەو بیر لە شت دەکەیتەوە، وەرە ئەم مەتەڵەم بۆ هەڵبێنە. پیاو دەژی، چل دانەساڵ دەژی ژنی هەیە، منداڵی هەیە، بەڵام هەر تەنیایە، کەسێک شک نابات گرێی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە، دەربارەی شتی جۆراوجۆر قسەی دەگەڵ بکات، کەسێکی دەستناکەوێ دوو قسەی ماقووڵی لە گەڵدا بکات. بۆ نموونە ئەگەر من بمەوێ دەگەڵ ژنەکەما قسە بکەم، هەر مەپرسە وەکو ئەوە وایە قسە لەگەڵ دیواردا بکەم. چاوەڕوانی چی لێدەکرێ؟ ئەویش سەرقاڵی خۆی هەیە. ماڵی هەیە، منداڵی هەیە. ئیدی بەلایەوە گرینگ نییە من ڕوحم هەیە یان نا.

پیاو کە ژن دێنێ، ژنەکەی تا یەکەم منداڵی دەبێت، دۆست و هاوڕێیەتی. ئیدی زۆربەی ژن ومێرد واهین، بەڵام ژنەکەی

مـن، بەخـۆت دەیبینـی، دەیناسـیت چ مـاڵێکە! نە مانگـایە نە گوێرەکە. بریتیە لە تۆپەڵێک گۆشت، سندانم لێدا! ئێی بـرادەر، بە ڕاستی بێتاقەت بووم.

پێکێـک بیـرەی سـاردی تـاڵی هەڵدا. تاوێـک بێـدەنگ بـوو، ئەوسا دەستی خستە ناو قژە درێژەکەی و درێژەی دایێ:

– خەڵکـی بە شـێوەیەکی گشـتی بـودەڵە و دووڕوو و خوێڕین. بۆ نموونە تۆ، دەربـارەی ئەم بـابەت یـان ئەو بـابەت قسە بۆ کرێکارەکـان دەکەیت. من دەزانـم ژیـانی ئەوان پڕە لە بێدادی و نەهەقی.. بەڵام کە سـەیریان دەکەی دەبینی ئەوانیش دز و درۆزنـن، ڕەنـگە وا هەسـت بکەیـت کە قسـەکانت کاریـان تێـدەکات و وەکـو تووێـک لە مێشـکی خـاڵی ئەوانـدا دەڕوێـت! هەڵبەتە وانییە، تـۆ هەڵەی! خەڵکی ئەمەکدار و پێـزان دەسـت ناکەوێ، ئیدی باو باوی عەوام خەڵەتێنییە! تۆ هەر قسـەیەکیان بۆ دەکەیت، یەکسەر بۆ منی دێنن! پیوتر و ئوسـیپ و ئەوانـی دیکەش، دێن بۆلام و هەرچیەکیان پێ دەڵێی، موو بە مـوو بـۆ منـی دەگێـڕنەوە، پێـت سـەیرە؟! ئەو ئوسـیپەی کە بە ڕواڵەت دۆستی گیانی بەگیانی تۆیە، هەموو قسـەکانی تـۆم بـۆ دێنێت. لەم بارەیەوە چ دەڵێی؟

مـن کە لە ڕادەبەدەر حەپەسـابووم، هـیچم نەگـوت، زمـانم بەسـترابوو. وەسـتام، هێـدی هێـدی، قـوم قـوم، بیـرەکەی دەخواردەوە و دەنگی نەوی کردەوە وگوتی:

– ئەمە حەقیقەتی شتەکانە. تۆ ئەم پەندە دەزانی کە دەڵێت: " ئەگەر قسەکردن زیو بێ، بێدەنگی زێڕە " ها؟ ئەو بیرۆکەیەی کە بەنیـاز بـووی سـەفەری وڵاتـی فـارس بـکەی، بیرۆکەیەکـی زۆرچاکە، بەلای کەمەوە لە زمـانی خەڵکەکەی ئەوێنـدەر حـاڵی

نابیت، زمانێکی بیانییە، بەڵام لێرە زمانی زکماکی خۆت، قوڕاوە قوڕاو..

پرسیم: - یانی ئوسیپ، قسەکانی منت بۆ دەگێڕیتەوە؟

- بێگومان. پێت سەیرە؟ ئەوەی ئەو دەیگێڕێتەوە، بارتەقای هەموو ئەوانی دیکەیە، پیاوێکی چەنەبازە. ڕێوییە ڕێوی، هەر کلکی لە ڕێوی کەمە. نا پشکوف گیان، وشە ناچێتە دڵی خەڵکییەوە. حەقیقەت؟ تۆ ئەو خوایە کێ گوێ لە حەقیقەت دەگرێ؟ وەکو بەفری پاییزە، بە سەر حەڕی و قوڕا دەبارێت، قوڕەکە شلتر دەکاتەوە..

بە دەم بیرە خواردنەوە، بەرەبەرە، بەبێ ئەوەی سەرخۆش ببێت، بە ئاو وتاوتر قسەی دەکرد:

- بەڕاستی ژیانێکی ناخۆشە، مرۆڤ زۆر تەنیایە! ئەوەی کابرای گۆرانیبێژ دەیگوت دروستە : نە دۆستم هەیە نە ئاشنا..

ڕوانییە دەور وبەری خۆی، دەنگی نەوی کرد و لە سەری ڕۆیی:

- من ماوەیەک لەمەپێش دۆستێکی جوانم گرتبوو، تێدەگەی؟ بێوەژنێک بوو کە مێردەکەی لەسەر قەڵبەزەنی ڕەهەنەی سیبریا کرابوو، ئیدی لێرە ناسیاویم لەگەڵیا پەیدا کرد، ئەم ژنە داماوە تاقە پولێکی نەبوو، دەلالێک بەمنی ناساند. من پەلەم نەکرد، کەوتمە تاقیبی. ژنێکی باش، جوان، وشەریف بوو. یەک دووجار دیتم، جارێک پێم گوت : باشە ئەمە چۆن دەبێ، مێردەکەت لە زنداندایە وتۆش لێرە خۆت ڕادەستی من دەکەیت و ناپاکی لێدەکەیت، دەتەوێت بچیت بۆلای؟ هەوڵیدەدا هەرچۆنێ بووە، بچێ بۆ تاراوگە بۆلای مێردەکەی. گوتی: چ قەیدییە، من خۆشم دەوێ، ئەو زۆر بۆمن باش بوو، ڕەنگە ئەوکارەی لەپێناو مندا کردبێت، منیش لەپێناو ئەودا ئەمە لە گەڵ تۆدا دەکەم. گوتی : پێویستی بە پارەیە. بابایەکی خانەدان

بوو، فێری خۆشگوزەرانی بوو. گوتی: ئەگەر هەرخۆم بوایەم، شەریفانە دەژیام و ئەم کارەم نەدەکرد. تۆش پیاوێکی باش دیاریت، بەڵام تکایە چیتر ئەم بابەتەم لەگەڵدا مەکەوە، بەڕاستی برینم دەکولێتەوە، ژان دەچێتە دڵمەوە!...

ئیدی ئەلکسی هەر پارەیەکم پێ بوو دامێ، لە هەشتا ڕۆبڵ زیاتر بوو، پێمگوت : بمبورە، ناتوانم چیتر بتبینم، هەنگێ ملی ڕێگام گرت و ڕۆیشتم..

دوای بێدەنگییەکی کەم، نیشانەی سەرخۆشی و مەستی لێ بەدیارکەوت و ماندوویەتی زۆری بۆ هێنا، ئەوسا لە بن لێوانەوە گوتی:

- شەش کەڕەت چووم بۆلای بەڵام هیچ شتێک ڕووی نەدا، نا، من نەمتوانی. پێنج یان شەش چەلیش چوومە بەر شوقەکەی، بەڵام زاتم نەکرد لە دەرگا بدەم و بچمە ژوورەوە، هەروا بەدەستی بەتاڵ گەڕامەوە. ئێستا ئیدی تەواو ڕۆییوە..

هەردوو دەستی نایە سەر مێزەکە، بە قامکان کەوتە لێدانی مێزەکە. لەبن لێوانەوە گوتی:

- لە خودا دەپاڕێمەوە کە جارێکی دیکە نەی بینمەوە! ڕەنگە نەتوانم جڵەوی خۆم بگرم! دەی واچاکە بۆ ماڵ بڕۆینەوە!

لە ڕیستۆرانتەکە وەدەرکەوتین، ئەوجارجار بەلادا دەهات و لەبەرخۆوە ورتە ورتێکی دەکرد:

- بەڵێ، دۆستی ئازیزم، ئاوها..

ئەم ئیعترافەی ئەو غافڵگیری نەکردم. ماوەیەک بوو هەستم بەوە کردبوو کە گۆڕانێک بە سەر ژیانیا هاتووە. بەڵام من سەبارەت بە ڕاوبۆچوونەکانی دەربارەی مانای گشتی ژیان زۆر پەست بووم وئەویش لە متمانەی نابەجێی من بە ئوسیپ، ناڕەحەت بوو.

## (٢٣)

مـن سـێ دانە هـاوینم بەچـاودێرییەوە، لە نێـو ئەو شـڕە دووکانانەدا، کە وەکو شارێکی مردوو بەپێوە وەستابوون، بە سەربرد، چاودێری ئەو کرێکارانەم دەکرد کە لە پاییزا دووکانە شێواوەکانیان دەڕوخاند و لە بەهارا دووبارە و بەهەمان شێوە دروستیان دەکردنەوە.

ئاغام، سوور بوو لە سەر ئەوەی بایی ئەو پێنج ڕۆبڵەی کە مانگانە دەیدامێ، کارم لێ بکێشێتەوە. کە ناو دووکانەکانیان تەختەپـۆش بکـردایە، ئەرکـی مـن ئەوەبـوو، پانتـایی نـاو دووکـانەکە بە قـووڵی دوو پێیـان هەڵـبکەنم و پـاکی بـکەمەوە. ئەگەر بۆ ئەم کارە کرێکاری ئاساییان بگرتایە، بەلای کەمەوە ڕۆژێ ڕۆبڵێکی وەردەگرت، کەچی هیچیان بە من نەدەدا، کە ئەم کارەشـم دەکـرد نەم دەپەرژایە سـەر ئەوەی چـاودێری دارتـاش و تەختەبەسـتەکان بـکەم، کە هەرکە چـاوت لـێ غافڵ بکردنـایە، دەسـک و قفڵـی دەرگاکانیـان دەردێنـا وهەرشـتێکی وردیان بەردەست بکەوتبایە دەیاندزی.

کرێکارەکـــان و قۆنتەراتچییەکـــان، هەردوولایـــان بە هەمووجـۆرێ هەوڵیانـدەدا بمخەڵەتێـنن و بەوپەڕی چـاو قـایمییەوە دزی بـکەن، ئەگەر بەدزیـیەوە بتگرتبـان کەم وزۆر خۆیـان شـلوێ نەدەکـرد ولە خـۆ تەریـق نەدەبـوونەوە، بەڵکو، وەکـو ئەوەی نە بایـان دیبـێ نە بـاران، بە سەرسـامیەوە دەیانگوت:

– تۆ لە پێناوی پێنج ڕۆبڵاندا، بە ئەندازەیەک خۆت ماندوو دەکەی، خەڵکی بە بیست ڕۆبڵیش ئەو کارەی تۆ ناکەن. پیاو کە تۆ بەو حاڵەوە دەبینێت، پێکەنین دەیگرێت.

بۆ ئاغام ڕوونکردەوە کە ئەگەر بەم کارەی من یەک ڕۆبڵت بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام لە سۆنگەی چاودێری نەکردنی کرێکارەکانەوە دە ڕۆبڵ و زیاتریش زەرەر دەکەیت. بەڵام ئەو گومانی وابوو کە دەمەوێ هەڵی بخەڵەتێنم و وەکو کەسێکی شارەزا چاوێکی دادەگرت وبەرسڤی دەدامەوە:

- هەوڵ مەدە بمخەڵەتێنی!

ئیدی دڵنیابووم لێم بە گومانە و وا وێنادەکات شەریکە دزی کرێکارەکانم. دڵم بە حاڵی دەسووتا، بەڵام هیچ کاتێک توورە نەدەبووم. ئەمە کارێکی ئاسایی بوو: هەموو خەڵکەکە دز بوون، کەس لە دزی نەدەپرینگایەوە، تەنانەت ئاغاشم، کۆی لە دزینی ماڵی خەڵکی نەدەکردەوە.

بۆ نموونە وەختایەک لە کامپەکە تەواو دەبوو، سەرێکی دووکانەکانی دەدا تا بزانێ پێویستیان بە چ نۆژەنکردنەوەیەک هەیە، زۆرجار چاوی بە هەندێ شتی لە بیرکراو وبەجێماو دەکەوت وەکو: سەماوەر و ئامان و قۆری و مقەست و سەندووقێن پڕ لە کەل وپەل بە منی دەگوت:

- ئەمانە بکە بە لیستێک و بیانبە بۆ عەمارەکە!

پاشان، هەرچیەکی لەوانە پێویست بوایە، بۆماڵی دەبردەوە و داوای لێدەکردم لیستێکی تازەیان پێ دروست بکەم.

من یەک لە باری خۆم تەماحم لە هیچ شتێک نەبوو، تەنانەت تەماحم لە کتێبیشدا نەبوو. کتێبخانەکەم بریتی بوو لە کتێبێکی بچووکی بیرانجیە وکۆمەڵە شیعرێکی هاینە. حەزم دەکرد شیعرەکانی پوشکین بکڕم، بەلام تاقە کتێبفرۆشەکەی شار کە پیرەمێرێکی خڵەفاو بوو، داوای نرخێکی زۆری دەکرد. بەڵام کەم و زۆر تەماحم لەو موبێلە و مافوور و ئاوێنە و

شتانە نەبوو، کە لە شوقەکەی ئاغاما بە ناڕێک وپێکی کە لەکە بووبـوون. بە ڕاسـتی قەوارە و بـۆن و ڕەنـگە دزێوەکانیـان، ئەعسابی ناڕەحەت دەکردم. بەڕاستی زۆرم ڕق لە ژوورەکانی ئاغـام بـوو کە پڕبـوون لە شـتی تووڕەهـات و زیـادە، زۆرم پێناخۆش بوو کە ئاغام شتی خەڵکی دێنا و، لە سەر ئەوشتە بێکەڵک و زیادانەی ماڵەوە کەڵەکەی دەکردن. خۆ شـوقەکەی شاژنە مارگۆش زۆر قەرەباڵغ بوو، پڕبوو لە کەل وپەل، بەڵام شتەکانی ئەو بەلای کەمەوە جوان بوون.

ژیانم بەگشتی، بێ سـەروبەر و گەوجـانە دەهـاتە بەرچـاو، پڕبوو لە گەوجاتی. بۆ نموونە کە هەوا کەمێک خۆشبایە، ئێمە دەستمان بە نۆژەنکردنەوەی دووکانەکان دەکرد، بەڵام زۆری پێنەدەچوو لە بەهـارا ڕوبـارەکە هەڵدەسـتا و دووکانەکـان پـڕ دەبوون لە ئـاو وپارکێتەکانیـان هەڵدەوەشـایەوەو ئـاو دەیبـردن و، دەرگاکانیـان دەئاوسـا. کە لافـاوەکە دەنیشـتەوە کـۆڵەکە دارینەکـان بۆگەنیـان دەکـرد. ئیـدی ئەم بـویەرە بە درێژایـی دە ساڵان، هەموو ساڵێک دووبارە دەبووەوەو زەرەرێکی زۆر بەر خەڵکی دەکەوت، کەس نەبوو، بیـر لە چارەسـەرێک بکـاتەوە و پـێش بەم لافـاوە بگرێـت. سـەبارەت بەو کەشـتی و بەلەمە بچووکانەی کە هەموو ساڵێک سەهۆڵبەندانی زستان غـافڵگیری دەکردن و تێکی دەشکاندن، هەمان تاس و هەمان حەمـام بـوو، بەلەمەکـان دەشـکان، خەڵکی دووبـارە دروسـتیان دەکردنەوەو هەمـدیس لە وەرزی زسـتانا دەشـکانەوە، ئیـدی ئەم خـولانەوە بێهودەیەی خەڵکەکەم لەم بازنە بۆشـەدا زۆر لەبەر گران بـوو! وەختایەک هۆی ئەمەم لە ئوسیپ پرسی، پێم پێکەنی و گوتی:

- تەمەشای ئەم قەلەڕەشە بکەن چۆن دەقرێنێت! تۆ هەقت چیە؟ ئەم کارانە چ زیانێکیان بۆتۆ هەیە؟ کەی ئەمە خەمی تۆیە؟

ئەوجا، بێئەوەی پرشنگی تەوسامێزی چاوە شینەکانی دابمرکێتەوە، چاوی لە چاو هاوتەمەنەکانی خۆیا، زۆر ساف و گەش بوون، بە ڕاوێژێکی کەمێک جدیتر گوتی:

- تۆ زۆر ئاقڵی کە ئەم شتانە سەرنجت ڕادەکێشن! هەرچەندە ئەمە بۆ ئێستا هیچ سوودێکی بۆت نییە، بەڵام لەگینە ڕۆژێ لە ڕۆژان بە کەڵکت بێت. خراپ نییە پیاو سەروکاری دەگەڵ ئەقڵدا هەبێت. زۆر شتی دی هەیە پێویستە سەرنجت ڕابکێشیت..

ئیدی کەوتە گێڕانەوەی دیاردە باوەکانی ناو خەڵکی:

- تۆ گوێ لە سکاڵا وگلەیی خەڵکی بگرە، خەڵکانێک هەن گلەیی دەکەن: " ئێمە زەوی وزارمان زۆر کەمە، لە نرخی نەبوودایە " لەو کاتەدا کە گلەیی دەکەن ڤۆلگا هەڵدەستێ و هەموو زەویەکان دەکاتە ژێرەوە. یان گلەیی دیکەی خەڵکی ئەمەیە: " ئاوی ڤۆلگا هەستاوە! لافاوی بەهار و بارانی هاوین کەندان چێدەکات و ڤۆلگا دووبارە زەوییەکان نقوم دەکات!

ئوسیپ، بێ لایەنانە ئەو دیاردانەی دەژمارد، جۆرە غرووریێک لە قسەکانیا پەنهان بوو، وەکو بڵێی بەخۆی دەنازی کە ئەو شتانەی دەزانی. لە سەری ڕۆیی: - شتێکی دیکەش هەیە کە شەواتە!

لەم ڕووەشەوە هاوڕەئی ئەو بووم، دەمزانی هەموو هاوینێک بەشێ لە جەنگەڵ و بێشەکانی کەنارەکانی ڤۆلگا ئاگریان دەگرت. لە مانگی حەوت بە دواوە دووکەڵێکی زەردباوی چڕ بەری ئاسمانی دەگرت و دنیای لێڵ دەکرد.

ئوسیپ لە سەری دەڕوات:

- بێشە و جەنگەڵەکان، هەرنەیسە، هی دەوڵەتن، یان هی دەوڵەمەند و موڵکدارەکانن. جووتیاران لێرەواریان نییە. ئەگەر شارەکانیش بسووتێن زۆر گرینگ نییە، مەکۆ ومەڵبەندی دەوڵەمەندانن، خەمی من و تۆ نین. بەلام تۆ گوند و شارە دێیەکان وەربگرە، هەر هاوینێک چەند گوند و دێ دەسووتێن! بەلای کەمەوە سەد گوند دەسووتێ؟ ئەمە زیانێکی یەجگار گەورە!

نەرمە پێکەنینێکی بۆ دەکات و دەڵێت:

- ئێمە ئازارمان هەیە بەلام ئاوەزمان نییە! من وتۆ ئەوە دەزانین کە ماڵداری و کاروکاسبی ئەو خەڵکە بۆ خۆیان نییە، بەڵکو بۆ ئاگر و ئاوە، کردەی ئەوان و بردەی ئاگر وئاوە!

بەبێزارییەوە پرسیم: - باشە تۆ بۆ پێدەکەنیت؟

- بۆ پێنەکەنم؟ ئاگر بە ڕوندکان نایەتە ڤەمراندن..

دڵنیابووم، ئەم پیرەمێردە قۆزە، ئاقڵترین کەس بوو کە تا ئیستا تووشی بووبووم. بەلام تا ئێستا پەیم بەوە نەبردبوو کە حەزی لە چییە یان ڕقی لە چییە.

لە کاتێکا لەو شتانەم دەپرسی، زیاتر گیانی کونجکاوی لە لا وروژاندم و لە سەری ڕۆیی:

- تۆ تەمەشای ئەو خەڵکە بکە، بزانە چ وزەیەکی وێرانکەریان تیایە! بۆ نموونە ئاغات وەربگرە، بزانە چۆن هێز وتوانای تۆ تالان دەکات. یان تەمەشای ئەو ئاسیوە بکە کە ڤودکا پێتی دەگەیەنێ، کورم دەوێ بتوانێ ئەو ئاسیوانە بژمێرێت – لەوە زیاترن کە بێنە ژماردن. ئەگەر کوختەیەک بسووتێ، دەتوانی یەکێکی دیکە لە جیاتی دروست بکەیتەوە، بەلام ئەگەر مرۆڤێک بڕوخێت وهەرەس بێنێت، هەرگیز

دروســت نــاکرێتەوە. ئەردالیــون یــان گریگــۆری بە نمــوونە وەربگــرە. تەمەشــا چۆن لە دووکەڵا نقــووم بــووە. گریگــۆری، پیاوێکی بە ئاوەز نییە بەڵام پیاوێکە سەرڕێژ لە سۆز! وەکو چۆن کۆمایەک پووش گڕ دەگرێ و کڵپە دەکات، بەو ئاوایە گڕ وکڵپەی لێبەرز دەبێتەوە. ژنان وەکو چۆن کرم لە جەستەیەک دەوروکێن، بەو ئاوایە بەسەریا دادەبارن و تێی دەوروکێن.

من لە ڕووی لاپرەسەنی و فزوڵیەتەوە، نەک لە ڕووی زیز بوونەوە لێم پرسی: - باشە بۆچی هەر قسەیەکت بۆ دەکەم، بۆ ئاغامی دەگێڕیتەوە؟

ئەم پرســیارە، بە هــیچ جــۆرێ ئیحراجــی نەکــرد، زۆر بە شێنەیی بەرسڤی دامەوە:

- تا لە بیرە شەڕانیەکانت ئاگاداربێ. تا ئامۆژگاریت بکات. ئەگەر ئەو ئامۆژگاریـت نەکـا، کێ ئامۆژگاریت بکات؟ مـن بە مەبەسـتی شـۆڤاری و دوو زمـانی قسـەکانتی بـۆ نـاگێڕمەوە. باوەڕ بکە لەبەر خۆتمە، تۆ کوڕێکی کەودەن و بێ ئاوەز نیت، بەڵام هیچ شـەیتانێک نازانێت چیت لە بیر و خەیاڵدایە. بـاوەڕ بکە ئەگەر شتێک بدزیت، خەبەرت لێنادەم، ئەگەر لەگەڵ کچاندا دەربچیت قسە ناکەم، ئەگەر بخۆیتەوە و سەرخۆش ببیت هـیچ ناڵێم. بەڵام دڵنیـابە، هەمـوو ئەو بیروخەیـالانەی لە زەینتـایە بـۆ دەگێڕمەوە.

- کەواتە لە ئێستا بە دواوە قسەت بۆ ناکەم!

کەمێک بێدەنگ بوو، لەکەیەکی ڕەش بە نـاو لەپییەوە بوو، سـرِی و ئەوجـا نیگـایەکی باوکـانەی کـردم، ســەرێکی لەقانـد وگوتی:

- وانییە، درۆ دەکەیـت. جگە لە مـن کێـت هەیە قسـەی بـۆ بکەی؟ هیچ کەسێک.. بۆیە ناچاری هەموو قسەیەکم بۆ بکەیت..

لەوساتەدا "ئوسیپ"م وەکو یاکوفی توونچی هاتە بەرچاو، هەرچەندە ئوسیپ، لەو پاک و خاوێنتر بوو، بەڵام وەکو ئەو گوێی بە هیچ کەس و هیچ شتێک نەدەدا.

هەندێجار، پیوتر فاسیلیف و هەندێجاری دی پیوتری عەرەبانچی وەبیر دێنامەوە، هەندێ جاری دی پێدەچوو هەندێک خاڵی هاوبەش لە نێوان ئەو وباپیرما هەبێت – ئیدی لەم ڕووەوە یان لەو ڕووەوە لە هەموو ئەو پیرەمێرانە دەچوو کە تا ئێستا ناسی بوومن. هەرهەموویان لەو پیرەمێرانە بوون کە تا ڕادەیەکی زۆر مایەی سەرنج بوون، کەچی من هەستم دەکرد ژیان لەگەڵ ئەوانەدا زۆر دژوار و قێزەونە. لەوە دەچوو بە ئامۆژگاریە مۆراڵیە زۆر و زەبەندەکانیان، وەکو خۆرە بدەنە ڕۆحت و دڵت بخۆن. باشە ئۆسیپ پیاوێکی باش بوو؟ نەخێر. شەڕانی بوو؟ نەخێر. پیاوێکی بە ئاوەز بوو، ئەمەم بە ڕوونی تیا دەبینی. سەرم لە بادانەوە زەینیە سەیرەکانی دەسوڕما، گەییمە ئەو قەناعەتەی کە باندۆری شێوازی بیرکردنەوەی لە سەر من کەمە، لە ئەنجاما، هەستم دەکرد ڕقم لێیەتی، خۆشم ناوێ..

ئیدی جۆرە هزرینێکی ڕەشبینانە لە ناخما دەجۆشا:

"خەڵکی بە یەکدی نامۆن، وێڕای مجامەلە و پێکەنینی دۆستانە، هەرهەموویان نامۆن بە دنیا و خەڵکی دنیا. پێدەچێ شتاقیان داوی خۆشەویستی بە ئەرز وخاکیانەوە نەبەستێ. تەنیا نەنکم ژیان و خەڵک و هەموو شتێکی سەر ڕووی زەوی ڕاستگۆیانە خۆش دەویست. نەنکم و، شاژنە 'مارگۆ."

هەندێجار ئەم بیرانە و بیرێن هاوشێوەی ئەمانە وەکو پەڵە هەورێکی تاریک کەڵەکە دەبن و ژیان خەفە وخەمناک دەکەن، بەڵام ئەڵتەرناتیفی ئەم ژیانە کامەیە؟ چۆن فریای خۆم بکەوم،

ڕوو بکەمە کوێ، دەردی دڵم بەکێ بێژم؟ جگە لە ئوسیپ کەسی دیکەم شک نەدەبرد، زیاتر و زیاتر پەنام بۆ دەبرد.

ئیدی بە ڕواڵەت زۆر بەبایەخەوە گوێی لە وڕینە گەرم وگوڕەکانم دەگرت، بۆ ئەوەی بچێتە بنج و بناوانی ئەندێشە پەنهانەکانم، بە پرسیاران دایدەگرتمەوەو پاش ئەنجامگیرییەکانی خۆی، بە هێمنی دەیگوت:

- دار کرۆک، تەیریکی سرکە، بەڵام ترسناک نییە، کەس لێی ناترسێت. من دڵسۆزانە ئامۆژگاریت دەکەم کە تا تەمەنی باڵق بوون بچیە دێر، تۆ کەسێکی دەماوەری، بە ئاسانی دەرەقەتی وەعزخوانی دێیت. ئەم کارە سوکنایی بە دڵت دەبەخشێت و ڕەنگە پارەیەکیشت دەست بکەوێ، پڕ بەدڵ، دڵسۆزانە حەز دەکەم ئەم کارە بکەیت، تۆ بۆ کاروباری ئەم دنیایە نەخولقاوی، دەترسم دەرەقەتی گێرمە و کێشەکانی ئەم دنیایە نەیەیت..

من بە هیچ جۆرێ حەزم نەدەکرد بچمە دێر، بەڵام هەستم دەکرد، لە ونگەی ژیانا سەرگەردان بووم. لە دەروویەک دەگەڕام کە دەرباز ببم. ژیان لە بەرچاوم وەک بێشەیەکی وەرزی پاییز دەچوو، کە دوا قارچکیان کۆکردبێتەوەو ئومێدی هیچی تری لێ نەکرێت.

من ڤۆدگام نەدەخواردەوە، دوای ئافرەتان نەدەکەوتم، لە جیاتی ئەوشتانە خووم دابووە کتێبان، تا زیاتر کتێبانم دەخوێندەوە زیاتر بێهودەیی ژیانی بۆش وبەتاڵ و بێ ئامانجی زۆربەی خەڵکیم بۆ بەدیاردەکەوت، ئەو ژیانەی کە من بە هیچ جۆرێ پێی ڕازی نەبووم. لە تەمەنی پازدەساڵیدا بە ئەندازەی پیرەمێردێک بیرم دەکردەوە. هەرچییەکم خوێندبووەوە، هەرچییەکم بینی بوو، هەرچییەکم بیستبوو، هەرهەموویم لە مێشکی خۆما کەڵەکە کردبوو، مێشک و زەینم لە عەمارێکی

تاریک دەچوو کە پڕ بێ لە دار و شتی جۆراوجۆر، هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی پۆلێنیان بکەم و جیایان بکەمەوە.

ئیدی ئەم بیروبۆچوونانە، وەکو چۆن ئاو کەشتیەکی شکاو دێنێ و دەبات، بەو ئاوایە جۆلانەی پێدەکردم..

من نەگبەتی، سکالا، نەخۆشی خەڵکم زۆر بەلاوە ناخۆش بوو، هەر دیمەنێکی هۆڤیانەی وەکو خوێنڕێژی، شەقاوەگەری، قەرقەشە وشەڕە دەم، دەهری دەکردم، دەیکردم بە حەیوانێکی درندەی ئەوتۆ کە دەمویست پەلاماری هەر کەسێک بدەم کە بکەوێتە دەستم و تێروپڕی بکوتم، کە پاشان لەم کارەی خۆم تەریق دەبوومەوە، هەندێجار ئارەزووی لێدانی کەسێکی زاڵم بەجۆرێ بەسەرما زاڵ دەبوو، بە خوت وخۆڕایی بەگژ ئەم وئەودا دەچووم، ئێستاش کە ئەو حاڵەتانەم بیر دەکەونەوە، لە شەرمان هەموو گیانم وەسەرئاو دەکەوێت.

دووکەس لە مندا هەبوون، یەکێکیان گۆساخی و هەرزەیی و هەموو لایەنە دزێو وکرێتەکانی ژیانی جەڕباندبوو، ئیدی ڕۆتینیەتی ژیانی ترسناک وای لێکردبوو لە هەموو شتێک بە گومان بێ و بەوپەڕی نائومێدی بڕوانێتە هەم خەڵکی و هەم خۆی. ئەم کەسە ئارەزوومەندی ژیانێکی ئارامی گۆشەگیری دوور لە شاران و لە خەڵکی بوو. خەونی بە سەفەرێکەوە دەبینی کە تەنیا کتێبان لە گەڵ خۆیدا ببات، سەفەری وڵاتی فارس بکات، یان بچێتە خەڵوەتەوەو لە دێرێکا بگیرسێتەوە. یان لە کوختەیەکی ناو لێرەوارێکدا بگیرسێتەوە یان لە کابینەی پاسەوانێکی هێڵی ئاسندا بحەوێتەوە یان لە قەراخ و دەوروبەری شارا ببێت بە حەس حەس. چەند خەڵکی لە دەوربەری ئەودا کەم بوایەن و لە بەشەران دووربایە بۆ ئەو باشتر بوو.

کەسەکەی دووەمی ناخم، ڕێک پێچەوانەی کەسی یەکەم بوو، بە ڕوحی پیرۆزی کتێبان غوسڵی تەعمید کرابوو. ئەویش وەکو کەسی یەکەم باوەڕی بە باڵادەستی زاڵمی و سەختی ژیان هەبوو، دڵنیابوو کە زوڵم و جەوری ژیان دەتوانێ بە ئاسانی سەری بپەڕێنێ یان بیخاتە ژێر پێوە، بەڵام بە پێچەوانەی کەسی یەکەمەوە کۆڵی نەدەدا، هەموو هێز وتوانای خۆی دەخستەگەڕ کە بەرگری لە خۆی بکات، قەبووڵی نەدەکرد دڵ و ڕۆحی بخاتە خزمەتی ڕیسواییەکانەوە. ددانی چێڕ دەکردەوە، کۆڵە مستی دەگوشی، ئامادەی هەموو شەڕ و گەنگەشەیەک بوو. ئاسوودەیی و خۆشەویستی خۆی لە کارکردنا دەبینی، ئیدی وەکو قارەمانی ناو ڕۆمانە فەرەنسیە سوارچاکیەکان، شمشێری لە خۆی دەبەست ولە گەڵ کەمترین، هەڵچوون و تووڕەبووندا، هەڵیدەکێشا وبەکاری دەبرد..

لەم سەرو بەندەدا، دژمنایەتیەکی توندم لە گەڵ دەرگاوانی کابارەیەکی شەقامی مالا بوکروفسکایا دا هەبوو. یەکەمجار کە دیتم و ناسیم بەیانییەک بوو کە دەچووم بۆسەر ئیش بۆ کامپەکە، سەیرم کرد ڕاکێش ڕاکێش ئافرەتێکی سەرخۆشی لە عەرەبانەیەکدا کەلەبەر دەرگای کامپەکە وەستابوو، دێنایە خوارێ. ئەم ئافرەتە یەکێک بوو لە مشتەریانی کابارەکەی ئەو، هەردوو لاقی ئافرەتەکەی گرتبوو، ڕایدەکێشا، دەیویست بیهێنێتە خوارەوە، گۆرەویەکانی داکەندرا بوو، تەنوورەکەی هەڵدرابووەوە و تا ناوقەدی بەدەرەوە بوو. ئەم پیاوە بێ تەربێتە، هەر جنێوێکی بە دەما هاتبا بەو ئافرەتە بێنەوایەی دەدا وتف بارانی دەکرد. ئافرەتی داماو، بە قژی پەرێشان ودەمی داچەقیو وباسکی ڕووت وخاوەوە، بەرە بەرە لە ناو

گالیسکەکەوە دادەخزی. هەوەڵجار پشتی، دوایی سەری کەوت بەسەر کورسی عەرەبانەکەدا، ئەوجا داخزایە سەر ڕکێفی عەرەبانەکە، ئەنجام کابرای دەرگاوان دەڵەکی دا وجەستەی شینەوەبووی ژنەی تاین، بە دەما کەوتە سەر شۆستەکە وغل بووەوە.

کابرای عەرەبانچی، کە نەجاتی بوو، قامچییەکی خێواندە پشتی ئەسپەکەی وبۆی دەرچوو. ئەوجا کابرای دەرگاوان وەکو چۆن وڵاخێک لە عەرەبانەیەک دەبەستریَ، بەو ئاوایە، خۆی بە نێوان هەردوو لنگی ژنەی داماوا کرد، لە هەردوو لاقی نەوی و بەسەر شۆستەکەدا کەوتە ڕاکێشانی. کە ئەو دیمەنەم بینی بەجاریَ شێت و شبر بووم، بە هەشتاو بەرەولای ئەو چووم، ڕێک لەم کاتەدا، خۆم و شانسم، ئەو تەرازووەی پێم بوو، لە دەستم کەوت، ئەم ڕێکەوتە من و دەرگاوانەکەی لە بەڵایەکی گەورە ڕزگار کرد. بە هەرحاڵ بە هەشتاو بۆ کابرای دەرگاوان چووم، دام بە عاردیدا، کەوتە ئەودیو شۆستەکەوە. بێئەوەی گویَ بەو بدەم، بەرەو خانووەکە چووم، بە توونـدی لە زەنگی دەرگام دا، دەرگا کرایەوە، چەند ڕوخسارێکی ناحەز هاتنە بەر دەرگا، من هەندیَ قسەی هەلەق ومەلەق و نامەفهوومم کرد، پێدەچوو بە شێتم بزانن. ئیدی گەڕامەوە، ئەو ئەوزارەم، کە لە دەستم کەوتبوو، دۆزییەوە وملی ڕێگای خۆم گرت. کە بەرەو ڕووبارەکە بەڕێوە بووم، تووشی هەمان عەرەبانچی بوومەوە. هەر لە سەر عەرەبانەکەوە هاواریکرد: - ئافەرین، دەستخۆش، باشت تەمیَ کرد!

هێشتا تووڕەییم نەنیشتبووەوە، یەکسەر بە ڕووی کابرای عەرەبانچیا هەڵشاخیم کە بۆچی هێشتوویەتی یارۆی دەرگاوان بەو شێوازە نەنگینە مامەڵە دەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بکات.

زۆر بە هێمنی و بگرە بە جۆرە تەوسێکیەوە بەرسڤی دایەوە:

- من هەقم چییە بە سەرەوە. ئاغایان خستیانە ناو گالیسکەکەوە و کرێی تا ئێرەیان دامێ، ئیدی هەقم چییە چۆن ڕەفتاری دەگەڵ دەکەن یان نا؟ گرینگ کرێکەمە، من کرێی خۆم وەرگرتووە و تەواو.

- باشە ئەگەر بیانکوشتبایە؟!

وەکو یەکێک بە کوشتنی ژنانی سۆزانی و سەرخۆشان ڕاهاتبێ گوتی: - کوشتنی ئەو جۆرە ئافرەتانە ئاسان نییە.

لەو بویەرە بە دواوە، تەقریبەن هەموو بەیانییەک کابرای دەرگاوانم دەبینی، کە لە شەقامەکە دەپەڕیمەوە دەمبینی، یان شۆستەکەی گسک دەدا یان لە سەر پلیکانەکە دادەنیشت وەکو ئەوەی چاوەڕوانی من بکات. کە لێی نزیک دەبوومەوە لە جێی خۆی هەڵدەستا، قۆڵی لێ هەڵدەماڵی و بە هەڕەشەوە دەیگوت:

- دەم وقەپۆزت ورد وخاش دەکەم ها!

ئەم پیاوە لە چل ساڵان زیاتر بوو، کورتەباڵا و ورگن بوو، ورگی لە ورگی ژنی دووگیان دەچوو، لاقی کورت و خواربوون. لەو بەر دەرگایە دەوەستا بە من پێدەکەنی. لوتف ومەحەبەت و میرەبانی بە نیگایەوە دیار بوو. ئەهلی شەڕ و دەعوا نەبوو. باسکەکانی لە باسکەکانی من کورتتر بوون. دوای یەک دوو هێرش و پەلامار کۆڵی دەدا و ڕادەوەست دەبوو، هانکە هانکی پێدەکەوت و دەیگوت: - ڕاوەستە بۆم پشیلە کێوی بزانە چیت بەسەر دێنم!

من زوو لەم قەرقەشە بێ مانایانە بێزار بووم و پێمگوت:

- گوێ بگرە قەل پیاو. یەخەم لە یەخە بکەوە، باشە؟

بە جۆرە گلەییەکەوە گوتی: - خەڵای خۆتە، بۆ داکۆکی لە خەڵکی دەکەیت؟

لێیم پرسی: - بۆچی ئەو ڕۆژە ئەو ژنە بێنەوایەت بەو جۆرە ڕادەکێشا؟

- جا تۆ هەقت چییە؟ بەزەییت پێیدا دێتەوە؟

- بێگومان.

کەمێک بێدەنگ بوو، کەفی لالغاوەکانی سڕی و ئەوجا پرسی:

- بەزەییت بە پشیلانیشدا دێتەوە؟

- بەڵێ، دڵم بە حاڵی پشیلانش دەسووتێ.

یەکسەر گوتی:

- تۆ کەسێکی کەودەن و درۆزن و بەرەڵلایت، بۆم بوەستە، نەمرم فێرت دەکەم چۆن بژیت!

ناچاربووم بەو ڕێگایەدا بڕۆم بۆ سەر ئیشەکەم، کورت ترین ڕێگا بوو. بەڵام بۆ ئەوەی تووشی نەبم، بەیانیان زۆر زوو لە ماڵەوە بەڕێ دەکەوتم. دوو سێ ڕۆژ بە سەلامەتی بووری، بەڵام دووبارە سەر وسەکوتی پەیدا بووەوە، لە دوورەوە دیتم لە سەر پلیکانەکە ڕۆنیشتبوو، پشیلەیەکی قاوەیی لە باوەشا بوو و نەوازشی دەکرد. هەرکە گەییمە دوو شەقاوی ئەو هەستایە سەر پێیان، هەردوو پاشووی پشیلەکەی گرت و تا هێز لە بازوویدا بوو، سەری پشیلەکەی کێشا بە دیوارە بەردینەکەی تەنیشتیا و خوێن فیچکەی کرد و بە جلەکانما پرژا. ئەوجا پشیلەکەی هەڵدایە بەرپێی من، بە

هەشتاو خۆی گەیاندە بەر دەرگای خانووەکە و بە تەشەرەوە گوتی:

- باشە؟ بە دڵتە؟!

چ بکەم؟ یەکسەر، بەبێ هیچ قسەیەک ئامبازی بووم، ئیدی وەکو دوو سەگ، لە ناو حەوشەکەدا تێک بەربووین و یەکمان دەگەوزاند، بیرازێکی چاکم کرد، دوای ئەوەی ماندوو بووم، لە سەری لاکەوتم و چەند هەنگاوێک دوورتر لە سەر سەوزە گیایەکە ڕۆنیشتم، بە تۆبزی لێوی خۆم دەگەست بۆ ئەوەی هاوار نەکەم. کە ئەم بویەرەم وەبیر دێتەوە، موچوڕکەم پێدا دێت و سەرم دەسوڕمێ کە چۆن شێت نەبووم و تاوانێکم نەکرد.

باشە من بۆچی ئەم شتە ناحەز و دزێوانە دەگێڕمەوە؟ بۆیە ئەمە دەکەم تا ئێوەی خوێنەرانی ئازیزم بزانن کە ئەم شتانە زۆر کۆن نین! ئێوە تامەزرۆی ڕووداوێن ترسناکن، لەزەت لە خوێندنەوەی حیکایەتێن ترسناک دەبینن.. بەڵام من زۆر کارەساتی ڕاستەقینەم بەسەر هاتووە، کارەساتی ژیانی ڕۆژانە، پێم وایە مافی ئەوەم هەیە بە گێڕانەوەی ئەوشتانە لەرزتان لێ بێنم و بزانن لە کوێ و چۆن دەژین.

ئێمە هەمووومان، ژیانێکی زۆر خراپ وپیس بەسەر دەبەین و کەس نییە بتوانێت نکۆڵی لەوە بکات! من بەدڵ و بەگیان خەڵکیم خۆش دەوێن، حەزناکەم دڵی هیچ مرۆڤێک برەنجێنم، بەڵام ناشبێ جڵەو بۆ سۆز شل بکەین و حەقیقەتە پڕ سوێ و بە ئازارەکان، بە وشە و دەستەواژەێن عەوام خەڵەتێن پەردەپۆش بکەین. پێویستە لەگەڵ ژیانا بین، هەرچیەکمان پێدەکرێ لە پێناوی چاکە و بەرزیەتی مرۆڤانیدا بیکەین.

# (٢٤)

... ئەوەی لە هەمــوو شــتێک پتــر پەســتی دەکــردم، شــێت وشــبری دەکــردم، بەرخــورد ورەفتــاری خەڵکــی بــوو دەگەڵ ژنانــدا. خوێنــدنەوەی کتێبــان ئەو قەنــاعەتەی لا دروســت کردبووم، کە ژیان لە ئافرەت جوانتر وبێگەردتری تیانییە. ئەم بۆچوونەم بە هۆی باندۆر وکاریگەری نەنکم و حیکایەتەکانی وی سەبارەت بە پاکیزە و فاسیلیسای فاما و لەڕێگەی ناتالیای جلشۆری کلۆڵ و بەهۆی سەدان هەزار زەردەخەنە و نۆڕینی ژنـانەوە، ســەرچاوە و دایکـانی ژیـانەوە، کە بە بـوونی خۆیـان جوانییـان بە ژیـان دەبەخشــی، لەلا چەســپی. لە بەرهەمەکـانی تورکینیف و هاینەدا، شکۆ و گەورەیی ژن، بەرجەستە کرابوو، ئەمە جـــگە لەوە هەرچـــیەکم ســـەبارەت بە ژن و شـــکۆ و گەورەیـی ژن دەزانــی، ولە بیـرم مـابوو خـۆم بە قەرزاربـاری شاژنە مارگۆ دەزانی.

کە ئێــواران لە کــامپەکە دەگەڕامەوە، زۆرجــار لە ســـەر گردەکەی تەنیشت کۆنە قەڵاکەوە دەوەستام، تەمەشای هەتاوم دەکـرد کە چـۆن لەودیـو ڤۆلگـاوە ئـاوا دەبـوو، دیمەنـێن وەکـو ڕووبار و جوێباران بە ئاسمانەوە چێدەبوون، کەچی ڕووبارەکەی سەر زەوی جارێ سووری دەنواند و جارێ ئەرخەوانـی. لەو ساتانەدا وام هەستدەکرد کە دنیا وزەوی کەشتییەکی گەورەیە، پڕە لە زنـدانیان و بەلەمێکـی بەهێـز بەرەو شـوێنێکی نادیـاری ڕادەکێشێت. زۆرجار بیرم لە گەورەیی زەوی دەکردەوە. بیرم لەو وڵات و دیـار ودەڤەرە دوورە دەســتانە دەکــردەوە، کە لە

کتێبانـدا شـتم دەربارەیـان خوێنـدبووەوە، بیـرم لەو خـاک وخەڵکـانە دەکـردەوە کە بە شـێوەێن جیـاواز لەمە دەژیـان، کە نووسینی نووسـەرانی بیانی ژیـانێکی هێدی تر، خۆشتر وبێ کێشـەتری لەم هەرا وهوریـا و جەنجـاڵەی دەوروبەری منـی، دەنواند..

ئیـدی ئەمە ترسـی دەڕەوانـدمەوە و ئومێـدی ئەوەی لە لا چێدەکردم کە ژیانێکی باشتر هەیە و پیاو دەبێ بیگاتێ.

بە زۆری بیرم لەوە دەکردەوە کە بێژی نە بێژی ڕۆژێ لە ڕۆژان تووشی کەسێکی سادە و بە ئاوەز دەبم کە ڕێگەم پێ نیشانبدات و بمخاتە سەر ڕێگەیەکی پاک و ڕوناک.

ڕۆژێـک، لە نزیکـی دیـواری قەڵایەکە لە سـەر بارسـتاییەک ڕۆنیشـتبووم، خـاڵە "یـاکوف "م هـات بەسـەرا. هەوەڵجـار نە هەستم پێکرد و نە یەکسەر ناسیمەوە. هەرچەندە سالانێک بوو لە یەک شـارۆچکە دەژیـاین، بەلام بە دەگـمەن و بەڕێـکەوت یەکترمـــان دەبینـــی. دەســـتێکی بە شـــانما دا و بە دەم زەردەخەنەیەکەوە گوتی: - نامەخوا گەورە بووی!

هەنگـێ وەکـو دوو کەس کە هـیچ خزمایەتیەکیـان لە بەینـا نەبێت، بەلام دەمێ بێت یەکدی بناسن، کەوتینە گفت وگۆ. من لە نەنکمەوە زانی بووم کە خاڵە یاکوف دار ونەداری خـۆی لە ڕابواردنـا دانـا بـوو، سـەرەنجام بووبـوو بە یاریـدەدەری زندانەوانی، یەکێک لە زنـدانە کاتیەکانی دەڤەری سـیبریا. بەلام کـارەکەی زۆر خـراپ بە سـەریا دەشـکێتەوە. کە زنـدانەوانەکە نەخۆش دەکەوێت، خاڵە یاکوفم لە شـوقەکەی خۆیـا ئاهەنگێکی گەورە بۆ زندانیەکان سازدەکات. کە ئەمەی لێ کەشـف دەبێت و لە کـــارەکەی دەر دەکرێـــت و بەوە تۆمەتبـــار دەکـــرێ کە شـەوێ زنـدانیەکانی ئـازاد کـردووە. هەرچەنـدە هـیچ کەسـێک

هەڵنەهاتبوو، بەڵام زندانیەکیان دەستگیر کردبوو، کە خەریک بووبوو جانکوشی کڵێسایەک بخنکێنێ، پرس وجۆ وەختێکی زۆری خایاند، بەڵام کارەکە نەگەییە دادگا – ئیدی زندانیەکان و زندانەوانەکان ڕێک کەوتن و خاڵە دڵسافەکەمیان لەو کێشەیە ڕزگار کرد. ئێستا بەتاڵ و حەتاڵ، بێ ئیش و کار دەسووڕێتەوە، کوڕەکەی یارمەتی دەدات، کوڕەکەی لە کۆرسی سروودخوانانی کڵێسای ڕوکافچیکۆدا کە لەو سەروبەندەدا زۆر بەناوبانگ بوو، کاری دەکرد. خاڵم بە شێوەیەکی سەیر باسی ئەم کوڕەی دەکرد:

- زۆر کوڕێکی سەلار و سەنگینی لێدەرچووە. ئێستا بووە بە سولیست، ئەگەر من شەوانە سەماوەرەکە پێنەکەم، یان جلەکانی بە فلچە خاوێن نەکەمەوە تووڕە دەبێت. کوڕێکی پاک و خاوێن و کەشخەیە!

خاڵم زۆر پیر بووبوو، شڕ وشەپرێو، ڕوخسار داهێزراو، قژە لوولە جوانەکەی تەواو تەنک بووبوو، گوێچکەکانی لە سەری ڕەوی بووبوونەوە، وردە دەماری سوور کەوتبوونە سەر سپێنەی چاوەکانی، گۆنا سافەکانی داچەکی بوون. بە ڕەوانی قسەی دەکرد، بەڵام هەرچەندە ددانەکانی ساغ بوون، جارجار گرێ دەکەوتە قسەکانی.

من بە دیداری خۆشحاڵ بووم. ئێستا لە گەڵ پیاوێکا قسەم دەکرد، کە بە ئارەزووی خۆی ژیابوو، بێ دڵی خۆی نەکردبوو، زۆرشتی بینی بوو، ژیانی جەڕباندبوو. یەکسەر گۆرانیە شاد و بەجۆشەکانی جارانیم بیر کەوتەوە، ئەو قسانەم بیر کەوتنەوە کە بابام دەربارەی ئەو دەیکردن. بابام دەیگوت: - گۆرانیەکانی خودایی و کردەوەکانی شەیتانین. کە

گـۆرانی دەچـڕێ ئێـژی شـا داوده، کە کـار دەکـات دەڵێـی ئەبشالومە!

خەڵکی بەڕێزی شار بە بولڤارەکەی بەردەممماندا پیاسـەیان دەکـرد، خەڵکـی هەمەجـۆر و شـیک پـۆش بـوون : ئەفسـەران، کارمەندانی دەوڵەت، ئافرەتانی خەشیک و نازدار بۆ خۆ پیاسـە و ڕاوێچکەیـان دەکـرد. خـالَم پـاڵتۆیەکی شـڕ و وڕێ لەبەر، شەپقەیەکی دڕاوی لە سەر، جووتێ پێڵاوی کۆنی لە پێ بوو، زوو زوو ئـاوڕی دەدایەوە و ئەوجـا تەمەشـای خـۆی دەکـرد، دەتگـوت شـەرم لە شـڕ وشـەپڕێوی جـل وبەرگەکەی خـۆی دەکـات. ئیـدی چـووین بـۆ کـافەیەکی گەرەکـی بوچاینسـکی، لە نزیکی پەنجەرەیەکەوە دانیشتین کە دەیڕوانیە سەر بازاڕەکە.

– ئەم گۆرانیەی خۆتت لەبیرە:

*گەدایەک پانتۆڵەکەی هەڵدەخات*

*تا وشک ببێتەوە*

*گەدایەکی دی، لێی دەدزێت..*

بەدەم گـوتنەوەی وشـەکانی ئەو گـۆرانیەوە، بـۆ یەکەمجـار پەیم بە چەمک و مانا تەوسامێزەکەی برد، وام هات بە بیرا کە خالَم هەرچەندە ڕواڵەتێکی شـاد و سـادەی هەیە، بەڵام لە ناخـا وانیـیە و کەسـێکی دڵڕەشـە. لە کاتێکـا بە دەم خەیـاڵەوە پێکـی بۆخۆی تێ دەکرد گوتی:

– بـا، لە بیـرمە. بە ئـارەزووی خـۆم ژیـاوم، بـێ دڵـی خـۆم نەکردووە، لە سەر فشقیاتی خۆم بەردەوام بووم و تا ئێستاش هەر تێـر نەبــووم. بەڵام ئەو گــۆرانیە هــی مــن نەبــوو. مامۆسـتایەکی پەیمـانگە نووسـیبووی. ئەرێ نـاوی چـی بـوو؟ لەبیرم نەماوە. زۆریش برادەر بووین. ژنی نەبوو، مەیگوساری

دەکرد، ڕۆژێکی زستان لە سەرما ڕەق بووەوە. زۆر کەسم لەوانە بینی کە تا مردن دەستبەرداری خواردنەوە نەبوون! ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن! تۆش دەخۆیتەوە؟ ناخۆیتەوە. پەلە مەکە. بابات زوو زوو دەبینی؟ بەڕاستی پیاوێکی خراپە، پێدەچێ خڵەفابێ.

یەک دوو قومی خواردەوە، ملی قوت کردەوە، وەخۆ هاتەوە، زمانی کرایەوە و بوژایەوە. باسی زندان و زندانیەکانم لێ پرسی.

- تۆش بیستووتە؟

تەمەشایەکی دەوروبەری کرد، دەنگی نزم کردەوە وگوتی:

- ڕاستە زندانی بوون، بەڵام من هەقم چییە، خۆ قازی ئەوان نیم. بەڵام ئەوانیش خەڵکانێک بوون وەکو هەر خەڵکێکی دی.. پێمگوتن برادەرینە با دۆستانە پێکەوە بژین، با کەمێک بۆخۆ ڕابوێرین و ئەم گۆرانیەم بۆ گوتن:

*براینۆ گۆرانی بڵێن گۆرانی*

*پێک هەڵدەن، پێک*

*شتێە ئەوەی خەم دەخوات*

*شادی و پێکەنین مافی*

*بێ چەند وچوونی بەشەرە*

*تەنیا گەوجان ئەمە نازانن.*

لە ناکاوا پێکەنی، لە پەنجەرەکەوە ڕوانیە کوچەکە کە خەریک بوو لە تاریکی دا غەرق دەبوو. چەند کوشکێکی بچووک هێشتا هەر کراوە بوون، دەستێکی بە سمێڵیا هێنا وگوتی:

- هەڵبەتە زندانیەکان ئەمەیان زۆر پێخۆش بوو، لە کەیفان لە پێستی خۆیانا نەدەهێورین. ئینسان لە زندانا بێتاقەت دەبێت.

هەرکاتێ خوێندنەوەی ناوەکانیان تەواو دەبوو، دەهاتن بۆ ماڵەکەی من. ڤودگا و خواردن هەندێجار من دەمکڕی و هەندێجار ئەوان. ژیانێکی خۆشبوو، من حەزم لە گۆرانی و سەمایە، لە نێو زندانیەکاندا هەندێ سترانڤان و سەماکار هەبوون. هەندێکیان پێ بە کۆت و زنجیر بوون. باشە بە کۆت وزنجیرەوە سەما دەکرێ! ئیدی من ڕێگەم دەدان کۆت و بەندەکانیان بکەنەوە. خۆیان ئەوەندە وریا و شارەزا بوون، بەبێئەوەی پێویستیان بە ئاسنگەر ببێت، کۆت وبەندەکانیان دەکردەوە! بەڵام ئەو بانگەشەیەی کە گوایە من بەڕەڵلام دەکردن و دەکەوتنە ناو شار ودزییان دەکرد، درۆیەکی ڕووتە. کەس نییە بتوانێ بە بەڵگەوە ئەوە بسەلمێنێت..

بێدەنگ بوو، لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانیە ئەو کاسبکارانەی کە بە تەق وهوڕ دووکانەکانیان دادەخست، وقفڵیان لە دەرابەکانیان دەدا.. ئەوجا چاوێکی لە من داگرت و بە دەنگێکی نەوی لەسەری ڕۆیی:

- ئەگەر ڕاستت دەوێ، تەنیا یەک کەسیان شەوان دەردەچوو، ئەویش پێی بە کۆت و زنجیر نەبوو. لە دزەکانی نیژنی نوڤگورود بوو. ماشقەیەکی هەبوو، لە نزیکی زندانەکە، لەلای ڕوباری پچورکا! مەسەلەی هەوڵی کوشتنی یارۆی جانکوشەکەش ئەنجامی ئەو هەڵەیە بوو کە وایزانی بوو بابایەکی بازرگان و دەوڵەمەندە. لە تۆفە شەوێکی زستانا ئەو بویەرە ڕووی دابوو، نەهەقی نەبوو، هەموو خەڵکی پاڵتۆی ئەستووریان لەبەر کردبوو، کورم دەویست جانکوش و بازرگان لێکدی جیابکاتەوە. ئیدی یارۆی زندانیەکەی لەمەڕ ئێمەش، بە سەهو چووبوو.

کە ئەو دیمەنەم هێنایە بەرچاوی خۆم پێکەنین گرتمی، ئەویش پێکەنی و لە سەری ڕۆیی:

- ئیدی هەموو کەسێک هەڵە دەکات.

لە ناکاوا، خالّم تووڕە بوو. قاپەکەی بەردەمی دایە دواوە، نێوچاوانی تێکنا، جگەرەیەکی پێکرد و بەدەم مینگەوە گوتی:

- ئیدی لە کۆمەڵگەدا دزی هەر هەبووە، هەموو دزاودز کەوتوون. دزی گەورە دزی بچووک دەگرێ، لە زندانی توونی دەکات یان ڕەهەنەی سیبریای دەکات. بەڵام ئەم کارە چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ من هەقم چییە بەسەرەوە، چاویان دەرەهات، لە پێیان بکە.. من ڕوحی تایبەتی خۆم هەیە و لە ڕوحی خۆم بەرپرسم.

یەکسەر، کابرا قژنە توونچییەکەی ناو کەشتیەکەم هاتەوە بەرچاو، ئەویش دایمە وشەی " لە پێیان بکە "ی بە سەر دەمەوە بوو. ئەویش ناوی یاکوف بوو.

خالّم بە نەرمی پرسی: - بیر لە چی دەکەیتەوە؟

- دڵت بەو زندانیانە دەسووتێ؟ خەفەتیان بۆ دەخۆیت؟

- ئاساییە پیاو بەزەیی پێیاندا بێتەوە و خەفەتیان بۆ بخوات. خەڵکی زۆر گەنج و باشیان تیابوو. هەندێجار بەخۆم دەگوت: " تۆ ناکەیتە نینۆکی ئەمیان یان ئەویان، کەچی تۆ ئەمریان پێدەکەیت. " بە ڕاستی خەڵکانێکی شایستە وزیرەک بوون..

کاریگەری وبانـدۆری ڤودگاکە و وەبیرهاتنەوەی بیرەوەریەکانی، هێنایانەوە سەرحاڵ. هەردوو ئانیشکی نانە سەر قەراخی پەنجەرەکە، سیغارەکەی لە نێو قامکە زەرەکانیا

وەرچەرخاند و تەزبێحە یادگارییەکەی زندانەوانەکەی خۆی دەنک دەنک هەڵدەسووڕاند، لە سەری ڕۆیی وگوتی:

- یەکێکم لە لا بوو، خۆزگە گوێت لێدەبوو چۆن قسەی دەکرد! ئەمە چاوێکی کوێر بوو، سەعاتچی بوو، لە سەر قەڵبەزەنی گیرابوو، هەوڵیدا هەڵێت، کابرایەک بوو دەتگوت کڵپەی ئاگرە! خۆزگە گوێت لە دەنگی دەبوو، دەتگوت چریکەی بولبولە، دەیگوت: " بەس ئەوەم تێبگەیەنن کە بۆچی زەڕابخانە بۆی هەیە سکە لێبدات، من بۆم نەبێ ها؟ ئەوەم تێبگەیەنن ". شتاقمان نەماندەتوانی ئەوەی بۆ ڕوون بکەینەوە، تەنانەت منیش کە زندانەوان وپاسەوانیان بووم نەمدەتوانی. یەکێکی دیکەش هەبوو، ئەمە دزێکی مۆسکۆیی زۆر بەنامێ، پاک و خاوێن وهێمن بوو، زۆر بە ئەدەبەوە قسەی دەکرد. دەیگوت:من لە گەڵ ئەوەدا نیم، مرۆڤ تا ڕادەی مەرگ کار بکەن. بۆ نموونە من خۆم کارم دەکرد، زۆر کارم دەکرد، ئەوجا دوو پێکم دەخواردەوە، پارەیەکی کەمم لە قومارا دەدۆڕاند و هەندێک پارەم دەدایە ژنێکی دۆستم و ئەوجا دەکەوتمە سەر ساجی عەلی، تینوو وبرسی دەبوایە سەرلەنوێ شان بدەمەوە بەرکار. دەیگوت: " نا، من جارێکی دی ئەو گەمەیە دووبارە ناکەمەوە! "

یاکوف، خۆی بە سەر مێزەکەوە دانەواندبوو، بە جۆرێ توورە بووبوو، دەم وچاوی سوور بووبووەوە، بە ڕادەیەک هەڵچووبوو، گوێچکە تەنکەکانی دەلەرینەوە، لە سەر قسەکەی ڕۆیی:

- ئەوانە، کوڕی خۆم، کەر نین. ئەوانە لە ژیان تێگەیشتوون. بە هەرحاڵ، با واز لەوانە بێنین! بۆ نموونە من چۆن ژیاوم؟ کە بیر لە ژیانی خۆ دەکەمەوە تەریق دەبمەوە.

هەمیشە بە ترسەوە ژیاوم، جارێ لە ترسی باوکم کە هەمیشە هاواری بەسەرا دەکردم، ئەمە مەکە، ئەوە بکە، جارێ لە ترسی بۆڵەبۆڵی ژنەکەم کە ئەمە بکە ئەوە مەکە، خۆمیش لە پێناوی پارەدا زیرەم بەخۆم کردبوو. ژیانی من بەو ئاوایە بووری و حاڵی حازر تەمەنم کەوتووەتە لێژی و، بووم بە بار بەسەر کوڕەکەمەوە، ئەو دەمژینێ. بۆ ئەمە بشارمەوە؟ حاڵی حازر نۆکەری کورەکەمم، من بەگوێی دەکەم و وەکو ئاغایەکی تەواو بەسەرما دەبۆڵێنێت، ڕاستە بە " باوکە " بانگم دەکات، بەڵام لە گوێی منا وەکو ئەوەیە پێم بڵێ " خولام "! ئایا من بۆ ئەمە دروست بووم؟ یانی من ئەم هەموو ڕەنجەم بۆ ئەمە کێشاوە کە لەلای کوڕەکەم ببم بە خزمەتکار؟ ئاخر من چ خێرو خۆشیەکم لە ژیان بینیوە؟

قسەکانیم زۆر لە لا گرینگ نەبوون، هەر لە خۆوە، بێئەوەی بیر لە وەڵامدانەوە بکەمەوە گوتم:

- منیش وام، نازانم چۆن بژیم.. ڕۆژم بە چ ڕۆژگارێک دەگات..

پێکەنی: - چما کەس دەزانێت؟ لە ژیانما کەسێکم نەبینیوە ئەوە بزانێت! خەڵکی خوویان بە ژیانەوە گرتووە، ژیانیان لە لا بووە بە عادەت و خوو، لێی ڕاهاتوون..

جارێکی دی تووڕەیی، بە سەر دەنگیا زاڵ بوو:

- لە زندانا، گەنجێکی خەڵکی ئەریول هەبوو، ئەمە بە هۆی دەستدرێژی سێکسی و زەوتکردنەوە دەستگیر کرابوو، لە بنەماڵەیەکی خانەدان بوو، سەماکارێکی بێ وێنە بوو، گۆرانیەکی هەبوو بە نێوی ڤانکا، هەمووان حەزیان لێدەکرد:

*ڤانکا وێڵ و سەرگەردان*
*لە گۆڕستانێکا دەسووڕایەوە*
*پەست و خەمگین*
*بەتاقی تەنیا*
*ڤانکا، چیتە چما*
*لەم ناوە دەسووڕێیتەوە*
*بەسەر تەرمی*
*خەڵکیدا دەگەڕێی؟*

هەرچەند بیرم دەکردەوە، هیچ شتێک لەم گۆرانیەدا نەبوو کە مایەی شادی بێ، بەڵکو حەقیقەت بوو، بەشەر هەر کارێک بکات، ئاقیبەتی هەر گۆڕ و گۆڕستانە! بۆیە کە دەگەمە ئەو قۆناغە، بەلامەوە گرینگ نییە چ زندانی بم چ زندانەوان!

لە قسەکردن ماندوو بوو، پێکەکەی هەڵدا، وەکو چۆلەکەیەک چاوەکانی تروکاند و بەنیگایەکی حەسرەتبارەوە ڕوانیە پەرداخە بەتاڵەکە، ئەوجا جگەرەیەکی پێکرد و تۆپەڵە دووکەڵێک لە دەوری سمێڵی پەنگایەوە.

پیوتری بەنا، کە بە هیچ جۆرێ لە خاڵە یاکوفم نەدەچوو، زۆرجار دەیگوت: " هەر کارێک بکەین و هەر هیوا و ئومێدێکمان هەبێ، دوا چارەنووست هەر کفن و گۆڕە. " منیش زۆرم لەم جۆرە قسانە بیستبوو!

حەزم نەدەکرد هیچ پرسیارێکی دی لە خاڵە یاکوفم بکەم. زۆر دڵم بە حاڵی دەسووتا. خەفەتم بۆی دەخوارد. دەنگی گۆرانیەکانی و ئاوازی گیتارەکەیم وەبیرهاتەوە کە خەم و

بێـزاری لە دڵـی خەمینـی گـوێگر دەڕەوانـدەوە. تسـیگانوکی شۆخیبازیشـم لە بیـر نەچووبـووەوە، نەخێـر، لەبیـرم نەچووبـووەوە، ئەو کـوڕەی کە کەوتە ژێـر خـاچەکەوەو پـان وپلیش بووەوە، کە ڕوانیمە ڕوخسـاری تووڕەی خـاڵم، پڕ بە دڵ حەزم دەکـرد لێـی بپرسـم کە ئـاخۆ هیشـتا ئەو بـویەرەی لەبیر ماوە. بەڵام ئەو پرسیارەم لێی نەکرد.

چـاوم بـڕییە ئەو دۆڵەی کە ئێسـتا مـژ ودوومـانی هەیڤـی تەباخ (ئاب) دایپۆشی بوو، لە قووڵایی دۆڵەکەوە بۆنی کاڵەک و سـێو بەرز دەبـووەوە. گڵۆپێن ئەو جادەیەی دەچـوو بۆ شـار هەڵبوون، هەمـوو ئەم دیمەنـانەم بەلاوە ئاشـنا بـوون : شـووتی ئەو کەشتیە هەڵمینەی کە بۆ ڕبینیسـک دەچـوو بەرز بـووەوە، ئەوجـا دەنگـی شـووتی ئەو کەشـتیەی بـۆ پـرم دەچـوو بەرز بووەوە..

خاڵم گوتی: - دەی باشە دەبێ بڕۆم.

لە بەر دەرگـای کـافەکە دەسـتی گوشـیم و بە سـوعبەت و شۆخییەوە گوتی:

- ڕەشبین مەبە، تۆ هێشتا گەنجیت، ڕەشبینی دانە بۆ من، بەڵام ئەمەت لەبیر بێ: " براینۆ گۆرانی بڵێن گۆرانی " دەی بە دوعا، من بۆ کاتدرائیەی ئوسبینسکی دەڕۆم!

لالـۆم ڕۆیـی، منـی بە دوودڵـی بەجێهێشـت، بە گـردەکەدا هەڵـگەڕام و هەوەڵجـار بەرەو شـار ڕۆیـیم و پاشـان بەرەو کێڵگەکـان نشـێو بـوومەوە. مانـگ چـواردە بـوو، هەور بە نـزمییەوە بەری ئاسـمانی دەگـرت و دنیـای تاریـک دەکـرد و سێبەرەکەمی لە سـەر ئەرزەکە دەسڕییەوە، بە نـاو کێڵگەکاندا،

به دەوری شـــارا ســـووڕامەوە، گەیـــیمە ڕوبـــاری ڤولگـــا، لە سەرەولێژگەکەی لای روبارەکەوە، لە سەر سەوزە گیایە تەپ وتـــۆزاوییەکە پـــاڵکەوتم، مـــاوەیەکی زۆر روانـــیمە ڕوبـــارەکە، ڕوانـیمە مێـرگ و مەزرا و دەشــت ودەرە کـپ و بێـدەنگەکەی ئەوبەری ڕوبارەکە. سێبەری هەورەکان بە ئەسپایی بە سەر ڕوبـارەکەدا دەڕۆیـین، دەتگـوت خۆیـان لە ئـاوی ڕوبـارەکە شـــۆردووە و کە لە مێـرگ و مەزراکـــان نزیـــک دەبـــوونەوە، خاوێنتر دەیاننواند. هەموو شتێکی دەورروبەرم کڕ وکپ بوو، هەمــوو شــتێک بە نەبەدڵــی و لە ناچاریــدا دەجــوولا، نەک لە خۆشەویستی ژیان و زەروورەتی جووڵە.

پڕ بە دڵ حەزم دەکرد، سووکێ هەستم و لە سەر ئەرزەکە بکەومە ســەمایەکی ئەوتــۆ کە هەمــوو شــتێک وخۆیشــم لە بیـر بــکەم، هەمــوو ئاشــقانی شــادی و شــادمانی، ژیــن و ژیــان، ئەوانەی یەکدی و ژیانیان خۆشدەوێ بێنمە سەما و هەڵپەڕکێ، خۆیان بۆ ژیانێکی پاکتر وجوانتر و بوێرانەتر ئامادە بکەن..

لە دڵـی خـۆدا گـوتم: " ئەگەر فریـای خـۆ نەکەوم و کارێـک نەکەم تیا دەچم. "

زۆرجار، لە ڕۆژانـی هەور وهەڵا و گـرژ ومـۆنی پـایزدا، کە هەتاوم بە ئاسمانەوە نەدەبینی، یـان هەر هەسـتم پێنەدەکرد بە نـــاو لێرەوارەکـــان کەوتـــووم و ڕێگـــام گـــوم کـــردووە. بەڵام لێبـڕاوانە بـۆ ڕێـگەیەک دەگەڕام کە بمبـاتەوە سـەر ڕێگـاکەی خـۆم، خـۆ ئەگەر ڕێـگەم نەدۆزیبـاوە، ددانـم چیـڕ دەکـردنەوە، ئازایانە بە ناو لێرەوارەکەدا ملـم دەنـا و بەرەو پـێش دەچـووم، دار و دەوەن و زەلکـاو و زۆنگـاوانی پـڕ خەتەرم دەدایە ژێـر

پێوه و له هیچ نەدەترسام. هەموو جارێکیش، بەرێکەوت دەگەییمەوە سەر ڕاستە ڕێگاکە.

له پاییزی ئەو ساڵەدا، ڕووم کردە قازان، بەو ئومێدە پەنهانیەی کە بەڵکو لەوێندەر دەرفەت و دەرەتانێک بۆ خوێندن بدۆزمەوە.

١٩١٤

## تێبینی:

ڕۆژی چوارشـــەممە ٢٠٢٠/١٠/٢٨ لە ســـلێمانی، گەڕەکـــی چـــوارچرای نـــوێ، لە پـــاچڤەی ئەم بەرهەمە بـــوومەوە کە بە شــــێوەیەکی بەراوردکاریــــانە لەم دوو دەقەی خــــوارەوە وەرمگێـڕاوە.. جـا ئەگەر ئەمە بـووبێتە هـۆی ئەوەی هەنـدێک دەستەواژە و ڕستە و پەرەگرافی دەقە کوردیەکە لە ڕواڵەت و شـێوەدا تەواو لە گەڵ ســەرچاوەی یەکەمـدا تێکنەکـاتەوە ئەوا لەگەڵ ســـەرچاوەی دووەمـــدا دێـــتەوە و دیـــارەپێچەوانەش پـێچەوانەیە. هەڵـبەتە بەدڵنیـاییەوە پـاچڤە کـوردییەکە ئەگەر لە هەردوو پاچڤە (عەرەبی و فارسییەکە) باشتر نەبێ، ئەوا هیچی لەوان کەمتر نییە و بێ چەند وچوون ڕووی مەجلیسی دەقانی هەیە..

## سەرچاوەکان:


- مكسيم غوركى / المؤلفات المختـارة فى ٦ مجلدات، المجلد ٢ ، بين النـاس، جامعيـاتى / ترجمـة المحـامى سـهيل ايـوب، دار رادوغـا، موسكو/١٩٨٨.
- در جسـتجوى نـان/ ماكسـيم گوركى، احمـد صـادق/ انتشـارات نگاه / چاپ اول/ ١٣٨٨، تهران.

## زنجیره چاپکراوەکانی
## دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان

١ تأريخ مملكة حماة الايوبية- ابراهيم بشار قاسم

٢- في رثاء عامودا- عبداللطيف الحسيني-غسان جان كير

٣- پاكيزەكانی ئەنفال- محمد رەئوف

٤- نسل كشی در عيراق- هيومان رايتس ۆچ

٥- كاريگەری ئاسەوارە كۆمەڵايەتييەكانی كيمياباراني هەڵەبجە- سەر هەنگ محمد-

٦- تارماييەكانی هەڵەبجە- پ.د.مايكل.جەی.كيلی- و: كارزان محمد

٧- جينۆسايد زنجيرەيەک ..- تەها سليمان

٨- تيمور (ئينگليزی)- عارف قوربانی- و: عبدالكريم عوزيری

٩- تيمور (عربي)- عارف قوربانی- ت: سۆران علي

١٠- تيمور (فارسی)- عارف قوربانی- و: ڕشيد حيدری

١١- تيمور (كوردی)- عارف قوربانی

١٢- ئەنفال پرسی قوربانی- شۆڕش محمد حسين

١٣- التهجير القسري والصهر القومي نوعان من الاباده الجماعية آ.م.د. نبيل عكيد محمود

١٤- هەڵوێستی ڕۆژنامەگەری ميسری لەبارەی جينۆسايدی گەلی كوردەوە- د. محمود زايد- و: ئيدريس جەبار

١٥- ديدێكی نوێ بۆ يادكردنەوەی تاوانەكانی جينۆسايد- عومەر محمد

١٦- جينۆسايد- د. سالار باسيره

بابام لە حەوشەدا بوو، چۆکی دادابوو و تەشوێیەکی بەدەستەوە بوو و سەری ئەستوونێکی تیژ دەکرد، تەشوێیکەی هەڵبڕی وەکو ئەوەی بیەوێ بە سەرمیا بکێشێت، ئەوجا کڵاوەکەی لە سەری داگرت، بە تەوس وتوانجەوە گوتی:
- سڵاو حالی جەناب، دیمانەت بەخێر! تەواو، ئیشەکەت تەواوبوو؟ دەی هەنووکە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت، چۆنت پێخۆشە ئاوا بژیت. تفۆ لەو شیرەی لە دەمت نراوە!
نەنکم قسەکەی پێبڕی و گوتی: دەی بەسە، ئەم قەوانەمان زۆر بیستووە.
ئیدی ئەومان بەجێهێشت و خۆمان بە ژوورا کرد، نەنکم سەماوەرەکەی پێکرد وگوتی:- ئێستا بابات بە تەواوەتی نابووت بووە! تاقە پولێکی قەڵبی پێ نەماوە، هەرچییەکی هەبوو، دای بە نیکۆلای زڕکوڕی تا بۆی بخاتە ئیشەوە، بەبێ ئەوەی هیچ وەسڵێکی پێ ئیمزا بکات، ئەنجام کەس نەیزانی چی ڕوویدا،گرینگ هەرچی دارونەداری هەبوو، لە دەستی دا، بووبە هەڵم و چوو بەئاسمانا.. من هۆیەکەی دەزانم، هی ئەوەیە هیچ سەدەقەیەکمان لێی نەداوە، دەستمان بە هەژاران و نەدارانەوە نەبووە، بەزەییمان بە کلۆڵاندا نەهاتووەتەوە. ئیدی خوا لە دڵی خۆیدا گوتوویەتی: " بۆچی ئەم هەموو ماڵە بە ماڵباتی کاشرین بدەم؟ " ئیدی قەراری خۆی داوەو هەموو شتێکی لێوەرگرتینەوەو تەواو.



ناوەندی توێژینەوەی ئەدەبیی
عەبدولڕەحمان زەبیحی
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2021